# به كوردی

## بەرگی دووەم

پەڕاوەکانی بانگدان ،نوێژی هەینی، نوێژی ترس ، دوو جەژنەکە ، نوێژی ویتر ، داواکردنی بارانبارین، نوێژی خۆرگیران ، سوژدەکانی قورئان ، کورتکردنەوەی نوێژ، شەونوێژ، نوێژکردن لە مەککە و مەدینە، جوڵان لە نوێژکردندا ،هەڵەکردن ، مردوو و جەنازە، زەکات ، حەج

نوسینی

أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري

وەرگێڕانی

محمد ملا صالح بامۆکی

# ( صحيح البخاري ) به كوردى


بەرگی دووەم

نووسینی..أبو عبدالله محمد بن اسماعیل البخاری

وەرگێڕانی.. محمد ملا صالح بامۆکی

چاپی یەکەم ٢٠٢٣

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

دیزاین .. ئەحمەد

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تیشك

## ١٠٤- بابُ القِرَاءَةِ فِي الفَجْرِ

وَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ قَرَأَ النَّبِيُّ ﷺ بِالطُّورِ.

**٧٧١-** حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا سَيَّارُ بْنُ سَلَامَةَ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَأَبِي عَلَى أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ وَقْتِ الصَّلَوَاتِ، فَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الظُّهْرَ حِينَ تَزُولُ الشَّمْسُ، وَالْعَصْرَ وَيَرْجِعُ الرَّجُلُ إِلَى أَقْصَى المَدِينَةِ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ -وَنَسِيتُ مَا قَالَ فِي المَغْرِبِ- وَلَا يُبَالِي بِتَأْخِيرِ العِشَاءِ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ وَلَا يُحِبُّ النَّوْمَ قَبْلَهَا، وَلَا الحَدِيثَ بَعْدَهَا، وَيُصَلِّي الصُّبْحَ فَيَنْصَرِفُ الرَّجُلُ فَيَعْرِفُ جَلِيسَهُ، وَكَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ أَوْ إِحْدَاهُمَا مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى المِائَةِ[1].

## ١٠٤- باسی قورئانخوێندن له نوێژی بەیانیدا

**وە ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سوورەتی (والطُّور)ی خوێند.**

**٧٧١- سەیاری کوڕی سەلامە دەڵێ: من و باوکم ڕۆیشتین بۆ لای ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﵁ و پرسیارمان لێ کرد سەبارەت بە کاتی نوێژەکان؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە نوێژی نیوەڕۆی کاتێ دەکرد کە خۆر لای دەدا لە نێوەڕاستی ئاسمان، وە نوێژی عەسری دەکرد کەسێك دەگەڕایەوە بۆ ئەوپەڕی شاری مەدینە، خۆر هێشتا بە ئاسمانەوە بەرز بوو -وە لەبیرم چوو دەربارەی نوێژی مەغریب چی وت- وە پێغەمبەر ﷺ لای گرنگ نەبوو بە دواخستنی عیشا بۆ سێیەکی شەو، وە پێی خۆش نەبوو هیچ کام لە خەوتن لەپێش عیشادا و قسەکردن لەپاش عیشادا، وە کاتێ نوێژی بەیانی دەکرد، کە پیاو نوێژەکەی تەواو دەکرد هاوڕێکەی دەناسی کە لەپاڵیدایە، وە لە دوو ڕکاتەکەی بەیانیدا یان لە ڕکاتێکیاندا لە شەست بۆ سەد ئایەتی دەخوێند.**

---

[1] بڕوانە: ٥٤١.

٧٧٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: فِي كُلِّ صَلاَةٍ يُقْرَأُ، فَمَا أَسْمَعَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَسْمَعْنَاكُمْ، وَمَا أَخْفَى عَنَّا أَخْفَيْنَا عَنْكُمْ، وَإِنْ لَمْ تَزِدْ عَلَى أُمِّ الْقُرْآنِ أَجْزَأَتْ، وَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ.

**٧٧٢- عەتاو دەگێڕێتەوە کە لە ئەبو هورەیرەی ﷺ بیستووە دەیوت: لە هەموو نوێژێکدا قورئان دەخوێنرێ، جا ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە دەنگی بەرز خوێندوویەتی و گوێمان لێ بووە، ئێمەش بەدەنگی بەرز بۆ ئێوەی دەخوێنین و دەیدەین بەگوێتاندا، ئەوەشی پەنهانی کردووە لە ئێمە، ئێمەش پەنهانی دەکەین لە ئێوە، وە ئەگەر تەنها سوورەتی فاتیحەش بخوێنی دروستە، خۆ ئەگەر زیاتر بخوێنی چاکترە.**

## ١٠٥- بابُ الجَهْرِ بِقِرَاءَةِ صَلَاةِ الفَجْرِ

وَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: طُفْتُ وَرَاءَ النَّاسِ وَالنَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي وَيَقْرَأُ بِالطُّورِ.

٧٧٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ. فَقَالُوا مَا لَكُمْ؟ فَقَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ. قَالُوا: مَا حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ إِلاَّ شَيْءٌ حَدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَانْظُرُوا مَا هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَانْصَرَفَ أُولَئِكَ الَّذِينَ تَوَجَّهُوا نَحْوَ تِهَامَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهْوَ بِنَخْلَةَ، عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ وَهْوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلاَةَ الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَمِعُوا الْقُرْآنَ اسْتَمَعُوا لَهُ فَقَالُوا: هَذَا وَاللَّهِ الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ. فَهُنَالِكَ حِينَ رَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ وَقَالُوا:يا قَوْمَنا ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝١ يَهْدِىٓ

إِلَى ٱلرُّشۡدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦۖ وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا ﴿٢﴾ ﴾ الجن. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ: ﴿ قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ ﴾ الجن، وَإِنَّمَا أُوحِيَ إِلَيْهِ قَوْلُ الْجِنِّ[1].

## ١٠٥- باسی دەنگبەرزکردنەوەی قورئانخوێندنی نوێژی بەیانی

ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: من لەدوای خەڵکەوە بە دەوری کەعبەدا سووڕامەوە، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد و ﴿ وَٱلطُّورِ ﴾ی دەخوێند.

٧٧٣- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا ڕۆیشت بەنیازی بازاڕی عوکاز بوون، لەو کاتەدا شەیتانەکان ڕێگرییان لێ کرابوو لە زانینی هەواڵی ئاسمان (ئەگەر بڕۆیشتنایە)، چڵۆسکی ئاگرینیان بۆ دەهاوێژرا، بۆیە جنۆکەکان گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان، پێیان وتن: ئەوە چیتانە؟ ئەوانیش وتیان: بەربەستێك لە نێوان ئێمە و (زانینی) هەواڵی ئاسماندا دروست کراوە، چڵۆسکی ئاگرینمان بۆ دەهاوێژن! وتیان: دەی کەواتە شتێك ڕووی داوە کە ڕێگری دەکات لەوەی ئێوە هەواڵی ئاسمان بزانن، دەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی بگەڕێن و سەرنج بدەن بزانن چ شتێك لە نێوان ئێوە و هەواڵی ئاسماندا دروست بووە، جا ئەو کۆمەڵە جنۆکەی ڕووە و تیهامە ڕۆیشتبوون، چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە لە نەخەلەدا بوو، بەنیازی بازاڕی عوکاز بوون، لەو کاتەدا پێشنوێژی نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵانی دەکرد، جا کاتێ جنۆکەکان گوێیان لە قورئانخوێندنەکەی بوو، بەجوانی گوێیان بۆ شل کرد، وتیان سوێند بە خوا ئا ئەمەیە ڕێگری نێوان ئێوە و زانینی هەواڵی ئاسمانە، ئینجا لەو کاتەدا گەڕانەوە بۆ لای

---

[1] بڕوانە: ٤٩٢١.

**هۆزەكەيان و وتيان: ئەی هۆزەكەمان (بەڕاستی ئێمە قورئانێكی سەرسووڕهێنەرمان گوێ لێ بوو، ڕێنموونی دەكات بۆ ڕێی ڕاست، بۆيە ئێمەش باوەڕمان پێ هێنا وە هەرگيز كەس ناكەين بە هاوبەشی پەروەردگارمان)، جا ئيدی خوای گەورە: ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ ﴾ دابەزاند بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ، وە بێگومان خوا وتەی جنۆكەكانی بە قورئان بۆ دابەزاند.**

٧٧٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ ﷺ فِيمَا أُمِرَ، وَسَكَتَ فِيمَا أُمِرَ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾ مريم، ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

**٧٧٤- عەبدوڵای كوڕی عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێند لەو شوێن (نوێژانە)دا كە فەرمانی پێ كرابوو (بەئاشكرا و بەدەنگی بەرز بێ)، وە بەبێدەنگيش قورئانی دەخوێند لەو (نوێژانە)دا فەرمانی پێ كرابوو بەپەنهانی بخوێنێ (وە پەروەردگارت هيچ شتێكی لەبير نەچووە) (بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا ﷺ جوانترين سەرمەشق بۆ ئێوە هەيە).**

## ١٠٦- بَابُ الجَمْعِ بَيْنَ السُّورَتَيْنِ فِي الرَّكْعَةِ وَالْقِرَاءَةِ بِالْخَوَاتِيمِ، وَبِسُورَةٍ قَبْلَ سُورَةٍ، وَبِأَوَّلِ سُورَةٍ

وَيُذْكَرُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ: قَرَأَ النَّبِيُّ ﷺ المُؤْمِنُونَ فِي الصُّبْحِ حَتَّى إِذَا جَاءَ ذِكْرُ مُوسَى وَهَارُونَ أَوْ ذِكْرُ عِيسَى، أَخَذَتْهُ سَعْلَةٌ فَرَكَعَ. وَقَرَأَ عُمَرُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى بِمِائَةٍ وَعِشْرِينَ آيَةً مِنَ البَقَرَةِ، وَفِي الثَّانِيَةِ بِسُورَةٍ مِنَ المَثَانِي. وَقَرَأَ الأَحْنَفُ بِالْكَهْفِ فِي الأُولَى، وَفِي الثَّانِيَةِ بِيُوسُفَ أَوْ يُونُسَ، وَذَكَرَ أَنَّهُ صَلَّى مَعَ عُمَرَ رضي الله عنه الصُّبْحَ بِهِمَا. وَقَرَأَ ابن مَسْعُودٍ

بِأَرْبَعِينَ آيَةً مِنَ الأَنْفَالِ، وَفِي الثَّانِيَةِ بِسُورَةٍ مِنَ المُفَصَّلِ. وَقَالَ قَتَادَةُ فِيمَنْ يَقْرأُ سُورَةً وَاحِدَةً فِي رَكْعَتَيْنِ أَوْ يُرَدِّدُ سُورَةً وَاحِدَةً فِي رَكْعَتَيْنِ: كُلٌّ كِتَابُ اللَّهِ.

## ١٠٦- باسی خوێندنی دوو سووڕەت پێکەوە لە ڕکاتێکدا و خوێندنی بەشی کۆتایی سووڕەتەکان و خوێندنی سووڕەتێک پێش سووڕەتێک[1] وە خوێندنی سەرەتای سووڕەتێک

لە عەبدوڵای کوڕی سائیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ سووڕەتی (المُؤْمِنُونَ)ی خوێند هەتا هاتە سەر باسی مووسا و هاڕون یان باسی عیسا، کۆکەیەکی لێ هات، ئیدی کڕنوشی برد، وە عومەر ﷺ لە ڕکاتی یەکەم (ی نوێژی بەیانی)دا سەد و بیست ئایەتی لە سووڕەتی بەقەڕە خوێند، وە لە ڕکاتی دووەمدا یەکێ لە سووڕەتەکانی مەسانی خوێند (کە لە سەد ئایەت کەمترە). ئەحنەف لە ڕکاتی یەکەمدا سووڕەتی کەهفی خوێند، وە لە ڕکاتی دووەمدا سووڕەتی یوسف یان یونسی خوێندوە، وە وتی: خۆی نوێژی کرد لەدوای عومەرەوە ﷺ، ئەو دوو سووڕەتەی خوێند لە نوێژی بەیانیدا. وە عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ چل ئایەتی لە سووڕەتی ئەنفال خوێندووە (لە ڕکاتی یەکەمدا)، لە ڕکاتی دووەمیشدا سووڕەتێك لە سووڕەتەکانی (المُفَصَّل)[2] خوێندووە، وە قەتادە دەڵێ: دەربارەی ئەو کەسەی سووڕەتێك لە دوو ڕکاتدا دەخوێنێت، یان یەك سووڕەت لە دوو ڕکاتدا دووبارە دەکاتەوە، هەموو قوڕئانی خوایە (و دروستە).

---

[1] بەپێچەوانەی ڕیزبەندی قوڕئان، ئەوەی لەدوایە لە پێشدا بخوێنرێت.

[2] لە سووڕەتی (ق)ـەوە تا کۆتایی قوڕئان. بڕوانە فتح الباري: ٢٥٩/٢.

٧٧٤- وَقَالَ عُبَيْدُ اللهِ، عَنْ ثَابِتٍ عَنْ أَنَسٍ ﷺ كَانَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يَؤُمُّهُمْ فِي مَسْجِدِ قُبَاءٍ، وَكَانَ كُلَّمَا افْتَتَحَ سُورَةً يَقْرَأُ بِهَا لَهُمْ فِي الصَّلاَةِ مِمَّا يَقْرَأُ بِهِ افْتَتَحَ بِـ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ الإخلاص، حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهَا، ثُمَّ يَقْرَأُ سُورَةً أُخْرَى مَعَهَا، وَكَانَ يَصْنَعُ ذَلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ، فَكَلَّمَهُ أَصْحَابُهُ فَقَالُوا: إِنَّكَ تَفْتَتِحُ بِهَذِهِ السُّورَةِ، ثُمَّ لاَ تَرَى أَنَّهَا تُجْزِئُكَ حَتَّى تَقْرَأَ بِأُخْرَى، فَإِمَّا أَنْ تَقْرَأَ بِهَا وَإِمَّا أَنْ تَدَعَهَا وَتَقْرَأَ بِأُخْرَى. فَقَالَ: مَا أَنَا بِتَارِكِهَا، إِنْ أَحْبَبْتُمْ أَنْ أَؤُمَّكُمْ بِذَلِكَ فَعَلْتُ، وَإِنْ كَرِهْتُمْ تَرَكْتُكُمْ. وَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّهُ مِنْ أَفْضَلِهِمْ، وَكَرِهُوا أَنْ يَؤُمَّهُمْ غَيْرُهُ، فَلَمَّا أَتَاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ أَخْبَرُوهُ الْخَبَرَ، فَقَالَ: «يَا فُلاَنُ، مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَفْعَلَ مَا يَأْمُرُكَ بِهِ أَصْحَابُكَ؟ وَمَا يَحْمِلُكَ عَلَى لُزُومِ هَذِهِ السُّورَةِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ؟». فَقَالَ: إِنِّي أُحِبُّهَا. فَقَالَ: «حُبُّكَ إِيَّاهَا أَدْخَلَكَ الْجَنَّةَ».

**٧٧٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پیاوێکی ئەنصارِی لە مزگەوتی قوبادا پێشنوێژی بۆ دەکردن، هەموو کاتێ دەستی دەکرد بە خوێندنی سوورەتێك بۆیان لەو سوورەتانەی لە نوێژدا دەیخوێند بە: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ دەستی پێ دەکرد، هەتا کۆتاییەکەی پاشان سوورەتێکی دیکەی دەخوێند لەگەڵدا، وە ئەو پیاوە ئەم کارەی لە هەموو ڕکاتێکدا دەکرد، بۆیە هاوڕێکانی لەو بارەیەوە قسەیان لەگەڵدا کرد و وتیان: تۆ بەم سوورەتە: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ دەست پێ دەکەیت، پاشان وا نازانیت ئەم سوورەتە بەس بێت هەتا سوورەتێکی دیکە نەخوێنی، جا یان هەر ئەو سوورەتە بخوێنە، یان وازی لێ بێنە و سوورەتێکی دیکە بخوێنە، ئەویش وتی: من وازی لێ ناهێنم، ئەگەر پێتان خۆشە و بەو شێوە پێشنوێژیتان بۆ بکەم، ئەوە دەیکەم، وە ئەگەر پێتان ناخۆشە وازتان لێ دێنم (پێشنوێژیتان بۆ ناکەم)، وە نوێژکەرەکان ڕایان وا بوو لە هەموویان گەورەتر و چاکترە و پێیان ناخۆش بوو جگە لەو پێشنوێژییان بۆ**

**بکات جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لایان هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند، ئەویش ﷺ فەرمووی: ((فلان کەس چی ڕێگرە لەوەی ئەوە بکەیتە کە هاوڕێکانت فەرمانت پێ دەکەن؟ وە چی وای لێ کردووی دەستبەرداری ئەم سوورەتە نەبیت لە هەموو ڕکاتێکدا؟))، پیاوەکە وتی: چونکە من ئەو سوورەتەم خۆش دەوێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خۆشەویستیت بۆ ئەو سوورەتە دەتخاتە بەهەشتەوە)).**

٧٧٥- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابن مَسْعُودٍ فَقَالَ قَرَأْتُ الْمفَصَّلَ اللَّيْلَةَ فِي رَكْعَةٍ. فَقَالَ هذا كَهَذِّ الشِّعْرِ؟ لَقَدْ عَرَفْتُ النَّظَائِرَ التِي كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرِنُ بَيْنَهُنَّ. فَذَكَرَ عِشْرِينَ سُورَةً مِنَ الْمفَصَّلِ، سُورَتَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ[١].

**٧٧٥- ئەبو وائیل دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ و وتی: ئەمشەو لە ڕکاتێکدا سوورەتەکانی موفەصلم[٢] هەمووی خوێند، عەبدوڵاش وتی: زۆر بەپەلە وەك خوێندنەوەی هۆنراوە خوێندووتەوە (کەی ئەوە خوێندنەوەیە)؟! بەڕاستی ئەو سوورەتانە دەزانم هاوشێوەی یەکدین کە پێغەمبەر ﷺ دەیخستە پاڵ یەکدی، جا بیست سوورەتی لە سوورەتە موفەصەکان باس کرد کە لە هەر ڕکاتێکدا دوو سوورەتی (خوێندووە).**

## ١٠٧- بابٌ: يَقْرَأُ فِي الأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الكتَابِ

٧٧٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ فِي الأُولَيَيْنِ بِأُمِّ الكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، وَفِي

---

١ بروانە: ٤٩٩٦، ٥٠٤٣.

٢ سوورەتە موفەصەکان لە سوورەتی (ق)ـەوە تا کۆتایی قورئانە.

الرُّكعَتَيْنِ الأُخْرَيَيْنِ بِأُمِّ الكِتَابِ، وُيسْمِعُنَا الآيَةَ، وَيُطَوِّلُ فِي الرَّكعَةِ الأوْلَى مَا لَا يُطَوِّلُ فِي الرَّكعَةِ الثَّانِيَةِ، وَهَكَذَا فِي العَصْرِ، وَهَكَذَا فِي الصُّبْحِ[١].

## ١٠٧- باسێک: لە دوو ڕکاتی کۆتاییدا تەنها سوورەتی فاتیحە دەخوێندرێ

**٧٧٦- عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا سوورەتی فاتیحە و دوو سوورەتی دیکەی دەخوێند (پاش فاتیحە)، وە لە دوو ڕکاتی کۆتاییدا سوورەتی فاتیحەی دەخوێند، هەندێ جار ئایەتێکمان لێ دەبیست[٢]، ئەوەندەی لە ڕکاتی یەکەمدا درێژەی پێ دەدا، ئەوەندە لە ڕکاتی دووەمدا درێژەی پێ نەدەدا، لە نوێژی عەسریشدا بەهەمان شێوەی دەکرد، هەروەها لە نوێژی بەیانیشدا[٣].**

## ١٠٨- بابٌ مَنْ خَافَتَ القِرَاءَةَ في الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ

٧٧٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ: قُلْتُ لِخَبَّابٍ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟ قَالَ نَعَمْ. قُلْنَا مِنْ أَيْنَ عَلِمْتَ؟ قَالَ بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ[٤].

---

[١] بڕوانە: ٧٥٩.

[٢] لە ڕکاتی سێیەم و چوارەمدا پاش سوورەتی فاتیحە، چونکە لەپاش ڕکاتی یەکەم و دووەم سوورەتێکی دەخوێند، وەک لە فەرموودەکەدا بەڕوونی دیارە .

[٣] ڕکاتی یەکەمی درێژتر دەکرد لە ڕکاتی دووەم.

[٤] بڕوانە: ٧٤٦.

## ١٠٨- باسی ئەو کەسەی لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا قورئانخوێندن پەنهان دەکات

٧٧٧- ئەبو مەعمەڕ دەڵێ: بە خەبابم وت: کە پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیومڕۆ و عەسردا قورئانی دەخوێند (دوای فاتیحە)؟ وتی: بەڵێ، وتمان: لەکوێوە دەتزانی (قورئان دەخوێنێ)؟ وتی: بە جوڵانەوەی ڕیشی.

## ١٠٩- بابٌ: إِذَا أَسْمَعَ الإِمَامُ الآيَةَ

٧٧٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا الأوزَاعِيُّ، حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كانَ يَقْرَأُ بِأُمِّ الكِتَابِ وَسُورَةٍ مَعَهَا فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ وَصَلَاةِ العَصْرِ، وَيُسْمِعُنَا الآيَةَ أَحْيَانًا، وَكَانَ يُطِيلُ فِي الرَّكْعَةِ الأولَى[1].

## ١٠٩- باسێک: ئەگەر پێشنوێژ (نوێژکەرەکان) ئایەتێکی لێ ببیستن

٧٧٨- عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیومڕۆ و عەسردا هەمیشە سوورەتی فاتیحە و سووڕەتێکیشی دەخوێند لەگەڵیدا، وە هەندێ جار ئایەتێکی دەدا بە گوێماندا و دەمانبیست و هەمیشە ڕکاتی یەکەمی درێژە پێ دەدا.

---

[1] بڕوانە: ٧٥٩.

## ١١٠- بَابٌ: يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى

٧٧٩- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ، وَيَفْعَلُ ذَلِكَ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ[1].

## ١١٠- باسێک: (پێشنوێژ) ڕکاتی یەکەمی نوێژ درێژە پێ دەدات

**٧٧٩- عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا درێژەی پێ دەدا، وە ڕکاتی دووەمی کورت دەکردەوە، وە هەمان شتی لە نوێژی بەیانیشدا دەکرد.**

## ١١١- بَابُ جَهْرِ الإِمَامِ بِالتَّأْمِينِ

وَقَالَ عَطَاءٌ: آمِينَ دُعَاءٌ. أَمَّنَ ابن الزُّبَيْرِ وَمَنْ وَرَاءَهُ حَتَّى إِنَّ لِلْمَسْجِدِ لَلَجَّةً. وَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُنَادِي الإِمَامَ: لَا تَفُتْنِي بِآمِينَ. وَقَالَ نَافِعٌ: كَانَ ابن عُمَرَ لَا يَدَعُهُ وَيَحُضُّهُمْ عليه، وَسَمِعْتُ مِنْهُ فِي ذَلِكَ خَيْرًا.

## ١١١- باسی پێشنوێژ لە ئامیندا دەنگ بەرز دەکاتەوە

**عەتاو دەڵێ: ئامین نزایە، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ﷺ خۆی و ئەو نوێژکەرانەش لە دوایەوە بوون ئامینیان کرد، هەتا مزگەوتەکە دەنگی دەدایەوە (لەبەر گەورەیی دەنگیان). وە ئەبو هورەیرە ﷺ بانگی پێشنوێژەکەی دەکرد و دەیوت: ئامینەکەم لە دەست مەدە (یان پێشم مەکەوە بە وتنی (آمین)ـەکە)[2].**

---

[1] بروانە: ٧٥٩.

[2] وەك لە گێڕانەوەیەکی دیکەی بوخاریدا هاتووە. إرشاد الساري: ٢/٤٢٩.

**وە نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ وتنی ئامینی نەدەفەوتاند و هانی دەدان لەسەر وتنی، وە لەو بارەیەوە وتەی چاك و جوانم لێ بیستووە.**

٧٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُمَا أَخْبَرَاهُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ». وَقَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «آمِينَ»[1].

**٧٨٠- ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((کاتێ پێشنوێژ ئامینی کرد جا ئێوەش (نوێژکەران) ئامین بکەن، چونکە بەڕاستی هەر کەس ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی فریشتەکاندا پێکەوە بێت، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبوردرێ))، وە ئیبنو شیهاب دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (دوای فاتیحە) دەیفەرموو: ((ئامین)).**

## ١١٢- بابُ فَضْلِ التَّأْمِينِ

٧٨١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَالَ أَحَدُكُمْ: آمِينَ. وَقَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ فِي السَّمَاءِ: آمِينَ. فَوَافَقَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٧٨١، ٧٨٢، ٤٤٧٥، ٦٤٠٢.

[2] بڕوانە: ٧٨٠.

## ١١٢- باسی گەورەیی ئامینکردن (وتنی ئامین)

٧٨١- ئەبو هورەیرە ﷛ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان بڵێ ئامین و فریشتەکانیش لە ئاسمان وتیان: ئامین، ئەگەر ئەو دوو ئامینکردنە هاوتا بوون، لە گوناهەکانی ڕابردووی (ئەو کەسە) دەبوردرێ)).

## ١١٣- بابُ جَهْرِ المأْمُوم بالتَّأْمِين

٧٨٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ عَنْ سُمَيٍّ -مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ- عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَالَ الإِمَامُ: ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ الفاتحة. فَقُولُوا: آمِينَ. فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ». تَابَعَهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَنُعَيْمٌ الْمُجْمِرُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛[1].

## ١١٣- باسی نوێژکەرەکان ئامینکردن بە دەنگی بەرز بڵێن

٧٨٢- ئەبو هورەیرە ﷛ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((کاتێ پێشنوێژ وتی: ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ ئێوەش بڵێن: ئامین، چونکە بەڕاستی هەر کەس وتنی (ئامینەکەی) لەگەڵ وتنی ئامینی فریشتەکاندا پێکەوە بێت، خوا لە گوناهی ڕابردووی دەبورێ)). موحەممەدی کوڕی عەمر لە ئەبو سەلەمەوە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی سومەیی دەکات. هەروەها نوعەیمی موجمیر لە ئەبو هورەیرەوە ﷛ گێڕاویەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی سومەیی دەکات.

---

[1] بڕوانە: ٧٨٠.

## ١١٤- بَابٌ: إِذَا رَكَعَ دُونَ الصَّفِّ

٧٨٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنِ الأَعْلَمِ -وَهْوَ زِيَادٌ- عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهْوَ رَاكِعٌ، فَرَكَعَ قَبْلَ أَنْ يَصِلَ إِلَى الصَّفِّ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «زَادَكَ اللَّهُ حِرْصًا وَلاَ تَعُدْ».

## ١١٤- باسێک: ئەگەر کەسێک کڕنوش ببات پێش ئەوەی بگاتە ڕیزەکەوە

**٧٨٣- ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە (ڕۆیشتە مزگەوت و) گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە ئەو لە کڕنوشدا بوو، بۆیە (ئەبو بەکرە) پێش ئەوەی بگاتە ڕیزەکەوە کڕنوشی برد[1]، (کە نوێژ تەواو بوو) ئەو کارەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوای گەورە سووربوونت (لەسەر نوێژی جەماعەت) زیاد بکات، بەڵام ئەم کارە دووبارە مەکەرەوە)).**

## ١١٥- بَابُ إِتْمَامِ التَّكْبِيرِ فِي الرُّكُوعِ

قَاله ابْن عَبَّاس، عَنِ النَّبي ﷺ[2] فِيهِ مَالِك بن الحُويرث[3].

٧٨٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْوَاسِطِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنِ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي الْعَلاَءِ، عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: صَلَّى مَعَ عَلِيٍّ ﷺ بِالْبَصْرَةِ فَقَالَ: ذَكَّرَنَا هَذَا الرَّجُلُ صَلاَةً كُنَّا نُصَلِّيهَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَذَكَرَ أَنَّهُ كَانَ يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَفَعَ وَكُلَّمَا وَضَعَ[1].

---

[1] هەر کە لە کڕنوشدا بوو بەو حاڵەتەوە ڕۆیشتە ڕیزەکەوە.

[2] بڕوانە: ٧٨٧.

[3] بڕوانە: ٦٧٧.

## ١١٥- باسی (الله أكبر)كردن له كڕنوشدا بەتەواوی[٢]

ئەو فەرموودەیە لەم بارەیەوەیە عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، هەر لەم باسەیە ئەو فەرموودەی مالیكی كوڕی حوەیریس ﷺ دەیگێڕێتەوە[٣].

٧٨٤- موتەریف دەڵێ: عیمرانی كوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: لە بەصرە لەگەڵ عەلیدا ﷺ نوێژی كرد بەجەماعەت، عیمران وتی: ئەم پیاوە (واتە: عەلی) نوێژێكی بەبیر هێناینەوە كە ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەمانكرد، جا عیمران باسی كرد كە پێغەمبەر ﷺ الله أكبری دەكرد هەركات بەرز ببوایەتەوە، یان نزم ببوایەتەوە.

٧٨٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي بِهِمْ، فَيُكَبِّرُ كُلَّمَا خَفَضَ وَرَفَعَ، فَإِذَا انْصَرَفَ قَالَ: إِنِّي لأَشْبَهُكُمْ صَلاَةً بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٤].

٧٨٥- ئەبو سەلەمە لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: كە ئەو (ئەبو هوڕەیرە) پێشنوێژی بۆ موسوڵمانان دەكرد جا الله أكبری دەكرد لە هەر نزمبوونەوە و بەرزبوونەوەیەكدا، ئینجا كە لێ دەبۆیەوە دەیوت: نوێژی من لە هەمووتان زیاتر لە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێت.

---

[١] بڕوانە: ٧٨٦، ٨٢٦.

[٢] واتە: دەنگی درێژ دەكردەوە بە الله أكبرەكە لە وەستانەكەیەوە تا دەگەیشتە كڕنوشەكە، یان پیتەكانی جوان دەردەخست و دەخوێندەوە، یان الله أكبرەكانی نوێژەكەی تەواو دەكرد بە الله أكبری كڕنوشەوە. إرشاد الساري: ٤٣٥/٢.

[٣] كە لە (بَابُ المُكْثِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ)دا باسی دەكەین.

[٤] بڕوانە: ٧٨٩، ٧٩٥، ٨٠٣.

## ١١٦- بابُ إِتْمَامِ التَّكْبِيرِ فِي السُّجُودِ

٧٨٦- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ غَيْلاَنَ بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ أَنَا وَعِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ، فَكَانَ إِذَا سَجَدَ كَبَّرَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ كَبَّرَ، وَإِذَا نَهَضَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ أَخَذَ بِيَدِي عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ فَقَالَ قَدْ ذَكَّرَنِي هَذَا صَلاَةَ مُحَمَّدٍ ﷺ. أَوْ قَالَ: لَقَدْ صَلَّى بِنَا صَلاَةَ مُحَمَّدٍ ﷺ[1].

## ١١٦- باسی تەواوکردنی (الله أکبر)لە سوژدەدا

**٧٨٦- موتەریفی کوڕی عەبدولا دەڵێ: من و عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ لەدوای عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ﷺ نوێژمان کرد، جا عەلی کە سوژدەی دەبرد الله أکبری دەکرد، وە کاتێ سەری بەرز دەکردەوە لە سوژدە الله أکبری دەکرد، کاتێکیش لە دوو ڕکات هەڵدەسایەوە الله أکبری دەکرد، جا کە نوێژەکەی تەواو کرد، موتەریف دەستی عیمرانی کوڕی حوصەینی گرت و وتی: ئەم پیاوە نوێژکردنی موحەممەدی ﷺ بیر خستمەوە. یان وتی: بەڕاستی ئەم پیاوە (عەلی) نوێژێکی بۆ کردین وەك نوێژی موحەممەد ﷺ.**

٧٨٧- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلًا عِنْدَ الْمَقَامِ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ خَفْضٍ وَرَفْعٍ، وَإِذَا قَامَ وَإِذَا وَضَعَ، فَأَخْبَرْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: أَوَلَيْسَ تِلْكَ صَلاَةَ النَّبِيِّ ﷺ لاَ أُمَّ لَكَ؟![2].

**٧٨٧- ئەبو بیشر لە عیکریمەوە دەگێڕێتەوە وتی: لەلای مەقامی ئیبراهیمدا پیاوێکم بینی لە هەموو نزمبوونەوەو و بەرز بوونەوەیەکدا ئەڵاهو ئەکبەری**

---

[1] بڕوانە: ٧٨٤.

[2] بڕوانە: ٧٨٨.

دەکرد، کاتێکیش هەڵسایەتەوە یان دانەویایەتەوە، منیش (شێوەی) ئەم نوێژکردنەم بۆ عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ گێڕایەوە، ئەویش وتی: ئەی مەگەر ئەوە شێوەی نوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ نییە بێ دایك بیت؟!

## ١١٧- بَابُ التَّكْبِيرِ إِذَا قَامَ مِنَ السُّجُودِ

٧٨٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: أَخْبَرَنَا هَمَّامٌ عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ شَيْخٍ بِمَكَّةَ فَكَبَّرَ ثِنْتَيْنِ وَعِشْرِينَ تَكْبِيرَةً، فَقُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّهُ أَحْمَقُ. فَقَالَ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ، سُنَّةُ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ. وَقَالَ مُوسَى: حَدَّثَنَا أَبَانُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ[1].

## ١١٧- باسی (الله أكبر)کردن

## کاتێ نوێژکەر هەڵدەستێتەوە لە سوژدەبردن

**٧٨٨- عیکریمە دەڵێ: لە مەککە لەپشتی پیاوێکی پیرەوە نوێژی (نیوەڕۆ)م کرد بیست و دوو الله أكبری کرد (لە نوێژەکەیدا)، بە عەبدوڵای کوڕی عەباسم ﷺ وت: بەڕاستی پیاوێکی نەزان و بێئەقڵە، عەبدوڵاش وتی: دایکت تۆی لەبار بچێ! ئەوە سوننەتی ئەبولقاسیمە ﷺ. (بەم ڕێگەیەش فەرموودەکە گێڕدراوەتەوە): مووسا دەڵێ: ئەبان بۆی گێڕاینەوە دەڵێ: قەتادە بۆی گێڕاینەوە عیکریمە بۆی گێڕاینەوە.**

٧٨٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: .سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ، ثُمَّ يَقُولُ

---

[1] بروانە: ٧٨٧.

وَهُوَ قَائِمٌ: ‹رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ› - قَالَ عَبْدُ اللَّهِ (بْنُ صَالِحٍ، عَنِ اللَّيْثِ): ‹وَلَكَ الْحَمْدُ›- ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي الصَّلَاةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا، وَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الثِّنْتَيْنِ بَعْدَ الْجُلُوسِ[1].

**٧٨٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كە هەڵدەستا نوێژ بكات، كاتێ بەپێوە دەوەستا الله أكبری دەكرد (و نوێژی دەست پێ دەكرد)، پاشان كە دەڕۆیشت بۆ كڕنوش الله أكبری دەكرد، پاشان پشتی ڕاست دەكردەوە لە كڕنوش و دەیفەرموو: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ))، پاشان كە بەپێوە بوو دەیفەرموو: ((رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ))، عەبدوڵا (ی كوڕی صالح لە لەیسەوە دەیگێڕێتەوە و) دەڵێ: دەیفەرموو: ((وَلَكَ الْحَمْدُ))، پاشان كە دادەنەوییەوە (بۆ سوژدە) الله أكبری دەكرد، پاشان كە سەری بەرز دەكردەوە (لە سوژدە) الله أكبری دەكرد، پاشان كە دەچووەوە بۆ سوژدە الله أكبری دەكرد، پاشان كە جارێكی دیكە سەری بەرز دەكردەوە لە سوژدە الله أكبری دەكرد، پاشان ئەمەی دەكرد لە هەموو ڕكاتەكانی نوێژەكەیدا هەتا تەواوی دەكرد، هەروەها لە دووەم ڕكات هەڵدەسایەوە، پاش دانیشتنی (تەحیاتخوێندن) الله أكبری دەكرد.**

## ١١٨- بابُ وَضْعِ الأَكُفِّ عَلَى الرُّكَبِ فِي الرُّكُوعِ

وَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ فِي أَصْحَابِهِ: أَمْكَنَ النَّبِيُّ ﷺ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ[2].

٧٩٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي يَعْفُورٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُصْعَبَ بْنَ سَعْدٍ يَقُولُ صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي فَطَبَّقْتُ بَيْنَ كَفَّيَّ ثُمَّ وَضَعْتُهُمَا بَيْنَ فَخِذَيَّ، فَنَهَانِي أَبِي وَقَالَ: كُنَّا نَفْعَلُهُ فَنُهِينَا عَنْهُ، وَأُمِرْنَا أَنْ نَضَعَ أَيْدِيَنَا عَلَى الرُّكَبِ.

---

[1] بڕوانە: ٧٨٥.

[2] بڕوانە: ٨٢٨.

## ١١٨- باسی دانانی دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکان لە کڕنوشدا

ئەبو حومەید لەنێو هاوڕێکانیدا وتی: پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی قایم کرد لە ئەژنۆکانی.

٧٩٠- موصعەبی کوڕی سەعد (ی کوڕی ئەبو وەقاص) دەڵێ: لە تەنیشت باوکمدا نوێژم کرد، جا هەردوو نێولەپم پێکەوە نووسان، پاشان لە نێوان هەردوو ڕانمدا دامنان، (دوای نوێژەکە) باوکم ڕێگری ئەوەی لێ کردم (وتی: وا مەکە)، وتی: ئێمە کاتی خۆی وامان دەکرد، بەڵام ڕێگری کراین لەوەی وا بکەین، وە فەرمانمان پێ کرا کە دەستەکانمان لەسەر ئەژنۆکانمان دابنێین.

## ١١٩- بابٌ: إِذَا لَمْ يُتِمَّ الرُّكوعَ

٧٩١- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ وَهْبٍ قَالَ رَأَى حُذَيْفَةُ رَجُلًا لاَ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ قَالَ: مَا صَلَّيْتَ، وَلَوْ مُتَّ مُتَّ عَلَى غَيْرِ الْفِطْرَةِ الَّتِي فَطَرَ اللَّهُ مُحَمَّدًا ﷺ عَلَيْهَا [1].

## ١١٩- باسێک: ئەگەر (نوێژکەر) کڕنوش بەجوانی و تەواوی نەبات

٧٩١- زەیدی کوڕی وەهب دەڵێ: حوزەیفە ﷺ پیاوێکی بینی (نوێژی دەکرد)، کڕنوش و سوژدەی بەتەواوی نەدەبرد، حوزەیفە وتی: تۆ نوێژت نەکردووە، وە ئەگەر بمریت لەسەر سروشتی دینداری (یان سوننەت) نامریت، ئەو سروشتەی خوا موحەممەدی ﷺ لەسەر دروست کردووە.

---

[1] بڕوانە: ٣٨٩.

## ١٢٠- بابُ اسْتِوَاءِ الظَّهْرِ فِي الرُّكُوعِ

وَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ فِي أَصْحَابِهِ: رَكَعَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ[١].

## ١٢٠- باسی ڕێککردنی پشت لە کڕنوشدا

**ئەبو حومەید لەنێو هاوڕێکانیدا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کڕنوشی برد و پاشان پشتی چەماندەوە.**

## ١٢١- بابُ حَدِّ إِتْمَامِ الرُّكُوعِ وَالاِعْتِدَالِ فِيهِ وَالاِطْمَأْنِينَةِ

٧٩٢- حَدَّثَنَا بَدَلُ بْنُ الْمُحَبَّرِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنِي الْحَكَمُ عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: كَانَ رُكُوعُ النَّبِيِّ ﷺ وَسُجُودُهُ وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ وَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ -مَا خَلاَ الْقِيَامَ وَالْقُعُودَ- قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ[٢].

## ١٢١- باسی ئەندازەی کڕنوش و ڕاستبوونەوە لە کڕنوش و وەستانەوە لە جوڵان

**٧٩٢- بەڕاو ﷺ دەڵێ: کڕنوشی پێغەمبەر ﷺ و سوژدە و نێوانی دوو سوژدەکە و کاتێکیش بەرز دەبۆیەوە لە کڕنوش، ماوەی مانەوەی لەوانەدا وەك یەك و نزیك بوون لە یەکدی -جگە لە وەستان و دانیشتن- (کە جیاواز بوون لەوانەی باس کران).**

---

[١] بڕوانە: ٨٢٨.

[٢] بڕوانە: ٨٠١، ٨٢٠.

## ١٢٢- بابُ أمْرِ النَّبِيِّ ﷺ الَّذي لا يُتِمُّ رُكوعَهُ بِالإِعَادَةِ

٧٩٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَرَدَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْهِ السَّلاَمَ فَقَالَ: «ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». ثَلاَثًا. فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ فَمَا أُحْسِنُ غَيْرَهُ فَعَلِّمْنِي. قَالَ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا»[1].

## ١٢٢- باسی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەو پیاوەی بە چاکی کڕنوشی نەدەبرد نوێژەکەی بکاتەوە

**٧٩٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە مزگەوت، جا پیاوێکیش چووە مزگەوت و نوێژی کرد، پاشان هات و سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوە و فەرمووی: ((بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکە، چونکە بەڕاستی نوێژت نەکردووە!))، ئەویش گەڕایەوە نوێژی کردەوە، پاشان هات سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکە، چونکە بەڕاستی نوێژت نەکردووە!))، سێ جار پێی فەرموو، پیاوەکەش وتی: سوێند بەو زاتەی تۆی ناردووە بەڕاستی لەوە چاکتر نازانم، کە وا بوو فێرم بکە! فەرمووی: ((کاتێ هەستای نوێژ بکەیت الله أکبر بکە، پاشان لەوەی کە لەبەرتە لە قورئان هەندێکی بخوێنە، پاشان کڕنوش ببە و بوەستە تا**

---

[1] بڕوانە: ٧٥٧.

**لاشەت لە جوڵە دەوەستێت، پاشان بەرز بەرەوە بەجۆرێك هەتا تەواو ڕاست دەبیتەوە، پاشان سوژدە ببە (و بوەستە) هەتا لاشەت لە جوڵە دەکەوێت لە سوژدەدا، پاشان بەرز بەرەوە لە سوژدە و بوەستە هەتا لاشەت لە جوڵە دەکەوێت بەدانیشتنەوە، جا ئەمە بکە لە هەموو ڕکاتەکانی نوێژەکەت دا)).**

## ١٢٣- بابُ الدُّعَاءِ فِي الرُّكُوعِ

٧٩٤- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي»[١].

## ١٢٣- باسی دوعاکردن لە کاتی کڕنوشدا

**٧٩٤- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کڕنوش و سوژدەدا دەیفەرموو: ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي))، واتە: ((ئەی خوایە! پەروەردگاری ئێمە پاك و بێگەردی بۆ تۆ، وە سوپاس و ستاییش بۆ تۆ، ئەی خوایە لێم خۆش بە)).**

## ١٢٤- بابُ مَا يَقُولُ الإِمَامُ وَمَنْ خَلْفَهُ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ

٧٩٥- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». قَالَ: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ». وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا رَكَعَ وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ يُكَبِّرُ، وَإِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ»[١].

---

[١] بڕوانە: ٨١٧، ٤٢٩٣، ٤٩٦٧، ٤٩٦٨.

## ١٢٤- باسی پێشنوێژ و ئەو نوێژکەرانەی لە دوایەوەن کاتی سەربەرزکردنەوە لە کڕنوش چی دەڵێن؟

٧٩٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەیفەرموو: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ))، دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ رَبَّنَاوَلَكَ الْحَمْدُ))، وە پێغەمبەر ﷺ کاتێ کڕنوشی ببردایە و کاتێ سەری بەرز کردایەتەوە لە کڕنوش، الله أکبری دەکرد، کاتێکیش لە دوو سوژدە هەڵدەسایەوە دەیفەرموو: ((الله أکبر)).

## ١٢٥- بابُ فَضلِ اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ

٧٩٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَالَ الإِمَامُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ. فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

## ١٢٥- باسی گەورەیی نزای: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)

٧٩٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((کاتێ پێشنوێژ وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، جا ئێوەش بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، چونکە بەڕاستی هەرکەس وتەکەی پێکەوە بێت لەگەڵ وتەی فریشتەکاندا، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبوردرێ)).

---

[١] بڕوانە: ٧٨٥.

[٢] بڕوانە: ٣٢٢٨.

## ١٢٦- بابٌ

٧٩٧- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَام، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لأُقَرِّبَنَّ صَلاَةَ النَّبِيِّ ﷺ. فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ يَقْنُتُ فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ، وَصَلاَةِ الْعِشَاءِ، وَصَلاَةِ الصُّبْحِ، بَعْدَ مَا يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَيَدْعُو لِلْمُؤْمِنِينَ، وَيَلْعَنُ الْكُفَّارَ.

## ١٢٦- باسێک

**٧٩٧- ئەبو سەلەمە دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: سوێند بە خوا نوێژکردنی پێغەمبەرتان ﷺ بۆ نزیك دەكەمەوە[١]، جا ئەبو هورەیرە لە ڕكاتی كۆتایی نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عیشا و نوێژی بەیانیدا پاش ئەوەی دەیوت: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، دوعای قونوتی دەخوێند و دەپاڕایەوە بۆ ئیمانداران و نەفرینی دەكرد لە بێباوەڕان.**

٧٩٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ الْقُنُوتُ فِي الْمَغْرِبِ وَالْفَجْرِ[٢].

**٧٩٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە ڕابردوودا دوعای قونوت لە نوێژی مەغریب و بەیانیدا هەبوو.**

٧٩٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُجْمِرِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ يَحْيَى بْنِ خَلاَّدٍ الزُّرَقِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ الزُّرَقِيِّ قَالَ: كُنَّا يَوْمًا نُصَلِّي وَرَاءَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». قَالَ رَجُلٌ وَرَاءَهُ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ «مَنِ الْمُتَكَلِّمُ». قَالَ: أَنَا. قَالَ: «رَأَيْتُ بِضْعَةً وَثَلاَثِينَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا، أَيُّهُمْ يَكْتُبُهَا أَوَّلُ».

---

[١] بە پێشنوێژیکردنی بۆ ئەوانەی قسەیان بۆ دەکات.

[٢] بڕوانە: ١٠٠٤.

٧٩٩- ڕیفاعەی کوڕی ڕافیعی زوڕەقی ﷺ دەڵێ: ڕۆژێکیان ئێمە لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان دەکرد، ئینجا کاتێ سەری لە کڕنوش بەرز کردەوە فەرمووی: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ))، پیاوێك لە دوایەوە وتی: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ)، جا لە نوێژەکە بۆیەوە فەرمووی: ((ئەو قسەکەرە کێ بوو؟))، پیاوەکە وتی: من بووم، فەرمووی: ((سی و ئەوەندە فریشتەم بینی هەموو پەلەیان دەکرد کامیان یەکەم کەس (پاداشتی ئەم زیکرەت) بنووسێ)).

## ١٢٧- بَابُ الطُّمَأْنِينَةِ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ

وقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ وَاسْتَوى جَالِسًا، حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مَكَانَهُ[1].

٨٠٠- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: كَانَ أَنَسٌ يَنْعَتُ لَنَا صَلَاةَ النَّبِيِّ ﷺ فَكَانَ يُصَلِّي وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَامَ حَتَّى نَقُولَ قَدْ نَسِيَ[2].

## ١٢٧- باسی لەجوڵەکەوتنی لەش کاتێ نوێژکەر سەر بەرز دەکاتەوە لە کڕنوش

ئەبو حومەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەرز بۆیەوە و ڕێك وەستا، هەتا هەموو بڕبڕەیەك چۆیەوە شوێنی خۆی.

٨٠٠- سابیت دەڵێ: ئەنەس ﷺ شێوەی نوێژکردنی پێغەمبەری ﷺ بۆ باس دەکردین، جا خۆی نوێژی دەکرد (بۆ ئەو مەبەستە)، کاتێ سەری بەرز دەکردەوە لە کڕنوش ڕادەوەستا، ئەوەندەی پێ دەچوو هەتا دەمانوت: بەڕاستی لەبیری چووە (نوێژ دەکات).

---

[1] بڕوانە: ٨٢٨.

[2] بڕوانە: ٨٢١.

٨٠١- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحكَمِ، عَنِ ابْنِ أبي لَيْلَى، عَنِ البَرَاءِ ﷺ قَالَ: كَانَ رُكُوعُ النَّبِيِّ ﷺ وَسُجُودُهُ، وإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ[١].

**٨٠١- بەڕاو ﷺ دەڵێ: ماوەی کڕنوش و سوژدە و بەرزبوونەوە لە کڕنووش و نێوانی دوو سوژدەکەی پێغەمبەر ﷺ لە یەکدییەوە نزیك بوون.**

٨٠٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: كَانَ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ يُرِينَا كَيْفَ كَانَ صَلاَةُ النَّبِيِّ ﷺ، وَذَاكَ فِي غَيْرِ وَقْتِ صَلاَةٍ، فَقَامَ فَأَمْكَنَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَمْكَنَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَنْصَتَ هُنَيَّةً، قَالَ: فَصَلَّى بِنَا صَلاَةَ شَيْخِنَا هَذَا أَبِي بُرَيْدٍ. وَكَانَ أَبُو بُرَيْدٍ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ الآخِرَةِ اسْتَوَى قَاعِدًا ثُمَّ نَهَضَ[٢].

**٨٠٢- ئەبو قیلابە دەڵێ: مالیکی کوڕی حوەیریس: شێوەی نوێژکردنی پێغەمبەری ﷺ نیشان دەداین چۆن بووە، ئەوەش لە کاتی نوێژکردندا نەبوو، جا هەستا و مایەوە بەوەستانەوە، پاشان کڕنوشی برد و مایەوە لە کڕنوشدا، پاشان سەری بەرز کردەوە (لە کڕنوش) و کەمێك ڕاست وەستا (یان بێدەنگ بوو)، ئەبو قیلابە دەڵێ: نوێژێکی بۆ کردین وەك نوێژی ئەم مامۆستایەمان کە ئەبو بورەیدەیە، جا ئەبو بورەیدە کاتێ لە سوژدەی دووەم سەری بەرز بکردایەتەوە ڕێك و ڕاست دادەنیشت، پاشان هەڵدەسایەوە.**

---

[١] بڕوانە: ٧٩٢.

[٢] بڕوانە: ٦٧٧.

## ١٢٨- بابٌ: يَهْوِي بِالتَّكْبِيرِ حِينَ يَسْجُدُ

وَقَالَ نَافِعٌ: كَانَ ابن عُمَرَ يَضَعُ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ.

٨٠٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ وَأَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ صَلاَةٍ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ وَغَيْرِهَا فِي رَمَضَانَ وَغَيْرِهِ، فَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. ثُمَّ يَقُولُ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. قَبْلَ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ. حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الْجُلُوسِ فِي الاِثْنَتَيْنِ، وَيَفْعَلُ ذَلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ حَتَّى يَفْرُغَ مِنَ الصَّلاَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: حِينَ يَنْصَرِفُ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لأَقْرَبُكُمْ شَبَهًا بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِنْ كَانَتْ هَذِهِ لَصَلاَتَهُ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا[1].

## ١٢٨- باسێک:بە (الله أكبر)ەوەدادەبەزی کاتێ سوژدەی دەبرد

**نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی دادەنا (لە چوون بۆ سوژدەدا).**

**٨٠٣- ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمان و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێنەوە: کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە هەموو نوێژێکی فەڕز و غەیری فەڕز، لە ڕەمەزان و لە غەیری ڕەمەزانیشدا الله أكبری دەکرد، جا کاتێ دەوەستا (بۆ نوێژدابەستن) الله أكبری دەکرد، پاشان کە کڕنوشی دەبرد الله أكبری دەکرد، پاشان دەیوت:** (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، **پاشان دەیوت:** (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) **پێش ئەوەی سوژدە ببات، پاشان دەیوت: الله أكبر کاتێ دادەبەزی بۆ سوژدەبردن، پاشان**

---

[1] بڕوانە: ٧٨٥.

**كه سەری بەرز دەكردەوە لە سوژدە الله أكبری دەكرد، پاشان كه دەچۆیەوە بۆ سوژدە الله أكبری دەكرد، پاشان كاتێ سەری بەز دەكردەوە لە سوژدە الله أكبری دەكرد، پاشان كاتێ لە دانیشتن (ی تەحیات)ی دوای دوو ڕكات هەڵدەسایەوە الله أكبری ئەكرد، ئیدی بەم شێوەیەی دەكرد لە هەموو ڕكاتێكدا هەتا لە نوێژەكەی دەبۆیەوە، پاشان كاتێ تەواو بوو وتی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بێگومان نوێژكردنی من لە هەمووتان زیاتر لە نوێژكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێت، كه نوێژكردنی ئا بەم شێوەیە بوو هەتا لە دونیا دەرچوو.**

٨٠٤- قَالا: وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ يَقُولُ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ». يَدْعُو لِرِجَالٍ فَيُسَمِّيهِمْ بِأَسْمَائِهِمْ فَيَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، وَاجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ». وَأَهْلُ الْمَشْرِقِ يَوْمَئِذٍ مِنْ مُضَرَ مُخَالِفُونَ لَهُ[1].

**٨٠٤- وە (ئەبو بەكری كوڕی عەبدوڕەحمان و ئەبو سەلەمەی كوڕی عەبدوڕەحمان) دەڵێن: وە ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ سەری بەرز دەكردەوە (لە كڕنوش) دەیفەرموو: ((**سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ**))، دوعا و نزای دەكرد بۆ چەند پیاوێك كه بە ناو ناوی دەبردن و دەیفەرموو: ((خوایە وەلیدی كوڕی وەلید و سەلەمەی كوڕی هیشام و عەیاشی كوڕی ئەبو ڕەبیعە و باوەڕدارە لاوازەكان ڕزگار بكەیت، خوایە تۆڵەی توندی خۆت بنێری بۆ هۆزی موزەر، گرانی و قاتوقڕی بخەیتە نێویان وەك گرانی و**

---

[1] بڕوانە: ١٠٠٦، ٢٩٣٢، ٣٣٨٦، ٤٥٦٠، ٤٥٩٨، ٦٢٠٠، ٦٣٩٣، ٦٩٤٠.

**قاتی سەردەمی پێغەمبەر یوسف ﷺ))، لەو کات و ڕۆژگارەدا خەڵکی ڕۆژهەڵات لە هۆزی موزەڕ دژی پێغەمبەر ﷺ بوون.**

٨٠٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ غَيْرَ مَرَّةٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ سَقَطَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ فَرَسٍ -وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: مِنْ فَرَسٍ- فَجُحِشَ شِقُّهُ الأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ نَعُودُهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَصَلَّى بِنَا قَاعِدًا وَقَعَدْنَا -وَقَالَ سُفْيَانُ مَرَّةً: صَلَّيْنَا قُعُودًا- فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. وَإِذَا سَجَدَفَاسْجُدُوا». قَالَ سُفْيَانُ: كَذَا جَاءَ بِهِ مَعْمَرٌ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ لَقَدْ حَفِظَ، كَذَا قَالَ الزُّهْرِيُّ: «وَلَكَ الْحَمْدُ». حَفِظْتُ: مِنْ شِقِّهِ الأَيْمَنِ. فَلَمَّا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِ الزُّهْرِيِّ قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ -وَأَنَا عِنْدَهُ-: فَجُحِشَ سَاقُهُ الأَيْمَنُ[1].

**٨٠٥- عەلی کوڕی عەبدوڵا دەڵێ: سوفیان لە زیاد لە جارێك بۆی گێڕاینەوە لە زوهرییەوە دەڵێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەسپێك کەوتە خوارەوە - هەندێ جار سوفیان دەیوت: (مِنْ فَرَسٍ) لەجیاتی (عَنْ فَرَسٍ)- لای ڕاستی بریندار بوو، ئێمەش ڕۆیشتین بۆ لای دیدەنیمان کرد، ئینجا نوێژ بوو پێغەمبەر ﷺ بەدانیشتنەوە پێشنوێژی بۆ کردین، ئێمەش دانیشتین (نوێژمان کرد)، -سوفیان جارێکیان وتی: بەدانیشتنەوە نوێژمان کرد-، جا کە لە نوێژەکە بۆیەوە فەرمووی: ((بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە پەیڕەوی لێ بکرێ، جا کاتێ الله أکبری کرد، ئێوەش الله أکبر بکەن، وە کاتێ کڕنوشی برد ئێوەش کڕنوش ببەن، کاتێکیش بەرز بۆیەوە (لە کڕنوش) ئێوەش بەرز ببنەوە، وە کاتێ وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش**

---

[1] بڕوانە: ٣٧٨.

**بلێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، وە كاتێ سوژدەی برد ئێوەش سوژدە ببەن))، سوفیان دەڵێ: مەعمەر ئاوەها هێناویەتی؟ (عەلی كوڕی عەبدوڵا -یەكێكە لەڕاوییەكان دەڵێ:) وتم: بەڵێ، وتی: بەڕاستی چاك لەبەری كردووە، زوهریش هەر وەك مەعمەری وتووە: (وَلَكَ الْحَمْدُ)، سوفیان وتی: من بەم شێوە لەبەرم كردووە (مِنْ شِقِّهِ الأَيْمَنِ)، جا كاتێ لای زوهری هاتینە دەرەوە ئیبنو جوڕەیج -لە كاتێكدا من لەلای بووم- وتی: (فَجُحِشَ سَاقُهُ الأَيْمَنُ)، واتە: (لاقی ڕاستی بریندار بوو).**

## ١٢٩- بابُ فَضْلِ السُّجُودِ

٨٠٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، وَعَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ اللَّيْثِيُّ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ أَخْبَرَهُمَا، أَنَّ النَّاسَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: «هَلْ تُمَارُونَ فِي الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْسَ دُونَهُ سَحَابٌ؟». قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «فَهَلْ تُمَارُونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ؟». قَالُوا: لاَ. قَالَ: «فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ، يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتَّبِعْ. فَمِنْهُمْ مَنْ يَتَّبِعُ الشَّمْسَ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَتَّبِعُ الْقَمَرَ وَمِنْهُمْ مَنْ يَتَّبِعُ الطَّوَاغِيتَ، وَتَبْقَى هَذِهِ الأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ فَيَقُولُونَ: هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا، فَإِذَا جَاءَ رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ. فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا. فَيَدْعُوهُمْ فَيُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَانَى جَهَنَّمَ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يَجُوزُ مِنَ الرُّسُلِ بِأُمَّتِهِ، وَلاَ يَتَكَلَّمُ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ إِلاَّ الرُّسُلُ، وَكَلاَمُ الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ. وَفِي جَهَنَّمَ كَلاَلِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، هَلْ رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ؟». قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ «فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلاَّ اللَّهُ، تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ يُوبَقُ بِعَمَلِهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُخَرْدَلُ ثُمَّ يَنْجُو، حَتَّى إِذَا أَرَادَ اللَّهُ رَحْمَةَ مَنْ أَرَادَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، أَمَرَ اللَّهُ الْمَلاَئِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوا

مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ، فَيُخْرِجُونَهُمْ وَيَعْرِفُونَهُمْ بِآثَارِ السُّجُودِ، وَحَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ، فَكُلُّ ابْنِ آدَمَ تَأْكُلُهُ النَّارُ إِلاَّ أَثَرَ السُّجُودِ، فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ قَدِ امْتَحَشُوا، فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مَاءُ الْحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ، ثُمَّ يَفْرُغُ اللَّهُ مِنَ الْقَضَاءِ بَيْنَ الْعِبَادِ، وَيَبْقَى رَجُلٌ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، وَهْوَ آخِرُ أَهْلِ النَّارِ دُخُولًا الْجَنَّةَ، مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ قِبَلَ النَّارِ فَيَقُولُ:يا رَبِّ، اصْرِفْ وَجْهِي عَنِ النَّارِ، قَدْ قَشَبَنِي رِيحُهَا، وَأَحْرَقَنِي ذَكَاؤُهَا. فَيَقُولُ: هَلْ عَسَيْتَ إِنْ فُعِلَ ذَلِكَ بِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: لاَ وَعِزَّتِكَ. فَيُعْطِي اللَّهَ مَا يَشَاءُ مِنْ عَهْدٍ وَمِيثَاقٍ، فَيَصْرِفُ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ، فَإِذَا أَقْبَلَ بِهِ عَلَى الْجَنَّةِ رَأَى بَهْجَتَهَا سَكَتَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ، ثُمَّ قَالَ:يا رَبِّ، قَدِّمْنِي عِنْدَ بَابِ الْجَنَّةِ. فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: أَلَيْسَ قَدْ أَعْطَيْتَ الْعُهُودَ وَالْمَوَاثِيقَ أَنْ لاَ تَسْأَلَ غَيْرَ الَّذِي كُنْتَ سَأَلْتَ؟ فَيَقُولُ:يا رَبِّ، لاَ أَكُونُ أَشْقَى خَلْقِكَ. فَيَقُولُ: فَمَا عَسَيْتَ إِنْ أُعْطِيتَ ذَلِكَ أَنْ لاَ تَسْأَلَ غَيْرَهُ فَيَقُولُ لاَ وَعِزَّتِكَ لاَ أَسْأَلُ غَيْرَ ذَلِكَ. فَيُعْطِى رَبَّهُ مَا شَاءَ مِنْ عَهْدٍ وَمِيثَاقٍ، فَيُقَدِّمُهُ إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ، فَإِذَا بَلَغَ بَابَهَا، فَرَأَى زَهْرَتَهَا وَمَا فِيهَا مِنَ النَّضْرَةِ وَالسُّرُورِ، فَيَسْكُتُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ، فَيَقُولُ:يا رَبِّ أَدْخِلْنِي الْجَنَّةَ. فَيَقُولُ اللَّهُ: وَيْحَكَ يا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ! أَلَيْسَ قَدْ أَعْطَيْتَ الْعَهْدَ وَالْمِيثَاقَ أَنْ لَا تَسْأَلَ غَيْرَ الَّذِي أُعْطِيتَ؟ فَيَقُولُ:يا رَبِّ، لاَ تَجْعَلْنِى أَشْقَى خَلْقِكَ. فَيَضْحَكُ اللَّهُ ﷻ مِنْهُ، ثُمَّ يَأْذَنُ لَهُ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ فَيَقُولُ: تَمَنَّ. فَيَتَمَنَّى حَتَّى إِذَا انْقَطَعَتْ أُمْنِيَّتُهُ قَالَ اللَّهُ ﷻ: تَمَنَّ كَذَا وَكَذَا. أَقْبَلَ يُذَكِّرُهُ رَبُّهُ، حَتَّى إِذَا انْتَهَتْ بِهِ الأَمَانِيُّ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: لَكَ ذَلِكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ لأَبِي هُرَيْرَةَ - ﷺ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ: لَكَ ذَلِكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لَمْ أَحْفَظْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلاَّ قَوْلَهُ: «لَكَ ذَلِكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ إِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «ذَلِكَ لَكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ»[1].

---

[1] بروانه: ٦٥٧٣، ٧٤٣٧.

# ١٢٩- باسی گەورەیی سوژدەبردن

٨٠٦- سەعیدی کوڕی موسەیەب و عەتائی کوڕی یەزیدی لەیسی گێڕایانەوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕانەوە کە خەڵکی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگارمان دەبینین؟ فەرمووی: ((ئایا گومانتان دەبێ لە بینینی مانگی چواردە، ئەگەر هیچ هەور بەری نەگرێ و سایەقەی ساماڵ بێت؟!))، وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((دەی ئایا گومانتان دەبێ لە بینینی خۆر ئەگەر هیچ هەور بەری نەگرێ و سایەقەی ساماڵ بێت؟!))، وتیان: نەخێر، فەرمووی: ((دەی بێگومان ئێوە هەر ئاوا پەروەردگارتان دەبینن، لە ڕۆژی دواییدا خەڵکی کۆ دەکرێنەوە، جا (خوا یان فریشتەیەك) دەڵێ: هەر کەس هەرچی پەرستووە با شوێنی بکەوێت، جا هەیانە شوێن خۆر دەکەوێ، هەیانە شوێن مانگ دەکەوێ، هەیانە شوێن گومڕاکار و سەرلێشێوێنەران دەکەوێ، ئینجا ئەم ئوممەتی ئیسلامە دەمێنێتەوە و دووڕووەکانیشی تێدایە، جا خوای گەورە دێ بۆ لایان (بەشێوەیەك نەیناسن) و دەفەرمووێ: من پەروەردگارتانم، ئەوانیش دەڵێن: ئەمە شوێنمانە هەتا پەروەردگارمان دێت بۆ لامان، جا ئەگەر پەروەردگارمان هات دەیناسینەوە، ئینجا خوای گەورە دێت بۆ لایان و دەفەرمووێ: من پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: ڕاستە تۆ پەروەردگاری ئێمەی، جا بانگیان دەکات، ئەوسا پردی (صِّرَاط) بەسەر دۆزەخدا دادەنرێ، ئینجا من یەکەم کەس دەبم لە پێغەمبەران کە ئوممەتەکەم لەو پردە دەپەڕێنمەوە، وە لەو ڕۆژەدا جگە لە پێغەمبەران کەس قسە ناکات، قسەی پێغەمبەرانیش ﷺ لەو ڕۆژەدا (ئەمەیە): خوایە

بێوەیمان بکە، بێوەیمان بکە، وە لە دۆزەخدا قولاپ هەیە وەك دڕکی سەعدان[1]، ئایا دڕکی سەعدانتان بینیوە؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((جا بەڕاستی (قولاپەکانی دۆزەخ) وەك دڕکی سەعدان وایە، بەڵام ئەوەندە هەیە خوا نەبێ کەس نازانێ چەند گەورەن، بەئەندازەی کردەوە (ی خراپ)یان خەڵکی دەفڕێنن (و فڕێی دەدەنە دۆزەخەوە)، جا هەیانە بەهۆی کردەوەی خراپییەوە تیا دەچێ، وە هەشیانە پارچە پارچە دەکرێ پاشان ڕزگاری دەبێ، هەتا کاتێ خوا بەزەیی دێتەوە بە هەر کەس کە بیەوێ لە دۆزەخییان، خوا فەرمان دەکات بە فریشتەکانی: کە ئەوەی خوای پەرستووە لە دۆزەخ دەریبێنن، ئەوانیش دەریاندێنن و بە شوێنەواری سوژدەدا دەیاناسنەوە، وە خوای گەورە قەدەغەی کردوە لە ئاگر شوێنەواری سوژدە بسووتێنێ و بیخوات، ئیدی لە دۆزەخ دێنە دەرەوە، وە هەموو شوێنێکی مرۆڤ ئاگر دەیسووتێنێ جگە لە شوێنەواری سوژدە، جا لە دۆزەخ دێنە دەرەوە بەسووتاوی و بەڕەشی، ئینجا ئاوی ژیانەوە دەکرێ بە سەریاندا و لاشەیان گۆشت دێنێتەوە، هەر وەك چۆن دانەوێڵەی قەراغی لافاو سەوز دەبێت، پاشان خوای گەورە لە قەزاوەت و دادگای نێوان بەندەکانی دەبێتەوە، پیاوێك لە نێوانی بەهەشت و دۆزەخدا دەمێنێتەوە، کە کۆتا کەسە لە دۆزەخییان دەچێتە بەهەشتەوە، ڕووی دەموچاوی ڕوو بە دۆزەخە، بۆیە دەپاڕێتەوە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ڕووم لە دۆزەخ وەرچەرخێنە، بەڕاستی بۆنی ناخۆشی کوشتومی، گڕ و گەرمییەکەشی سووتاندوومی، خوای گەورەش دەفەرمووێ: ئایا لەوانە نییە ئەگەر ئەوەت بۆ بکرێ شتی دیکە داوا نەکەیت؟ ئەویش دەڵێ: نە سوێند بێ بە عیزەتت، جا ئەوەندەی بیەوێ حەز بکات لە پەیمان و سوێند دەیدا بە خوا، ئینجا خوا ڕووی وەردەچەرخێنێ لە دۆزەخ، جا

---

[1] ڕووەکێکی دڕکاوییە.

كە ڕووی دەكاتە بەهەشت و جوانی و نازدارییەكەی دەبینێ، ئەوەندەی خوا حەز كات و بیەوێ بێدەنگ دەبێ، پاشان دەڵێ: ئەی پەروەردگار نزیكم بخەرەوە لە دەرگای بەهەشت، خوای گەورەش پێی دەفەرمووێ: ئایا تۆ بەڵێن و پەیمانت نەدا كە جگە لەوەی داوات كرد داوای هیچی دیكە نەكەیت؟ ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم (ئومێدەوارم) نەگبەتترینی دروستكراوەكانت نەبم، جا خوای گەورە دەفەرمووێ: جا لەوانە نییە ئەگەر ئەوەت پێ بدەم شتی دیكە جیا لەوە داوا نەكەیت؟ دەڵێ: سوێند بێ بە عیزەتت جگە لەوە هیچی دیكە داوا ناكەم، جا ئەوەندەی بیەوێ و حەز بكات لە بەڵێن و پەیمان دەیدات بە پەروەردگاری، جا خوای گەورە نزیكی دەخاتەوە لە دەرگای بەهەشت، جا كاتێ گەیشتە لای دەرگای بەهەشت و جوانی و ڕازاوەیی بەهەشت و ئەوەش تێیدایە لە ناسكی و جوانی و خۆشی دەبینێ، جا ئەوەندەی خوا حەز بكات بێدەنگ بێ، ئینجا دەڵێ: ئەی پەروەردگار بمبەرە بەهەشتەوە، خوای گەورەش دەفەرمووێ: داماوی بۆ تۆ ئەی ئادەمیزاد چەند بێ پەیمانیت! ئایا تۆ پەیمان و بەڵێنت نەدا كە جگە لەوەی داوات كرد، داوای هیچی دیكە نەكەیت؟ ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم مەمگێڕە لە خراپترینی دروستكراوەكانت، خوای ﷻ پێ دەكەنێ پێی، پاشان ڕێگەی پێ دەدا بە چوونە بەهەشت، ئینجا پێی دەڵێ: ئاوات بخوازە، ئەویش ئەوەندە ئاوات دەخوازێ هەتا ئاواتەكانی كۆتاییان دێ، خوای ﷻ دەفەرمووێ: ئاواتی ئەوە و ئەوەش بخوازە، پەروەردگار دەست دەكات بە بیرخستنەوەی ئاواتی دیكە هەتا ئاواتەكانی كۆتاییان دێ، خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: ئەوەی ئاواتت خواست بۆ تۆ ئەوەندەی دیكەشی لەگەڵدا بێت)، ئەبو سەعیدی خودری بە ئەبو هوڕەیرەی ﷺ وت: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا فەرمووی: ئەوە بۆ تۆ دە ئەوەندەش)). ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: من لە

پێغەمبەری خوام ﷺ نەبیستووە و لەبەرم نەکردووە جگە لەوەی فەرمووی: ((ئەوە بۆ تۆ ئەوەندەی دیکەشی لەگەڵدا بێت))، ئەبو سەعید وتی: بێگومان من گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((ئەوە (ی ئاواتت خواست) بۆ تۆ و دە ئەوەندەی دیکەش)).

## ١٣٠- بَابٌ: يُبْدِي ضَبْعَيْهِ وَيُجَافِي فِي السُّجُودِ

٨٠٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي بَكْرُ بْنُ مُضَرَ، عَنْ جَعْفَرٍ، عَنِ ابْنِ هُرْمُزَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ ابْنِ بُحَيْنَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا صَلَّى فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ نَحْوَهُ[1]

## ١٣٠- باسێک: (نوێژکەر) هەردوو ژێرباڵی دەرخات و قۆڵەکانی دوور خاتەوە لە لاشەی لە کاتی سوژدەدا

٨٠٧- عەبدوڵای کوڕی مالیکی کوڕی بوحەینە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە کە نوێژی دەکرد باڵەکانی لە خۆی دوور دەخستەوە، هەتا سپیایی هەردوو بنباڵی دەردەکەوت. لەیس دەڵێ: جەعفەری کوڕی ڕەبیعە وێنەی ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕامەوە.

## ١٣١- بَابٌ: يَسْتَقْبِلُ بِأَطْرَافِ رِجْلَيْهِ القِبْلَةَ

قَالَهُ أَبُو حُمَيْدٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

---

[1] بڕوانە: ٣٩٠.

## ١٣١- باسێک: سەرپەنجەی پێیەکانی ڕوو پێ دەکردە قیبلە

ئەم فەرموودەیە (سەرپەنجەی پێیەکانی ڕوو پێ دەکردە قیبلە) ئەبو حومەید لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە.

## ١٣٢- بابٌ: إِذَا لَم يُتِمَّ السُّجُودَ

٨٠٨- حَدَّثَنَا الصَّلْتُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مَهْدِيٌّ، عَنْ وَاصِلٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ، رَأَى رَجُلًا لاَ يُتِمُّ رُكُوعَهُ وَلاَ سُجُودَهُ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ قَالَ لَهُ حُذَيْفَةُ: مَا صَلَّيْتَ -قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ:- وَلَوْ مُتَّ مُتَّ عَلَى غَيْرِ سُنَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ[1].

## ١٣٢- باسێک: ئەگەر کەسێک بەتەواوی سوژدە نەبات

٨٠٨- ئەبو وائیل دەگێڕێتەوە کە حوزەیفە ﷺ پیاوێکی بینی کڕنوش و سوژدەی بەچاکی و تەواوی نەدەبرد، جا کاتێ کابرا لە نوێژەکەی بۆیەوە حوزەیفە پێی وت: تۆ نوێژت نەکردووە - ئەبو وائیل دەڵێ: وا بزانم وتی: -ئەگەر بمری لەسەر سوننەتی موحەممەد ﷺ نامری.

## ١٣٣- بابٌ: السُّجُودِ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ

٨٠٩- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أُمِرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْضَاءٍ، وَلاَ يَكُفَّ شَعَرًا وَلاَ ثَوْبًا: الجَبْهَةِ وَاليَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ[2].

---

[1] بروانە: ٣٨٩.

[2] بروانە: ٨١٠، ٨١٢، ٨١٥، ٨١٦.

# ١٣٣- باسێک: سوژدەبردن لەسەر حەوت ئێسک (ئەندام)

**٨٠٩- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرا کە لەسەر حەوت ئەندام سوژدە ببات، وە فەرمانی پێ کراوە نە قژ کۆ بکاتەوە نە جلوبەرگ، (حەوت ئەندامەکەش ئەمانەن): نێوچاوان (تەوێڵ)، هەردوو دەست (نێولەپ)، هەردوو ئەژنۆ، هەردوو پێ.**

٨١٠- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أُمِرْنَا أَنْ نَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ، وَلاَ نَكُفَّ ثَوْبًا وَلاَ شَعَرًا».

**٨١٠- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((فەرمانمان پێ کراوە کە لەسەر حەوت ئێسقان سوژدە ببەین، وە پۆشاك و قژیش کۆ نەکەینەوە (لەدواوە قژمان نەبەستین))).**

٨١١- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ الْخَطْمِيِّ، حَدَّثَنَا الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ -وَهْوَ غَيْرُ كَذُوبٍ- قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ فَإِذَا قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». لَمْ يَحْنِ أَحَدٌ مِنَّا ظَهْرَهُ حَتَّى يَضَعَ النَّبِيُّ ﷺ جَبْهَتَهُ عَلَى الأَرْضِ[1].

**٨١١- عەبدوڵای کوڕی یەزیدی خەتمی دەڵێ: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ بۆی گێڕاینەوە-کە بێگومان ڕاستگۆیە و درۆزن نییە- وتی: ئێمە لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان دەکرد، جا کاتێ دەیفەرموو: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ))[2]، هیچ کام لە ئێمە پشتی نەدەچەماندەوە، هەتا پێغەمبەر ﷺ نێوچاوانی دەنایە سەر زەوی.**

---

[1] بڕوانە: ٦٩٠.

[2] واتە: خوای بەرز و بڵند ستاییشی ئەو کەسەی بیست کە ستاییشی کرد و سوپاس و پێزانینی بۆ دەربڕیوە.

## ١٣٤- بَابُ السُّجُودِ عَلَى الْأَنْفِ

٨١٢- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ قَالَ حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ طَاوُسٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ عَلَى الْجَبْهَةِ وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ وَالْيَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ وَلَا نَكْفِتَ الثِّيَابَ وَالشَّعَرَ».

## ١٣٤- باسی سوژدەبردن لەسەر لووت

**٨١٢- عەبدولڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فەرمانم پێ کراوە لەسەر حەوت ئێسك سوژدە ببەم: لەسەر نێوچاوان -بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ لووتی-، هەردوو دەست و هەردوو ئەژنۆ و سەرپەنجەی پێیەکان، وە نابێ پۆشاك و قژ کۆ بکەینەوە)).**

## ١٣٥- بابُ السُّجُودِ عَلَى الأَنْفِ فِي الطِّينِ

٨١٣- حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: انْطَلَقْتُ إِلَى أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ فَقُلْتُ: أَلاَ تَخْرُجُ بِنَا إِلَى النَّخْلِ نَتَحَدَّثْ؟ فَخَرَجَ. فَقَالَ: قُلْتُ: حَدِّثْنِي مَا سَمِعْتَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ؟. قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَشْرَ الأُوَلِ مِنْ رَمَضَانَ، وَاعْتَكَفْنَا مَعَهُ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ فَقَالَ: إِنَّ الَّذِي تَطْلُبُ أَمَامَكَ. فَاعْتَكَفَ الْعَشْرَ الأَوْسَطَ، فَاعْتَكَفْنَا مَعَهُ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ فَقَالَ: إِنَّ الَّذِى تَطْلُبُ أَمَامَكَ. فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ خَطِيبًا صَبِيحَةَ عِشْرِينَ مِنْ رَمَضَانَ فَقَالَ: «مَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَلْيَرْجِعْ، فَإِنِّي أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، وَإِنِّي نُسِّيتُهَا، وَإِنَّهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ فِي وِتْرٍ، وَإِنِّي رَأَيْتُ كَأَنِّي أَسْجُدُ فِي طِينٍ وَمَاءٍ». وَكَانَ سَقْفُ الْمَسْجِدِ جَرِيدَ النَّخْلِ وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ شَيْئًا، فَجَاءَتْ قَزْعَةٌ فَأُمْطِرْنَا، فَصَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى رَأَيْتُ أَثَرَ الطِّينِ وَالمَاءِ عَلَى جَبْهَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَرْنَبَتِهِ تَصْدِيقَ رُؤْيَاهُ[1].

---

[1] بڕوانە: ٦٦٩.

## ١٣٥- باسی سوژدەبردن لەسەر لووت لەنێو قوڕدا

٨١٣- ئەبو سەلەمە دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای ئەبو سەعیدی خودری ﷺ و وتم: ئەرێ نامانبەیت بۆ نێو ئەو دارخورمایانە باسی فەرموودە بکەین؟ ئەویش لە ماڵ دەرچوو (هات) و دەڵێ: وتم: دەربارەی شەوی قەدر چیت بیستووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆم بگێڕەوە؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دە شەو و ڕۆژی یەکەمی ڕەمەزان ئیعتیکافی کرد[1]، ئێمە لە خزمەتیدا ئیعتیکافمان کرد، جا جیبریل ﷺ هات بۆ لای و فەرمووی: بێگومان ئەو پەرستشەی بە شوێنیدا دەگەڕێیت لەپێشتەوەیە، بۆیە دە شەوی نێوەڕاست ئیعتیکافی کرد و ئێمەش لەگەڵیدا ئیعتیکافمان کرد، جا جیبریل ﷺ هات بۆ لای و فەرمووی: بێگومان ئەو پەرستشەی بەشوێنیدا دەگەڕێیت لە پێشتەوەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەیانی بیستی ڕەمەزان هەستایەوە و وتارێکی دا و فەرمووی: ((هەر کەس پێشتر لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئیعتیکافی کردووە با بگەڕێتەوە (بۆ ئیعتیکافکردن سێبارە)، چونکە بەڕاستی شەوی قەدرم نیشان درا، وە بێگومان لەبیرم برایەوە، بەڵام بێگومان لە شەوە تاکەکانی دە شەوی کۆتایی (ڕەمەزان)دایە، وە بێگومان من لە خەومدا بینیم دەتوت لەنێو قوڕ و ئاودا سوژدە دەبەم))، (ئەبو سەعید وتی:) وە سەربانی مزگەوت پەلی دارخورما بوو، وە ئێمە هیچ هەورمان بە ئاسمانەوە نەبینی، کەچی هەورێك هات و بارانمان بە سەردا باری، پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی بۆکردین (و سوژدەی برد) هەتا شوێنەواری قوڕ و ئاوم بە نێوچاوانی پێغەمبەری خواوە ﷺ بینی، کە ڕاستی خەوەکەی (پێشووی) سەلماند.

---

[1] ئیعتیکاف: مانەوەیە لە مزگەوت بەمەبەستی پەرستش.

## ١٣٦- بابُ عَقْدِ الثِّيَابِ وَشَدِّهَا
## وَمَنْ ضَمَّ إِلَيْهِ ثَوْبَهُ إِذَا خَافَ أَنْ تَنْكَشِفَ عَوْرَتُهُ

٨١٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُصَلُّونَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَهُمْ عَاقِدُو أُزْرِهِمْ مِنَ الصِّغَرِ عَلَى رِقَابِهِمْ فَقِيلَ لِلنِّسَاءِ: «لاَ تَرْفَعْنَ رُءُوسَكُنَّ حَتَّى يَسْتَوِيَ الرِّجَالُ جُلُوسًا»[1].

## ١٣٦- باسی بەستنی پۆشاک و گرێدانی، ئەوەی پۆشاکەکەی بە خۆیەوە بپێچێ ئەگەر ترسا عەوڕەتی دەربکەوێ

**٨١٤- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: خەڵکانێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژیان دەکرد، لەبەر بچووکی پۆشاکەکەیان بەستبوو بە ملیانەوە، بە ئافرەتانیش وترا: (((لەکاتی سوژدەدا) هەتا پیاوەکان بەتەواوی هەڵنەستنەوە و دانەنیشن ئێوە سەرتان بەرز مەکەنەوە)).**

## ١٣٧- بابٌ: لَا يَكُفُّ شَعَرًا

٨١٥- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ -وَهْوَ ابْنُ زَيْدٍ - عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أُمِرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ، وَلاَ يَكُفَّ ثَوْبَهُ وَلاَ شَعَرَهُ[2].

## ١٣٧- باسێک: (نوێژکەر) قژی نەگرێ و نەیبەستێ

**٨١٥- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرابوو کە لەسەر حەوت ئێسک سوژدە ببات، وە قژی سەری کۆ نەکاتەوە و نەیبەستێ، وە جلوبەرگیش کۆ نەکاتەوە.**

---

[1] بڕوانە: ٣٦٢.

[2] بڕوانە: ٨٠٩.

## ١٣٨- بابٌ: لَا يَكُفُّ ثَوْبَهُ فِي الصَّلَاةِ

٨١٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةٍ، لاَ أَكُفُّ شَعَرًا وَلاَ ثَوْبًا»[١].

## ١٣٨- باسێک: (نوێژکەر) لەنێو نوێژدا جلوبەرگ نەگرێ و کۆ نەکاتەوە

**٨١٦- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((فەرمانم پێ کراوە کە لەسەر حەوت ئێسقان سوژدە ببەم و قژ و پۆشاك كۆ نەکەمەوە)).**

## ١٣٩- بابُ التَّسْبِيحِ وَالدُّعَاءِ فِي السُّجُودِ

٨١٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْصُورٌ، عَنْ مُسْلِمٍ عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي» يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ[٢].

## ١٣٩- باسی (سُبحان اللّه) وتن و دوعاکردن لە سوژدەدا

**٨١٧- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە و زۆر لە کڕنوش و سوژدەکانیدا دەیفەرموو: ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي))[٣]، ئەمەی لە ئایەتی قورئان وەرگرتبوو.**

---

[١] بڕوانە: ٨٠٩.

[٢] بڕوانە: ٧٩٤.

[٣] واتە: خوایە پاك و بێگەردی و گەورەیی بۆ تۆیە پەروەردگارمان ستاییش شیاوی تۆیە، دەی خوایە لێم خۆش بە.

## ١٤٠- بَابُ المُكْثِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ

٨١٨- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، أَنَّ مَالِكَ بْنَ الْحُوَيْرِثِ قَالَ لأَصْحَابِهِ: أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: وَذَاكَ فِي غَيْرِ حِينِ صَلاَةٍ، فَقَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَكَبَّرَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَامَ هُنَيَّةً، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ هُنَيَّةً، فَصَلَّى صَلاَةَ عَمْرِو بْنِ سَلِمَةَ شَيْخِنَا هَذَا. قَالَ أَيُّوبُ: كَانَ يَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ أَرَهُمْ يَفْعَلُونَهُ، كَانَ يَقْعُدُ فِي الثَّالِثَةِ أَوْ الرَّابِعَةِ[1].

## ١٤٠- باسی مانەوەی نێوان دوو سوژدەکە

**٨١٨- ئەبو قیلابە دەڵێ: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ بە هاوڕێکانی وت: ئایا پێتان بڵێم نوێژکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بووە؟ ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەو کاتەش کاتی نوێژکردن نەبوو، جا هەستا و نوێژی دابەست، پاشان کڕنوشی برد و الله أکبری کرد، پاشان سەری بەرز کردەوە لە کڕنوش کەمێك ڕاوەستا، پاشان سوژدەی برد، پاشان سەری بەرز کردەوە و کەمێك (لە نێوان دوو سوژدەکەدا) مایەوە، ئیدی نوێژێکی کرد وەکوو نوێژی ئەم مامۆستایەمان کە عەمری کوڕی سەلەمەیە. (بەهەمان سەنەد) ئەیوب وتی: شتێکی دەکرد پێشتر نەمدیوە بیکەن: کەمێك دادەنیشت لە (پاش) ڕکاتی سێیەم یان چوارەم (پاش سەربەرزکردنەوە لە سوژدە).**

٨١٩- قَالَ: فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ، فَقَالَ: «لَوْ رَجَعْتُمْ إِلَى أَهْلِيكُمْ صَلُّوا صَلاَةَ كَذَا فِي حِينِ كَذَا، صَلُّوا صَلاَةَ كَذَا فِي حِينِ كَذَا، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْيُؤَذِّنْ أَحَدُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٦٧٧.

[2] بڕوانە: ٦٢٨.

**٨١٩- (مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ) دەڵێ: جا ڕۆیشتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و لە خزمەتیدا (بیست ڕۆژ) ماینەوە، ئینجا فەرمووی: ((ئەگەر گەڕانەوە بۆ نێو کەسوکارتان ئەو نوێژە لەو کاتەدا بکەن، ئەو نوێژەش لەو کاتەدا بکەن، جا کاتێ نوێژ بوو با یەکێکتان بانگ بدات ئەوەشتان گەورەترە پێشنوێژیتان بۆ بکات)).**

٨٢٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الزُّبَيْرِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنِ الحكَمِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنِ البَرَاءِ قَالَ: كَانَ سُجُودُ النَّبِيِّ ﷺ وَرُكُوعُهُ وَقُعُودُهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ[1].

**٨٢٠- بەڕاو ﷺ دەڵێ: ماوەی سوژدە و کڕنوش و دانیشتنی نێوان دوو سوژدەکەی پێغەمبەر ﷺ نزیك بوون لە یەکدی.**

٨٢١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: إِنِّي لا آلُو أَنْ أُصَلِّيَ بِكُمْ كَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي بِنَا. قَالَ ثَابِتٌ: كَانَ أَنَسٌ يَصْنَعُ شَيْئًا لَمْ أَرَكُمْ تَصْنَعُونَهُ، كَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَامَ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ قَدْ نَسِيَ. وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ: قَدْ نَسِيَ[2].

**٨٢١- سابیت لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: بێگومان ئەگەر پێشنوێژیتان بۆ بکەم هیچ کەموکورتی تێدا ناکەم (بەچاکی و جوانی دەیکەم) بەو شێوەیەی کە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە پێشنوێژی دەکرد بۆمان. سابیت وتی: ئەنەس شتێکی دەکرد ئێوەم نەدیوە بیکەن! کاتێ سەری بەرز دەکردەوە لە کڕنوش ڕێك دەوەستا، (ئەوەندەی پێ دەچوو) تا مرۆڤ دەیوت بەڕاستی لەبیری چووە نوێژ دەکات، هەروەها لە نێوان دوو سوژدەکەدا (ئەوەندە دەمایەوە) کە مرۆڤ دەیوت بێگومان لەبیری چووە (لە نوێژدایە).**

---

[1] بڕوانە: ٧٩٢.

[2] بڕوانە: ٨٠٠.

## ١٤١- بَابٌ: لَا يَفْتَرِشُ ذِرَاعَيْهِ فِي السُّجُودِ

وَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: سَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ وَوَضَعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ وَلَا قَابِضِهِمَا.

٨٢٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلاَ يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الْكَلْبِ»[1].

## ١٤١- باسێک: (نوێژکەر) قۆڵەکانی نەخاتە سەر زەوی لە کاتی سوژدەکاندا

**ئەبو حومەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سوژدەی برد، هەردوو دەستی دانا بێئەوەی قۆڵەکانی ڕابخات لەسەر زەوی یان دەستەکانی بقوچێ[2].**

**٨٢٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لە سوژدەبردندا ڕێك و ڕاست بن، با هیچ کام لە ئێوە هەردوو باسکی (قۆڵی) ڕانەخات لەسەر زەوی وەك دەستڕاخستنی سەگ)).**

## ١٤٢- بَابُ مَنِ اسْتَوَى قَاعِدًا فِي وِتْرٍ مِنْ صَلَاتِهِ ثُمَّ نَهَضَ

٨٢٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ قَالَ: أَخْبَرَنَا هُشَيْمٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا خَالِدٌ الحَذَّاءُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ الحُوَيْرِثِ اللَّيْثِيُّ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي، فَإِذَا كَانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلاَتِهِ لَمْ يَنْهَضْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا.

---

[1] بروانە: ٥٣٢.

[2] بەمجۆرەش مانا بکرێ ڕاستە: دەست و قۆڵەکانی نەلکێنێت بە خۆیەوە، واتە: قۆڵەکانی دوور خاتەوە لە خۆی.

## ١٤٢- باسی ئەو کەسەی لە نوێژی ویتردا (لە سوژدە) بەرز بێتەوە و ڕێک دانیشێت پاشان هەڵسێتەوە

٨٢٣- ئەبو قیلابە دەڵێ: مالیکی کوڕی حوەیریسی لەیسی ﷺ بۆی گێڕاینەوە: کە پێغەمبەری ﷺ بینی نوێژی دەکرد، جا ئەگەر لە نوێژی ویتردا بووایە یەکسەر هەڵنەدەستایەوە (بۆ ڕکاتی سێیەم)، هەتا بەتەواوی دانەنیشتایە (دوای سەربەرزکردنەوە لە سوژدە).

## ١٤٣- بَابٌ: كَيْفَ يَعْتَمِدُ عَلَى الأَرْضِ إِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَةِ؟

٨٢٤- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: جَاءَنَا مَالِكُ بْنُ الحُوَيْرِثِ فَصَلَّى بِنَا فِي مَسْجِدِنَا، هَذَا فَقَالَ: إِنِّي لأُصَلِّي بِكُمْ، وَمَا أُرِيدُ الصَّلاَةَ، وَلَكِنْ أُرِيدُ أَنْ أُرِيَكُمْ كَيْفَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي. قَالَ أَيُّوبُ: فَقُلْتُ لأَبِي قِلاَبَةَ وَكَيْفَ كَانَتْ صَلاَتُهُ؟ قَالَ: مِثْلَ صَلاَةِ شَيْخِنَا هَذَا -يَعْنِي عَمْرَو بْنَ سَلِمَةَ- قَالَ أَيُّوبُ: وَكَانَ ذَلِكَ الشَّيْخُ يُتِمُّ التَّكْبِيرَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ عَنِ السَّجْدَةِ الثَّانِيَةِ جَلَسَ وَاعْتَمَدَ عَلَى الأَرْضِ، ثُمَّ قَامَ[1].

## ١٤٣- باسێک: چۆن دەستی دەخستە سەر زەوی کاتێ لە ڕکاتێ هەڵدەسایەوە؟

٨٢٤- ئەبو قیلابە دەڵێ: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ هات بۆ لامان و لەم مزگەوتەماندا نوێژی بۆ کردین و وتی: بێگومان من نوێژتان بۆ دەکەم مەبەستم نوێژکردن نییە، بەڵکوو دەمەوێ پیشانتان بدەم کە چۆن پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی دەکرد، ئەیوب وتی: جا بە ئەبو قیلابەم وت: دەی

[1] بڕوانە: ٦٧٧.

**نوێژكردنەكەی چۆن بووە؟ ئەبو قیلابە وتی: هەر وەك نوێژی ئەم مامۆستایەی خۆمان بوو- واتە: عەمری كوڕی سەلەمە-، ئەیوب دەڵێ: ئەو مامۆستایە الله أكبرەكانی هەمووی دەكرد، كاتێكیش لە سوژدەی دووەم سەری بەرز دەكردەوە دادەنیشت، وە (دەستەكانی) لەسەر زەوی دادەنا، پاشان هەڵدەسایەوە.**

## ١٤٤- بابٌ: يُكَبِّرُ وَهْوَ يَنْهَضُ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ

وَكَانَ ابن الزُّبَيْرِ يُكَبِّرُ فِي نَهْضَتِهِ.

٨٢٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الحَارِثِ قَالَ: صَلَّى لَنَا أَبُو سَعِيدٍ فَجَهَرَ بِالتَّكْبِيرِ حِينَ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، وَحِينَ سَجَدَ، وَحِينَ رَفَعَ، وَحِينَ قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ.

## ١٤٤- باسێک: نوێژکەر (الله أکبر) دەکات کە هەڵدەسێتەوە لە دوو ڕکات (بۆ ڕکاتی سێیەم)

**ئیبنو زوبەیر هەمیشە لە هەڵسانەوەیدا الله أكبری دەكرد.**

**٨٢٥- سەعیدی كوڕی حاریس دەڵێ: ئەبو سەعید ﷺ پێشنوێژی بۆ كردین و بە دەنگی بەرز الله أكبری كرد كاتێ سەری بەرز كردەوە لە سوژدە، وە كاتێكیش سوژدەی برد و كاتێكیش بەرز بۆیەوە (لە سوژدە)، وە كاتێ هەستایەوە لە دووەمین ڕكاتی (نوێژكردن)، وە وتی: ئا بەم جۆرە پێغەمبەرم ﷺ بینی (نوێژی كرد).**

٨٢٦- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غَيْلاَنُ بْنُ جَرِيرٍ، عَنْ مُطَرِّفٍ قَالَ: صَلَّيْتُ أَنَا وَعِمْرَانُ صَلاَةً خَلْفَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، فَكَانَ إِذَا سَجَدَ

كَبَّرَ، وَإِذَا رَفَعَ كَبَّرَ، وَإِذَا نَهَضَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ، فَلَمَّا سَلَّمَ أَخَذَ عِمْرَانُ بِيَدِي فَقَالَ: لَقَدْ صَلَّى بِنَا هَذَا صَلاَةَ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَوْ قَالَ: لَقَدْ ذَكَّرَنِي هَذَا صَلاَةَ مُحَمَّدٍ ﷺ[1].

**٨٢٦- موتەریف دەڵێ: من و عیمڕان لەدوای عەلی كوڕی ئەبو تالیبەوە ؓ نوێژمان كرد، جا كاتێ سوژدەی برد الله أكبری كرد، كاتێكیش بەرز بۆیەوە الله أكبری كرد، وە كاتێ لە دووەم ڕكات هەستایەوە الله أكبری كرد، جا كاتێ سەلامی دایەوە عیمڕان دەستی گرتم و وتی: بەڕاستی ئەم پیاوە پێشنوێژییەكی بۆ كردین وەك پێشنوێژی موحەممەد ﷺ بوو، یان وتی: سوێند بەخوا ئەم (نوێژكردنەی) نوێژی موحەممەدی ﷺ بیرخستمەوە.**

## ١٤٥- بابُ سُنَّةِ الجُلُوسِ فِي التَّشَهُّدِ

وَكَانَتْ أُمُّ الدَّرْداءِ تَجْلِسُ فِي صَلاَتِهَا جِلْسَةَ الرَّجُلِ، وَكَانَتْ فَقِيهَةً.

٨٢٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ كَانَ يَرَى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ يَتَرَبَّعُ فِي الصَّلاَةِ إِذَا جَلَسَ، فَفَعَلْتُهُ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ حَدِيثُ السِّنِّ، فَنَهَانِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ وَقَالَ: إِنَّمَا سُنَّةُ الصَّلاَةِ أَنْ تَنْصِبَ رِجْلَكَ اليُمْنَى وَتَثْنِيَ اليُسْرَى. فَقُلْتُ: إِنَّكَ تَفْعَلُ ذَلِكَ! فَقَالَ: إِنَّ رِجْلَيَّ لاَ تَحْمِلاَنِي.

## ١٤٥- باسی دانیشتنی سوننەت لە تەحیاتدا

**ئومو دەرداو ؓ لە نوێژكردنیدا بە شێوەی دانیشتنی پیاو دادەنیشت، وە زانا و شارەزاش بوو لە شەرعدا.**

**٨٢٧- عەبدوڵای كوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە كە عەبدوڵای كوڕی عومەری ﵄ بینی كاتێ دانیشتبایە لە نوێژدا چوارمەشقی دادەنیشت، منیش وام كرد لە**

[1] بڕوانە: ٧٨٤.

**کاتێکدا من تەمەنم کەم بوو، کەچی عەبدوڵای کوڕی عومەر ڕێگری لێ کردم و وتی: سوننەتی (دانیشتنی) نوێژ ئەوەیە کە پێی ڕاست قنج بوەستێنی (لەسەر پەنجەکانی پێت بوەستی)، وە پێی چەپت لار بکەیتەوە (و بیخەیتە ژێرت)، منیش وتم: تۆ چوارمشقی دادەنیشیت؟ ئەویش وتی: قاچەکانم توانای هەڵگرتنی منیان نییە. (واتە عوزری هەبوو کە چوارمشقی داوە لە نوێژدا).**

٨٢٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَلْحَلَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ. وَحَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، وَيَزِيدَ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَلْحَلَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا مَعَ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَذَكَرْنَا صَلاَةَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ: أَنَا كُنْتُ أَحْفَظَكُمْ لِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، رَأَيْتُهُ إِذَا كَبَّرَ جَعَلَ يَدَيْهِ حِذَاءَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ، فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ اسْتَوَى حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مَكَانَهُ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ وَلاَ قَابِضِهِمَا، وَاسْتَقْبَلَ بِأَطْرَافِ أَصَابِعِ رِجْلَيْهِ القِبْلَةَ، فَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ جَلَسَ عَلَى رِجْلِهِ اليُسْرَى وَنَصَبَ اليُمْنَى، وَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ اليُسْرَى وَنَصَبَ الأُخْرَى وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ.

وَسَمِعَ اللَّيْثُ يَزِيدَ بْنَ أَبِي حَبِيبٍ، وَيَزِيدُ مِنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَلْحَلَةَ، وَابْنُ حَلْحَلَةَ مِنَ ابْنِ عَطَاءٍ. قَالَ أَبُو صَالِحٍ، عَنِ اللَّيْثِ: كُلُّ فَقَارٍ. وَقَالَ ابْنُ المُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَيُّوبَ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ أَبِي حَبِيبٍ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ عَمْرٍو حَدَّثَهُ: كُلُّ فَقَارٍ.

**٨٢٨- موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتاو دەگێڕێتەوە: کە ئەو لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو، جا باسی نوێژکردنی پێغەمبەرمان ﷺ کرد ئەبو حومەیدی ساعیدیش ﷺ وتی: بێگومان من لە هەمووتان چاکتر (شێوەی) نوێژکردنی پێغەمبەری خوام ﷺ لەبەرە، بینیومە کاتێ الله أکبری دەکرد (بۆ نوێژدابەستن)، هەردوو دەستی دەبردە ئاستی هەردوو شانی، وە کاتێ کڕنوشی ببردایە هەردوو دەستی بەچاکی گیر دەکرد لە**

ئەژنۆكانی، پاشان پشتی دەچەماندەوە، جا كاتێ سەری بەرز بكردايەتەوە ڕاست دەبۆیەوە، هەتا هەموو بڕبڕەكانی پشتی دەچوونەوە جێگای خۆی، ئینجا كە سوژدەی دەبرد هەردوو دەستی دادەنا بەبێ ڕاخستنی قۆڵەكانی و بەبێ قوچاندنی دەستەكانی، وە ڕووی سەرپەنجەكانی پێی دەكردە قیبلە، وە كە دادەنیشت لە دووەمین ڕكاتی نوێژدا لەسەر پێی چەپی دادەنیشت، وە پێی ڕاستی ڕێك دەچەقاند (و پەنجەكانی ڕوو دەكردە قیبلە)، وە كاتێ دادەنیشت لە ڕكاتی كۆتاییدا قاچی چەپی (دەخستە ژێری و) دەیبردە پێشەوە (لای ڕاستیەوە دەیبردە دەرەوە)، پێیەكەی دیكەی ڕێك دەچەقاند و لەسەر سمتی (چەپی) دادەنیشت.

وە لەیس (ئەم فەرموودەی) لە یەزیدی كوڕی ئەبو حەبیب بیستووە، یەزیدیش لە موحەممەدی كوڕی حەلحەلەی بیستووە، موحەممەدی كوڕی حەلحەلەش لە ئیبنو عەتائی بیستووە، ئەبو صالح (ئەم فەرموودەیەی) لە لەیس بەم جۆرە گێڕاوەتەوە: (كُلُّ فَقَارٍ)، واتە: هەموو بڕبڕەیەك. وە ئینبو موبارەك (ئەم فەرموودەیەی) گێڕاوەتەوە لە یەحیای كوڕی ئەیوبەوە دەڵێ: یەزیدی كوڕی ئەبو حەبیب بۆی گێڕامەوە كە موحەممەدی كوڕی عەمر بەم جۆرە بۆی گێڕاوەتەوە: (كُلُّ فَقَارٍ)، واتە: هەموو بڕبڕەیەك.

## ١٤٦- بابُ مَنْ لَمْ يَرَ التَّشَهُّدَ الأَوَّلَ وَاجِبًا، لأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ وَلَمْ يَرْجِعْ

٨٢٩- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ هُرْمُزَ - مَوْلَى بَنِي عَبْدِ المُطَّلِبِ، وَقَالَ مَرَّةً: مَوْلَى رَبِيعَةَ بْنِ الحَارِثِ- أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ ابْنَ بُحَيْنَةَ -وَهُوَ مِنْ أَزْدِ شَنُوءَةَ، وَهُوَ حَلِيفٌ لِبَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِهِمُ

الظُّهْرَ فَقَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ لَمْ يَجْلِسْ، فَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ حَتَّى إِذَا قَضَى الصَّلاَةَ، وَانْتَظَرَ النَّاسُ تَسْلِيمَهُ، كَبَّرَ وَهْوَ جَالِسٌ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ ثُمَّ سَلَّمَ[1].

## ١٤٦- باسی ئەوەی تەحیاتی یەکەمی لا واجب نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە دووەم ڕکاتدا هەستایەوە (تەحیاتی نەخوێند) و بۆشی نەگەڕایەوە

**٨٢٩- زوهری دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی هوڕموز- ئازادکراوی هۆزی عەبدولموتەلیبە، وە جارێ وتی: ئازادکراوی ڕەبیعەی کوڕی حاریسە - گێڕایەوە کە عەبدوڵای کوڕی بوحەینە کە لە هۆزی ئەزدی سەر بە عەشیرەتی شەنوئەیە، کە هاوپەیمانی بنەماڵەی عەبدولمەنافن و یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن، لە دوو ڕکاتی یەکەمدا هەستایەوە، دانەنیشت (تەحیات بخوێنێ) خەڵکەکەش لەگەڵیدا هەستانەوە (بەردەوام بوو)، هەتا نوێژەکەی تەواو کرد، خەڵکی چاوەڕوان بوون سەلام بداتەوە، دانیشتبوو الله أكبری کرد، ئینجا دوو سوژدەی برد پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، پاشان سەلامی دایەوە.**

## ١٤٧- بابُ التَّشَهُّدِ فِي الأُولَى

٨٣٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا بَكْرٌ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ ابْنِ بُحَيْنَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ فَقَامَ وَعَلَيْهِ جُلُوسٌ، فَلَمَّا كَانَ فِي آخِرِ صَلاَتِهِ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهْوَ جَالِسٌ[1].

---

[1] بڕوانە: ٨٣٠، ١٢٢٤، ١٢٢٥، ١٢٣٠، ٦٦٧٠.

## ١٤٧- باسی تەحیات (خوێندن) لە دانیشتنی یەکەمدا[2]

**٨٣٠- عەبدوڵای کوڕی مالیکی کوڕی بوحەینە ؓ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، جا لەو شوێنەی کە دەبوو دانیشتبایە (بۆ تەحیاتخوێندن) هەستایەوە، جا کاتێ لە کۆتایی نوێژەکەیدا بوو، کە دانیشتبوو (بۆ تەحیاتخوێندنی کۆتایی) دوو سوژدەی برد.**

## ١٤٨- بابُ التَّشَهُّدِ فِي الآخِرَةِ

٨٣١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ قُلْنَا: السَّلاَمُ عَلَى جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ، السَّلاَمُ عَلَى فُلاَنٍ وَفُلاَنٍ. فَالتَفَتَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلاَمُ، فَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ -فَإِنَّكُمْ إِذَا قُلْتُمُوهَا أَصَابَتْ كُلَّ عَبْدٍ لِلَّهِ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ- أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»[٣].

## ١٤٨- باسی تەحیات (خوێندن) لە دانیشتنی کۆتاییدا

**٨٣١- عەبدوڵا ؓ دەڵێ: ئێمە لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان دەکرد و دەمانوت: سەلام لەسەر جیبریل و میکائیل بێت، سەلام لەسەر فلان و فلان بێت،**

---

[١] بڕوانە: ٨٢٩.

[٢] لە نوێژی چوارڕکاتی و سێڕکاتیدا کە دوو دانیشتنی تێدایە، ئەم تەحیاتە لە دانیشتنی یەکەمدایە.

[٣] بڕوانە: ٨٣٥، ١٢٠٢، ٦٢٣٠، ٦٢٦٥، ٦٣٢٨، ٧٣٨١.

**پێغەمبەری خواش ﷺ لای کردەوە بە لاماندا و فەرمووی: ((بێگومان خوا بۆ خۆی سەلام و ئاشتییە، کەواتە ئەگەر کەسێکتان نوێژی کرد با بڵێ:** التَّحِيَّاتُ لله، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُه، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ[1]، **-چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە ئەمەتان وت، هەموو بەندەیەکی چاك دەگرێتەوە لە ئاسمان و لە زەویدا- (وە بڵێن):** أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ))[2].

## ١٤٩- بابُ الدُّعَاءِ قَبْلَ السَّلَامِ

٨٣٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنَا عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ عَنْ عَائِشَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو فِي الصَّلاَةِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَفِتْنَةِ المَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ المَأْثَمِ وَالمَغْرَمِ». فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ مِنَ المَغْرَمِ فَقَالَ: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ».

## ١٤٩- باسی دوعا و نزاکردن پێش سەلامدانەوە

**٨٣٢- عورِوەی کوڕی زوبەیر دەڵێ: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژدا نزای دەکرد و دەیفەرموو:**

---

[1] واتە: موڵك و مانەوە و گەورەیی و درووود و پاڕانەوە و لاڵانەوەو وشەی پاك و چاك هەر بۆ خودایە، سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەتی خودات لەسەر بێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سڵاو لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاکەکانی خودای گەورە.

[2] واتە: شایەتی ئەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نییە جگە لە (الله)، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد ﷺ بەندە و نێردراوی خودایە.

**((خوایە گیان من پەنات پێ دەگرم لە سزای نێو گۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە ئاژاوە و تاقیکردنەوەی دەجال، وە پەنات پێ دەگرم لە ناڕەحەتی و بەڵای ژیان و بەڵای سەرەمەرگ، خوایە گیان پەنات پێ دەگرم لە گوناهباری و قەرزداری))، جا کەسێك عەرزی کرد: بۆ ئەوەندە زۆر پەنا دەگریت بە خوا لە قەرزداری! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان پیاو کە قەرزدار بوو قسە دەکات، درۆ دەکات و بەڵێن دەدات و نایباتە سەر)).**

٨٣٣- وَعَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْتَعِيذُ فِي صَلاَتِهِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ[1].

**٨٣٣- عائیشە ﵂ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نوێژدا، پەنای دەگرت بە خوا لە تاقیکردنەوە و ئاژاوەی دەجال.**

٨٣٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵁. أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلاَتِي. قَالَ: «قُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيمُ»[2].

**٨٣٤- عەبدوڵای کوڕی عەمر ﵁ دەگێڕێتەوە لە ئەبو بەکری صدیقەوە ﵁ دەڵێ: ئەو بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: دوعایەکم فێر بکە لە نوێژەکانمدا دوعای پێ بکەم، ئەویش فەرمووی: ((بڵێ: خوایە گیان من ستەمێکی گەورەم لە**

---

[1] بروانە: ٨٣٢.

[2] بروانە: ٦٣٢٦، ٧٣٨٧، ٧٣٨٨.

**خۆم کردووه، جگه له تۆش خوایه کەس له تاوانەکان خۆش نابێ، دەی کەواته به لێخۆشبوونی تایبەتی خۆت لێم خۆش به، وه بەزەییت پێمدا بێتەوه، بەڕاستی هەر تۆ لێخۆشبووی میهرەبانی)).**

## ١٥٠- بابُ مَا يُتَخَيَّرُ مِنَ الدُّعَاءِ بَعْدَ التَّشَهُّدِ وَلَيْسَ بِوَاجِبٍ

٨٣٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنِ الأَعْمَشِ، حَدَّثَنِي شَقِيقٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنَّا إِذَا كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الصَّلاَةِ قُلْنَا السَّلاَمُ عَلَى اللَّهِ مِنْ عِبَادِهِ، السَّلاَمُ عَلَى فُلاَنٍ وَفُلاَنٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَقُولُوا: السَّلاَمُ عَلَى اللَّهِ. فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلاَمُ، وَلَكِنْ قُولُوا التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ- فَإِنَّكُمْ إِذَا قُلْتُمْ أَصَابَ كُلَّ عَبْدٍ فِي السَّمَاءِ أَوْ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ- أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ يَتَخَيَّرُ مِنَ الدُّعَاءِ أَعْجَبَهُ إِلَيْهِ فَيَدْعُو»[1].

## ١٥٠- باسی هەر نزایەک دوای تەحیات هەڵبژێردرێت دروسته، بەڵام واجب نییه

**٨٣٥- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئێمه ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان بکردایه دەمانوت: سەلام له خوا بێ لەلایەن بەندەکانیەوه، سەلام لەسەر فلان کەس و فلان کەس بێ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مەڵێن سەلام لەسەر خوا بێ، چونکه بێگومان خوا خۆی سەلامه، بەڵکوو بڵێن:** التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ

---

[1] بڕوانه: ٨٣١.

وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، **-چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە ئەمە بڵێن هەموو بەندەیەك دەگرێتەوە لە ئاسماندا یان لە نێوان ئاسمان و زەویدا- (وە بڵێن:)** أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، **پاشان كام دوعا و نزای بەلاوە باشە، هەڵیبژێرێ و پێی بپاڕێتەوە)).**

## ١٥١ - بابُ مَنْ لَمْ يَمْسَحْ جَبْهَتَهُ وَأَنفَهُ حَتَّى صَلَّى

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: رَأَيْتُ الحُمَيْدِيَّ: يَحْتَجُّ بِهَذَا الحَدِيثِ ((أَنْ لَا يَمْسَحَ الجَبْهَةَ فِي الصَّلَاةِ)).

٨٣٦- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ فَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَسْجُدُ فِي المَاءِ وَالطِّينِ حَتَّى رَأَيْتُ أَثَرَ الطِّينِ فِي جَبْهَتِهِ[١].

## ١٥١- باسی ئەوەی نێوچاوان و لووتی نەسڕێ (ئەگەر قوڕاوی بوو) هەتا نوێژەکەی تەواو دەکات

**ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: حومەیدیم بینی ئەم فەرموودەیەی دەکردە بەڵگە کە نوێژکەر نابێ نێوچاوی بسڕێ لەنێو نوێژدا.**

**٨٣٦- ئەبو سەلەمە دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ کرد ئەویش وتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی لەنێو قوڕدا سوژدەی برد، (بەجۆرێ) شوێنەواری قوڕەکەم بینی بە نێوچاوانیەوە.**

---

[١] بڕوانە: ٦٦٩.

## ١٥٢- بابُ التَّسْلِيمِ

٨٣٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ هِنْدٍ بِنْتِ الحَارِثِ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا سَلَّمَ قَامَ النِّسَاءُ حِينَ يَقْضِي تَسْلِيمَهُ، وَمَكَثَ يَسِيرًا قَبْلَ أَنْ يَقُومَ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأُرَى -وَاللَّهُ أَعْلَمُ- أَنَّ مُكْثَهُ لِكَيْ يَنْفُذَ النِّسَاءُ قَبْلَ أَنْ يُدْرِكَهُنَّ مَنِ انْصَرَفَ مِنَ القَوْمِ[1].

## ١٥٢- باسی سەلامدانەوەی نوێژ

**٨٣٧- ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: هەمیشە پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دەدایەوە، کاتێ سەلامدانەوەکەی تەواو دەکرد ئافرەتان هەڵدەستان (و دەڕۆیشتن)، بەڵام پێغەمبەر ﷺ خۆی کەمێك دەمایەوە پێش ئەوەی هەستێ (و بڕوات)، ئیبنو شیهاب دەڵێ: من وا دەزانم - خواش زاناترە- کە مانەوەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوە بوو ئافرەتان بڕۆنە دەرەوە، پێش ئەوەی ئەو پیاوانەی دەڕۆنەوە پێیان بگەن.**

## ١٥٣- بابٌ: يُسَلِّمُ حِينَ يُسَلِّمُ الإِمَامُ

وَكَانَ ابن عُمَرَ يَسْتَحِبُّ إِذَا سَلَّمَ الإِمَامُ أَنْ يُسَلمَ مَنْ خَلْفَهُ.

٨٣٨- حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنْ عِتْبَانَ، قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَسَلَّمْنَا حِينَ سَلَّمَ.

## ١٥٣- باسێک: کاتێ پێشنوێژ سەلام دەداتەوە، ئینجا نوێژکەر سەلام دەداتەوە

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ پێی باش بوو کاتێ پێشنوێژ سەلامی دایەوە، ئەوەی لە دوایەوەیە سەلام بداتەوە.**

---

[1] بڕوانە: ٨٤٩، ٨٥٠.

**٨٣٨- مەحمودی كوڕی ڕەبیع لە عیتبانەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بە جەماعەت نوێژمان كرد، كاتێ ئەو سەلامی دایەوە ئێمەش سەلامامان دایەوە.**

## ١٥٤- بابُ مَنْ لَمْ يُرَدَّ السَّلَامِ عَلَى الإِمَامِ وَاكْتَفَى بِتَسْلِيمِ الصَّلَاةِ

٨٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ، وَزَعَمَ أَنَّهُ عَقَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَعَقَلَ مَجَّةً مَجَّهَا مِنْ دَلْوٍ كَانَ فِي دَارِهِمْ.

## ١٥٤- باسی ئەوەی دەڵێ وەڵامی سەلامی پێشنوێژ نادرێتەوە (لەلایەن نوێژكەرانەوە) و تەنها سەلامدانەوەی نوێژەكە بەسە

**٨٣٩- زوهری دەڵێ: مەحمودی كوڕی ڕەبیع بۆی گێڕامەوە و وتی: ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ لەبیرە، وە لەبیریەتی لە دۆڵچەیەك كە لەماڵیاندا بوو، دەمی پڕ ئاو كرد و تفییەوە (و پڕژاندی بە ڕوخساری مەحموددا).**

٨٤٠- قَالَ: سَمِعْتُ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ الأَنْصَارِيَّ ثُمَّ أَحَدَ بَنِي سَالِمٍ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي لِقَوْمِي بَنِي سَالِمٍ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: إِنِّي أَنْكَرْتُ بَصَرِي، وَإِنَّ السُّيُولَ تَحُولُ بَيْنِي وَبَيْنَ مَسْجِدِ قَوْمِي، فَلَوَدِدْتُ أَنَّكَ جِئْتَ فَصَلَّيْتَ فِي بَيْتِي مَكَانًا حَتَّى أَتَّخِذَهُ مَسْجِدًا، فَقَالَ: «أَفْعَلُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ». فَغَدَا عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ مَعَهُ بَعْدَ مَا اشْتَدَّ النَّهَارُ، فَاسْتَأْذَنَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَذِنْتُ لَهُ، فَلَمْ يَجْلِسْ حَتَّى قَالَ: «أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ مِنْ بَيْتِكَ؟». فَأَشَارَ إِلَيْهِ مِنَ المَكَانِ الذِي أَحَبَّ أَنْ يُصَلِّيَ فِيهِ، فَقَامَ فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ ثُمَّ سَلَّمَ، وَسَلَّمْنَا حِينَ سَلَّمَ[1].

---

[1] بڕوانە: ٤٢٤.

**٨٤٠- مەحمودی کوڕی ڕەبیع دەڵێ: لە عیتبانی کوڕی مالیکی ئەنصاڕیم ﷺ بیست، پاشان عیتبان پیاوێکە لە هۆزی بەنو سالیم دەڵێ: من پێشنوێژیم دەکرد بۆ هۆزەکەم کە هۆزی سالیمە، ڕۆیشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتم: بەڕاستی من چاو و بینینم لاواز بووە و لافاو ڕێگرە لە نێوان من و مزگەوتی هۆزەکەمدا، لەبەر ئەوە ئاواتەخواز بووم کە جەنابت بهاتیتایە بۆ ماڵمان و لە شوێنێکی ماڵەکەماندا نوێژت بکردایە، هەتا بیکەم بە نوێژگە، ئەویش فەرمووی: ((خوا حەز کات دێم و نوێژ دەکەم لە ماڵتان))، جا سەرلەبەیانییەك دوای ئەوەی خۆر تینی پەیدا کردبوو و بەرز بووبۆیەوە، پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکریشی لەگەڵدا بوو هاتن بۆ ماڵمان، جا پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی خواست، منیش مۆڵەتم پێ دا و دانەنیشت، هەتا فەرمووی: ((حەز دەکەیت لە کام شوێنی ماڵەکەدا نوێژ بکەم؟))، عیتبان ئاماژەی کرد بۆ ئەو شوێنەی کە حەزی لێ بوو نوێژی تێدا بکات، پێغەمبەریش ﷺ وەستاو (نوێژی دەست پێ کرد)، (عیتبان دەڵێ:) ئێمە لە دوایەوە بەڕیز نوێژمان دابەست، پاشان سەلامی دایەوە ئێمەش کاتێ ئەو سەلامی دایەوە سەلاممان دایەوە.**

## ١٥٥- بَابُ الذِّكْرِ بَعْدَ الصَّلَاةِ

٨٤١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو أَنَّ أَبَا مَعْبَدٍ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- أَخْبَرَهُ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ حِينَ يَنْصَرِفُ النَّاسُ مِنَ المَكْتُوبَةِ كَانَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كُنْتُ أَعْلَمُ إِذَا انْصَرَفُوا بِذَلِكَ إِذَا سَمِعْتُهُ.

## ١٥٥- باسی زیكر و یادی خوا پاش سەلامدانەوەی نوێژ

**٨٤١- ئەبو مەعبەدی -كۆیلەی ئازادكراوی عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ- دەگێڕێتەوە كە عەبدوڵای كوڕی عەباس بۆی گێڕاوەتەوە: كە دەنگبەرزكردنەوە بە زیكر و یادی خوا لە كاتێكدا كە خەڵك لە نوێژی فەرز دەبوونەوە ئەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبوو. عەبدوڵای كوڕی عەباسیش دەڵێ: من بەو دەنگبەرزكردنەوەی زیكردا دەمزانی كە لە نوێژ بوونەتەوە كە گوێم لێ دەبوو.**

٨٤٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حدَّثنا عَمْرٍو قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو مَعْبَدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَعْرِفُ انْقِضَاءَ صَلاَةِ النَّبِيِّ ﷺ بِالتَّكْبِيرِ[1].

**٨٤٢- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: من تەواوبوونی نوێژی پێغەمبەرم ﷺ بە الله أكبركردندا دەزانی (كە لەپاش تەواوبوونی نوێژ دەكرا).**

٨٤٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ الفُقَرَاءُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا: ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ مِنَ الأَمْوَالِ بِالدَّرَجَاتِ العُلاَ وَالنَّعِيمِ المُقِيمِ، يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَلَهُمْ فَضْلٌ مِنْ أَمْوَالٍ يَحُجُّونَ بِهَا، وَيَعْتَمِرُونَ، وَيُجَاهِدُونَ، وَيَتَصَدَّقُونَ قَالَ: «أَلاَ أُحَدِّثُكُمْ بِأَمْرٍ إِنْ أَخَذْتُمْ بِهِ أَدْرَكْتُمْ مَنْ سَبَقَكُمْ، وَلَمْ يُدْرِكْكُمْ أَحَدٌ بَعْدَكُمْ، وَكُنْتُمْ خَيْرَ مَنْ أَنْتُمْ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِم، إِلاَّ مَنْ عَمِلَ مِثْلَهُ؟ تُسَبِّحُونَ وَتَحْمَدُونَ، وَتُكَبِّرُونَ خَلْفَ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ». فَاخْتَلَفْنَا بَيْنَنَا فَقَالَ بَعْضُنَا نُسَبِّحُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَنَحْمَدُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَنُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ. فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ: «تَقُولُ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالحَمْدُ لِلَّهِ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، حَتَّى يَكُونَ مِنْهُنَّ كُلِّهِنَّ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ»[2].

---

[1] بروانە: ٨٤١.

[2] بروانە: ٦٣٢٩.

**٨٤٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: هەژارەکان هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەوانەی سەروەت و سامانیان زۆرە، پلە بەرزەکان و نازو نیعمەتی هەتا هەتاییان برد بۆ خۆیان (لە بەهەشتدا)، ئێمە چۆن نوێژ دەکەین ئەوانیش نوێژ دەکەن، وە ئێمە چۆن ڕۆژوو دەگرین ئەوانیش ڕۆژوو دەگرن، وە ئەوان ماڵ و سامانیان هەیە زیاد لەمانە، حەج و عومرە و جیهادی پێ دەکەن و خێر و خێراتی لێ دەکەن! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر دەستی پێوە بگرن، دەگەن بەوانە کە پێشتان کەوتوون، وە لەدوای خۆتان کەس پێتان ناگات وە ئێوە هەر خۆتان چاکترینی نێوانیانن، مەگەر کەسێك وێنەی کردەوەکەی ئەو بکات؟! لەپاش هەموو نوێژێکی فەرز سی و سێ جار** (سُبْحَانَ اللَّهِ) و (الحَمْدُ لِلَّهِ) و (اللَّهُ أَكْبَرُ) **بکەن))، ئەبو هورەیرە دەڵێ: لە نێوان خۆماندا ڕاجیا بووین، هەندێکمان دەیوت: سی و سێ جار** (سُبْحَانَ اللَّهِ) **دەکەین، سی و سێ جار** (الحَمْدُ لِلَّهِ) **دەکەین، سی و چوار جار** (اللَّهُ أَكْبَرُ) **دەکەین. بۆیە منیش گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سی و سێ جار دەڵێی:** (سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالحَمْدُ لِلَّهِ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ)**، بە هەموویانەوە سی و سێ جار بێت)).**

٨٤٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ المَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ وَرَّادٍ كَاتِبِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: أَمْلَى عَلَيَّ المُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فِي كِتَابٍ إِلَى مُعَاوِيَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ: .لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ.. وَقَالَ شُعْبَةُ عَنْ عَبْدِ المَلِكِ بِهَذَا، وَعَنِ الحَكَمِ عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُخَيْمِرَةَ، عَنْ وَرَّادٍ بِهَذَا. وَقَالَ الحَسَنُ: الجَدُّ: غِنًى[1].

---

[1] بروانە: ١٤٧٧، ٢٤٠٨، ٥٩٧٥، ٦٣٣٠، ٦٤٧٣، ٦٦١٥، ٧٢٩٢.

**٨٤٤- وەڕاد کە نووسەری موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ بوو دەڵێ: لە نامەیەکدا کە موغیرە ﷺ بۆ موعاویەی ﷺ نووسیبوو بۆی خوێندمەوە، کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە دوای هەموو نوێژێکی فەرز دەیفەرموو:** «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ». **واتە: هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، کە هاوەڵی نییە، هەموو دەسەڵات و ستاییش هەر بۆ ئەوە، ئەو خوایە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، خوایە ئەوەی تۆ بیبەخشی ڕێگری بۆ نییە، ئەوەش تۆ ڕێگری بیت کەس ناتوانێ بیدات، دەوڵەمەندی و دارایی هیچ سوودێکی نییە، دەوڵەمەندی تەنها لای تۆیە. شوعبە دەڵێ: لە عەبدولمەلیکەوە جا ئەم فەرموودەیە دێنی. وە (شوعبە) لە حەکەمەوە گێڕاویەتەوە، ئەویش لە قاسیمی کوڕی موخەیمیرەوە، ئەویش لە وەڕادەوە ئەم فەرموودە دێنێ. حەسەن دەڵێ: وشەی (الجَدُّ) واتە: دەوڵەمەندی و بێنیازی.**

## ١٥٦- بابٌ: يَسْتَقْبِلُ الإِمَامُ النَّاسَ إِذَا سَلَّمَ

٨٤٥- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى صَلاَةً أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ[1].

---

[1] بروانە: ١١٤٣، ١٣٨٦، ٢٠٨٥، ٢٧٩١، ٣٢٣٦، ٣٢٥٤، ٤٦٧٤، ٦٠٩٦، ٧٠٧٤.

# ١٥٦- باسێک: پێشنوێژ کە سەلامی نوێژی دایەوە ڕوو دەکاتە نوێژکەرەکان

**٨٤٥- سەموورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر نوێژێکی (فەرزی) بکردایە، ڕووی تێ دەکردین.**

٨٤٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالحُدَيْبِيَةِ عَلَى إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلَةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: «هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي، وَكَافِرٌ بِالكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا كَافِرٌ بِي، وَمُؤْمِنٌ بِالكَوْكَبِ»[1].

**٨٤٦- زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حودەیبییە پێشنوێژی نوێژی بەیانی بۆ کردین، پاش ئەوەی ئەو شەوە باران باریبوو، جا کاتێ لە نوێژەکە بۆیەوە، ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ((ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی فەرمووە؟))، وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ((ئەم بەیانییە هەندێ لە بەندەکانم باوەڕدار بوون بە من و هەندێکیان بێباوەڕ بوون بە من، جا ئەوەیان کە وتی: بەهۆی بەخشندە و بەزەیی خواوە بارانمان بۆ باری، ئەوە ئەوەیان باوەڕی بە من هەیە و بێباوەڕە بە ئەستێرە، ئەوەشیان کە وتی: بەهۆی ئەو شتە و ئەو شتەوە بارانمان بۆ باری، ئەوە ئەوەشیان بێباوەڕ بوو بە من و باوەڕی بە ئەستێرە هەیە)).**

---

[1] بڕوانە: ١٠٣٨، ٤١٤٧، ٧٥٠٣.

٨٤٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ، سَمِعَ يَزِيدَ قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أَخَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصَّلاَةَ ذَاتَ لَيْلَةٍ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ ثُمَّ خَرَجَ عَلَيْنَا، فَلَمَّا صَلَّى أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: «إِنَّ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا وَرَقَدُوا، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَزَالُوا فِي صَلاَةٍ مَا انْتَظَرْتُمُ الصَّلاَةَ»[1].

**٨٤٧- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان نوێژی (عیشای) دوا خست بۆ نیوەی شەو، پاشان لە ماڵ هاتە دەر بۆ لامان، جا کە نوێژەکەی تەواو کرد ڕووی تێ کردین و فەرمووی: ((بێگومان خەڵکی نوێژیان کردووە و خەوتوون، بەڵام بەڕاستی ئێوە هەر لە نوێژدان تا چاوەڕوانی نوێژ بکەن)).**

## ١٥٧- بابُ مُكْثِ الإِمَامِ فِي مُصَلَّاهُ بَعْدَ السَّلَامِ

٨٤٨- وَقَالَ لَنَا آدَمُ:حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ يُصَلِّي فِي مَكَانِهِ الذِي صَلَّى فِيهِ الفَرِيضَةَ، وَفَعَلَهُ القَاسِمُ. وَيُذْكَرُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَفَعَهُ: «لاَ يَتَطَوَّعُ الإِمَامُ فِي مَكَانِهِ». وَلَمْ يَصِحَّ.

## ١٥٧- باسی مانەوەی پێشنوێژ لە شوێنی نوێژکردنەکەیدا دوای سەلامدانەوە (ی نوێژەکەی)

**٨٤٨- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ نوێژی سوننەتی دەکرد لەو شوێنەدا کە نوێژە فەرزەکەی تێدا کردبوو، وە قاسمیش هەر وای دەکرد، وە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((نابێ پێشنوێژ لە شوێنی نوێژە فەرزەکەیدا نوێژی سوننەت بکات))، (ئیمام بوخاری دەڵێ:) بەڵام ئەمە بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ڕاست نییە.**

---

[1] بڕوانە: ٥٧٢.

٨٤٩- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ هِنْدٍ بِنْتِ الحَارِثِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا سَلَّمَ يَمْكُثُ فِي مَكَانِهِ يَسِيرًا. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ فَنُرَى - واللَّهُ أَعْلَمُ- لِكَيْ يَنْفُذَ مَنْ يَنْصَرِفُ مِنَ النِّسَاءِ[1].

**٨٤٩- ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەر ﷺ كاتێ سەلامی دەدایەوە، كەمێك لە شوێنی خۆیدا دەمایەوە. ئیبنو شیهاب دەڵێ: جا ئێمە وای بۆ دەچین -خواش زاناترە- تا ئەو ئافرەتانە بڕۆنە دەرەوە كە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە.**

٨٥٠- وَقَالَ ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ: أَخْبَرَنَا نَافِعُ بْنُ يَزِيدَ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ، أَنَّ ابْنَ شِهَابٍ كَتَبَ إِلَيْهِ قَالَ: حَدَّثَتْنِي هِنْدُ بِنْتُ الحَارِثِ الفِرَاسِيَّةُ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَتْ مِنْ صَوَاحِبَاتِهَا- قَالَتْ: كَانَ يُسَلِّمُ، فَيَنْصَرِفُ النِّسَاءُ، فَيَدْخُلْنَ بُيُوتَهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَنْصَرِفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. وَقَالَ ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ: أَخْبَرَتْنِي هِنْدُ الفِرَاسِيَّةُ. وَقَالَ عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَتْنِي هِنْدُ الفِرَاسِيَّةُ. وَقَالَ الزُّبَيْدِيُّ: أَخْبَرَنِي الزُّهْرِيُّ، أَنَّ هِنْدَ بِنْتَ الحَارِثِ القُرَشِيَّةَ أَخْبَرَتْهُ، وَكَانَتْ تَحْتَ مَعْبَدِ بْنِ المِقْدَادِ -وَهْوَ حَلِيفُ بَنِي زُهْرَةَ- وَكَانَتْ تَدْخُلُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: حَدَّثَتْنِي هِنْدُ القُرَشِيَّةُ. وَقَالَ ابْنُ أَبِي عَتِيقٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ هِنْدٍ الفِرَاسِيَّةِ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَهُ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ امْرَأَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ حَدَّثَتْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

**٨٥٠- هیندی كچی حاریسی فیراسییە لە ئومو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە -كە لە هاوڕێكانی هیند بوو- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەلامی دەدایەوە، جا ئافرەتان نوێژیان تەواو دەكرد و دەگەڕانەوە و دەچوونە ماڵەوە، پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەڕێتەوە. ئیبنو وەهب دەگێڕێتەوە**

---

[1] بروانە: ٨٣٧.

[2] بروانە: ٨٣٧.

لە یونوسەوە، ئەویش لە ئیبنو شیهابەوە، دەڵێ: هیندی فیراسییە بۆی گێڕامەوە. وە عوسمانی كوڕی عومەر دەڵێ: یونوس لە زوهرییەوە، بۆی گێڕاینەوە دەڵێ: هیندی فیراسییە بۆی گێڕامەوە. هەروەها زوبەیدی دەڵێ: زوهری بۆی گێڕامەوە كە هیندی كچی حاریسی قورەیشی بۆی گێڕاوەتەوە، كە خێزانی مەعبەدی كوڕی میقداد بووە -كە هاوپەیمانی بەنو زوهرە بووە- ئەو هیندە دەرۆیشت بۆ لای خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ. شوعەیب دەڵێ و دەیگێڕێتەوە لە زوهرییەوە ئەویش دەڵێ: هیندی قورەیشی بۆی گێڕامەوە. ئیبنو ئەبو عەتیق لە زوهرییەوە دەگێڕێتەوە، زوهریش لە هیندی فیراسییەوە دەگێڕێتەوە. وە لەیس دەڵێ: یەحیای كوڕی سەعید بۆی گێڕامەوە، ئەویش ئیبنو شیهاب بۆی گێڕاوەتەوە لە ئافرەتێكی قورەیشییەوە، كە لە پێغەمبەرەوە گێڕاویەتەوە ﷺ[1].

## ١٥٨- بابُ مَنْ صلَّى بِالنَّاسِ فَذَكَرَ حَاجَةً فَتَخَطَّاهُمْ

٨٥١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُقْبَةَ قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ العَصْرَ، فَسَلَّمَ ثُمَّ قَامَ مُسْرِعًا، فَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ إِلَى بَعْضِ حُجَرِ نِسَائِهِ، فَفَزِعَ النَّاسُ مِنْ سُرْعَتِهِ، فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ، فَرَأَى أَنَّهُمْ عَجِبُوا مِنْ سُرْعَتِهِ فَقَالَ: «ذَكَرْتُ شَيْئًا مِنْ تِبْرٍ[2] عِنْدَنَا، فَكَرِهْتُ أَنْ يَحْبِسَنِي، فَأَمَرْتُ بِقِسْمَتِهِ»[3].

---

[1] واتە: ئەم فەرموودەیە بە چەند ڕێگا ڕیوایەت كراوە و گێردراوەتەوە.

[2] (تبر) بریتییە لە ئاڵتوون یان زیو، یان هەر ئاڵتوونە نەخشی لێ دروست نەكرابێ، واتە: پارچەئاڵتوونێك بێت. إرشاد الساري: ٥١٧/٢.

[3] بروانە: ١٢٢١، ١٤٢٠، ٦٢٧٥.

## ١٥٨- باسی ئیمام پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، جا پێویستییەکی بیر کەوێتەوە هەنگاو بنێ بەسەر نوێژکەرەکاندا (بڕواتەوە بۆ ماڵەوە)

٨٥١- عوقبە ﷺ دەڵێ: لە مەدینە نوێژی عەسرم لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ کرد، جا سەلامی دایەوە، پاشان بەپەلە هەستا و بەسەر خەلکەکەدا هەنگاوی نا و ڕۆیشت بەرەو ژووری یەکێك لە خێزانەکانی، بۆیە خەلکەکە لە پەلەکردنەکەی ترسان، جا زوو هاتەوە بۆ نێویان و زانی هاوەلان سەریان سووڕما لە پەلەکردنەکەی، بۆیە فەرمووی: (( (لەنێو نوێژەکەدا) بیرم کەوتەوە کە هەندێك ئاڵتوونمان لایە، جا حەزم نەکرد بەهۆیەوە (لە دواڕۆژدا) ڕابگیرێم، بۆیە فەرمانم کرد بە دابەشکردنی)).

## ١٥٩- بَابُ الانْفِتَالِ وَالانْصِرَافِ عَنِ الْيَمِينِ وَالشِّمَالِ

وَكَانَ أَنَسٌ يَنْفَتِلُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ، وَيَعِيبُ عَلَى مَنْ يَتَوَخَّى، أَوْ يَعْمِدُ الانْفِتَالَ عَنْ يَمِينِهِ.

٨٥٢- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لاَ يَجْعَلْ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ شَيْئًا مِنْ صَلاَتِهِ، يَرَى أَنَّ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَنْصَرِفَ إِلَّا عَنْ يَمِينِهِ، لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ كَثِيرًا يَنْصَرِفُ عَنْ يَسَارِهِ.

## ١٥٩- باسی (ئیمام) بەلای ڕاست و بەلای چەپدا ڕوو بکاتە نوێژکەرەکان، یان هەڵسێ و بڕوا (دروستە)

ئەنەس ﷺ بە لای ڕاست و بەلای چەپیدا دەسووڕایەوە (ڕووی دەکردە نوێژکەرەکان)، وە بە نەنگی دەگرت لە کەسێ کە بەمەبەست و بەئەنقەست بە لای ڕاستدا بسووڕێتەوە (کاتێ پێشنوێژییەکەی تەواو کرد).

**٨٥٢- ئەسوەد دەڵێ: عەبدوڵا ﷺ وتی: کەستان وا مەکەن بەشێکی نوێژەکەی بۆ شەیتان بێ، ڕای وا بێ کە پێویستە لەسەری کە نابێ شوێن نوێژەکەی بەجێ بێڵێ بەلای ڕاستیدا نەبێ، سوێند بە خوا زۆر جار پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بە لای چەپیدا شوێنی نوێژەکەی بەجێ هێشتووە و ڕۆیشتووە.**

## ١٦٠- بابُ مَا جَاءَ فِي الثُّومِ النَّيِّ وَالبَصَلِ وَالكُرَّاثِ

وَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((مَنْ أَكَلَ الثُّومَ أَوِ البَصَلَ مِنَ الجُوعِ أَوْ غَيرِهِ فَلَا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا)).

٨٥٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي غَزْوَةِ خَيْبَرَ «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ -يَعْنِي: الثُّومَ - فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا»[1].

## ١٦٠- باسی ئەوەی دەربارەی (خواردنی) سیری کاڵ و پیاز و کەوەر هاتووە

**وە باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: ((هەر کەس سیر یان پیاز بخوات لەبەر برسێتی، یان بە مەبەستێکی دیکە ئەوە با نزیکی مزگەوتەکەمان نەکەوێ)).**

**٨٥٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە غەزای خەیبەردا فەرمووی: ((هەر کەس ئا لەم ڕووەکە -واتە: سیر- بخوات، ئەوە با نزیکی مزگەوتەکەمان نەکەوێ)).**

---

[1] بڕوانە: ٤٢١٥، ٤٢١٧، ٤٢١٨، ٥٥٢١، ٥٥٢٢.

٨٥٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ - يُرِيدُ الثُّومَ- فَلاَ يَغْشَانَا فِي مَسَاجِدِنَا». قُلْتُ: مَا يَعْنِي بِهِ؟ قَالَ: مَا أُرَاهُ يَعْنِي إِلَّا نِيئَهُ. وَقَالَ مَخْلَدُ بْنُ يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ: إِلاَّ نَتْنَهُ[1].

**٨٥٤- جابیری کوڕی عەبدولاّ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس ئا لەم ڕووەکە -مەبەستی سیرە- بخوات، ئەوە با نەیەت بۆ مزگەوتەکەمان، (ئیبنو جوڕەیج) دەڵێ: وتم (بە عەتاو): مەبەستی چییە بەوە؟ وتی: وا دەزانم مەبەستی بەس سیری کاڵە. هەروەها مەخلەدی کوڕی یەزید لە ئیبنو جوڕەیجەوە گێڕاویەتەوە کە وتوویەتی: بەس سیری بۆنناخۆشە (کە سیری کاڵە).**

٨٥٥- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، زَعَمَ عَطَاءٌ أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلًا فَلْيَعْتَزِلْنَا -أَوْ قَالَ: - فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا- وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ». وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِقِدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنْ بُقُولٍ، فَوَجَدَ لَهَا رِيحًا فَسَأَلَ، فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنَ البُقُولِ، فَقَالَ: «قَرِّبُوهَا» -إِلَى بَعْضِ أَصْحَابِهِ كَانَ مَعَهُ- فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا، قَالَ: «كُلْ، فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لاَ تُنَاجِي».
وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ وَهْبٍ أُتِيَ بِبَدْرٍ. قَالَ ابْنُ وَهْبٍ يَعْنِي طَبَقًا فِيهِ خُضَرَاتٌ[2]. وَلَمْ يَذْكُرِ اللَّيْثُ وَأَبُو صَفْوَانَ عَنْ يُونُسَ قِصَّةَ القِدْرِ، فَلاَ أَدْرِي هُوَ مِنْ قَوْلِ الزُّهْرِيِّ أَوْ فِي الحَدِيثِ.

---

[1] بروانە: ٨٥٥، ٥٤٥٢، ٧٣٥٩.

[2] بروانە: ٧٣٥٩.

**٨٥٥- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکەس سیر یان پیازی خوارد با کەنار بگرێ و دوور بێ لە ئێمە -یان فەرمووی: با دوور کەوێتەوە لە مزگەوتمان-، وە با لە ماڵی خۆی دانیشێ))، وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفرێکیان بۆ هێنا سەوزەواتی تێدا بوو، هەستی کرد بۆنی هەبوو، بۆیە پرسیاری کرد، جا ئەو سەوزەواتەی تێدا بوو پێی وترا، ئەویش فەرمووی: ((نزیکی بکەنەوە))، لە هەندێ لە هاوەڵانی کە لەگەڵیدا بوون، جا کە بینی حەزی نەکرد بیخوات، فەرمووی: ((بخۆ، چونکە بێگومان من وتووێژ لەگەڵ زاتێکدا دەکەم کە تۆ لەگەڵی ناکەیت)).**

**وە ئەحمەدی کوڕی سالح لە ئیبنو وەهبەوە گێڕاویەتەوە، وتی: (بَدْرٍ)ێکیان هێنان ئیبنو وەهب وتی: (بَدْرٍ) واتە: سینییەك کە سەوزەی تیا بێت، بەڵام لەیس و ئەبو صەفوان کە لە یونوسەوە ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە باسی قابلەمەکەیان نەکردووە، جا نازانم ئەو وشە قسەی زوهرییە، یان بەشێکە لە فەرموودەکە.**

٨٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ أَنَسًا: مَا سَمِعْتَ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ فِي الثُّومِ؟ فَقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَلاَ يَقْرَبْنَا» أَوْ: «لاَ يُصَلِّيَنَّ مَعَنَا»[1].

**٨٥٦- عەبدولعەزیز دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە ئەنەس ﷺ کرد چیت دەربارەی سیر لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووە؟ ئەنەسیش وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس لەم ڕووەکەی خوارد، ئەوە با نزیکمان نەکەوێتەوە))، یان فەرمووی: ((با لەگەڵماندا نوێژ نەکات)).**

---

[1] بڕوانە: ٥٤٥١.

## ١٦١- بابُ وُضُوءِ الصِّبْيَانِ، وَمَتَى يَجِبُ عَلَيْهِمُ الغَسْلُ وَالطُّهُورُ، وَحُضُورِهِم الجَمَاعَةَ وَالعِيدَيْنِ وَالجَنَائِزَ وَصُفُوفِهِمْ؟

٨٥٧- حَدَّثَنَا ابْنُ المُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنِي غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ سُلَيْمَانَ الشَّيْبَانِيَّ قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ مَرَّ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى قَبْرٍ مَنْبُوذٍ، فَأَمَّهُمْ وَصَفُّوا عَلَيْهِ. فَقُلْتُ:يا أَبَا عَمْرٍو مَنْ حَدَّثَكَ؟ فَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ.

## ١٦١- باسی دەستنوێژگرتنی منداڵان، وە کەی خۆشۆردن و دەستنوێژگرتن واجبە لەسەریان، وە ئامادەبوونیان بۆ نوێژی جەماعەت و جەژنەکان و نوێژی مردوو و ڕیزی منداڵان (لە نوێژی جەماعەتدا)

**٨٥٧- سولەیمانی شەیبانی دەڵێ: لە شەعبیم بیست وتی: ئەو هاوەڵە بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ تێ پەڕی بە لای گۆڕێکی بەتەنیای پەڕدا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی بۆ کردن و ئەوانیش ڕیز بوون و نوێژیان لەسەر کرد. (سولەیمان دەڵێ)، وتم: ئەبو عەبدوڕەحمان کێ ئەمەی بۆ گێڕایتەوە؟ وتی: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄.**

٨٥٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي صَفْوَانُ بْنُ سُلَيْمٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الغُسْلُ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ»[1].

[1] بڕوانە: ٨٧٩، ٨٨٠، ٨٩٥، ٢٦٦٥.

**٨٥٨- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ)).**

٨٥٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو قَالَ: أَخْبَرَنِي كُرَيْبٌ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ لَيْلَةً، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا كَانَ فِي بَعْضِ اللَّيْلِ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَتَوَضَّأَ مِنْ شَنٍّ مُعَلَّقٍ وُضُوءًا خَفِيفًا -يُخَفِّفُهُ عَمْرٌو وَيُقَلِّلُهُ جِدًّا- ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَقُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ نَحْوًا مِمَّا تَوَضَّأَ، ثُمَّ جِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَحَوَّلَنِي فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ، ثُمَّ صَلَّى مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، فَأَتَاهُ الْمُنَادِي يَأْذِنُهُ بِالصَّلاَةِ فَقَامَ مَعَهُ إِلَى الصَّلاَةِ، فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. قُلْنَا لِعَمْرٍو: إِنَّ نَاسًا يَقُولُونَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَنَامُ عَيْنُهُ وَلاَ يَنَامُ قَلْبُهُ. قَالَ عَمْرٌو: سَمِعْتُ عُبَيْدَ بْنَ عُمَيْرٍ يَقُولُ: إِنَّ رُؤْيَا الأَنْبِيَاءِ وَحْيٌ ثُمَّ قَرَأَ: ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ ﴿١٠٢﴾﴾ الصافات[1].

**٨٥٩- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: شەوێك لە ماڵی مەیمونەی پوورم مامەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەستا، جا کاتێ بەشێکی شەو ڕۆیشتبوو پێغەمبەر ﷺ هەستا، لە کوندەیەکی هەڵواسراو دەستنوێژێکی سووکەڵەی گرت- عەمر زۆر سووك و کورتی دەکردەوە-، پاشان هەستا و دەستی کرد بە نوێژکردن، (عەبدوڵا دەڵێ:) منیش هەستام دەستنوێژم گرت وەك دەستنوێژەکەی ئەو، پاشان هاتم لای چەپیەوە وەستام (نوێژم دابەست)، بەڵام پێغەمبەر ﷺ سووڕاندمی و بردمیە لای ڕاستیەوە، پاشان ئەوەندەی خوا حەز بکات نوێژی کرد، پاشان پاڵ کەوت و خەوت هەتا پرخەی لێ دا، جا بانگبێژەکە هات بۆ لای و ئاگاداری کرد کە کاتی نوێژە، ئەویش لەگەڵی ڕۆیشت بۆ نوێژکردن، جا نوێژی کرد و دەستنوێژیشی نەگرتەوە. بە عەمرمان وت: بێگومان کەسانێك دەڵێن بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ چاوی دەخەوێ،**

---

[1] بڕوانە: ١١٧.

**بەڵام دڵی بەئاگایە و ناخەوێ؟ عەمر وتی: لە عوبەیدی کوڕی عومەیرم بیست دەیوت: بەڕاستی خەوبینینی پێغەمبەران نیگایە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ئیبڕاهیم وتی بە ئیسماعیل ﷺ: بێگومان من خەوم بینیوە کە من تۆ سەر ببڕم) (ئەوە بوو ویستی سەری ببڕێ، بەڵام خوا ئاگاداری کرد سەری نەبڕێ).**

٨٦٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ فَقَالَ «قُومُوا فَلأُصَلِّيَ بِكُمْ». فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدِ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِمَاءٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالْيَتِيمُ مَعِي، وَالْعَجُوزُ مِنْ وَرَائِنَا، فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ[١].

**٨٦٠- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: مولەیکەی نەنکی خواردنێکی دروست کرد و پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ دەعوەت کرد، پێغەمبەریش ﷺ لێی خوارد و فەرمووی: ((هەستن با پێشنوێژیتان بۆ بکەم))، حەسیرێکمان هەبوو لەبەر زۆر مانەوە زۆر ڕەش بووبوو، منیش هەستام بە ئاو ئاوپرژێنم کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ (لەسەری) وەستا، مندالە هەتیوەکەش لەگەڵ من بوو (لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ)، پیرەژنەکەش (نەنکم) لەدوای ئێمەوە بوو، جا پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات پێشنوێژی بۆ کردین.**

٨٦١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: أَقْبَلْتُ رَاكِبًا عَلَى حِمَارٍ أَتَانٍ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الاِحْتِلاَمَ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِالنَّاسِ بِمِنًى إِلَى غَيْرِ جِدَارٍ، فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ، فَنَزَلْتُ وَأَرْسَلْتُ الأَتَانَ تَرْتَعُ وَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ أَحَدٌ[٢].

---

[١] بڕوانە: ٣٨٠.

[٢] بڕوانە: ٧٦.

**٨٦١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: به سواری ماکەرێك هاتم، لەو ڕۆژگارەدا خەریك بوو باڵغ دەبووم، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ له مینا پێشنوێژی دەکرد بۆ موسوڵمانان، ڕووی له دیوار نەبوو، جا (بەسواری گوێدرێژەکەوە) به بەردەم بەشێك له ڕیزی نوێژخوێناندا ڕۆیشتم، جا دابەزیم و ماکەرەکەم بەڕەڵا کرد بلەوەڕێ، خۆشم چوومه ڕیزی نوێژکەرەکانەوە، بەم کارەشم کەس ڕەخنەی لێ نەگرتم.**

٨٦٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ[1] قَالَتْ: أَعْتَمَ النَّبِيُّ ﷺ. وَقَالَ عَيَّاشٌ حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي العِشَاءِ حَتَّى نَادَاهُ عُمَرُ: قَدْ نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ. فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ يُصَلِّي هَذِهِ الصَّلاَةَ غَيْرُكُمْ». وَلَمْ يَكُنْ أَحَدٌ يَوْمَئِذٍ يُصَلِّي غَيْرَ أَهْلِ المَدِينَةِ[2].

**٨٦٢- عائیشه ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای دوا خست تا دونیا تاریك بوو، هەتا عومەر ﷺ بانگی کرد، وتی: ئافرەتان و منداڵان خەوتن! ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ له ماڵ هاته دەرەوە و فەرمووی: ((بێگومان ئا ئێستا کەس نییه له خەڵکی سەر زەوی ئەم نوێژه بکات جگه له ئێوە))، لەو ڕۆژگارەدا جگه له خەڵکی مەدینه کەس نوێژی (بەئاشکرا) نەدەکرد.**

٨٦٣- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَابِسٍ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ لَهُ رَجُلٌ: شَهِدْتَ الخُرُوجَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ:

---

[1] ئەم فەرموودەیه دوو سەنەدی هەیه که هەردووکیان دەچنەوە سەر عائیشه ﷺ.

[2] بڕوانه: ٥٦٦.

نَعَمْ، وَلَوْلاَ مَكَانِي مِنْهُ مَا شَهِدْتُهُ -يَعْنِى: مِنْ صِغَرِهِ- أَتَى العَلَمَ الَّذِي عِنْدَ دَارِ كَثِيرِ بْنِ الصَّلْتِ، ثُمَّ خَطَبَ، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ أَنْ يَتَصَدَّقْنَ، فَجَعَلَتِ المَرْأَةُ تُهْوِي بِيَدِهَا إِلَى حَلْقِهَا تُلْقِي فِي ثَوْبِ بِلاَلٍ، ثُمَّ أَتَى هُوَ وَبِلاَلٌ البَيْتَ[١].

**٨٦٣- عەبدوڕەحمانی کوڕی عابیس دەڵێ: گوێم لێ بوو پیاوێ بە ئیبنو عەباسی ﷺ وت: ئامادەی ڕۆیشتنەدەرەوە بووی (بۆ نوێژی جەژن) لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ؟ وتی: بەڵێ، وە ئەگەر لەبەر نزیکیم لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەبووایە ئامادە نەدەبووم- واتە لەبەر کەمی تەمەنی-، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە لای ئەو بەیداخەی کە لای ماڵی کەسیری کوڕی صەلت بوو، پاشان وتاری دا (بۆ پیاوان)، ئینجا ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتان و ئامۆژگاری کردن، فەرمانی پێ کردن کە ماڵ ببەخشن، جا ئافرەت هەبوو دەستی دەبرد بۆ ملوانکەکەی مل و گەردنی و فرێی دەدایە پۆشاکەکەی بیلالەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ و بیلال هاتنەوە بۆ ماڵەوە.**

## ١٦٢- بابُ خُرُوجِ النِّسَاءِ إِلَى المَسَاجِدِ بِاللَّيْلِ وَالغَلَسِ

٨٦٤- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالعَتَمَةِ حَتَّى نَادَاهُ عُمَرُ: نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ. فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «مَا يَنْتَظِرُهَا أَحَدٌ غَيْرُكُمْ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ». وَلاَ يُصَلَّى يَوْمَئِذٍ إِلاَّ بِالمَدِينَةِ، وَكَانُوا يُصَلُّونَ العَتَمَةَ فِيمَا بَيْنَ أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ الأَوَّلِ[٢].

[١] بروانە: ٩٨.

[٢] بروانە: ٥٦٦.

## ١٦٢- باسی (حوکمی) دەرچوونی ئافرەتان (لە ماڵ) بە شەو و بە تاریکی بۆ مزگەوتەکان (بۆ نوێژکردن)

**٨٦٤- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی عیشا دوا کەوت، هەتا عومەر ﵁ بانگی کرد و وتی: ئافرەتان و منداڵان خەوتن، جا پێغەمبەریش ﷺ هاتە دەرەوە لە ماڵ و فەرمووی: ((کەس لە خەڵکی سەر زەوی چاوەڕوانی ئەم نوێژە ناکات جگە لە ئێوە))، لەو ڕۆژگارەدا تەنها لە مەدینەدا نوێژ (بەئاشکرا) دەکرا، وە نوێژی عیشایان لە نێوان ئاوابوونی سورایی کەناری ئاسمان تا سێیەکی یەکەمی شەودا دەکرد.**

٨٦٥- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ حَنْظَلَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَأْذَنَكُمْ نِسَاؤُكُمْ بِاللَّيْلِ إِلَى المَسْجِدِ فَأْذَنُوا لَهُنَّ». تَابَعَهُ شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٨٦٥- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: ((ئەگەر ئافرەتەکانتان داوای مۆڵەتیان لێ کردن لە شەودا بڕۆن بۆ مزگەوت، ئەوە مۆڵەتیان بدەن)). شوعبە لە ئەعمەشەوە، لە موجاهیدەوە، لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عوبەیدوڵای کوڕی مووسا دەکات.**

---

[1] بڕوانە: ٨٧٣، ٨٩٩، ٩٠٠، ٥٢٣٨.

## ١٦٣- بابُ انْتِظَارِ النَّاسِ قِيَامَ الإِمَامِ العَالِمِ

٨٦٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَتْنِي هِنْدُ بِنْتُ الحَارِثِ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ- أَخْبَرَتْهَا، أَنَّ النِّسَاءَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كُنَّ إِذَا سَلَّمْنَ مِنَ المَكْتُوبَةِ قُمْنَ، وَثَبَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَنْ صَلَّى مِنَ الرِّجَالِ مَا شَاءَ اللَّهُ، فَإِذَا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَامَ الرِّجَالُ[1].

## ١٦٣- باسی خەڵکی چاوەڕوانی هەستانی پێشنوێژی زانا بکەن

**٨٦٦- زوهری دەڵێ: هیندی کچی حاریس بۆی گێڕامەوە کە ئومو سەلەمەی ﵂ -خێزانی پێغەمبەر ﷺ- بۆی گێڕاوەتەوە، کە ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کە سەلامیان دەدایەوە لە نوێژی فەرز هەڵدەسان، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو پیاوانەی نوێژیان کردبوو لەگەڵی دەمانەوە ئەوەندەی خوا بیویستایە، جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵبسایە پیاوەکانیش هەڵدەسان.**

٨٦٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ[2] ح. وَحَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيُصَلِّي الصُّبْحَ، فَيَنْصَرِفُ النِّسَاءُ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ، مَا يُعْرَفْنَ مِنَ الغَلَسِ[3].

**٨٦٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی دەکرد، ئینجا ئافرەتان دەگەڕانەوە و خۆیان پێچابۆیەوە بە پۆشاکەکانیان لەبەر تاریکی نەدەناسران.**

---

[1] بڕوانە: ٨٣٧.

[2] ئیمام بوخاری ئەم فەرموودەیەی بە دوو ڕشتە گێڕاوەتەوە.

[3] بڕوانە: ٣٧٢.

٨٦٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مِسْكِينٍ قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرٌ، أَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لأَقُومُ إِلَى الصَّلاَةِ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلاَتِي كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ»[1].

**٨٦٨- ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من هەڵدەستم بۆ نوێژکردن، وە من دەمەوێ درێژەی پێ بدەم، کەچی گریانی منداڵێك دەبیستم، بۆیە نوێژەکەم کورت دەکەمەوە، نەبادا بۆ دایکی ببمە ناڕەحەتی و بارگرانی)).**

٨٦٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَوْ أَدْرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا أَحْدَثَ النِّسَاءُ لَمَنَعَهُنَّ كَمَا مُنِعَتْ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ. قُلْتُ لِعَمْرَةَ: أَوَ مُنِعْنَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ.

**٨٦٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بەم سەردەمە بگەشتایە کە ئافرەتان چییان داهێناوە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی دەکرد (لە هاتنیان بۆ مزگەوت)، هەر چۆنێك ئافرەتانی بەنو ئیسرائیل بەرگری کران، (یەحیا دەڵێ:) بە عەمرەم وت: ئایا ئافرەتانی بەنو ئیسرائیل ڕێگری کران؟ وتی: بەڵێ.**

## ١٦٤- بابُ صَلَاةِ النِّسَاءِ خَلْفَ الرِّجَالِ

٨٧٠- ٨٧٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ هِنْدٍ بِنْتِ الحَارِثِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَلَّمَ قَامَ النِّسَاءُ حِينَ يَقْضِي

---

[1] بروانە: ٧٠٧.

تَسْلِيمَهُ، وَيَمْكُثُ هُوَ فِي مَقَامِهِ يَسِيرًا قَبْلَ أَنْ يَقُومَ. قَالَ: نَرَى -وَاللَّهُ أَعْلَمُ- أَنَّ ذَلِكَ كَانَ لِكَيْ يَنْصَرِفَ النِّسَاءُ قَبْلَ أَنْ يُدْرِكَهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الرِّجَالِ[1].

## ١٦٤- باسی نوێژی ئافرەتان لەدوای (ڕیزی) پیاوانەوەیە

**٨٧٠- ٨٧٥- ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ سەلامی دەدایەوە و لە سەلامدانەوەكەی دەبۆیەوە، ئافرەتان هەڵدەسان (و دەڕۆیشتن)، بەڵام پێغەمبەر ﷺ كەمێك لە جێگای خۆی دەمایەوە پێش ئەوەی هەڵسێ، دەڵێ: وا دەزانین -خواش زاناترە- بێگومان ئەم مانەوە لەبەر ئەوە بوو تا ئافرەتان بڕۆن پێش ئەوەی كەس لە پیاوان پێیان بگەن.**

٨٧١- ٨٧٢- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ إِسْحَاقَ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ فِي بَيْتِ أُمِّ سُلَيْمٍ، فَقُمْتُ وَيَتِيمٌ خَلْفَهُ، وَأُمُّ سُلَيْمٍ خَلْفَنَا[2].

**٨٧١- ٨٧٢- ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەماڵی ئومو سولەیم ﵂ نوێژی كرد، من و منداڵێكی هەتیو لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ وەستاین، ئومو سولەیمیش لەدوامانەوە وەستا (و نوێژی كرد).**

## ١٦٥- بَابُ سُرْعَةِ انْصِرَافِ النِّسَاءِ مِنَ الصُّبْحِ، وَقِلَّةِ مَقَامِهِنَّ فِي الْمَسْجِدِ

٨٧٣- ٨٧٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الصُّبْحَ بِغَلَسٍ، فَيَنْصَرِفْنَ نِسَاءُ الْمُؤْمِنِينَ، لاَ يُعْرَفْنَ مِنَ الْغَلَسِ، أَوْ لاَ يَعْرِفُ بَعْضُهُنَّ بَعْضًا[1].

---

[1] بڕوانە: ٨٧٥.

[2] بڕوانە: ٣٨٠.

## ١٦٥- باسى بەپەلە گەڕانەوەى ئافرەتان لە نوێژى بەيانيدا، وە كەم مانەوەيان لە مزگەوتدا

٨٧٣- ٨٧٤- عائيشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەرى خوا ﷺ هەميشە نوێژى بەيانى بەتاريكى دەكرد، جا ئافرەتانى ئيمانداران دەگەڕانەوە لەبەر تاريكى نەدەناسران، يان ئافرەتان يەكديان نەدەناسييەوە.

## ١٦٦- بَابُ اسْتِئْذَانِ الْمَرْأَةِ زَوْجَهَا بِالْخُرُوجِ إِلَى الْمَسْجِدِ

٨٧٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ عَنْ مَعْمَرٍ عَنْ الزُّهْرِيِّ عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا اسْتَأْذَنَتْ امْرَأَةُ أَحَدِكُمْ فَلَا يَمْنَعْهَا.

## ١٦٦- باسى ئافرەت داواى مۆڵەت لە مێردەكەى بكات كە بڕوات بۆ مزگەوت

٨٧٥- ساليمى كوڕى عەبدوڵا لە باوكيەوە ﵄ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: ((ئەگەر خێزانى يەكێك لەئێوە مۆڵەتى خواست (بڕوا بۆ مزگەوت)، با ڕێگرى نەبێ)).

[١] بڕوانە: ٣٧٢.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ١١- كِتابُ الجمعة

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١١- پەڕاوی نوێـژی هەینی

## ١- بابُ فَرْضِ الجُمُعَةِ

لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الجمعة.

٨٧٦- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ هُرْمُزَ الأَعْرَجَ -مَوْلَى رَبِيعَةَ بْنِ الحَارِثِ- حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ القِيَامَةِ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، ثُمَّ هَذَا يَوْمُهُمُ الَّذِي فُرِضَ عَلَيْهِمْ فَاخْتَلَفُوا فِيهِ، فَهَدَانَا اللَّهُ، فَالنَّاسُ لَنَا فِيهِ تَبَعٌ، اليَهُودُ غَدًا وَالنَّصَارَى بَعْدَ غَدٍ»[١].

## ١- باسی نوێژی هەینی فەرزە

**به بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەگەر لە ڕۆژی هەینیدا بانگ درا بۆ نوێژی هەینی، ئەوە زوو بڕۆن بۆ نوێژ و یادی خوا و واز لە کڕین و فرۆشتن بێنن، ئەمەتان چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن و شارەزا بن).**

---

[١] بڕوانە: ٢٣٨.

٨٧٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((ئێمە (ی ئوممەتی ئیسلام) كۆتاهەمین ئوممەتین لە دونیادا، پێشكەوتووترین ئومەتین (لە پلەوپایەی چوونەبەهەشت) لە ڕۆژی دواییدا، تەنها ئەوەندە هەیە بەڕاستی ئەوان پێش ئێمە نامە و كتێبیان پێ دراوە، پاشان ئەم ڕۆژی هەینییە ئەو ڕۆژەیان بوو كە لەسەریان فەرز كرابوو (پەرستشی تێدا بكەن)، كەچی ڕاجیا بوون تێیدا، بەڵام خوا ڕێنموونی ئێمەی كرد بۆی، جا بۆیە خەڵكی تێیدا شوێن ئێمە دەكەون، ڕۆژی جوولەكە سبەینێ و ڕۆژی گاور دوو سبەینێیە))[١].

## ٢- بابُ فَضْلِ الغُسْلِ يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَهَلْ عَلَى الصَّبِيِّ شُهُودُ يَوْمِ الجُمُعَةِ أَوْ عَلَى النِّسَاءِ؟

٨٧٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ»[٢].

## ٢- باسی گەورەیی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی، وە ئایا منداڵ لەسەریەتی ئامادەی نوێژی هەینی ببێت، یان ئایا ئافرەتان لەسەریانە ئامادەی نوێژی هەینی ببن؟

٨٧٧- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر كەسێكتان هات بۆ نوێژی هەینی، با خۆی بشوات)).

---

[١] واتە: شەممە ڕۆژی جوولەكەكانە و یەك شەممە ڕۆژی گاورەكانە.

[٢] بڕوانە: ٨٩٤، ٩١٩.

٨٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ أَسْمَاءَ قَالَ: أَخْبَرَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ بَيْنَمَا هُوَ قَائِمٌ فِي الخُطْبَةِ يَوْمَ الجُمُعَةِ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ مِنَ المُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَنَادَاهُ عُمَرُ: أَيَّةُ سَاعَةٍ هَذِهِ؟ قَالَ: إِنِّي شُغِلْتُ فَلَمْ أَنْقَلِبْ إِلَى أَهْلِي حَتَّى سَمِعْتُ التَّأْذِينَ، فَلَمْ أَزِدْ أَنْ تَوَضَّأْتُ. فَقَالَ وَالوُضُوءُ أَيْضًا؟ وَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِالغُسْلِ[1].؟!

**٨٧٨- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بەپێوە بوو لە وتاری ڕۆژی هەینیدا، لەپڕ پیاوێك هاتە ژوورەوە کە لە کۆچەرە یەکەمینەکان بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، عومەریش بانگی کرد و وتی: ئێستا چ کاتێکە (کە دێیت بۆ نوێژ)؟ وتی: بەڕاستی سەرقاڵ کرام، بۆیە نەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە هەتا گوێم لە بانگ بوو، ئیدی هیچم نەکرد ئەوە نەبێ دەستنوێژم گرت. عومەر وتی: (دوا کەوتوویت و) تەنها دەستنوێژت گرتووە؟ لە کاتێکدا خۆت دەزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە فەرمانی دەکرد بە خۆشۆردن؟!**

٨٧٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «غُسْلُ يَوْمِ الجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ»[2].

**٨٧٩- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ واجبە)).**

---

[1] بڕوانە: ٨٨٢.

[2] بڕوانە: ٨٥٨.

## ٣- بَابُ الطِّيبِ لِلْجُمُعَةِ

٨٨٠- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ قَالَ: حَدَّثَنَا حَرَمِيُّ بْنُ عُمَارَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ سُلَيْمٍ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الغُسْلُ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَأَنْ يَسْتَنَّ وَأَنْ يَمَسَّ طِيبًا إِنْ وَجَدَ». قَالَ عَمْرٌو: أَمَّا الغُسْلُ فَأَشْهَدُ أَنَّهُ وَاجِبٌ، وَأَمَّا الِاسْتِنَانُ وَالطِّيبُ فَاللَّهُ أَعْلَمُ أَوَاجِبٌ هُوَ أَمْ لاَ، وَلَكِنْ هَكَذَا فِي الحَدِيثِ[1].

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: هُوَ أَخُو مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، وَلَمْ يُسَمَّ أَبُو بَكْرٍ هَذَا. رَوَاهُ عَنْهُ بُكَيْرُ بْنُ الأَشَجِّ، وَسَعِيدُ بْنُ أَبِي هِلاَلٍ، وَعِدَّةٌ. وَكَانَ مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ يُكْنَى بِأَبِي بَكْرٍ وَأَبِي عَبْدِ اللَّهِ.

## ٣- باسی بۆنی خۆش لەخۆدان بۆ (ڕۆژی) هەینی

**٨٨٠- عەمری كوڕی سولەیمی ئەنصاڕی دەڵێ: شایەتی ئەدەم لەسەر ئەوەی ئەبو سەعیدی خودری ﷺ وتی: شایەتی ئەدەم لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو كەسێكی باڵغ، وە دەبێ سیواك بكات، وە دەبێ بۆنی خۆش لە خۆی بدات ئەگەر هەیبوو))، عەمر دەڵێ: جا خۆشۆردن ئەوە شایەتی دەدەم كە واجبە، بەڵام سیواككردن و بۆنی خۆش لەخۆدان ئەوە خوا زاناترە واجبە یان نا، بەڵام لە فەرموودەكەدا ئاوەها هاتووە (كە باس كرا). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: ئەبو بەكر برای موحەممەدی كوڕی مونكەدیرە، ئەم ئەبو بەكرە ناوی خۆی نەوتراوە، بەڵكوو كونییەكەی وتراوە، بوكەیر كوڕی ئەشەج و سەعیدی كوڕی ئەبو هیلال و چەند كەسی دیكە فەرموودەیان لێیەوە گێڕاوەتەوە، موحەممەدی كوڕی مونكەدیر بە ئەبو بەكر و ئەبو عەبدوڵاش ناودەبرێ (ئەم دوو كونییەیەی هەیە).**

---

[1] بڕوانە: ٨٥٨.

## ٤- بابُ فَضْلِ الجُمُعَةِ

٨٨١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ -مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ- عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الجُمُعَةِ غُسْلَ الجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ حَضَرَتِ المَلَائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ»[1].

## ٤- باسی گەورەیی (نوێژی) هەینی

**٨٨١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس ڕۆژی هەینی خۆی بشۆرێ لەبەر لەشگرانی، پاشان زوو بڕوات (بۆ نوێژی هەینی) ئەوە وەك ئەوە وایە وشترێکی کردبێ بە خێر، وە ئەو کەسەش لە ساتی دووەمدا بڕوات، ئەوە وەك ئەوە وایە مانگایەکی کردبێ بە خێر، وە ئەو کەسەش لە ساتی سێیەمدا بڕوات، ئەوە وەك ئەوە وایە بەرانێکی شاخداری کردبێ بە خێر، ئەو کەسەش لە ساتی چوارەمدا بڕوات، ئەوە وەك ئەوە وایە مریشکێکی کردبێ بە خێر، ئەو کەسەش لە ساتی پێنجەمدا بڕوات، ئەوە وەك ئەوە وایە هێلکەیەکی کردبێ بە خێر، جا کاتێ ئیمام (وتارخوێن) چووە سەر دوانگە، فریشتەکان ئامادە دەبن و گوێ لە وتارەکە دەگرن)).**

[1] بڕوانە: ٨٥٠.

## ٥- بابٌ

٨٨٢- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ عُمَرَ ﷺ بَيْنَمَا هُوَ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ، فَقَالَ عُمَرُ: لِمَ تَحْتَبِسُونَ عَنِ الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ الرَّجُلُ مَا هُوَ إِلاَّ سَمِعْتُ النِّدَاءَ تَوَضَّأْتُ. فَقَالَ أَلَمْ تَسْمَعُوا النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا رَاحَ أَحَدُكُمْ إِلَى الجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ»[1]؟!

## ٥- باسێک

**٨٨٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ لە کاتێکدا عومەری کوڕی خەتاب ﷺ لە ڕۆژی هەینی دا وتاری دەدا، لەپڕ پیاوێك هاتە ژوورەوە، عومەریش وتی: بۆ دوا دەکەون لە نوێژ؟ پیاوەکەش وتی: ماوەم نەبوو ئەوەندە نەبێ گوێم لە بانگ بوو، دەستنوێژم گرت، عومەر وتی: ئەم فەرموودەی پێغەمبەرتان ﷺ نەبیستووە کە فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان ڕۆیشت بۆ نوێژی هەینی، با خۆی بشوات))؟.**

## ٦- بابُ الدُّهْنِ لِلجُمُعَةِ

٨٨٣- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنِ ابْنِ وَدِيعَةَ، عَنْ سَلْمَانَ الفَارِسِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ، أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ ثُمَّ يَخْرُجُ، فَلاَ يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الإِمَامُ، إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الجُمُعَةِ الأُخْرَى»[2].

---

[1] بروانە: ٨٧٨.

[2] بروانە: ٩١٠.

## ٦- باسی بەکارهێنانی ڕۆن بۆ نوێژی هەینی[١]

**٨٨٣- سەلمانی فارسی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەو پیاوەی کە خۆی بشوات لە ڕۆژی هەینیدا، وە چەندە بتوانێ خۆی پاك و خاوێن کاتەوە، ڕۆنی ماڵەوەیان بەکار بێنێ (بۆ سەر و ڕیشی)، یان بۆنی خۆشی ماڵەوەیان لە خۆی بدات، پاشان دەرچێ (لە ماڵەوە بۆ مزگەوت)، لەوێ نەڕواتە نێوان دوو کەسەوە (و بەناڕەحەتی جێگای خۆی بکاتەوە)، پاشان ئەوەندەی بۆی نووسراوە نوێژی سوننەت بکات، پاشان کە وتارخوێن دەستی بە وتار کرد بێدەنگ بێ، ئیللا (خوا) لە گوناهی نێوان ئەو هەینییە تا هەینی داهاتووی خۆش دەبێ)).**

٨٨٤- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: قَالَ طَاوُسٌ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: ذَكَرُوا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اغْتَسِلُوا يَوْمَ الجُمُعَةِ وَاغْسِلُوا رُءُوسَكُمْ وَإِنْ لَمْ تَكُونُوا جُنُبًا، وَأَصِيبُوا مِنَ الطِّيبِ». قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَّا الغُسْلُ فَنَعَمْ، وَأَمَّا الطِّيبُ فَلاَ أَدْرِي[٢].

**٨٨٤- تاوس دەڵێ: بە عەبدوڵای کوڕی عەباسم ﷺ وت: دەڵێن پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ڕۆژی هەینی خۆتان بشۆرن و سەرتان بشۆرن، با لەشیشتان گران نەبێ (یان تووشی جەنابەت نەبووبن)[٣]، وە بۆنی خۆش لە خۆتان بدەن)). عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ وتی: بۆ خۆشۆردن ئەوە بەڵێ وایە، بەڵام بۆ بۆنی خۆش بەکارهێنان نازانم (و ئاگادار نیم).**

---

١ واتە: بەکارهێنانی ڕۆن بۆ سەر و ریش.

٢ بڕوانە: ٨٥٥.

٣ واتە: لەشتان گران بێ یان نا هەر خۆشۆردن لە ڕۆژی هەینیدا سوننەتە.

٨٨٥- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مَيْسَرَةَ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّهُ ذَكَرَ قَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الغُسْلِ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَقُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: أَيَمَسُّ طِيبًا أَوْ دُهْنًا إِنْ كَانَ عِنْدَ أَهْلِهِ؟ فَقَالَ: لاَ أَعْلَمُهُ[1].

**٨٨٥- تاوس لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﵄ کە باسی فەرموودەیەکی پێغەمبەری ﷺ کرد دەربارەی خۆشۆردن لە ڕۆژی هەینیدا، تاوس دەڵێ: منیش بە عەبدوڵای کوڕی عەباسم وت: ئایا ئەو کەسەی دەڕوات بۆ نوێژی هەینی، بۆنی خۆش لە خۆی بدات، یان ڕۆن بدات لە سەر و ڕیشی ئەگەر لە ماڵەوە هەیبوو؟ وتی: نازانم.**

## ٧- بابٌ: يَلْبَسُ أَحْسَنَ مَا يَجِدُ

٨٨٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رَأَى حُلَّةَ سِيَرَاءَ عِنْدَ بَابِ المَسْجِدِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوِ اشْتَرَيْتَ هَذِهِ فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ». ثُمَّ جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْهَا حُلَلٌ، فَأَعْطَى عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﵁ مِنْهَا حُلَّةً، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَسَوْتَنِيهَا وَقَدْ قُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ! قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا». فَكَسَاهَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ ﵁ أَخًا لَهُ بِمَكَّةَ مُشْرِكًا[2].

## ٧- باسێک: (نوێژکەر) چاکترین پۆشاکێ کە هەیەتی لەبەری کات (بۆ نوێژی هەینی)

**٨٨٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتاب پۆشاکێکی خەتخەتی ئاوریشمی بینی لەبەر دەرگای مزگەوتدا، وتی: ئەی**

---

[1] بروانە: ٨٨٤.

[2] بروانە: ٩٤٨، ٢١٠٤، ٢٦١٢، ٢٦١٩، ٣٠٥٤، ٥٨٤١، ٥٩٨١، ٦٠٨١.

پێغەمبەرى خوا ﷺ خۆزگە ئەم پۆشاكەت بكڕیایە بۆ ڕۆژانى هەینى و بۆ پێشوازى وەفد و نوێنەر كە دێت بۆ لات لەبەرت بكردایە، پێغەمبەرى خواش ﷺ فەرمووى: ((بێگومان كەسێك ئەم پۆشاكە (ئاوریشمە) لەبەر دەكات كە لە ڕۆژى دواییدا هیچ بەشێكى نەبێت لەلاى خوا))، پاشان پێغەمبەرى خوا ﷺ چەند پۆشاكێكى ئاوریشمى بۆ هات و پۆشاكێكیانى بەخشى بە عومەرى كوڕى خەتاب، عومەریش وتى: ئەم پۆشاكەت پێ دام لە كاتێكدا جەنابت دەربارەى پۆشاكەكەى عوگارید (كە لەبەردەمى مزگەوتدا دەفرۆشرا) ئەوەت فەرموو كە فەرمووت (ئەمەم بۆ ڕوون كەرەوە؟)، پێغەمبەرى خواش ﷺ فەرمووى: ((من بۆ ئەوە ئەم پۆشاكەم پێ نەداوى كە لەبەرى بكەیت))، بۆیە عومەرى كوڕى خەتاب داى بە برایەكى بتپەرستى لە مەككە لەبەرى بكات.

## ٨- بَابُ السِّوَاكِ يَوْمَ الجُمُعَةِ

وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: يَسْتَنُّ[١].

٨٨٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي -أَوْ عَلَى النَّاسِ- لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلاَةٍ»[٢].

## ٨- باسى سیواككردن لە ڕۆژى هەینیدا

ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتى: (((هەر كەسێك ڕۆیشت بۆ نوێژى هەینى با) سیواك بكات)).

---

[١] بڕوانە: ٨٥٨.

[٢] بڕوانە: ٧٢٤٠.

**٨٨٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ئەگەر بارگرانی و ناڕەحەت نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم -یان لەسەر خەڵك-، بێگومان فەرمانم پێ دەکردن بە سیواککردن لەگەڵ هەموو نوێژێك)).**

٨٨٨- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعَيْبُ بْنُ الحَبْحَابِ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْثَرْتُ عَلَيْكُمْ فِي السِّوَاكِ».

**٨٨٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دەربارەی سیواککردن زۆرم پێ وتوون و هانم داون)).**

٨٨٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ وَحُصَيْنٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ[1].

**٨٨٩- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: هەمیشە پێغەمبەر ﷺ کە شەو هەڵدەسا بۆ شەونوێژ، سیواکی دەهێنا بە دەم و ددانیدا.**

## ٩- بابُ مَنْ تَسَوَّكَ بِسِوَاكِ غَيْرِهِ

٨٩٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ بِلَالٍ قَالَ: قَالَ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: دَخَلَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، وَمَعَهُ سِوَاكٌ يَسْتَنُّ بِهِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ لَهُ أَعْطِنِي هَذَا السِّوَاكَ يا عَبْدَ الرَّحْمَنِ. فَأَعْطَانِيهِ، فَقَصَمْتُهُ ثُمَّ مَضَغْتُهُ، فَأَعْطَيْتُهُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَاسْتَنَّ بِهِ وَهْوَ مُسْتَسْنِدٌ إِلَى صَدْرِي[2].

---

[1] بروانە: ٢٤٥.

[2] بروانە: ١٣٨٩، ٣١٠٠، ٣٧٧٤، ٤٤٣٨، ٤٤٤٦، ٤٤٤٩، ٤٤٥٠، ٤٤٥١، ٥٢١٧، ٦٥١٠.

## ٩- باسی کەسێک بە سیواکی کەسێکی دیکە سیواک بکات

٨٩٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﵄ هاتە ماڵەوە و سیواکێکی پێ بوو، دەیهێنا بەدەم و ددانیدا، پێغەمبەری خواش ﷺ سەیری کرد، (عائیشە دەڵێ:) منیش بە عەبدوڕەحمانم وت: عەبدوڕەحمان ئەو سیواکەم بدەرێ، عەبدوڕەحمانیش پێی دام، منیش شکاندم (واتە: شوێنی دەمی عەبدوڕەحمانم شکاند)، پاشان خستمە دەمم و تەڕم کرد، جا دام بە پێغەمبەری خوا ﷺ، هێنای بە دەم و ددانیدا لە کاتێکدا پاڵی دابوو بە سنگی منەوە.

## ١٠- بابُ مَا يُقرَأُ فِي صَلَاةِ الفَجْرِ يَومَ الجُمُعَةِ

٨٩١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ -هُوَ ابْنُ هُرْمُزَ- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الجُمُعَةِ فِي صَلَاةِ الفَجْرِ: ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢ ﴾ السجدة، وَ ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ۝١ ﴾ الإنسان[1].

## ١٠- باسی ئەوەی لە نوێژی بەیانی لە ڕۆژی هەینیدا دەخوێنرێ

٨٩١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە لە ڕۆژی هەینیدا لە نوێژی بەیانیدا: ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢ ﴾، سوورەتی سەجدە و: ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ۝١ ﴾ سوورەتی ئینسانی دەخوێند[2].

---

[1] بڕوانە: ١٠٦٨.

[2] واتە: ئەم دوو سوورەتەی لە دوو ڕکاتەکەی بەیانیدا دەخوێند.

## ١١- بابُ الجُمُعَةِ فِي القُرى وَالمُدُنِ

٨٩٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ العَقَدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ الضُّبَعِيِّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ جُمُعَةٍ جُمِّعَتْ -بَعْدَ جُمُعَةٍ فِي مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ- فِي مَسْجِدِ عَبْدِ القَيْسِ بِجُوَاثَى مِنَ البَحْرَيْنِ[1].

## ١١- باسی (حوکمی) کردنی نوێژی هەینی لە لادێ و شارەکاندا

**٨٩٢- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: یەکەم نوێژی هەینی کرابێ پاش نوێژی هەینی لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە مزگەوتی عەبدولقەیس کرا لە جواسا[2] لە بەحرەین.**

٨٩٣- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنَا سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: ((كُلُّكُمْ رَاعٍ)). وَزَادَ اللَّيْثُ: قَالَ يُونُسُ: كَتَبَ رُزَيْقُ بْنُ حُكَيْمٍ إِلَى ابْنِ شِهَابٍ -وَأَنَا مَعَهُ يَوْمَئِذٍ بِوَادِي القُرَى-: هَلْ تَرَى أَنْ أُجَمِّعَ؟ وَرُزَيْقٌ عَامِلٌ عَلَى أَرْضٍ يَعْمَلُهَا، وَفِيهَا جَمَاعَةٌ مِنَ السُّودَانِ وَغَيْرِهِمْ، وَرُزَيْقٌ يَوْمَئِذٍ عَلَى أَيْلَةَ، فَكَتَبَ ابْنُ شِهَابٍ -وَأَنَا أَسْمَعُ- يَأْمُرُهُ أَنْ يُجَمِّعَ، يُخْبِرُهُ أَنَّ سَالِمًا حَدَّثَهُ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، الإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَمَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا، وَالخَادِمُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ -قَالَ وَحَسِبْتُ أَنْ قَدْ قَالَ: وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي مَالِ أَبِيهِ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ- وَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»[3].

---

[1] بروانە: ٤٣٧١.

[2] دێیەکە لە دێهاتەکانی بەحرەین.

[3] بروانە: ٢٤٠٩، ٢٥٥٤، ٢٥٥٨، ٢٧٥١، ٥١٨٨، ٥٢٠٠، ٧١٣٨.

٨٩٣- زوهری دەڵێ: سالیمی کوڕی عەبدوڵا بۆی گێڕانەوە لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((هەمووتان بەرپرسیارن))، لەیس ئەم زیادەی هێناوە: یونس وتی: ڕوزەیقی کوڕی حوکەیم نامەیەکی نووسی بۆ ئیبنو شیهاب -لەو ڕۆژەدا منیش لەگەڵیدا بووم لە (واد القری[1]-: ئایا ڕات لەسەریەتی من نوێژی هەینی بکەم؟ ڕوزەیقیش زەوییەکی هەبوو کشتوکاڵی تێدا دەکرد، وە کۆمەڵێ زنج و ڕەشپێست و خەڵکی دیکەی لێ بوو، وە ڕوزەیق لەو کاتەدا ئەمیر و کاربەدەستی ئەیلە[2] بوو، ئیبنو شیهابیش بۆی نووسییەوە: -منیش گوێم لێ بوو- فەرمانی پێ کرد کە نوێژی هەینی بکات[3]، وە بۆی گێڕایەوە کە سالیم بۆی گێڕاوەتەوە کە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەمووتان بەرپرسن، وە هەمووتان بەرپرسیارن لە بەرپرسیارییەکەتان، پێشەوا بەرپرسە و بەرپرسیارە لە بەرپرسیارییەتییەکەی، پیاو بەرپرسە لەنێو ماڵ و منداڵیدا و بەرپرسیارە لە بەرپرسیارییەتییەکەی، وە ئافرەت شوانە لە ماڵی مێردەکەیدا و بەرپرسیارە لە بەرپرسیارییەتییەکەی، بەردەست و خزمەتکار شوانە لە ماڵی گەورەکەیدا، وە بەرپرسە لە بەرپرسیارییەتییەکەی))، -وتی: وا گومان دەبەم فەرمووی: پیاو شوان و بەرپرسە لە ماڵی باوکیدا و بەرپرسیارە لە بەرپرسیارییەتییەکەی- وە هەریەکەتان بەرپرسە، وە بەرپرسیارە لە بەرپرسیارییەتییەکەی)).

---

[1] شوێنێکە لە دەوروبەری مەدینە. إرشاد الساري: ٥٦٤/٢.

[2] شارێک بووە لەسەر ڕێگای شام لە نێوان مەدینە و میصردا.

[3] واتە: لەو شوێنەی زەوییەکەی خۆی لێ بوو لە دێهات بوو، نەک لە شارەکە، چونکە لە شاردا پرسیاری ناوێ و دروستە.

## ١٢- بابٌ: هَلْ عَلَى مَنْ لَمْ يَشْهَدِ الجُمُعَةَ غُسْلٌ مِنَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ وَغَيرِهِمْ؟

وَقَالَ ابنُ عُمَرَ:إِنَّمَا الغُسْلُ عَلَى مَنَ تَجبُ عَلَيْهِ الجُمُعَةُ.

٨٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ جَاءَ مِنْكُمُ الجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ»[1].

## ١٢- باسێک: ئایا ئەوانەی ئامادەی نوێژی هەینی نابن[2] لە ئافرەتان و منداڵان و کەسانی دیکە پێویستە خۆیان بشۆن؟

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی تەنها لەسەر ئەو کەسانە پێویستە کە نوێژی هەینییان لەسەرە.**

**٨٩٤- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەر یەك لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات)).**

٨٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «غُسْلُ يَوْمِ الجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ»[3].

---

[1] بڕوانە: ٨٧٧.

[2] واتە: نوێژی هەینی فەڕز نییە لەسەریان، بەڵام دروستە نوێژی هەینی بکەن.

[3] بڕوانە: ٨٥٨.

**٨٩٥- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو کەسێکی (موسوڵمانی) باڵغ)).**

٨٩٦- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ:حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ القِيَامَةِ، أُوتُوا الكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ، فَهَذَا اليَوْمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ فَهَدَانَا اللَّهُ، فَغَدًا لِلْيَهُودِ وَبَعْدَ غَدٍ لِلنَّصَارَى». فَسَكَتَ[١].

**٨٩٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئێمە کۆتاهەمین ئوممەتین (لە دونیادا)، پێشەنگین لە (چوونەبەهەشت لە) ڕۆژی دواییدا، ئەوان لەپێش ئێمەدا پەڕاویان پێ دراوە، ئێمە لەپاش ئەوان پێمان دراوە، ئەم ڕۆژی هەینییە ئەو ڕۆژەیە ئەوان جیاواز بوون دەربارەی، جا خوا ڕێنموونی ئێمەی کرد بۆی و نیشانی داین، جا سبەینێ ڕۆژی جوولەکەیە و دوو سبەی ڕۆژی گاورەکانە))، ئینجا بێدەنگ بوو.**

٨٩٧- ثُمَّ قَالَ: «حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا، يَغْسِلُ فِيهِ رَأْسَهُ وَجَسَدَهُ»[٢].

**٨٩٧- پاشان فەرمووی: ((هەق و پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك لە هەموو هەفتەیەکدا ڕۆژێك خۆی بشوات، لەو ڕۆژەدا سەری و لاشەی بشوات)).**

---

[١] بڕوانە: ٢٣٨.

[٢] بڕوانە: ٨٩٨، ٣٤٨٧.

٨٩٨- رَوَاهُ أَبَانُ بْنُ صَالِحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لِلَّهِ تَعَالَى عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ حَقٌّ أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا»[1].

**٨٩٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مافی خوای بەرز و بڵندە بەسەر هەموو موسوڵمانێکەوە کە لە هەفتەیەکدا ڕۆژێك خۆی بشوات)).**

## ١٣- بابٌ

٨٩٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ائْذَنُوا لِلنِّسَاءِ بِاللَّيْلِ إِلَى المَسَاجِدِ»[2].

## ١٣- باسێک

**٨٩٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بەشەو ڕێگە بدەن بە ئافرەتان بۆ ڕۆیشتن بۆ مزگەوتەکان)).**

٩٠٠- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَتِ امْرَأَةٌ لِعُمَرَ تَشْهَدُ صَلَاةَ الصُّبْحِ وَالعِشَاءِ فِي الجَمَاعَةِفِي المَسْجِدِ، فَقِيلَ لَهَا لِمَ تَخْرُجِينَ وَقَدْ تَعْلَمِينَ أَنَّ عُمَرَ يَكْرَهُ ذَلِكَ وَيَغَارُ؟ قَالَتْ وَمَا يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْهَانِي؟ قَالَ: يَمْنَعُهُ قَوْلُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ مَسَاجِدَ اللَّهِ»[3].

**٩٠٠- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: خێزانێکی عومەر ئامادەی نوێژی بەیانی و عیشا دەبوو بەجەماعەت لە مزگەوتدا، جا پێی وترا: بۆ لە ماڵ**

---

[1] بروانە: ٨٩٧.

[2] بروانە: ٨٦٥.

[3] بروانە: ٨٦٥.

دەردەچی بۆ مزگەوت، لە کاتێکدا دەزانی کە عومەر ئەوەی پێ ناخۆشە و غیرە دەیگرێ؟ وتی: چی ڕێگریەتی قەدەغەی چوون بۆ مزگەوتم لێ بکات؟ وتی: ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگری دەکات کە دەفەرمووێ: ((ئافرەتانی خوا ڕێگری مەکەن لە ماڵەکانی خوا)).

## ١٤- بَابُ الرُّخْصَةِ إِنْ لَمْ يَحْضُرِ الجُمُعَةَ فِي المَطَرِ

٩٠١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الحَمِيدِ صَاحِبُ الزِّيَادِيِّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الحَارِثِ ابْنُ عَمِّ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ لِمُؤَذِّنِهِ فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ إِذَا قُلْتَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. فَلاَ تَقُلْ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ. قُلْ: صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ. فَكَأَنَّ النَّاسَ اسْتَنْكَرُوا، قَالَ: فَعَلَهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي، إِنَّ الجُمُعَةَ عَزْمَةٌ، وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أُخْرِجَكُمْ، فَتَمْشُونَ فِي الطِّينِ وَالدَّحْضِ[1].

## ١٤- باسی مۆڵەتدان ئەگەر (نوێژکەر) ئامادەی نوێژی هەینی نەبێت لە باراندا

٩٠١- عەبدوڵای کوڕی حاریس کە برازای موحەممەدی کوڕی سیرینە دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە ڕۆژێکی باراندا بەبانگبێژەکەی وت: کە وتت (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، مەڵێ: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)، واتە: وەرن بۆ نوێژ، بەڵکوو بڵێ: (صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ)، واتە: نوێژەکەتان لە ماڵەوە بکەن، جا وەك ئەوەی بڵێی خەڵك ئەمەیان پێ ڕاست و دروست نەبوو، عەبدوڵا وتی: کەسێك کە لە من چاکترە کردوویەتی (واتە: پێغەمبەر ﷺ)، بێگومان نوێژی هەینی فەرز و گرنگە

---

[1] بروانە: ٦١٦.

(له كاتی ئاساييدا)، بەڵام بەڕاستی پێم ناپەسەند بوو له ماڵ دەربچن و به نێو قوڕو ليتەدا بێن بۆ مزگەوت.

## ١٥- بابٌ: مِنْ أَيْنَ تُؤْتَى الْجُمُعَةُ وَعَلَى مَنْ تَجِبُ؟

لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ ﴿٩﴾﴾ الجمعة، وقَالَ عَطَاءٌ: إِذَا كُنْتَ فِي قَرْيَةٍ جَامِعَةٍ، فَنُودِيَ بِالصَّلاَةِ مِنْ يَوْمِ الجُمُعَةِ، فَحَقٌّ عَلَيْكَ أَنْ تَشْهَدَهَا، سَمِعْتَ النِّدَاءَ أَوْ لَمْ تَسْمَعْهُ. وَكَانَ أَنَسٌ فِي قَصْرِهِ أَحْيَانًا يُجَمِّعُ وَأَحْيَانًا لاَ يُجَمِّعُ، وَهْوَ بِالزَّاوِيَةِ عَلَى فَرْسَخَيْنِ.

٩٠٢- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ الحَارِثِ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي جَعْفَرٍ أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ جَعْفَرِ بْنِ الزُّبَيْرِ حَدَّثَهُ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ- قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ يَنْتَابُونَ يَوْمَ الجُمُعَةِ مِنْ مَنَازِلِهِمْ وَالعَوَالِي، فَيَأْتُونَ فِي الغُبَارِ، يُصِيبُهُمُ الغُبَارُ وَالعَرَقُ، فَيَخْرُجُ مِنْهُمُ العَرَقُ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِنْسَانٌ مِنْهُمْ وَهْوَ عِنْدِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ أَنَّكُمْ تَطَهَّرْتُمْ لِيَوْمِكُمْ هَذَا»[1].

## ١٥- باسێک: له چ جێگایەکەوە دەبێ (نوێژکەر) بێت بۆ نوێژی هەینی، وە لەسەر کێ فەڕزە؟

(هاتن بۆ نوێژی هەینی فەڕزە) بەبەڵگەی ئەم فەرمايیشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەگەر بانگ درا بۆ نوێژ(ی هەینی) له ڕۆژی هەینیدا ...)، وە عەتاو دەڵێ: ئەگەر تۆ له شارێکدا بووی و له ڕۆژی هەینیدا بانگ درا بۆ نوێژی هەینی، ئەوە پێویستە لەسەرت ئامادەی نوێژی هەینی بيت، گوێت له بانگ بێ،

[1] بڕوانە: ٩٠٣، ٢٠٧١.

یان گوێت لێ نەبێ. وە ئەنەس ﷺ لە خانووەکەی خۆی کە لە زاوییە بوو، دوو فەرسەخ (لە بەسرەوە) دوور بوو، هەندێ جار نوێژی هەینی دەکرد (لەگەڵ ئەوانەی لەوێ بوون)، وە هەندێ جار نەیدەکرد (لە بەسرە دەیکرد).

٩٠٢- عائیشەی ﷺ -خێزانی پێغەمبەر ﷺ- دەڵێ: خەڵکی بەنۆرە لە ماڵ و دێهاتەکانی ڕۆژهەڵاتی مەدینەوە دەهاتن (بۆ نوێژ) لە ڕۆژی هەینیدا، جا بە نێو تەپوتۆزدا دەهاتن، تەپوتۆزاوی دەبوون و عارەقیان دەکرد، جا لاشەیان عارەقی دەردەدا، ئینجا لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی من بوو، پیاوێکیان هات بۆ خزمەتی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خۆزگە ئێوە بۆ ئەم ڕۆژەتان خۆتان بشۆردایە)).

## ١٦- بابٌ: وَقْتُ الجُمُعَةِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ

وَكَذَلِكَ يُرْوى عَنْ عُمَرَ وَعَلِيٍّ وَالنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ وَعَمْرِو بْنِ حُرَيْث ﷺ.

٩٠٣- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ أَنَّهُ سَأَلَ عَمْرَةَ عَنِ الغُسْلِ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَقَالَتْ: قَالَت عَائِشَةُ ﷺ: كَانَ النَّاسُ مَهَنَةَ أَنْفُسِهِمْ، وَكَانُوا إِذَا رَاحُوا إِلَى الجُمُعَةِ رَاحُوا فِي هَيْئَتِهِمْ فَقِيلَ لَهُمْ: لَوِ اغْتَسَلْتُمْ[1].

## ١٦- باسێک: کە خۆر لای دا لە نێوەڕاستی ئاسمان کاتی نوێژی هەینییە

هەر ئاوا گێڕدراوەتەوە لە عومەر و عەلی و نوعمانی کوڕی بەشیر و عەمری کوڕی حومێریس ﷺ.

[1] بڕوانە: ٩٠٢.

**٩٠٣- عەبدوڵا وتی: یەحیای کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە کە خۆی پرسیاری لە عەمرەت کرد دەربارەی خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی، عەمرەتیش وتی: عائیشە ﵂ وتی: جاران خەڵك خۆیان خزمەتی خۆیانیان دەکرد، وە ئەوان کە دەڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی هەر بەو جلوبەرگ و شێوەیانەوە دەڕۆیشتن، بۆیە پێیان وترا: ((خۆزگە خۆتان بشۆردایە))، (بەم عارەق و پیسییەوە نەهاتنایە).**

٩٠٤- حَدَّثَنَا سُرَيْجُ بْنُ النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الجُمُعَةَ حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ.

**٩٠٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ئەو کاتە نوێژی هەینی دەکرد، کە خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لای دەدا.**

٩٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كُنَّا نُبَكِّرُ بِالجُمُعَةِ، وَنَقِيلُ[1] بَعْدَ الجُمُعَةِ[2].

**٩٠٥- ئەنەس ﵁ دەڵێ: ئێمە نوێژی هەینیمان زوو لە سەرەتای کاتەکەیەوە دەکرد، پاش نوێژی هەینی کەمێك دەخەوتین.**

## ١٧- بابٌ: إِذَا اشْتَدَّ الحَرُّ يَومَ الجُمُعَةِ

٩٠٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ المُقَدَّمِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا حَرَمِيُّ بْنُ عُمَارَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو خَلْدَةَ -هُوَ: خَالِدُ بْنُ دِينَارٍ- قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا اشْتَدَّ

[1] نَقِيلُ: کاری تێنەپەڕە و چاوگەکەی (القیلولة)یە، واتە: نوستنی قرچەی نیوەڕۆ. بڕوانە: ئەلمونجید بە کوردی: ٢٣٩/٤.

[2] بڕوانە: ٩٤٠.

البَرْدُ بَكَّرَ بِالصَّلاَةِ، وَإِذَا اشْتَدَّ الحَرُّ أَبْرَدَ بِالصَّلاَةِ، يَعْنِي: الجُمُعَةَ. قَالَ يُونُسُ بْنُ بُكَيْرٍ: أَخْبَرَنَا أَبُو خَلْدَةَ فَقَالَ: بِالصَّلاَةِ، وَلَمْ يَذْكُرِ الجُمُعَةَ. وَقَالَ بِشْرُ بْنُ ثَابِتٍ: حَدَّثَنَا أَبُو خَلْدَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا أَمِيرٌ الجُمُعَةَ ثُمَّ قَالَ لأَنَسٍ ﷺ: كَيْفَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الظُّهْرَ؟ .

## ١٧- باسێک: ئەگەر لە ڕۆژی هەینیدا گەرمای بەتین بوو

**٩٠٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: هەمیشە پێغەمبەر ﷺ کاتێ زۆر سارد بووایە، لە سەرەتای کاتەوە نوێژی دەکرد، وە کاتێ زۆر گەرم بووایە، نوێژی (دوا دەخست و) بەفێنکی دەیکرد، -مەبەستی نوێژی هەینی بوو-. یونسی کوڕی بوکەیر دەڵێ: ئەبو خەلدە بۆی گێڕاینەوە وتی: بە نوێژکردن، باسی هەینی نەکرد. وە بیشری کوڕی سابیت دەڵێ: ئەبو خەلدە بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەمیرێك پێشنوێژی هەینی بۆ کردین، پاشان بە ئەنەسی ﷺ وت: چۆن پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد؟[1]**

## ١٨- بابُ المَشْيِ إِلَى الجُمُعَةِ

وَقَوْلِ اللَّهِ: ﴿ فَاسْعَوْا إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ ﴿٩﴾ ﴾ الجمعة، وَمَنْ قَالَ: السَّعْيُ: العَمَلُ وَالذَّهَابُ، لِقَوْلِهِ الله تَعَالَى: ﴿ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا ﴿١٩﴾ ﴾ الإسراء، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَحْرُمُ البَيْعُ حِينَئِذٍ. وَقَالَ عَطَاءٌ: تَحْرُمُ الصِّنَاعَاتُ كُلُّهَا، وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: إِذَا أَذَّنَ المُؤَذِّنُ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَهْوَ مُسافر فَعَلَيْهِ أَنْ يَشْهَدَ.

---

[1] وەک بڵێی: ئەم فەرموودەیە لە جوابی ئەو ئەمیرەدا وترابێ.

٩٠٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَايَةُ بْنُ رِفَاعَةَ قَالَ: أَدْرَكَنِي أَبُو عَبْسٍ وَأَنَا أَذْهَبُ إِلَى الجُمُعَةِ فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ»[1].

## ١٨- باسی بەپیادە ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی

**وە باسی ئەم فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند: (دەی بەپەلە بەپیادە بڕۆن بۆ نوێژی هەینی)، ئەوەش کە دەڵێ: وشەی (السَّعْيُ) کار و ڕۆیشتنە، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە: (کار و کۆششی شیاوی خۆی بۆ دەکات). وە عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: کڕین و فرۆشتن لەو کاتەدا (کاتی ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی) حەڕامە. عەتاو دەڵێ: هەموو پیشەسازییەك (لەو کاتەدا) حەڕامە. ئیبراهیمی کوڕی سەعد لە زوهرییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەگەر لە ڕۆژی هەینیدا بانگبێژەکە بانگی دا، کەسێك لەو کاتەدا گەشتیار بوو، ئەوە پێویستە لەسەری ئامادەی نوێژی هەینی بێت (پاشان سەفەرەکەی بکات).**

**٩٠٧- عەبایەی کوڕی ڕیفاعە دەڵێ: ئەبو عەبسم پێ گەشت لە کاتێکدا دەڕۆیشتم بۆ نوێژی هەینی، جا وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەو کەسەی پێیەکانی لەپێناوی خوا تۆزاوی ببن، ئەوە خوا چوونەئاگری دۆزەخی لێ قەدەغە دەکات)).**

٩٠٨- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: عَنْ سَعِيدٍ وَأَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَحَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ[2] قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا

[1] بڕوانە: ٢٨١١.

[2] ئیمام بوخاری ئەم فەرموودەیەی بە دوو سەنەد هێناوە.

أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَأْتُوهَا تَسْعَوْنَ، وَأْتُوهَا تَمْشُونَ عَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا»[1].

**٩٠٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ (و نوێژ دابەسترا)، ئەوە بەپەلە مەڕۆن بۆ نوێژکردن، بەڵکوو بەئاسایی بڕۆن لەسەرخۆ و ئارام بن، جا ئەوەی فریا کەوتن لە نوێژەکە بیکەن، ئەوەشی فریا نەکەوتن، (دوای سەلامدانەوەی ئیمام) خۆتان تەواوی بکەن)).**

٩٠٩- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو قُتَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ -لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ عَنْ أَبِيهِ- عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي، وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ»[2].

**٩٠٩- عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە -(ئیمام بوخاری دەڵێ:) ئەوەندەی من بزانم لە باوکیەوە دەیگێڕێتەوە- ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((هەڵمەستن (بۆ نوێژ) هەتا من دەبینن، وە لەسەرخۆ و ئارام بن)).**

## ١٩- بابٌ: لاَ يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

٩١٠- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ وَدِيعَةَ، عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ

---

[1] بڕوانە: ٦٣٦.

[2] بڕوانە: ٦٣٧.

الجُمُعَةِ، وَتَطَهَّرَ بِمَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، ثُمَّ ادَّهَنَ أَوْ مَسَّ مِنْ طِيبٍ، ثُمَّ رَاحَ فَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ، فَصَلَّى مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ إِذَا خَرَجَ الإِمَامُ أَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الجُمُعَةِ الأُخْرَى»[١].

## ١٩- باسێک: لە ڕۆژی هەینیدا (مرۆڤ) دوو کەس لە یەکدی جیا نەکاتەوە (و بەزۆر بڕواتە نێوانیانەوە)

**٩١٠- سەلمانی فارسی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس لە ڕۆژی هەینیدا خۆی بشوات، وە چەندە بتوانێ خۆی پاکوخاوێن بکاتەوە، پاشان ڕۆن بدات (لە سەر و ڕیشی)، یان بۆنی خۆش لە خۆی بدات، پاشان بڕوات (بۆ نوێژی هەینی)، وە دوو کەس جیا نەکاتەوە (و لە نێوانیاندا دانیشێت)، پاشان ئەوەندەی بۆی نووسراوە نوێژی سوننەت بکات، پاشان کە وتارخوێن دەستی بە وتار کرد بێدەنگ بێ، ئەوە خوا لە گوناهی نێوان ئەو هەینییە تا هەینی داهاتووی خۆش دەبێ)).**

## ٢٠- بابٌ: لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ أَخَاهُ يَومَ الجُمُعَةِ وَيَقْعُدُ فِي مَكَانِهِ

٩١١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَخْلَدُ بْنُ يَزِيدَ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: سَمِعْتُ نَافِعًا يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُقِيمَ الرَّجُلُ أَخَاهُ مِنْ مَقْعَدِهِ وَيَجْلِسَ فِيهِ. قُلْتُ لِنَافِعٍ: الجُمُعَةَ؟ قَالَ: الجُمُعَةَ وَغَيْرَهَا[٢].

---

[١] بڕوانە: ٨٨٣.

[٢] بڕوانە: ٦٢٦٩، ٦٢٧٠.

## ٢٠- باسێک: لە ڕۆژی هەینیدا پیاو براکەی هەڵنەستێنێ و خۆی لە جێگاکەی دانیشێت

**٩١١- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە پیاو براکەی لە شوێنی دانیشتنەکەیدا هەستێنێ، وە خۆی لە شوێنیدا دانیشێت، ئینو جورەیج دەڵێ: بە نافیعم وت: تەنها لە ڕۆژی هەینیدا؟ وتی: لە هەینی و ڕۆژەکانی دیکەشدا.**

## ٢١- بابُ الأَذَانِ يَومَ الجُمُعَةِ

٩١٢- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كَانَ النِّدَاءُ يَوْمَ الجُمُعَةِ أَوَّلُهُ إِذَا جَلَسَ الإِمَامُ عَلَى المِنْبَرِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ ﷺ، فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ ﷺ وَكَثُرَ النَّاسُ زَادَ النِّدَاءَ الثَّالِثَ عَلَى الزَّوْرَاءِ[1]. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: الزَّوْرَاءُ: مَوْضِعٌ بِالسُّوقِ بِالْمَدِينَةِ.

## ٢١- باسی کاتی بانگدان لە ڕۆژی هەینیدا

**٩١٢- سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: کاتی خۆی بانگدانی ڕۆژی هەینی لە سەرەتادا لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەردا ﷺ لەو کاتەدا بوو کە وتارخوێن لەسەر مینبەر دادەنیشت، بەڵام لە سەردەمی عوسماندا خەڵکی زۆر بوون، بۆیە بانگی سێیەمی[2] زیاد کرد، (کە بانگەکە) لەسەر زەوڕا (دەدرا). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: زەوڕا شوێنێك بوو لە بازاڕی مەدینە.**

---

[1] بڕوانە: ٩١٣، ٩١٥، ٩١٦.

[2] بۆیە بە سێیەم ناوی بردووە، چونکە بانگ و قامەتی بە دوو بانگ داناوە، بە زیادکراوەکەوە دەبێتە سێیەم.

## ٢٢- بابُ المُؤَذِّنِ الوَاحِدِ يَوْمَ الجُمُعَةِ

٩١٣- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ الْمَاجِشُونُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، أَنَّ الَّذِي زَادَ التَّأْذِينَ الثَّالِثَ يَوْمَ الجُمُعَةِ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ حِينَ كَثُرَ أَهْلُ المَدِينَةِ، وَلَمْ يَكُنْ لِلنَّبِيِّ ﷺ مُؤَذِّنٌ غَيْرَ وَاحِدٍ، وَكَانَ التَّأْذِينُ يَوْمَ الجُمُعَةِ حِينَ يَجْلِسُ الإِمَامُ، يَعْنِي عَلَى المِنْبَرِ[1].

## ٢٢- باسی نوێژی هەینی یەك بانگبێژی هەبووە

**٩١٣- سائیبی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە: بێگومان ئەو کەسەی بانگدانی سێیەمی زیاد کرد لە ڕۆژی هەینیدا، عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بوو، کاتێ خەڵکی مەدینە زۆر بوون، وە پێغەمبەر ﷺ تەنها یەك بانگبێژی هەبوو (بۆ نوێژی هەینی)، بانگدانیش لە ڕۆژی هەینی لەو کاتەدا بوو وتارخوێن دادەنیشت، -واتە: لەسەر دوانگە-.**

## ٢٣- بابٌ: يُجِيبُ الإِمَامُ عَلَى المِنْبَرِ إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ

٩١٤- حَدَّثَنَا ابْنُ مُقَاتِلٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عُثْمَانَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ، وَهُوَ جَالِسٌ عَلَى المِنْبَرِ، أَذَّنَ المُؤَذِّنُ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ. قَالَ مُعَاوِيَةُ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ. قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ. فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: وَأَنَا. فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ. فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: وَأَنَا. فَلَمَّا أَنْ قَضَى التَّأْذِينَ قَالَ:يا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى هَذَا المَجْلِسِ حِينَ أَذَّنَ المُؤَذِّنُ، يَقُولُ مَا سَمِعْتُمْ مِنِّي مِنْ مَقَالَتِي[2].

---

[1] بروانە: ٩١٢.

[2] بروانە: ٦١٢.

## ٢٣- باسێک: وتارخوێن لەسەر دوانگە وەڵامی بانگبێژ دەداتەوە کاتێ گوێی لە بانگ بوو

**٩١٤- سەهلی کوڕی حونەیف دەڵێ: گوێم لەموعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو، لە کاتێکدا دانیشتبوو لەسەر دوانگە، بانگبێژەکە بانگی دا وتی:** (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ)، **موعاویەش وتی:** (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ)، **بانگبێژەکە وتی:** (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، **موعاویەش وتی: منیش هەمان شایەتی دەدەم، بانگبێژەکە وتی:** (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، **موعاویەش وتی: منیش هەمان شایەتی دەدەم، جا کاتێ بانگبێژەکە بانگەکەی تەواو کرد، موعاویە وتی: ئەی خەڵکینە بێگومان من خۆم ئا لەم شوێنەدا لە پێغەمبەرم ﷺ بیست، کاتێ بانگبێژەکە بانگی دا ئەوەی دەفەرموو کە لە منتان بیست وتم (بەدوای بانگبێژەکەدا).**

## ٢٤- بابُ الجُلُوسِ عَلَى المِنْبَرِ عِنْدَ التَّأْذِينِ

٩١٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ التَّأْذِينَ الثَّانِيَ يَوْمَ الجُمُعَةِ أَمَرَ بِهِ عُثْمَانُ حِينَ كَثُرَ أَهْلُ المَسْجِدِ، وَكَانَ التَّأْذِينُ يَوْمَ الجُمُعَةِ حِينَ يَجْلِسُ الإِمَامُ[1].

## ٢٤- دانیشتنی (پێشنوێژ) لەسەر مینبەر لە کاتی بانگدان (سوننەتە)

**٩١٥- سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: بانگدانی دووەمی ڕۆژی هەینی کە عوسمان ﷺ فەرمانی کرد بدرێ، کاتێك بوو خەڵکی مزگەوت زۆر بوون، وە بانگدانەکەی ڕۆژی هەینی لە کاتێکدا بوو کە پێشنوێژ (لەسەر دوانگە) دادەنیشت.**

---

[1] بڕوانە: ٩١٢.

## ٢٥- باب التَّأْذِينِ عِنْدَ الخُطْبَةِ

٩١٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ يَقُولُ: إِنَّ الأَذَانَ يَوْمَ الجُمُعَةِ كَانَ أَوَّلُهُ حِينَ يَجْلِسُ الإِمَامُ يَوْمَ الجُمُعَةِ عَلَى المِنْبَرِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ ﵄، فَلَمَّا كَانَ فِي خِلاَفَةِ عُثْمَانَ ﵁ وَكَثُرُوا، أَمَرَ عُثْمَانُ يَوْمَ الجُمُعَةِ بِالأَذَانِ الثَّالِثِ، فَأُذِّنَ بِهِ عَلَى الزَّوْرَاءِ، فَثَبَتَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ[1].

## ٢٥- باسی بانگدان له كاتی وتاردانددا

**٩١٦- سائیبی كوڕی یەزید دەڵێ: بێگومان بانگدانی ڕۆژی هەینی سەرەتاكەی لەو كاتەدا بوو، كە پێشنوێژ لە ڕۆژی هەینیدا لەسەر دوانگە دادەنیشت لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەكر و عومەردا ﵄، جا لە خیلافەتی عوسماندا خەڵكی زۆر بوون، عوسمان فەرمانی كرد بە بانگدانی سێیەم لە ڕۆژی هەینیدا، جا ئەو بانگە لەسەر زەوڕا درا، ئیدی ئەو بانگدانە بەردەوام بوو مایەوە.**

## ٢٦- بابُ الخُطْبَةِ عَلَى المِنْبَرِ

قَالَ أَنَسٌ: خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى المِنْبَرِ.

٩١٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدٍ القَارِيُّ القُرَشِيُّ الإِسْكَنْدَرَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمِ بْنُ دِينَارٍ، أَنَّ رِجَالًا أَتَوْا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ، وَقَدِ امْتَرَوْا فِي المِنْبَرِ مِمَّ عُودُهُ، فَسَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْرِفُ مِمَّا هُوَ، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَوَّلَ يَوْمٍ وُضِعَ، وَأَوَّلَ يَوْمٍ جَلَسَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى فُلاَنَةَ -

---

[1] بڕوانە: ٩١٢.

امْرَأَةٍ قَدْ سَمَّاهَا سَهْلٌ-: «مُرِي غُلاَمَكِ النَّجَّارَ أَنْ يَعْمَلَ لِي أَعْوَادًا أَجْلِسُ عَلَيْهِنَّ إِذَا كَلَّمْتُ النَّاسَ». فَأَمَرَتْهُ، فَعَمِلَهَا مِنْ طَرْفَاءِ الغَابَةِ ثُمَّ جَاءَ بِهَا، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَ بِهَا فَوُضِعَتْ هَا هُنَا، ثُمَّ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى عَلَيْهَا، وَكَبَّرَ وَهُوَ عَلَيْهَا، ثُمَّ رَكَعَ وَهُوَ عَلَيْهَا، ثُمَّ نَزَلَ القَهْقَرَى فَسَجَدَ فِي أَصْلِ المِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ، فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا صَنَعْتُ هَذَا لِتَأْتَمُّوا وَلِتَعَلَّمُوا صَلاَتِي»[1].

## ٢٦- باسی (ڕەوایەتی) وتاردان لەسەر دوانگە

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگە وتاری دا.**

**٩١٧- ئەبو حازیمی کوڕی دینار دەگێڕێتەوە کە چەند کەسێك هاتن بۆ لای سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ، دەمەقاڵێیان بوو کە داری دوانگەکە (ی پێغەمبەر ﷺ) لە چی بوو، جا لەو بارەیەوە پرسیاریان لێ کرد؟ ئەویش وتی: سوێند بە خوا بێگومان من دەزانم دوانگەکە لە چی بوو، وە بێگومان بینیم لە یەکەم ڕۆژەوە دانرا، وە یەکەم ڕۆژ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری دانیشت (ئامادە بووم)، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ لای فلانە ئافرەت -ئافرەتێك بوو کە سەهل ناوەکەی برد-، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فەرمان بکە بە غوڵامە دارتاشەکەت لە چەند دارێك دوانگەیەکم بۆ دروست بکات، بۆ ئەوەی کاتێ وتار دەدەم بۆ خەڵك لەسەری دابنیشم))، ئافرەتەکەش فەرمانی کرد بە غوڵامەکەی، ئەویش لە (طَرْفَاءِ الغَابَةِ)[2] دروستی کرد، پاشان دوانگەکەی هێنا، جا ئافرەتەکە**

---

[1] بروانە: ٣٧٧.

[2] طَرْفَاءِ: جۆرە دارێکی بیابانە. الغَابَةِ: شوێنێکە لە عەوالی مەدینە، کە ئەو کاتە لە دەرەوەی مەدینە بوو، ئێستا بەشێکە لە مەدینە، ماناکەی بەم جۆرەی لێ دێت: لە دارێکی بیابانی دوانگەکەی دروست کرد، ئەو دارە لە شوێنێک هەبوو کە ناوی غابە بوو لە عەوالی مەدینە.

کەسێکی نارد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ (کە دوانگەکە تەواو بووە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد، (هێنرا و) ئا لەوێدا دانرا، پاشان پێغەمبەرم ﷺ بینی نوێژی لەسەر کرد، وە الله أكبرى کرد لەسەری، پاشان کڕنووشی برد و هەر لەسەری بوو، پاشان بە پشتا گەڕایە دواوە و دابەزی، لەسەر زەوی لەبنی دوانگەکەدا سوژدەی برد، پاشان گەڕایەوە (شوێنی خۆی لەسەر دوانگەکە)، جا کە لە نوێژەکە بۆیەوە، ڕووی لە خەڵکەکە کرد و فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە! بێگومان بۆیە ئەمەم کرد تا پەیڕەویم لێ بکەن، وە شێوەی نوێژکردنی من بزانن)).

٩١٨- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَنَسٍ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ جِذْعٌ يَقُومُ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا وُضِعَ لَهُ المِنْبَرُ سَمِعْنَا لِلْجِذْعِ مِثْلَ أَصْوَاتِ العِشَارِ، حَتَّى نَزَلَ النَّبِيُّ ﷺ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهِ. قَالَ سُلَيْمَانُ: عَنْ يَحْيَى، أَخْبَرَنِي حَفْصُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسٍ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا[1].

٩١٨- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەگێڕێتەوە کە بنە دارخورمایەك هەبوو پێغەمبەر ﷺ لەلایدا دەوەستا و پاڵی پێوە دەدا، جا کاتێ دوانگەیان بۆ دانا (و لەسەری وتاری دەدا)، ئەو بنە دارخورمایە دەنگێکی لێوە دەهات، وەك قۆڕەی وشتری ئاوس (بێدەنگ نەدەبوو)، هەتا پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگەکە دابەزی و دەستی خستە سەری (جا بێدەنگ بوو). (ئەم وتەی جابیر بەم ڕێگەیەش گێڕدراوەتەوە): سولەیمان لە یەحیاوە دەیگێڕێتەوە دەڵێ: حەفصی کوڕی عوبەیدوڵای کوڕی ئەنەس بۆی گێڕامەوە کە ئەو (ئەم فەرموودەیەی) لە جابیر بیستووە.

---

[1] بڕوانە: ٤٤٩.

٩١٩- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: «مَنْ جَاءَ إِلَى الجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ»[1].

**٩١٩- سالیم له(عەبدوڵای) باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوێم له پێغەمبەر ﷺ بوو لەسەر دوانگە وتاری دەدا و فەرمووی: ((هەر کەس هات بۆ نوێژی هەینی، با خۆی بشوات)).**

## ٢٧- بابُ الخُطْبَةِ قائمًا

وَقَالَ أَنَسٌ: بَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ قَائِمًا.

٩٢٠- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ القَوَارِيرِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ قَائِمًا، ثُمَّ يَقْعُدُ، ثُمَّ يَقُومُ، كَمَا تَفْعَلُونَ الآنَ[2].

## ٢٧- باسی وتاردان بەپێوە[3]

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: له کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ بەپێوە وەستابوو وتاری دەدا.**

**٩٢٠- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەپێوە دەوەستا وتاری دەدا، پاشان دادەنیشت، ئینجا هەڵدەسایەوە بەو شێوەی ئێستا ئێوە وتار دەدەن.**

---

[1] بڕوانە: ٨٧٧.

[2] بڕوانە: ٩٢٨.

[3] واتە: دەبێ وتارخوێن له کاتی وتارداندا بەپێوە ڕاوەستێ و نابێ دابنیشێت، مەگەر نەتوانێت و عوزرێکی هەبێت. إرشاد الساري: ٢/٥٩٢.

## ٢٨- بَابٌ: يَسْتَقْبِلُ الإِمَامُ القَوْمَ وَاسْتِقْبَالِ النَّاسِ الإِمَامَ إِذَا خَطَبَ

وَاسْتَقْبَلَ ابْنُ عُمَرَ وَأَنَسٌ الإِمَامَ.

٩٢١- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ هِلَالِ بْنِ أَبِي مَيْمُونَةَ، حَدَّثَنَا عَطَاءُ بْنُ يَسَارٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَلَسَ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى المِنْبَرِ وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ[١].

## ٢٨- باسێک:پێشنوێژ ڕوو دەکاتە خەڵکەکە، خەڵکەکەش ڕوویان لە پێشنوێژە کاتێک وتار دەدات

**عەبدوڵای کوڕی عومەر و ئەنەس ﷺ ڕوویان دەکردە پێشنوێژ (کاتی وتاردان).**

**٩٢١- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکیان لەسەر دوانگە دانیشت، ئێمەش بە چواردەوریدا دانیشتین.**

## ٢٩- بابُ مَنْ قَالَ فِي الخُطْبَةِ بَعْدَ الثَّنَاءِ: أَمَّا بَعْدُ

رَوَاهُ عِكْرِمَةُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٩٢٢- وَقَالَ مَحْمُودٌ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي فَاطِمَةُ بِنْتُ المُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ﷺ وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ قُلْتُ: مَا شَأْنُ النَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا إِلَى السَّمَاءِ. فَقُلْتُ: آيَةٌ؟ فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَيْ نَعَمْ. قَالَتْ: فَأَطَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جِدًّا حَتَّى تَجَلَّانِي الغَشْيُ وَإِلَى جَنْبِي قِرْبَةٌ فِيهَا مَاءٌ، فَفَتَحْتُهَا فَجَعَلْتُ أَصُبُّ مِنْهَا عَلَى رَأْسِي، فَانْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ

---

١ بڕوانە: ١٤٦٥، ٢٨٤٢، ٦٤٢٧.

النَّاسَ، وَحَمِدَ اللَّهَ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ». قَالَتْ وَلَغِطَ نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَانْكَفَأْتُ إِلَيْهِنَّ لأُسَكِّتَهُنَّ فَقُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَا قَالَ؟ قَالَتْ: قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ لَمْ أَكُنْ أُرِيتُهُ إِلَّا قَدْ رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي هَذَا حَتَّى الجَنَّةَ وَالنَّارَ، وَإِنَّهُ قَدْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي القُبُورِ مِثْلَ -أَوْ قَرِيبَ مِنْ- فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ، يُؤْتَى أَحَدُكُمْ، فَيُقَالُ لَهُ: مَا عِلْمُكَ بِهَذَا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا المُؤْمِنُ -أَوْ قَالَ: المُوقِنُ. شَكَّ هِشَامٌ- فَيَقُولُ هُوَ رَسُولُ اللَّهِ، هُوَ مُحَمَّدٌ ﷺ جَاءَنَا بِالبَيِّنَاتِ وَالهُدَى فَآمَنَّا وَأَجَبْنَا وَاتَّبَعْنَا وَصَدَّقْنَا. فَيُقَالُ لَهُ: نَمْ صَالِحًا، قَدْ كُنَّا نَعْلَمُ إِنْ كُنْتَ لَتُؤْمِنُ بِهِ. وَأَمَّا المُنَافِقُ -أَوْ قَالَ: المُرْتَابُ. شَكَّ هِشَامٌ- فَيُقَالُ لَهُ: مَا عِلْمُكَ بِهَذَا الرَّجُلِ؟ فَيَقُولُ: لاَ أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ». قَالَ هِشَامٌ: فَلَقَدْ قَالَتْ لِي فَاطِمَةُ: فَأَوْعَيْتُهُ، غَيْرَ أَنَّهَا ذَكَرَتْ مَا يُغَلِّظُ عَلَيْهِ[1].

## ٢٩- باسی ئەوەی لە وتاردا پاش سوپاس و ستاییشی خوا بڵێ: جا دوای ئەوە دەڵێم

**ئەم فەرموودەیە عیکریمە گێڕاویەتەوە لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

**٩٢٢- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە ﷺ، لەو کاتەدا خەڵکی نوێژیان دەکرد وتم: ئەوە خەڵکی چییانە (بۆچی نوێژ دەکەن)؟ عائیشە بە سەری ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد، منیش وتم: (ئەم خۆرگیرانە) نیشانەیەکە (بۆ ترساندن)؟ عائیشەش بە سەری ئاماژەی کرد -وتی: بەڵێ-، ئەسماو دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر درێژەی بە نوێژەکەی دا، نزیک بوو لەهۆش خۆم بچم، لە تەنیشتمەوە گۆزەیەکی لێ بوو ئاوی تێدا بوو، منیش دەمەکەیم کردەوە لێیەوە دەستم کرد بە ئاوکردن بە سەرمدا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکە**

---

[1] بڕوانە: ٨٦.

بۆیەوە، لەو کاتەدا خۆریش بەدەرکەوت، جا پێغەمبەر ﷺ وتاری دا بۆ خەڵکی، سوپاسی خوای کرد بەجۆرێك شایستەی خوایە، پاشان فەرمووی: ((جا دوای ئەوە دەڵێم:)) ئەسماو دەڵێ: جا چەند ئافرەتێکی ئەنصاری دەنگەدەنگێکیان دەست پێ کرد، منیش ڕۆیشتمە لایان تا بێدەنگیان بکەم، بە عائیشەم وت: چی فەرمووی؟ وتی: فەرمووی: ((ئەوەی کە نیشانم نەدرابوو نیشانم درا، بینیم لەم شوێنەدا کە وەستاوم هەتا بەهەشت و دۆزەخیش، وە بێگومان نیگام بۆ کرا، کە بێگومان ئێوە لەنێو گۆڕەکانتاندا تاقی دەکرێنەوە وەك بەلاَ و تاقیکردنەوەی دەجاله کوێرەکه -یا نزیك لەو-، دێنە لای هەر کام لە ئێوە و پێی دەڵێن: دەربارەی ئەو پیاوە چ زانیارییەکت هەیە؟ جا ئەو کەسەی ئیمانداره -یان فەرمووی باوەڕی پتەوی هەیە، هیشام گومانی بردووە (کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی فەرموودەکە)- دەڵێ: ئەو پیاوە نێردراوی خوایە ئەو - موحەممەدە ئایینی ڕۆشن و ڕێنمایی بۆ هێنابووین، ئێمەش باوەڕمان پێ هێنا و وەلاَمی بانگەوازەکەیمان دایەوە، وە شوێنی کەوتین و بە ڕاستمان زانی، ئینجا پێی دەوترێت: دە بخەوە بەخۆشی، بێگومان ئێمە دەمانزانی کە بەڕاستی تۆ باوەڕی پێ دێنی، بەلاَم ئەو کەسەی کە دووڕووە -یان لە گوماندایە، هیشام گومانی بردووە- پێی دەوترێ: دەربارەی ئەو پیاوە موحەممەد ﷺ چی دەزانی؟ ئەویش دەڵێ: هیچ نازانم! (ئەوە نەبێ) گوێم لێ بووە خەڵك دەربارەی ئەو شتێکیان دەوت، منیش دەموت))، هیشام دەڵێ: جا بەڕاستی فاتیمە (ی کچی مونزیر) ئەم فەرموودەیەی بۆ باس کردم، منیش لەبەرم کرد و هەڵمگرت، جگە لەوەی وتی: (کە پەیوەندی بە سزای دووڕووانەوە هەبوو، من بە درێژی لەبەرم نەکردووە، کورتەکەی ئەوەیە:) لە سزای دۆزەخدا وتەی زبری پێ دەوترێ[1].

---

[1] بڕوانە: الكوثر الجاري في رياض أحاديث البخاري: ٤٢/٣.

٩٢٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ الحَسَنَ يَقُولُ حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِمَالٍ أَوْ سَبْيٍ فَقَسَمَهُ، فَأَعْطَى رِجَالًا وَتَرَكَ رِجَالًا، فَبَلَغَهُ أَنَّ الَّذِينَ تَرَكَ عَتَبُوا، فَحَمِدَ اللَّهَ ثُمَّ أَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، فَوَاللَّهِ إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ، وَأَدَعُ الرَّجُلَ، وَالَّذِي أَدَعُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الَّذِي أُعْطِي وَلَكِنْ أُعْطِي أَقْوَامًا لِمَا أَرَى فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الجَزَعِ وَالهَلَعِ، وَأَكِلُ أَقْوَامًا إِلَى مَا جَعَلَ اللَّهُ فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الغِنَى وَالخَيْرِ، فِيهِمْ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ». فَوَاللَّهِ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِكَلِمَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حُمْرَ النَّعَمِ. تَابَعَهُ يُونُسُ[1].

**٩٢٣- عەمری کوڕی تەغلیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ ماڵ و سامان یان ژن و منداڵی بەدیلگیراویان بۆ هێنا، ئەویش دابەشی کرد، جا بەشی کەسانێکی دا و کەسانێکی بێبەش کرد، ئینجا پێی گەیشتەوە ئەوانەی کە بەشی نەدابوون گلەییان کردبوو، پێغەمبەریش ﷺ (لەسەر مینبەر) سوپاسی خوای کرد، پاشان ستاییشی کرد، پاشان فەرمووی: ((ئینجا دوای ئەوە سوێند بە خوا دڵنیا بن من بەشی کەسێك ماڵ و سامان دەدەم، کەسێکیش بێبەش دەکەم، ئەو کەسەیان لام خۆشەویستترە کە بەشی نادەم لەوەیان کە بەشی دەدەم، بەڵام بەشی کەسانێك دەدەم چونکە دەبینم دڵیان دانەمەزراوە و هەڵپەهەڵپییەتی، وە کەسانێکیش دەسپێرم بەو دەوڵەمەندی و چاکەی کە خوا لە دڵیاندا دروستی کردووە، لەوانە عەمری کوڕی تەغلیب))، عەمر دەڵێ: سوێند بە خوا ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەلامەوە لە پێدانی وشتری سوور خۆشەویستتر بوو. یونسیش ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی جەریری کوڕی حازیم دەکات.**

[1] بڕوانە: ٣١٤٥، ٧٥٣٥.

٩٢٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ ذَاتَ لَيْلَةٍ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي المَسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلاَتِهِ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ فَصَلَّوْا مَعَهُ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا، فَكَثُرَ أَهْلُ المَسْجِدِ مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّوْا بِصَلاَتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ عَجَزَ المَسْجِدُ عَنْ أَهْلِهِ حَتَّى خَرَجَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَلَمَّا قَضَى الفَجْرَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ مَكَانُكُمْ، لَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ فَتَعْجِزُوا عَنْهَا». تَابَعَهُ يُونُسُ[1].

**٩٢٤- عوروە دەڵێ: عائیشە ﵂ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك لە نێوەڕاستی شەودا لە ماڵ ڕۆیشتە دەرەوە، لە مزگەوت نوێژی کرد، جا کەسانێك لەدوایەوە کردیان بە جەماعەت و لەگەڵی نوێژیان کرد، جا کە خەڵك ڕۆژیان لێ بۆیەوە باسیان کرد، جا (بۆ شەوی داهاتوو) خەڵکی زیاتر لەوان کۆ بوونەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژیان کرد، ئینجا خەڵك ڕۆژیان کردەوە بۆ خەڵکیان باس کرد، ئینجا بۆ شەوی سێیەم خەڵکی مزگەوت زۆر بوون، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات و پێشنوێژی بۆ کردن و خەڵك لەگەڵی نوێژیان کردن جا کە شەوی چوارەم هات، مزگەوت خەڵکەکەی نەدەگرت و جێیان نەدەبۆیەوە، (پێغەمبەر ﷺ نەهات) هەتا هات بۆ نوێژی بەیانی، جا کە نوێژی بەیانی تەواو کرد ڕووی کردە خەڵکەکە، شایەتومانی هێنا و پاشان فەرمووی: ((جا دوای ئەوە، بێگومان ئامادەبوونتان لە مزگەوت لە من شاراوە نەبوو، بەڵام ترسام ئەو شەونوێژە فەرز ببێ لەسەرتان و ئێوەش نەتوانن بیکەن)). یونسیش ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عوقەیل لە ئیبنو شیهابەوە دەکات.**

[1] بڕوانە: ٧٢٩.

٩٢٥- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ عَشِيَّةً بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَتَشَهَّدَ وَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ». تَابَعَهُ أَبُو مُعَاوِيَةَ وَأَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ». تَابَعَهُ العَدَنِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ فِي: «أَمَّا بَعْدُ»[1].

**٩٢٥- زوهری دەڵێ: عوروە بۆی گێڕامەوە وتی: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئێوارەیەك پاش نوێژ هەستایە سەر پێ، شایەتومانی هێنا و سوپاس و ستاییشی خوای کرد بەو شێوەیەی شیاوی خوا بێ، پاشان فەرمووی: ((پاش ئەمە)). ئەبو موعاویە و ئەبو ئوسامە لە هیشامەوە گێڕاویانەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە، ئەویش لە ئەبو حومەیدی ساعیدییەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرمووی: ((جا پاش ئەمە))، پاڵپشتی گێڕانەوەکەی زوهری دەکەن. وە لەو بڕگەیەدا ((لەپاش ئەمە)) گێڕانەوەی عەدەنی لە سوفیانەوە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی زوهری دەکات.**

٩٢٦- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ، عَنِ المِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَمِعْتُهُ حِينَ تَشَهَّدَ يَقُولُ: «أَمَّا بَعْدُ». تَابَعَهُ الزُّبَيْدِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ[2].

**٩٢٦- میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایە سەر پێ و (وتاری دا)، گوێم لێ بوو کاتێ شایەتومانی، دەیفەرموو: ((جا پاش ئەمە)). زوبەیدی لە زوهرییەوە بە ڕێگەیەکی دیکە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، کە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی شوعەیب دەکات.**

---

[1] بڕوانە: ١٥٠٠، ٢٥٩٧، ٦٦٣٦، ٦٩٧٩، ٧١٧٤، ٧١٩٧.

[2] بڕوانە: ٣١١٠، ٣٧١٤، ٣٧٢٩، ٣٧٦٧، ٥٢٣٠، ٥٢٧٨.

٩٢٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ الغَسِيلِ قَالَ: حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: صَعِدَ النَّبِيُّ ﷺ المِنْبَرَ، وَكَانَ آخِرَ مَجْلِسٍ جَلَسَهُ مُتَعَطِّفًا مِلْحَفَةً عَلَى مَنْكِبَيْهِ، قَدْ عَصَبَ رَأْسَهُ بِعِصَابَةٍ دَسِمَةٍ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ إِلَيَّ». فَثَابُوا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ هَذَا الحَيَّ مِنَ الأَنْصَارِ يَقِلُّونَ، وَيَكْثُرُ النَّاسُ، فَمَنْ وَلِيَ شَيْئًا مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ فَاسْتَطَاعَ أَنْ يَضُرَّ فِيهِ أَحَدًا أَوْ يَنْفَعَ فِيهِ أَحَدًا، فَلْيَقْبَلْ مِنْ مُحْسِنِهِمْ، وَيَتَجَاوَزْ عَنْ مُسِيئِهِمْ»[1].

**٩٢٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتە سەر دوانگە، کە کۆتا جاری بوو بڕواتە سەر دوانگە، قوماشێکی وەك پاڵتۆ دابوو بەسەر شانیدا و لە خۆی ئاڵاندبوو، مێزەرێکی ڕەشی[2] پێچابوو بە سەریەوە، جا سوپاس و ستاییشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە! نزیك بنەوە لێم))، ئەوانیش لە چواردەوری کۆ بوونەوە، پاشان فەرمووی: ((لە پاش ئەمە بێگومان ئا ئەم خەڵکە کە ناویان ئەنصارە کەم دەبنەوە، بەڵام خەڵکی دیکە زۆر دەبن، جا هەر کەس هەر شتێکی لە کاروباری ئوممەتی موحەممەد ﷺ کەوتە دەست و دەیتوانی زیان بە کەسێ بگەیەنێ، یان سوود و کەڵك بە کەسێ بگەیەنێ لەو کارەدا، ئەوە با چاکەی چاکیان وەربگرێ و چاوپۆشی لە خراپیان بکات)).**

## ٣٠- بابُ القَعْدَةِ بَيْنَ الخُطْبَتَيْنِ يَوْمَ الجُمُعَةِ

٩٢٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ المُفَضَّلِ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ خُطْبَتَيْنِ يَقْعُدُ بَيْنَهُمَا[3].

---

[1] بڕوانە: ٣٦٢٨، ٣٨٠٠.

[2] بِعِصَابَةٍ دَسِمَةٍ: بەدوو جۆری دیکە مانا کراوە: مێزەرەیەکی ڕەنگ زەیتی، یان مێزەرەیەکی ڕەنگ گۆڕاو بە بۆنی خۆش.

[3] بڕوانە: ٩٢٠.

## ٣٠- باسی (حوكمی) دانیشتن لە نێوان دوو وتارەكەی ڕۆژی هەینیدا

**٩٢٨- نافیع لە عەبدوڵاوە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ (لە ڕۆژی هەینیدا) دوو وتاری دەدا، لە نێوانیاندا دادەنیشت.**

## ٣١- بابُ الِاسْتِمَاعِ إِلَى الخُطبَةِ

٩٢٩- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الأَغَرِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الجُمُعَةِ، وَقَفَتِ المَلاَئِكَةُ عَلَى بَابِ المَسْجِدِ يَكْتُبُونَ الأَوَّلَ فَالأَوَّلَ، وَمَثَلُ المُهَجِّرِ كَمَثَلِ الَّذِي يُهْدِي بَدَنَةً، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي بَقَرَةً، ثُمَّ كَبْشًا، ثُمَّ دَجَاجَةً، ثُمَّ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ طَوَوْا صُحُفَهُمْ، وَيَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ»[1].

## ٣١- باسی گوێگرتن لە وتاری هەینی

**٩٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ڕۆژی هەینی بوو، فریشتەكان لەبەر دەرگای مزگەوتدا دەوەستن، ناوی (نوێژكەرەكان) دەنووسن یەكەم ئەوەی دوای یەكەم (بەپێی ڕیزبەندی ئەوەی كامیان زووتر هاتبێت)، وە نموونەی ئەوەی زوتر دێت بۆ نوێژی هەینی، وەك ئەو كەسە وایە وشترێكی كردبێ بە خێر، دواتر وەك ئەوە وایە مانگایەكی بەخشیبێ، دواتر وەك ئەوە وایە بەرانێكی بەخشیبێ، دواتر وەك ئەوە وایە مریشكێكی بەخشیبێ، دواتر وەك ئەوە وایە هێلكەیەكی بەخشیبێ، جا كە وتارخوێن ڕۆیشتە سەر دوانگە، فریشتەكان دەفتەرەكانیان دەپێچنەوە و گوێ لە وتارەكە دەگرن)).**

---

[1] بڕوانە: ٣٢١١.

## ٣٢- بابٌ: إِذَا رَأَى الإِمَامُ رَجُلًا جَاءَ وَهُوَ يَخْطُبُ أَمَرَهُ أَنْ يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ

٩٣٠- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَقَالَ: «أَصَلَّيْتَ يَا فُلاَنُ؟». قَالَ لاَ. قَالَ «قُمْ فَارْكَعْ»[1].

## ٣٢- باسێک: ئەگەر ئیمام لە کاتێکدا وتاری دەدا کەسێکی بینی هات، فەرمانی پێ بکات کە دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکات

**٩٣٠- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە مزگەوت لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا بۆ خەڵکی لە ڕۆژی هەینیدا، فەرمووی: ((فلان کەس نوێژ (ی سوننەت)ت کردووە؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((هەستە (دوو ڕکات) نوێژ بکە)).**

## ٣٣- بابُ مَنْ جَاءَ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ

٩٣١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، سَمِعَ جَابِرًا قَالَ: دَخَلَ رَجُلٌ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ: «أَصَلَّيْتَ؟». قَالَ: لاَ. قَالَ: «فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ»[2].

## ٣٣- باسی ئەگەر لە کاتێکدا پێشنوێژ وتاری دەدا کەسێک هات دوو ڕکات نوێژی کورت بکات

**٩٣١- عەمر دەڵێ: لە جابیرم بیست ﷺ وتی: لە ڕۆژی هەینیدا پیاوێك هاتە مزگەوت، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، فەرمووی بە پیاوەکە: ((نوێژت کردووە؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((کەواتە دوو ڕکات نوێژ بکە)).**

---

[1] بڕوانە: ٩٣١، ١١٦٦.

[2] بڕوانە: ٩٣٠.

## ٣٤- بابُ رَفْعِ اليَدَيْنِ فِي الخُطْبَةِ

٩٣٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ. وَعَنْ يُونُسَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ إِذْ قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَ الكُرَاعُ، وَهَلَكَ الشَّاءُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَسْقِيَنَا. فَمَدَّ يَدَيْهِ وَدَعَا[1].

## ٣٤- باسی بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە وتارداندا

**٩٣٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا وتاری دەدا، لەپڕ کابرایەك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وڵاخ (ئەسپ) و مەڕومالاّت هەموو مردن و تیا چوون، دەی داوا و نزا بکە لای خوا بارانمان بۆ ببارێنێ، جا پێغەمبەریش ﷺ هەر دوو دەستی بەرز کردەوە و دوعای کرد (خوایە بارانیان بۆ ببارێنی).**

## ٣٥- بابُ الاِسْتِسْقَاءِ فِي الخُطْبَةِ يَوْمَ الجُمُعَةِ

٩٣٣- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَمْرٍو قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: أَصَابَتِ النَّاسَ سَنَةٌ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَبَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَ المَالُ، وَجَاعَ العِيَالُ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا. فَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَةً، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا وَضَعَهَا حَتَّى ثَارَ السَّحَابُ أَمْثَالَ الجِبَالِ، ثُمَّ لَمْ يَنْزِلْ عَنْ مِنْبَرِهِ حَتَّى رَأَيْتُ المَطَرَ يَتَحَادَرُ عَلَى لِحْيَتِهِ ﷺ، فَمُطِرْنَا يَوْمَنَا ذَلِكَ، وَمِنَ الغَدِ، وَبَعْدَ الغَدِ وَالَّذِي يَلِيهِ، حَتَّى الجُمُعَةِ الأُخْرَى، وَقَامَ ذَلِكَ الأَعْرَابِيُّ -أَوْ قَالَ غَيْرُهُ- فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَهَدَّمَ البِنَاءُ وَغَرِقَ

---

[1] بروانە: ٩٣٣، ١٠١٣، ١٠١٤، ١٠١٥، ١٠١٦، ١٠١٧، ١٠١٨، ١٠١٩، ١٠٢١، ١٠٢٩، ١٠٣٣، ٣٥٨٢، ٦٠٩٣، ٦٣٤٢.

المَالُ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا. فَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا، وَلاَ عَلَيْنَا». فَمَا يُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ السَّحَابِ إِلاَّ انْفَرَجَتْ، وَصَارَتِ المَدِينَةُ مِثْلَ الجَوْبَةِ، وَسَالَ الوَادِي قَنَاةُ شَهْرًا، وَلَمْ يَجِيءْ أَحَدٌ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلاَّ حَدَّثَ بِالجَوْدِ[1].

## ٣٥- باسی داواکردنی بارانبارین له وتاری ڕۆژی هەینیدا

**٩٣٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: له سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خەڵکی (مەدینە) تووشی قاتوقڕی و بێبارانی بوون، جا له کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ له ڕۆژی هەینیدا وتاری دەدا، پیاوێکی دەشتەکی هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵ و ماڵاتمان هەموو تیا چوون، ماڵ و منداڵمان برسی بوون، دەی له خوا بپاڕێرەوە بۆمان، پێغەمبەریش ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، (لەو کاتەدا) پەڵەیەك هەورمان بە ئاسمانەوە نەدی، جا سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە دەستەکانی نەهێنایە خوارێ، هەتا هەور بەوێنەی کێو کۆ بوویەوە، پاشان لەسەر دوانگەکەی نەهاتە خوارەوە، هەتا بارانمان بینی بەڕیشیدا دەهاتە خوار، جا ئەو ڕۆژ و سبەینێ و دوو سبەی و ڕۆژی دواتریش بارانمان بۆ باری، هەتا هەینی داهاتوو، هەر ئەو عەرەبە دەشتەکییە هەستایەوە -یان وتی:کەسێکی دیکە بوو- وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خانووەکانمان ڕوخان، ئاژەڵ و ماڵاتەکانی خنکان (لەنێو ئاودا)، دەی بپاڕێرەوە له خوا بۆمان (باران خۆش بکات)، پێغەمبەریش ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی: ((خوایە له دەوروبەرمان بیبارێنە، نەك بەسەرماندا))، جا بەدەستی ئاماژەی بۆ هەر لایەك بکردایە کە هەوری لێ بوو، هەورەکە دەڕەوییەوە، جا (ئاسمانی شاری) مەدینە وەك بازنەیەك بۆیە سایەقە،**

---

[1] بڕوانە: ٩٣٢.

شیوی قەناتیش تا یەك مانگ لافاوی دەڕۆیشت، وە هەر کەس لەهەر لایەکی ولأتەوە دەهات بۆ مەدینە، باسی ئەو بارانە زۆرە پڕبەرەکەتەی دەکرد.

## ٣٦- بابُ الإِنصَاتِ[1] يَومَ الجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخطُبُ

إِذَا قَالَ لِصَاحِبِهِ: أَنْصِتْ. فَقَدْ لَغَا. وَقَالَ سَلْمَانُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّم الإِمَامُ.

## ٣٦- باسی بەباشی گوێگرتن لە ڕۆژی هەینی کاتێ ئیمام وتار دەدات

ئەگەر یەکێك بە هاوڕێکەی بڵێ: بێدەنگ بە و گوێ بگرە (لە کاتی وتاری هەینی)، ئەوە کارێکی ناڕێکی کردووە (پاداشتی نوێژی جومعەکەی بەتاڵ بۆتەوە)، وە سولەیمان لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ((دەبێ نوێژکەر بێدەنگ بێ، کاتێ پێشنوێژ قسەی کرد و وتاری دا)).

٩٣٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ المُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الجُمُعَةِ أَنْصِتْ. وَالإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ».

٩٣٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر لە ڕۆژی هەینی بە هاوڕێکەت وت: بێدەنگ بە و گوێ بگرە، لە کاتێکدا پێشنوێژ وتاری دەدا، ئەوە بێگومان کارێکی ناشایستەت کردووە (پاداشتی نوێژی هەینییەکەشت پوچەڵ بۆتەوە))).

---

[1] (الانصات) واتە: گوێی گرت. یان بەباشی گوێی گرت، وە بەمانای بێدەنگ بوو و گوێی گرت دێت. معجم الوسیط: ٦٤٤.

## ٣٧- بابُ السَّاعَةِ الَّتِي فِي يَوْمِ الجُمُعَةِ

٩٣٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَكَرَ يَوْمَ الجُمُعَةِ فَقَالَ: «فِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ، وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللَّهَ تَعَالَى شَيْئًا إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ» وَأَشَارَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا[1].

## ٣٧- باسی ئەو سات و کاتەی لە ڕۆژی هەینیدایە (نزای تێدا گیرا دەبێ)

**٩٣٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ باسی ڕۆژی هەینی کرد، جا فەرمووی: ((سات و کاتێکی تێدایە هەر کەسێك پێکەوە هاوکات بێ لەو کاتەدا هەستا بێ نوێژ بکات، وە داوای هەر شتێك لە خوای گەورە بکات، ئیللا پێی دەدات))، جا بە دەستی ئاماژەی کرد، کاتەکەی کاتێکی کەمە.**

## ٣٨- بابٌ: إِذَا نَفَرَ النَّاسُ عَنِ الإِمَامِ فِي صَلاَةِ الجُمُعَةِ فَصَلاَةُ الإِمَامِ وَمَنْ بَقِيَ جَائِزَةٌ

٩٣٦- حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ قَالَ: حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ أَقْبَلَتْ عِيرٌ تَحْمِلُ طَعَامًا، فَالتَفَتُوا إِلَيْهَا حَتَّى مَا بَقِيَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ إِلاَّ اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَـٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓا۟ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ۚ ﴿١١﴾ ﴾ الجمعة.

---

[1] بڕوانە: ٥٢٩٤، ٦٤٠٠.

## ٣٨- باسێک: ئەگەر خەڵکی لە کاتی نوێژی هەینی ئیمامیان بەجێ هێشت، جا ئیمامش لەگەڵ ئەوانەی ماونەتەوە نوێژی کرد (دروستە)

٩٣٦- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان دەکرد، لەپڕ کاروانێك هاتەوە (بۆ مەدینە) کە خواردنی پێ بوو، خەڵکەکەش چوون بۆ لای و دەوریان دا، هەتا وای لێ هات کە تەنها دوانزە کەس لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ مایەوە، بەوهۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (وە ئەگەر بازرگانییەك، یان تەپڵێدانێك ببینن، یەکسەر دەچن بۆ لای، وە تۆ (ئەی موحەممەد!) بەڕاوەستاوی بەجێ دێڵن).

## ٣٩- بابُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الجُمُعَةِ وَقَبْلَهَا

٩٣٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ المَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَبَعْدَ العِشَاءِ رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ لاَ يُصَلِّي بَعْدَ الجُمُعَةِ حَتَّى يَنْصَرِفَ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ[1].

## ٣٩- باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لە پێش و پاشی نوێژی هەینی

٩٣٧- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەپێش نوێژی نیوەڕۆ دوو ڕکات نوێژی (سوننەتی) دەکرد، وە لەدوایەوە دوو ڕکاتی دەکرد، لەپاش نوێژی ئێوارەش لە ماڵەوە دوو ڕکاتی دەکرد، وە لەپاش عیشاش

---

[1] بڕوانە: ١١٦٥، ١١٧٢، ١١٨٠.

دوو ڕکاتی دەکرد، وە لە پاش نوێژی هەینی سوننەتی نەدەکرد هەتا دەگەڕایەوە، ئینجا دوو ڕکاتی دەکرد.

## ٤٠- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى:

﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴿١٠﴾ ﴾ **الجمعة**

٩٣٨- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: كَانَتْ فِينَا امْرَأَةٌ تَجْعَلُ عَلَى أَرْبِعَاءَ فِي مَزْرَعَةٍ لَهَا سِلْقًا، فَكَانَتْ إِذَا كَانَ يَوْمُ جُمُعَةٍ تَنْزِعُ أُصُولَ السِّلْقِ فَتَجْعَلُهُ فِي قِدْرٍ، ثُمَّ تَجْعَلُ عَلَيْهِ قَبْضَةً مِنْ شَعِيرٍ تَطْحَنُهَا، فَتَكُونُ أُصُولُ السِّلْقِ عَرْقَهُ، وَكُنَّا نَنْصَرِفُ مِنْ صَلاَةِ الجُمُعَةِ فَنُسَلِّمُ عَلَيْهَا، فَتُقَرِّبُ ذَلِكَ الطَّعَامَ إِلَيْنَا فَنَلْعَقُهُ، وَكُنَّا نَتَمَنَّى يَوْمَ الجُمُعَةِ لِطَعَامِهَا ذَلِكَ[1].

## ٤٠- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند:

## (جا کاتێ نوێژی هەینی تەواو بوو ئیدی بڵاو ببنەوە بەسەر زەویدا، وە بگەڕێن بە شوێن ڕزق و ڕۆزی خوادا)

**٩٣٨- سەهل ﷺ دەڵێ: ئافرەتێك لە نێوماندا بوو، لە قەراغی جۆگەیەکدا و لەنێو کشتوکاڵەکەیدا هەندێ سڵقی کردبوو، جا هەر ڕۆژێ هەینی بووایە، لاسکی سڵقەکانی هەڵدەکێشا و دەیکردە قابلەمەیەکەوە، پاشان مشتێ جۆی دەهاڕی و دەیکرد بەسەر سڵقەکەدا، جا لاسکە سڵقەکان لەجیاتی گۆشت بوو[2]، ئینجا کە لە نوێژی هەینی دەگەڕاینەوە، سەلاممان دەکرد لەو ئافرەتە، ئەویش ئەو**

[1] بروانە: ٩٣٩، ٩٤١، ٢٣٤٩، ٥٤٠٣، ٦٢٤٨، ٦٢٧٩.

[2] (عَرْق): بەو گۆشتە دەوترێ کە بە ئێسقانەوەیە.

**خواردنەی (کە لێی نابوو) دەیهێنا بۆمان، (هەموویمان دەخوارد و دەفرەکەشمان دەلێسایەوە، ئێمە خۆزگەی هاتنی ڕۆژی هەینیمان دەخواست، لەبەر ئەو خواردنەی ئەو ئافرەتە (بۆی لێ دەناین).**

٩٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلٍ بِهَذَا، وَقَالَ: مَا كُنَّا نَقِيلُ وَلاَ نَتَغَدَّى إِلاَّ بَعْدَ الجُمُعَةِ[1].

**٩٣٩- ئەو وتەیەی سەهل بەم ڕێگەیەش هاتووە: عەبدولاّی کوڕی مەسلەمە دەڵێ: ئیبنو ئەبو حازیم لە باوکیەوە بۆی گێڕاینەوە، ئەویش لە سەهلەوە (ئەوەی پێشوو دێنێ بەم زیادەشەوە) وتی: ئێمە لە ڕۆژی هەینی پشوومان نەدەدا و نەدەخەوتین، خواردنی نیوەڕۆمان نەدەخوارد پاش نوێژی هەینی نەبێ.**

## ٤١- بابُ القائلةِ بَعْدَ الجُمُعَةِ

٩٤٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُقْبَةَ الشَّيْبَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ الفَزَارِيُّ، عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ: كُنَّا نُبَكِّرُ إِلَى الجُمُعَةِ ثُمَّ نَقِيلُ[2].

## ٤١- باسی نیوەڕۆخەو پاش نوێژی هەینی

**٩٤٠- حومەید دەڵێ: لە ئەنەسم بیست ﷺ دەیوت: ئێمە لە سەرەتای کاتەکەیەوە دەڕۆیشتین بۆ نوێژی هەینی (ئەنجامامان دەدا)، پاشان سەرخەومان دەشکاند.**

---

[1] بڕوانە: ٩٣٨.

[2] بڕوانە: ٩٠٥.

٩٤١- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الجُمُعَةَ ثُمَّ تَكُونُ القَائِلَةُ[1].

**٩٤١- سەهل ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نوێژی هەینیمان دەکرد، پاشان پشوومان دەدا و سەرخەوێکمان دەشکاند**

[1] بڕوانە: ٩٣٨.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ١٢- كِتابُ صَلاةِ الخَوفِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١٢- پەڕاوی نوێــژی ترس

## ١- بابُ صَلاةِ الخَوفِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾ ﴾ النساء.

## ١- باسی نوێژی ترس

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە كاتێ سەفەرتان كرد لە زەویدا، ئەوە هیچ گوناهێكتان لەسەر نییە كە هەندێ لە نوێژەكانتان كورت بكەنەوە، ئەگەر ترسان لەوانەی كە بێباوەڕن جەنگتان لەگەڵ بكەن، بێگومان بێباوەڕان هەمیشە بۆ ئێوە دوژمنێكی ڕوون و ئاشكران، (ئەی موحەممەد ﷺ) ئەگەر تۆ خۆت لەنێو موسوڵمانانەدا بوویت (لە كاتی جەنگدا) و پێشنوێژیت بۆ

**کردن، ئەوە با کۆمەڵێك لەوان لەگەڵت نوێژ بکەن، وە با چەکەکانیان پێ بێت، جا کاتێ سوژدەیان برد (ڕکاتێکیان تەواو کرد)، با (بڕۆنە دواوە) لەپشتەوە پاسەوان بن، وە با کۆمەڵەکەی دیکەیان بێن کە نوێژیان نەکردووە (و پاسەوان بوون) لەگەڵت نوێژ بکەن، با وریای خۆیان بن و چەکەکانیشیان پێ بێت، بێباوەڕان ئاواتەخوازن کە ئێوە لە چەکەکان و شت و مەکەکانتان بێئاگا بن تا پەلامارتان بدەن بە پەلامارێکی یەکجاری (و لەناوتان ببەن)، گوناهبار نابن ئەگەر باران نارەحەتی کردن یان نەخۆش بوون چەکەکانتان دانێن، بەڵام وریای خۆتان بن، بەڕاستی خوا سزای سەختی ئامادە کردووە بۆ بێباوەڕان).**

٩٤٢- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: سَأَلْتُهُ: هَلْ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ؟ يَعْنِي: صَلاَةَ الخَوْفِ، قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قِبَلَ نَجْدٍ، فَوَازَيْنَا العَدُوَّ فَصَافَفْنَا لَهُمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي لَنَا، فَقَامَتْ طَائِفَةٌ مَعَهُ تُصَلِّي، وَأَقْبَلَتْ طَائِفَةٌ عَلَى العَدُوِّ، وَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَنْ مَعَهُ، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفُوا مَكَانَ الطَّائِفَةِ التِي لَمْ تُصَلِّ، فَجَاءُوا، فَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِهِمْ رَكْعَةً، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، فَقَامَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ فَرَكَعَ لِنَفْسِهِ رَكْعَةً وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ[1].

**٩٤٢- شوعەیب لە زوهرییەوە گێڕایەوە و دەڵێ: پرسیارم لە زوهری کرد: ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد -مەبەستی نوێژی ترس بوو-، زوهری وتی: سالیم بۆی گێڕامەوە کە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ غەزایەکمان کرد ڕوو بە وڵاتی نەجد ڕۆیشتین، جا کە لە بەرانبەر دوژمن وەستاین و ڕیز بووین لە بەرانبەریاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و پێشنوێژی**

[1] بڕوانە: ٩٤٣، ٤١٣٢، ٤١٣٣، ٤٥٣٥.

**بۆ کردین، جا کۆمەڵێك لەگەڵیدا نوێژی کرد، کۆمەڵێکی دیکەیان ڕوو بە دوژمن وەستان و (پاسەوان بوون)، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێکیان کڕنوش و دوو سوژدەی برد، پاشان ئەو کۆمەڵە گەڕانەوە و ڕۆیشتنە شوێنی ئەو کۆمەڵەی نوێژیان نەکردبوو، ئەوانیش هاتن و پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵیاندا کڕنووش و دوو سوژدەی برد، پاشان پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە، جا هەردوو کۆمەڵەکە هەستان و هەریەکەیان کڕنووش و دوو سوژدەیان برد[1].**

## ٢- بابُ صَلَاةِ الخَوْفِ رِجَالًا وَرُكْبَانًا

٩٤٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ القُرَشِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ نَحْوًا مِنْ قَوْلِ مُجَاهِدٍ: إِذَا اخْتَلَطُوا قِيَامًا. وَزَادَ ابْنُ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «وَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَلْيُصَلُّوا قِيَامًا وَرُكْبَانًا»[2].

## ٢- باسی ئەنجامدانی نوێژی ترس بەپیادە و بەسواری

**٩٤٣- نافیع وێنەی گێڕانەوەکەی موجاهید لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەگەر جەنگاوەرانی موسوڵمان لەگەڵ دوژمندا تێکەڵ بوون، نوێژکردن بەدەم ڕۆیشتنەوە دروستە، جا عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ ئەمەشی لێ زیاد دەکات و لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر دوژمنان لەوە زۆرتر بوون (ترس زیاتر دەبێ)، ئەوە نوێژەکانیان بکەن (هەر چۆن بۆیان کرا) بەپیادە بێت یان بە سواری)).**

---

[1] واتە: ڕکاتێکیان بەجەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد و خۆشیان ڕکاتەکەی دیکەیان کرد بەتەنها.

[2] بڕوانە: ٩٢٤.

## ٣- بابٌ: يَحْرُسُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ

٩٤٤- حَدَّثَنَا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَرْبٍ، عَنِ الزُّبَيْدِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ وَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، فَكَبَّرَ وَكَبَّرُوا مَعَهُ، وَرَكَعَ وَرَكَعَ نَاسٌ مِنْهُمْ، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدُوا مَعَهُ، ثُمَّ قَامَ لِلثَّانِيَةِ فَقَامَ الذِينَ سَجَدُوا وَحَرَسُوا إِخْوَانَهُمْ، وَأَتَتِ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا مَعَهُ، وَالنَّاسُ كُلُّهُمْ فِي صَلَاةٍ، وَلَكِنْ يَحْرُسُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا.

## ٣- باسێک: لە نوێژی ترسدا جەنگاوەران پاسەوانی یەکدی دەکەن[1]

**٩٤٤- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ هەستایە سەر پێ و خەڵکەکەش بەپێوە وەستان لەگەڵی، جا پێغەمبەر ﷺ الله أکبری کرد، خەڵکەکەش بەدوایدا الله أکبریان کرد، ئینجا کڕنووشی برد، کۆمەڵێکیان لەگەڵی کڕنوشیان برد، پاشان سوژدەی برد ئەوانیش سوژدەیان برد لەگەڵیدا، پاشان هەستایەوە بۆ ڕکاتی دووەم، جا ئەوانەی سوژدەیان بردبوو و پاسەوانی براکانیان کردبوو لەگەڵیدا هەستان (و چوونە دواوە)، ئینجا کۆمەڵەکەی دیکەیان هاتن و کڕنوش و سوژدەیان برد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، (لە کۆتاییدا) هەموو خەڵکەکە لە نوێژدا بوون، بەڵام پاسەوانی یەکدییان دەکرد.**

## ٤- بابُ الصَّلَاةِ عِنْدَ مُنَاهَضَةِ الحُصُونِ وَلِقَاءِ العَدُوِّ

وَقَالَ الأَوْزَاعِيُّ: إِنْ كَانَ تَهَيَّأَ الفَتْحُ، وَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى الصَّلَاةِ صَلَّوْا إِيمَاءً كُلُّ امْرِئٍ لِنَفْسِهِ، فَإِنْ لَمْ يَقْدِرُوا عَلَى الإِيمَاءِ أَخَّرُوا الصَّلَاةَ، حَتَّى يَنْكَشِفَ القِتَالُ أَوْ يَأْمَنُوا. فَيُصَلُّوا رَكْعَتَيْنِ،

---

[1] ئەگەر دوژمن لە ڕووی قیبلەوە بوو.

فَإِنْ لَمْ يَقْدِرُوا صَلَّوْا رَكْعَةً وَسَجْدَتَيْنِ، لَا يُجْزِئُهُمُ التَّكْبِيرُ وَيُؤَخِّرُوهَا حَتَّى يَأْمَنُوا. وَبِهِ قَالَ مَكْحُولٌ. وَقَالَ أَنَسٌ: حَضَرْتُ عِنْدَ مُنَاهَضَةِ حِصْنِ تُسْتَرَ عِنْدَ إِضَاءَةِ الفَجْرِ، وَاشْتَدَّ اشْتِعَالُ القِتَالِ، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى الصَّلَاةِ، فَلَمْ نُصَلِّ إِلَّا بَعْدَ ارْتِفَاعِ النَّهَارِ، فَصَلَّيْنَاهَا وَنَحْنُ مَعَ أَبِي مُوسَى، فَفُتِحَ لَنَا. وَقَالَ أَنَسٌ: وَمَا يَسُرُّنِي بِتِلْكَ الصَّلَاةِ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا .

## ٤- باسی ئەنجامدانی نویژی ترس لە کاتی پەلاماری قەلا و لە کاتی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ دوژمندا

**ئەوزاعی دەڵێ: ئەگەر سەرکەوتن ئاسان بوو[١] و نەیاندەتوانی نوێژەکەیان بکەن، بە ئاماژەکردن هەر کەسە بۆ خۆی نوێژەکەی بکات، جا ئەگەر بە ئاماژەکردنیش نەیاندەتوانی نوێژەکەیان بکەن، نوێژەکەیان دوا خەن هەتا جەنگەکە تەواو دەبێ، یان ترس نامێنێ (دەتوانن نوێژ بکەن)، ئەوسا دوو ڕکات نوێژی ترس دەکەن، ئەگەر نەیانتوانی ئەوە یەك کڕنوش و دوو سوژدە دەبەن (یەك ڕکات بکەن)، تەنها الله أکبرکردن بەس نییە (لەجیاتی نوێژەکە)، بەڵکوو نوێژەکە دوا خەن هەتا ترسیان نامێنێ، ئەمە ڕای مەکحولیشە. ئەنەس ﷺ دەڵێ: لەگرتنی قەلاّی توستەردا ئامادە بوو، کاتی ڕووناکی نوێژی بەیانی بوو، جەنگەکە زۆر گەرم و توند بوون، موسوڵمانان نەیانتوانی نوێژی بەیانی بکەن، نوێژمان نەکرد هەتا خۆر بەرز بۆیەوە، جا نوێژمان کرد لەگەڵ ئەبو مووسادا ﷺ، ئینجا قەلاّکەمان گرت، ئەنەس دەڵێ: دونیا و هەرچی**

[١] لە گرتنی قەلاّ و شتی لەو جۆرەدا.

**تیادایه هی من بێت، بەئەندازەی ئەو نوێژە پێم خۆش نەبوو (ئەو دوو ڕکاتەی لە کاتی جیهادەکەدا کردم).**

٩٤٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ مُبَارَكٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: جَاءَ عُمَرُ يَوْمَ الخَنْدَقِ، فَجَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ وَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا صَلَّيْتُ العَصْرَ حَتَّى كَادَتِ الشَّمْسُ أَنْ تَغِيبَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَأَنَا وَاللهِ مَا صَلَّيْتُهَا بَعْدُ». قَالَ: فَنَزَلَ إِلَى بُطْحَانَ فَتَوَضَّأَ، وَصَلَّى العَصْرَ بَعْدَ مَا غَابَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى المَغْرِبَ بَعْدَهَا([1]).

**٩٤٥- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا عومەر هات، دەستی کرد بە جنێودان بە بێباوەڕانی قوڕەیش و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسرم نەکرد هەتا نزیك بوو خۆر ئاوا دەبوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((منیش سوێند بە خوا هێشتا نوێژی عەسرم نەکردووە))، جابیر دەڵێ: ئینجا پێغەمبەر ﷺ دابەزی بۆ شیوی بوتحان، دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد، پاش ئەوەی خۆر ئاوا بووبوو، پاشان نوێژی مەغریبی کرد، دوای ئەوەی نوێژی عەسری کرد.**

## ٥- بابُ صَلَاةِ الطَّالِبِ وَالمَطْلُوبِ رَاكِبًا وَإِيمَاءً

وَقَالَ الوَلِيدُ: ذَكَرْتُ لِلأَوْزَاعِيِّ صَلاَةَ شُرَحْبِيلَ بْنِ السِّمْطِ وَأَصْحَابِهِ عَلَى ظَهْرِ الدَّابَّةِ، فَقَالَ كَذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا إِذَا تُخُوِّفَ الفَوْتُ، وَاحْتَجَّ الوَلِيدُ بِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ العَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ».

---

[1] بڕوانە: ٥٩٦.

## ٥- باسی نوێژی داواکار و داواکراو بەسواری و بەئاماژەکردن

**وەلید دەڵێ: باسی نوێژی شورەحبیلی کوڕی سیمت و هاوڕێکانیم کرد بۆ ئەوزاعی، کە بەسەر وڵاخەوە نوێژیان کردووە، ئەوزاعیش وتی: بڕیار و فەرمان لای ئێمەش وایە، ئەگەر ترسی چوونی نوێژەکە هەبوو، وە وەلید بەڵگەی بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ هێناوەتەوە کە دەفەرمووێ: ((کەس نوێژی عەسر نەکات لە بەنو قورەیزە نەبێت)).**

٩٤٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ أَسْمَاءَ قَالَ: حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لَنَا لَمَّا رَجَعَ مِنَ الأَحْزَابِ: «لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ العَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ». فَأَدْرَكَ بَعْضُهُمُ العَصْرَ فِي الطَّرِيقِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ نُصَلِّي حَتَّى نَأْتِيَهَا. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصَلِّي، لَمْ يُرَدْ مِنَّا ذَلِكَ. فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَلَمْ يُعَنِّفْ وَاحِدًا مِنْهُمْ[1].

**٩٤٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ؓ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە جەنگی ئەحزاب گەڕایەوە فەرمووی: ((کەس نوێژی عەسر نەکات لە بەنو قورەیزە نەبێ))، جا هەندێك لە هاوەڵان لە ڕێگادا نوێژی عەسریان لێ بوو، بۆیە هەندێکیان وتیان: نوێژی عەسر ناکەین تا نەچینە بەنو قورەیزە، هەندێکی دیکەیان وتیان: نەخێر وا نییە! بەڵکوو نوێژ دەکەین، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی مەبەست نەبوو کە فەرمووی بە ئێمە (کە تا بەنو قورەیزە نوێژ نەکەین)، جا ئەو قسەوباسە بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕدرایەوە، ئەویش ڕەخنەی لە هیچیان نەگرت.**

## ٦- بابُ التَّبْكِيرِ وَالغَلَسِ بِالصُّبْحِ وَالصَّلاَةِ عِنْدَ الإِغَارَةِ وَالحَرْبِ

٩٤٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ وَثَابِتٍ البُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى الصُّبْحَ بِغَلَسٍ ثُمَّ رَكِبَ فَقَالَ: «اللهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ،

---

[1] بڕوانە: ٤١١٩.

إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ المُنْذَرِينَ»([1]). فَخَرَجُوا يَسْعَوْنَ فِي السِّكَكِ وَيَقُولُونَ: مُحَمَّدٌ وَالخَمِيسُ -قَالَ: وَالخَمِيسُ الجَيْشُ- فَظَهَرَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَتَلَ المُقَاتِلَةَ وَسَبَى الذَّرَارِيَّ، فَصَارَتْ صَفِيَّةُ لِدِحْيَةَ الكَلْبِيِّ، وَصَارَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ تَزَوَّجَهَا وَجَعَلَ صَدَاقَهَا عِتْقَهَا. فَقَالَ عَبْدُ العَزِيزِ لِثَابِتٍ:يا أَبَا مُحَمَّدٍ، أَنْتَ سَأَلْتَ أَنَسًا مَا أَمْهَرَهَا؟ قَالَ: أَمْهَرَهَا نَفْسَهَا. فَتَبَسَّمَ.

## ٦- باسی نوێژی بەیانی زوو (لە سەرەتای کاتەکەیەوە) و بەتاریکی بکرێ، هەروەها نوێژکردن لە کاتی پەلامار و جەنگدا

**٩٤٧- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بەتاریکی نوێژی بەیانی کرد (لە سەرەتای کاتەکەیەوە)، پاشان سواری وڵاخەکەی بوو، فەرمووی: ((الله أکبر خەیبەر وێران بوو، بێگومان ئەگەر ئێمە دابەزینە گۆڕەپان و نزیکی هەر گەلێ، ئای ترسێنراوان چ ڕۆژێکی ڕەشیان دەبێ))، جا خەڵکی خەیبەر هاتنە دەرەوە بە نێو کوچە و کۆڵانەکاندا دەگەڕان و دەیانوت: ئەوە موحەممەد و لەشکرەکەیەتی! -دەڵێ: والخمیس: سوپا و لەشکرە- پێغەمبەری خواش ﷺ سەر کەوت بەسەریاندا، ئینجا پیاوە شەڕکەرەکانی کوشتن، وە ژن و منداڵەکانیانی بەدیل گرت و کردنی بەکۆیلە، صەفییەش بۆ دیحیەی کەلبی بوو، دواتر بوو بە هی پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان مارەی کرد و ئازادکردنەکەی کردە مارەییەکەی. جا عەبدولعەزیز بە سابیتی وت: ئەی ئەبو موحەممەد تۆ پرسیارت لە ئەنەس کرد پێغەمبەر ﷺ چی دانا بە مارەیی صەفییە؟ (ئەنەس) وتی: صەفییە ئازادکردنی بۆیە مارەیی، جا ئەنەس زەردەخەنەیەکی کرد.**

---

[1] بڕوانە: ٣٧١.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ١٣- كِتَابُ العِيدَيْنِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١٣- پەڕاوی دوو جەژنەکە

## ١- بَابٌ: فِي العِيدَيْنِ وَالتَّجَمُّلِ فِيهِ

٩٤٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ أَنَّ عَبْدَ اللهِ، بْنَ عُمَرَ قَالَ: أَخَذَ عُمَرُ جُبَّةً مِنْ إِسْتَبْرَقٍ تُبَاعُ فِي السُّوقِ، فَأَخَذَهَا فَأَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ابْتَعْ هَذِهِ؛ تَجَمَّلْ بِهَا لِلْعِيدِ وَالوُفُودِ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ». فَلَبِثَ عُمَرُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَلْبَثَ، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِجُبَّةِ دِيبَاجٍ، فَأَقْبَلَ بِهَا عُمَرُ، فَأَتَى بِهَا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ قُلْتَ: «إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ». وَأَرْسَلْتَ إِلَيَّ بِهَذِهِ الجُبَّةِ! فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «تَبِيعُهَا وَ[١] تُصِيبُ بِهَا حَاجَتَكَ»[٢].

## ١- باسێک: دوو جەژنەکە و خۆڕازاندنەوە تێیاندا

**٩٤٨- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: عومەر جوبەیەکی ئاوریشم کە لە بازاڕ دەفرۆشرا هەڵیگرت و هێنای بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی**

---

[١] بە (وَ) هاتووە کە ماناکەی بەو جۆرەیە کە لە سەرەوە مانا کراوە، وە بە (أَوْ)یش هاتووە ماناکەی یان بە مانای (وَ) دێت یان بە مانای گۆڕینەوە و دان لەبری کاڵایەکی دیکەدا. یان بۆ دابەشکردنێکی ئافرەتانی خزمیدا. إرشاد الساري: ٦٣٨/٢.

[٢] بڕوانە: ٨٨٦.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پۆشاکە بکڕە خۆتی پێ برازێنەوە بۆ جەژن و بۆ پێشوازیکردن لە وەفد و نوێنەرەکان، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەمە پۆشاکی کەسێکە کە بەشی نییە (لە دوارۆژدا)))، جا عومەر ئەوەندە مایەوە کە خوا ویستی بمێنێتەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ جوبەیەکی ئاوریشمی بۆ (عومەر) نارد، عومەریش بە جوبەکەوە هاتەوە هێنایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جەنابت فەرمووت: ((بێگومان ئەم پۆشاکە ئاوریشمە کەسێك دەیپۆشێ کە بەشی نەبێ (لە ڕۆژی دواییدا)))، کەچی ئەم جوبە ئاوریشمەت ناردووە بۆ من؟! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بیفرۆشە و (بە نرخەکەی) پێویستییەکی خۆتی پێ جێبەجێ بکە)).

## ٢- بابُ الحِرَابِ وَالدَّرَقِ يَومَ العِيدِ

٩٤٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَمْرٌو، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَسَدِيَّ حَدَّثَهُ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ تُغَنِّيَانِ بِغِنَاءِ بُعَاثَ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ، وَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَانْتَهَرَنِي وَقَالَ: مِزْمَارَةُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ! فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ - عليه السلام - فَقَالَ: «دَعْهُمَا». فَلَمَّا غَفَلَ غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا[1].

## ٢- باسی شمشێر[2] و قەڵغان لە ڕۆژی جەژندا (یاریکردن پێیان دروستە)

٩٤٩- عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ ماڵی من دوو کچۆڵەم لابوو، گۆرانی ئاژاوەی بوعاسیان دەوت، پێغەمبەر ﷺ لەسەر نوێنەکە ڕاکشا و ڕووی وەرگێڕا لێمان،

---

[1] بروانە: ٩٥٢، ٩٨٧، ٢٩٠٦، ٣٥٢٩، ٣٩٣١.

[2] (حراب): کۆی (حربة): بە مانای شمشێرێکی کورت دێ و بە کوردی پێی دەڵێن: نێزە، بۆیە وشەی شمشێرمان بۆ ماناکەی بەکار هێنا، چونکە لەگەڵ قەڵغاندا شمشێر گونجاوترە.

**جا ئەبو بەکر هاتە ژوورەوە سەرزەنشتی کردم و لێم توڕە بوو، وتی: بەزم و بالۆرەی شەیتان لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ (چۆن شتی وا دەبێ)! جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی تێ کرد و فەرمووی: ((وازیان لێ بێنە))، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئاگای لێ نەبوو، ئاماژەم کرد بۆ کەنیزەکەکان کە بڕۆن، ئەوانیش ڕۆیشتنە دەرەوە.**

٩٥٠- وَكَانَ يَوْمَ عِيدٍ يَلْعَبُ السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَإِمَّا قَالَ: «تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ؟». فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ خَدِّي عَلَى خَدِّهِ، وَهُوَ يَقُولُ: «دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ». حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ قَالَ: «حَسْبُكِ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «فَاذْهَبِي»[١].

**٩٥٠- وە لە ڕۆژی جەژندا ڕەشپێستەکان بە نێزە و قەڵغان یارییان دەکرد، (عائیشە وتی): یان داوام کرد لە پێغەمبەر ﷺ، یان خۆی فەرمووی: ((حەز دەکەی سەیر بکەیت؟))، منیش وتم: بەڵێ حەز دەکەم، جا لەپشت خۆیەوە وەستاندمی کوڵمم لەسەر کوڵمی بوو، دەیفەرموو: ((ئادەی هۆزی ئەرفیدە یارییەکەتان بکەن))، ئەوەندە سەیرم کرد هەتا تاقەتم نەما، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئیدی بەسە؟))، وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((کەواتە بڕۆ)).**

## ٣- بابُ سُنَّةَ العِيدَيْنِ لأَهْلِ الإِسْلَامِ

٩٥١- حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: أَخْبَرَنِي زُبَيْدٌ قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ، عَنِ البَرَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ فَقَالَ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ مِنْ يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، فَمَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا»[١].

---

[١] بڕوانە: ٤٥٤.

## ٣- باسی سوننەتی جەژنەکان بۆ موسوڵمانان

**٩٥١- بەڕاو ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو وتاری دەدا دەیفەرموو: ((بێگومان یەکەم شت کە لە ئەمڕۆدا دەست پێ دەکەین ئەوەیە کە نوێژ دەکەین، پاشان دەگەڕێینەوە (بۆ ماڵەوە) و قوربانی سەر دەبڕین، جا هەر کەس ئەمەی کرد ئەوە پەیڕەوی سوننەتی ئێمەی کردووە)).**

٩٥٢- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ مِنْ جَوَارِي الأَنْصَارِ تُغَنِّيَانِ بِمَا تَقَاوَلَتِ الأَنْصَارُ يَوْمَ بُعَاثَ -قَالَتْ: وَلَيْسَتَا بِمُغَنِّيَتَيْنِ- فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ فِي بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟! وَذَلِكَ فِي يَوْمِ عِيدٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا، وَهَذَا عِيدُنَا»[٢].

**٩٥٢- عائیشە ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ هات بۆ ماڵمان دوو کەنیزەك لە کەنیزەکی ئەنصارییەکان لەلام بوون، گۆرانییان دەوت بەو گۆرانییانەی ئەنصارییەکان دەیانوت دەربارەی ئاژاوەی بوعاس، -عائیشە دەڵێ: وە ئەو دووانە گۆرانیبێژ نەبوون-، ئینجا ئەبو بەکر ﷺ وتی: چۆن گۆرانی و بەزمی شەیتان لە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ دەبێ؟ عائیشە دەڵێ: ئەم گۆرانیوتنەش لە ڕۆژی جەژندا بوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەبو بەکر بێگومان هەموو گەلێك جەژنێکیان هەیە، ئەمڕۆش جەژنی ئێمەی موسوڵمانە)).**

---

[١] بڕوانە: ٩٥٥، ٩٦٥، ٩٦٨، ٩٧٦، ٩٨٣، ٥٥٤٥، ٥٥٥٦، ٥٥٥٧، ٥٥٦٠، ٥٥٦٣، ٦٦٧٣.

[٢] بڕوانە: ٩٤٩.

## ٤- بَابُ الأَكْلِ يَوْمَ الفِطْرِ قَبْلَ الخُرُوجِ

٩٥٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ قَال: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لاَ يَغْدُو يَوْمَ الفِطْرِ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ. وَقَالَ مُرَجَّأُ بْنُ رَجَاءٍ حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: وَيَأْكُلُهُنَّ وِتْرًا.

## ٤- باسی له جەژنی ڕەمەزاندا

## خواردن بخورمێ پێش ڕۆیشتن بۆ نوێژی جەژن

**٩٥٣- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ له ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا نەدەڕۆیشت بۆ نوێژگە، هەتا چەند دەنکەخورمایەکی نەخواردبایە. مورەجەئی کوڕی ڕەجا دەڵێ: عوبەیدولا بۆی گێڕامەوە وتی: ئەنەس بۆی گێڕامەوە له پێغەمبەرەوە ﷺ[1] فەرموویەتی: ((با خورماکان تاك بن کە موسوڵمان دەیانخوات)).**

## ٥- بابُ الأكْلِ يَوْمَ النَّحْرِ

٩٥٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَلْيُعِدْ». فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: هَذَا يَوْمٌ يُشْتَهَى فِيهِ اللَّحْمُ. وَذَكَرَ مِنْ جِيرَانِهِ فَكَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَدَّقَهُ، قَالَ وَعِنْدِي جَذَعَةٌ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ، فَرَخَّصَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَلاَ أَدْرِي أَبَلَغَتِ الرُّخْصَةُ مَنْ سِوَاهُ أَمْ لاَ[2].

---

[1] لەگەڵ ئەم زیادەیەدا گێڕاویەتەوە.

[2] بڕوانە: ٩٨٤، ٥٥٤٦، ٥٥٤٩، ٥٥٦١.

## ٥- باسی خواردن لە جەژنی قورباندا

**٩٥٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس پێش نوێژکردنی جەژن قوربانی سەر بڕیبێت، ئەوا با دووبارە قوربانییەکی دیکە سەر ببڕێ))، ئینجا پیاوێك هەستا وتی: لەو ڕۆژەدا گۆشت حەزی لێ دەکرێ و خۆشە، جا باسی دراوسێکانی کرد، وەك بڵێی پێغەمبەر ﷺ باوەڕی بە قسەکەی کرد، جا وتی: من چتیرێکم هەیە لە مەڕێکی دابەستە لام چاکترە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێ دا سەری ببڕێ، بەڵام نازانم ئەو ڕێگەپێدانی (سەربڕینی چتیرە) خەڵکی دیکەشی گرتەوە یان نا[1].**

٩٥٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ الأَضْحَى بَعْدَ الصَّلاَةِ فَقَالَ: «مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا وَنَسَكَ نُسُكَنَا فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَإِنَّهُ قَبْلَ الصَّلاَةِ، وَلاَ نُسُكَ لَهُ». فَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ -خَالُ البَرَاءِ-: يَا رَسُولَ اللهِ، فَإِنِّي نَسَكْتُ شَاتِي قَبْلَ الصَّلاَةِ، وَعَرَفْتُ أَنَّ اليَوْمَ يَوْمُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ، وَأَحْبَبْتُ أَنْ تَكُونَ شَاتِي أَوَّلَ مَا يُذْبَحُ فِي بَيْتِي، فَذَبَحْتُ شَاتِي وَتَغَدَّيْتُ قَبْلَ أَنْ آتِيَ الصَّلاَةَ. قَالَ: «شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَإِنَّ عِنْدَنَا عَنَاقًا لَنَا جَذَعَةً هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْنِ، أَفَتَجْزِي عَنِّي قَالَ: «نَعَمْ، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[2].

**٩٥٥- بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قورباندا پاش نوێژکردن وتاری بۆ داین و فەرمووی: ((هەر کەس ئەم نوێژەی ئێمە بکات، وە وەك ئێمە قوربانی سەر ببڕیبێت، ئەوە قوربانی سەربڕینەکەی**

---

[1] چونکە ئەو چتیرە دروست نییە بۆ قوربانی، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بەو پیاوە دا، وە چشتیر و چووڵێتری پێ دەڵێن کە لە گیسك گەورەترە، بەڵام نەبووە بە بزن.

[2] بڕوانە: ٩٥١.

دروستە، بەڵام هەرکەس پێشنوێژی جەژن قوربانی سەر ببڕێ، جا لەبەر ئەوەی پێش نوێژ بووە ئەوە قوربانییەکەی دروست نییە))، ئینجا ئەبو بوردەی کوڕی نیار -کە خاڵی بەرائە- وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی من مەڕەکەم پێش نوێژ سەر بڕی و زانیم کە ئەمڕۆ ڕۆژی خواردن و خواردنەوەیە، وە حەزم کرد مەڕەکەم یەکەم مەڕ بێ لە ماڵی مندا سەر ببڕدرێ، جا بۆیە مەڕەکەم سەر بڕی و خواردنم خوارد پێش ئەوەی بێم بۆ نوێژی جەژن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مەڕەکەت مەڕی گۆشتە))[1]، ئەبو بوردە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چتیرێکمان هەیە لەدوو مەڕ لام چاکترە، ئایا دروستە سەری ببڕم؟ فەرمووی: ((بەڵێ، وە بۆ کەسی دیکە جگە لە تۆ دروست نییە)).

## ٦- بابُ الخُرُوجِ إِلَى المُصَلَّى بِغَيْرِ مِنْبَرٍ

٩٥٦- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي زَيْدٌ عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ يَوْمَ الفِطْرِ وَالأَضْحَى إِلَى المُصَلَّى، فَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِهِ الصَّلاَةُ ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَيَقُومُ مُقَابِلَ النَّاسِ، وَالنَّاسُ جُلُوسٌ عَلَى صُفُوفِهِمْ، فَيَعِظُهُمْ وَيُوصِيهِمْ وَيَأْمُرُهُمْ، فَإِنْ كَانَ يُرِيدُ أَنْ يَقْطَعَ بَعْثًا قَطَعَهُ، أَوْ يَأْمُرَ بِشَيْءٍ أَمَرَ بِهِ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَلَمْ يَزَلِ النَّاسُ عَلَى ذَلِكَ حَتَّى خَرَجْتُ مَعَ مَرْوَانَ -وَهْوَ أَمِيرُ المَدِينَةِ - فِي أَضْحًى أَوْ فِطْرٍ، فَلَمَّا أَتَيْنَا المُصَلَّى إِذَا مِنْبَرٌ بَنَاهُ كَثِيرُ بْنُ الصَّلْتِ، فَإِذَا مَرْوَانُ يُرِيدُ أَنْ يَرْتَقِيَهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَجَبَذْتُ بِثَوْبِهِ، فَجَبَذَنِي فَارْتَفَعَ، فَخَطَبَ قَبْلَ الصَّلاَةِ، فَقُلْتُ لَهُ غَيَّرْتُمْ وَاللَّهِ. فَقَالَ أَبَا سَعِيدٍ: قَدْ ذَهَبَ مَا تَعْلَمُ. فَقُلْتُ: مَا أَعْلَمُ وَاللَّهِ خَيْرٌ مِمَّا لاَ أَعْلَمُ. فَقَالَ: إِنَّ النَّاسَ لَمْ يَكُونُوا يَجْلِسُونَ لَنَا بَعْدَ الصَّلاَةِ فَجَعَلْتُهَا قَبْلَ الصَّلاَةِ.

---

[1] نەک قوربانی وە بە قوربانی دانانرێ، چونکە پێش کاتی دیاریکراو سەری بڕیبوو.

## ٦- باسی ڕۆیشتنەدەرەوەی شار بۆ نوێژگە بەبێ دوانگە

٩٥٦- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: هەمیشە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا لە شار دەڕۆیشتە دەرەوە بۆ نوێژگە، جا یەكەم شت كە دەستی پێ دەكرد نوێژكردن بوو، پاشان كە تەواو دەبوو، هەڵدەسایەوە ڕوو بە خەڵكەكە دەوەستا و خەڵكەكەش لە ڕیزەكانیاندا دانیشتبوون، ئینجا ئامۆژگاری دەكردن، وەسییەت و فەرمانی خۆی پێ ڕادەگەیاندن، جا ئەگەر بیویستایە لەشكرێك بنێرێ دەینارد، یان بیویستایە فەرمان بە شتێك بكات دەیكرد، پاشان دەگەڕایەوە. ئەبو سەعید دەڵێ: جا خەڵكی لەسەر ئەو شێوە بەردەوام بوون هەتا لە گەڵ مەڕواندا -كە ئەمیری مەدینە بوو- لە جەژنی قوربان یان ڕەمەزاندا ڕۆیشتینە دەرەوەی شار، جا كە ڕۆیشتینە نوێژگە، دەبینین كەسیری كوڕی صەڵت دوانگەیەكی لەوێدا دروست كردووە، یەكسەر مەڕوان ویستی سەر كەوێتە سەر دوانگەكە پێش ئەوەی نوێژ بكات، (ئەبو سەعید دەڵێ:) منیش بە پۆشاكەكەی ڕامكێشا، ئەویش منی ڕاكێشا و ڕۆیشتە سەر دوانگەكە، پێش نوێژكردن وتاری دا، منیش پێم وت: سوێند بە خوا شێوەی نوێژ و وتاری جەژنتان گۆڕی، مەڕوانیش وتی: ئەبو سەعید ئەوەی تۆ دەتزانی ڕۆیشت و بەسەر چوو، منیش وتم: سوێند بە خوا ئەوی دەیزانم چاكترە لەوەی نایزانم، ئەویش وتی: بێگومان خەڵكی دوای نوێژكردن دانانیشن گوێ لە ئێمە بگرن، بۆیە وتارەكەم خستە پێش نوێژەكەوە.

## ٧- بابُ المَشْيِ وَالرُّكُوبِ إِلَى العِيدِ وَالصَّلَاةِ قَبْلَ الخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ

٩٥٧- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسٌ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي فِي الأَضْحَى وَالفِطْرِ، ثُمَّ يَخْطُبُ بَعْدَ الصَّلَاةِ[1].

## ٧- باسی ڕۆیشتن بۆ نوێژی جەژن بەپیادە و بەسواری و نوێژکردنی جەژن پێش وتاردان بەبێ بانگدان و قامەتکردن

**٩٥٧- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە لە جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا نوێژی دەکرد، پاشان دوای نوێژەکە وتاری دەدا.**

٩٥٨- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَوْمَ الفِطْرِ، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الخُطْبَةِ[2].

**٩٥٨- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان چووە دەرەوە (بۆ نوێژگە)، جا پێش وتارەکە بە نوێژکردنی جەژن دەستی پێ کرد.**

٩٥٩- قَالَ: وَأَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَرْسَلَ إِلَى ابْنِ الزُّبَيْرِ فِي أَوَّلِ مَا بُويِعَ لَهُ إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُؤَذَّنُ بِالصَّلَاةِ يَوْمَ الفِطْرِ، إِنَّمَا الخُطْبَةُ بَعْدَ الصَّلَاةِ[3].

---

[1] بڕوانە: ٩٦٣.

[2] بڕوانە: ٩٦١، ٩٧٨.

[3] بڕوانە: ٩٦٠.

**٩٥٩- عەتاو دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ ناردنی بۆ لای عەبدوڵای کوڕی زوبەیر لە سەرەتای ئەو کاتەوەی کە بەیعەتی پێ درابوو، (پێی وت): لە جەژنی ڕەمەزاندا لە ڕابردوودا بانگ نەدەدرا بۆ نوێژی جەژن، وە بێگومان وتارەکە پێش نوێژکردنە (لە جەژندا) .**

٩٦٠- وَأَخْبَرَنِي عَطَاءٌ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَا لَمْ يَكُنْ يُؤَذَّنُ يَوْمَ الفِطْرِ وَلاَ يَوْمَ الأَضْحَى[١].

**٩٦٠- عەبدوڵای کوڕی عەباس و جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ هەردووکیان دەڵێن: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نە لە جەژنی ڕەمەزان و نە لە جەژنی قورباندا، بانگ نەدەدرا (بۆ نوێژی جەژن).**

٩٦١- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَامَ فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ بَعْدُ، فَلَمَّا فَرَغَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ نَزَلَ فَأَتَى النِّسَاءَ، فَذَكَّرَهُنَّ وَهْوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلاَلٍ، وَبِلاَلٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ، يُلْقِي فِيهِ النِّسَاءُ صَدَقَةً. قُلْتُ لِعَطَاءٍ: أَتَرَى حَقًّا عَلَى الإِمَامِ الآنَ أَنْ يَأْتِيَ النِّسَاءَ فَيُذَكِّرَهُنَّ حِينَ يَفْرُغُ؟ قَالَ: إِنَّ ذَلِكَ لَحَقٌّ عَلَيْهِمْ، وَمَا لَهُمْ أَنْ لاَ يَفْعَلُوا[٢].

**٩٦١- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ هەڵسا سەرەتا نوێژی کرد، پاشان دواتر وتاری دا بۆ خەڵکی، جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێ بۆیەوە دابەزی و ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتان، ئامۆژگاری کردن پاڵی دابوو بە دەست و باڵی بیلالەوە، بیلالیش پۆشاکەکەی ڕاخستبوو، ئافرەتان پارەی خێراتیان تێ فڕێ دەدا. (ئیبنو جورەیج دەڵێ:) بە عەتائم وت: تۆ ڕات وایە ئێستا ئیمام پێویستە لەسەری بڕوات بۆ لای ئافرەتان و ئامۆژگارییان بکات، کە لە وتاری**

---

١ بڕوانە: ٩٥٩.

٢ بڕوانە: ٩٥٨.

پیاوان بۆیەوە؟ عەتاو وتی: بەڵێ ئەوە پێویستە لەسەر ئیمامەكان، جا لەبەر چی و چییانە ئەوە ناكەن؟

## ٨- بابُ الخُطْبَةِ بَعْدَ العِيدِ

٩٦٢- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي الحَسَنُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ طَاوُسٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: شَهِدْتُ العِيدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ ﷺ فَكُلُّهُمْ كَانُوا يُصَلُّونَ قَبْلَ الخُطْبَةِ[1].

## ٨- باسی وتاردان پاش نوێژی جەژن

**٩٦٢- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەكر و عومەر و عوسماندا ﷺ، هەموویان پێش وتارەكە نوێژی جەژنیان دەكرد.**

٩٦٣- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ ﷺ يُصَلُّونَ العِيدَيْنِ قَبْلَ الخُطْبَةِ[2].

**٩٦٣- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: هەمیشە پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەكر و عومەر ﷺ پێش وتاردان نوێژی هەردوو جەژنەكانیان دەكرد.**

٩٦٤- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى يَوْمَ الفِطْرِ رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ، تُلْقِي المَرْأَةُ خُرْصَهَا وَسِخَابَهَا[1].

---

[1] بڕوانە: ٩٨.

[2] بڕوانە: ٩٥٧.

**٩٦٤- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژی جەژنی ڕەمەزانی کرد، نە لەپێشیەوە و نە لەپاشیەوە نوێژی سوننەتی نەکرد، پاشان (دوای وتاردان بۆ پیاوان) ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتان و بیلالیشی لەگەڵدا بوو، جا فەرمانی پێ کردن بە ماڵبەخشین، ئەوانیش دەستیان کرد بە فڕێدانی (ئاڵتوونەکانیان بۆ بیلال)، هەر ئافرەت بوو بازن و گوارە و ملوانکەکەی فڕێ دەدا (بۆ سەر پۆشاکەکەی بیلال).**

٩٦٥- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا زُبَيْدٌ قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ نَحَرَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسْكِ فِي شَيْءٍ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَبَحْتُ وَعِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ. فَقَالَ: «اجْعَلْهُ مَكَانَهُ، وَلَنْ تُوفِيَ -أَوْ تَجْزِيَ- عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[٢].

**٩٦٥- بەڕائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان یەکەم کارێك لەم ڕۆژەماندا دەیکەین ئەوەیە کە نوێژ دەکەین، پاشان دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە قوربانییەکەمان سەر دەبڕین، جا ئەو کەسەی ئەمە بکات، ئەوە بێگومان سوننەتی ئێمەی بەجێ هێناوە، هەرکەسیش پێش نوێژی جەژن ئاژەڵی سەر بڕیبێ، ئەوە بێگومان گۆشتێکە دەیدات بە ماڵ و منداڵی خۆی، هیچ پەیوەندی بە قوربانییەوە نییە))، ئینجا پیاوێکی ئەنصاری کە پێی دەوترا: ئەبو بوردەی کوڕی نیار وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پێش نوێژ ئاژەڵم سەر بڕیوە،**

[١] بڕوانە: ٩٨.

[٢] بڕوانە: ٩٥١.

بەڵام چتێریکم هەیە لە مەڕێك چاکترە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیخەرە جێگای سەربڕاوەکە (و سەری ببڕە)، وە بۆ هیچ کەس نابێ -یان دروست نییە- لەپاش تۆ (تەنها ئەمە بۆ تۆ دروستە کە چتێر سەر ببڕی))).

## ٩- بابُ مَا يُكْرَهُ من حَمْلِ السِّلاَحِ فِي العِيدِ وَالحَرَمِ

وَقَالَ الحَسَنُ: نُهُوا أَنْ يَحْمِلُوا السِّلاَحَ يَوْمَ عِيدٍ إِلَّا أَنْ يَخَافوا عَدُوًّا.

٩٦٦- حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ يَحْيَى أَبُو السُّكَيْنِ قَالَ: حَدَّثَنَا المُحَارِبِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سُوقَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ حِينَ أَصَابَهُ سِنَانُ الرُّمْحِ فِي أَخْمَصِ قَدَمِهِ، فَلَزِقَتْ قَدَمُهُ بِالرِّكَابِ، فَنَزَلْتُ فَنَزَعْتُهَا وَذَلِكَ بِمِنًى، فَبَلَغَ الحَجَّاجَ فَجَعَلَ يَعُودُهُ، فَقَالَ الحَجَّاجُ: لَوْ نَعْلَمُ مَنْ أَصَابَكَ. فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَنْتَ أَصَبْتَنِي. قَالَ: وَكَيْفَ؟ قَالَ: حَمَلْتَ السِّلاَحَ فِي يَوْمٍ لَمْ يَكُنْ يُحْمَلُ فِيهِ، وَأَدْخَلْتَ السِّلاَحَ الحَرَمَ وَلَمْ يَكُنِ السِّلاَحُ يُدْخَلُ الحَرَمَ[1].

## ٩- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە هەڵگرتنی چەک لە جەژن و لە مەککە و دەوروبەریدا

حەسەن دەڵێ: (هاوەڵان) ڕێگری کرابوون لە ڕۆژی جەژندا چەك هەڵگرن، مەگەر لە دوژمن بترسن.

٩٦٦- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: من لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەردا بووم رضي الله عنهما، کاتێ نووکی ڕمێك چوو بە ژێر پێیدا و پێی نووساند بە ورزەنگییەکەدا[2]، سەعید دەڵێ: منیش لە وڵاخەکەم دابەزیم نووکە ڕمەکەم دەرهێنا (کە چووبوو

[1] بڕوانە: ٩٦٧.

[2] ورزەنگی: ئەو پارچە ئاسنەیە کە کەسێک سواری وڵاخ و ئەسپ دەبێ پێیەکانی تێ دەخات.

به پێیدا)، ئەم ڕووداوه له مینادا بوو، جا ئەمە گەشتەوە بە حەجاج، ئەویش هات بۆ سەردانی عەبدوڵای کوڕی عومەر، حەجاج وتی: خۆزگە دەمانزانی کێ لێی داوی؟ عەبدوڵای کوڕی عومەریش وتی: تۆ لێت داوم! حەجاج وتی: چۆن؟ عەبدوڵا وتی: تۆ چەکت هەڵگرتووە لە ڕۆژێکدا کە چەکی تێدا هەڵناگیرێ وە چەکت هێناوەتە نێو مەککە و چواردەوری، کە لە ڕابردوودا چەك نەدەهێنرایە مەککە و چواردەوری.

٩٦٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يَعْقُوبَ قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعِيدِ بْنِ العَاصِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلَ الحَجَّاجُ عَلَى ابْنِ عُمَرَ وَأَنَا عِنْدَهُ فَقَالَ: كَيْفَ هُوَ؟ فَقَالَ: صَالِحٌ. فَقَالَ مَنْ أَصَابَكَ؟ قَالَ: أَصَابَنِي مَنْ أَمَرَ بِحَمْلِ السِّلاَحِ فِي يَوْمٍ لاَ يَحِلُّ فِيهِ حَمْلُهُ، يَعْنِي: الحَجَّاجَ[1].

٩٦٧- ئیسحاقی کوڕی سەعید لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: حەجاج هات بۆماڵی عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ، منیش لای عەبدوڵا بووم، حەجاج پێی وت: چۆنە؟ ئەویش وتی: باشە، حەجاج وتی: کێ وای لێ کردووی؟ عەبدوڵا وتی: ئەو کەسە وای لێ کردووم کە فەرمانی بە هەڵگرتنی چەك کردووە، لە ڕۆژێکدا کە چەکهەڵگرتن تێیدا دروست نییە (واتە: حەجاج وای لێ کردووم).

## ١٠- بابُ التَّبْكِيرِ لِلعِيدِ

وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُسْرٍ: إِنْ كُنَّا فَرَغْنَا فِي هَذِهِ السَّاعَةِ، وَذَلِكَ حِينَ التَّسْبِيحِ.

٩٦٨- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ البَرَاءِ قَالَ: خَطَبَنَا النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ قَالَ: .إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ،

---

[1] بڕوانە: ٩٦٦.

فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ عَجَّلَهُ لأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ». فَقَامَ خَالِي أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أُصَلِّيَ وَعِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ. قَالَ: «اجْعَلْهَا مَكَانَهَا -أَوْ قَالَ: اذْبَحْهَا- وَلَنْ تَجْزِيَ جَذَعَةٌ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[1].

## ١٠- باسی زوو ڕۆیشتن بۆ نوێژی جەژن

**عەبدوڵای كوڕی بوسر دەڵێ: ئێمە جاران ئا لەم كاتەدا لە نوێژی جەژن بووبووینەوە، كاتەكەش وەختی چێشتەنگاو بوو.**

**٩٦٨- بەڕاو ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان یەكەم كارێك لەم ڕۆژەماندا دەیكەین ئەوەیە كە نوێژ دەكەین، پاشان دەگەڕێینەوە بۆماڵەوە قوربانی سەر دەبڕین، جا ئەو كەسەی ئەمەی كرد، ئەوە بێگومان سوننەتی ئێمەی بەجێ هێناوە، هەركەسیش پێش نوێژی جەژن ئاژەڵی سەر بڕیبێ، ئەوە بێگومان گۆشتێكە دەیدات بەماڵ و منداڵی خۆی، هیچ پەیوەندی بە قوربانییەوە نییە))، ئینجا خاڵم كە ئەبو بوردەی كوڕی نیارە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پێش ئەوەی نوێژ بكەم ئاژەڵم سەر بڕیوە، بەڵام چتیرێكم هەیە لە مەڕێك چاكترە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیخەرە جێگای سەربڕاوەكە -یان فەرمووی: سەری ببڕە-، وە لەپاش تۆ سەربڕینی چتیر بۆ هیچ كەس نابێ و دروست نییە (ئەمە تەنها بۆ تۆ دروستە))).**

---

[1] بڕوانە: ٩٥١.

## ١١- بابُ فَضْلِ العَمَلِ فِي أيَّامِ التَّشْرِيقِ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَـٰتٍ ﴿٢٨﴾﴾ الحج، أَيَّامُ العَشْرِ، وَالأَيَّامُ المَعْدُودَاتُ: أَيَّامُ التَّشْرِيقِ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ وَأَبُو هُرَيْرَةَ يَخْرُجَانِ إِلَى السُّوقِ فِي أَيَّامِ العَشْرِ يُكَبِّرَانِ، وَيُكَبِّرُ النَّاسُ بِتَكْبِيرِهِمَا. وَكَبَّرَ مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيٍّ خَلْفَ النَّافِلَةِ.

## ١١- باسی گەورەیی کردەوەی چاک
## لە سێ ڕۆژی دوای ڕۆژی جەژنی قورباندا

**عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە مانای ئەم ئایەتەدا:** ﴿وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَـٰتٍ ﴿٢٨﴾﴾ **دەڵێ مەبەست لە:** ﴿أَيَّامٍ مَّعْلُومَـٰتٍ ﴿٢٨﴾﴾ **دە ڕۆژی مانگی** (ذي الحجة)**یە و مەبەست لە:** ﴿الأَيَّامُ المَعْدُودَاتُ﴾ **سێ ڕۆژی دوای ڕۆژی جەژنی قوربانە. عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ و ئەبو هورەیرە ﷺ لە دە ڕۆژی** (ذي الحجة)**دا لە ماڵ دەڕۆیشتنە دەرەوە بۆ بازاڕ و الله أكبریان دەکرد، خەڵکیش بەدوایاندا الله أكبریان دەکرد. وە موحەممەدی کوڕی عەلی لەپاش نوێژی سوننەت الله أكبری دەکرد.**

٩٦٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُسْلِمٍ البَطِينِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَا العَمَلُ فِي أَيَّامِ العَشْرِ أَفْضَلَ مِنَ العَمَلِ فِي هَذِهِ». قَالُوا: وَلاَ الجِهَادُ قَالَ: «وَلاَ الجِهَادُ، إِلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ يُخَاطِرُ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ بِشَيْءٍ».

**٩٦٩- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەنجامدانی کردەوەی چاکە لە دە ڕۆژی** (ذي الحجة) **گەورەتر**

نییه لەم ڕۆژانە (واتە: سێ ڕۆژی دوای ڕۆژی جەژنی قوربان)))، وتیان: جیهاد و تێکۆشانیش لە ڕێگای خوا بەقەدەر ئەوە گەورە نییە؟ فەرمووی: ((نەخێر جیهادیش ئەوەندە گەورە نییە، مەگەر کەسێك بڕوات بۆ جیهاد بەگیان و بە ماڵیەوە، هیچی نەگەڕێتەوە))[١].

## ١٢- بابُ التَّكْبِيرِ أَيَّامَ مِنًى وَإِذَا غَدَا إِلَى عَرَفَةَ

وَكَانَ عُمَرُ ﷺ يُكَبِّرُ فِي قُبَّتِهِ بِمِنًى فَيَسْمَعُهُ أَهْلُ المَسْجِدِ، فَيُكَبِّرُونَ وَيُكَبِّرُ أَهْلُ الأَسْوَاقِ، حَتَّى تَرْتَجَّ مِنًى تَكْبِيرًا. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُكَبِّرُ بِمِنًى تِلْكَ الأَيَّامَ وَخَلْفَ الصَّلَوَاتِ، وَعَلَى فِرَاشِهِ وَفِي فُسْطَاطِهِ، وَمَجْلِسِهِ وَمَمْشَاهُ تِلْكَ الأَيَّامَ جَمِيعًا. وَكَانَتْ مَيْمُونَةُ تُكَبِّرُ يَوْمَ النَّحْرِ. وَكُنَّ النِّسَاءُ يُكَبِّرْنَ خَلْفَ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ وَعُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزَ لَيَالِيَ التَّشْرِيقِ مَعَ الرِّجَالِ فِي المَسْجِدِ.

## ١٢- باسی (الله أكبر)کردن لە ڕۆژی جەژن و سێ ڕۆژی دوای جەژن و کاتێکیش دەڕوات بۆ عەرەفە

ئیمامی عومەر ﷺ لە چادرەکەیەوە لە مینا الله أکبری دەکرد، ئینجا خەڵکی مزگەوتیش گوێیان لێ دەبوو، ئەوانیش الله أکبریان دەکرد، هەروەها خەڵکی بازاڕیش الله أکبریان دەکرد، هەتا وای لێ دەهات هەموو مینا دەنگی الله أکبری لێ دەهات. وە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە ڕۆژانی مینا الله أکبری دەکرد لە مینا، وە لەپاش نوێژەکان و لەسەر نوێنەکانی و لەنێو چادرەکەیدا، وە لە دانیشتن و ڕۆیشتنیدا لە هەموو ئەو ڕۆژانەدا کە لە مینادا بوو (الله أکبری دەکرد). وە مەیمونە لە ڕۆژی جەژنی قورباندا الله أکبری دەکرد و ئافرەتانیش لە دوای

[١] واتە: بە سەر و ماڵەوە بڕوات لەپێناوی خوادا.

**ئەبانی کوڕی عوسمان و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە سێ شەوەکەی دوای جەژن لەگەڵ پیاواندا الله أکبریان دەکرد لە مزگەوتدا.**

٩٧٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الثَّقَفِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسًا وَنَحْنُ غَادِيَانِ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَاتٍ عَنِ التَّلْبِيَةِ كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: كَانَ يُلَبِّي الْمُلَبِّي لاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ الْمُكَبِّرُ فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ[1].

**٩٧٠- موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری سەقەفی دەڵێ: پرسیارم لەئەنەس ﷺ کرد دەربارەی تەلبیەکردن[2]، لەکاتێکدا پێکەوە لە میناوە دەڕۆیشتین بۆ عەرەفات، وتم: ئێوە چۆنتان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ؟ ئەنەس وتی: هەبوو تەلبیەی دەکرد، ڕەخنەی لێ نەدەگیرا، هەشبوو الله أکبری دەکرد، ئەوەش ڕەخنەی لێ نەدەگیرا.**

٩٧١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ حَفْصَةَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: كُنَّا نُؤْمَرُ أَنْ نَخْرُجَ يَوْمَ الْعِيدِ، حَتَّى نُخْرِجَ الْبِكْرَ مِنْ خِدْرِهَا، حَتَّى نُخْرِجَ الْحُيَّضَ فَيَكُنَّ خَلْفَ النَّاسِ، فَيُكَبِّرْنَ بِتَكْبِيرِهِمْ، وَيَدْعُونَ بِدُعَائِهِمْ يَرْجُونَ بَرَكَةَ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَطُهْرَتَهُ[3].

**٩٧١- ئومو عەتییە ﷺ دەڵێ: ئێمە فەرمانمان پێ دەکرا کە بڕۆینە دەرەوەی شار بۆ نوێژی جەژن، هەتا کچی ماڵەوەمان لەگەڵ خۆمان دەبردە دەرەوە، هەتا ئافرەتی حەیزداریشمان دەبرد لەگەڵ خۆمان، جا ئەو حەیزدارانە لەپشتی خەڵکەکەوە دەوەستان، وە لەگەڵ الله أکبری**

---

[1] بروانە: ١٦٥٩.

[2] تەلبیە بریتییە لە وتنی: (لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لك).

[3] بروانە: ٣٢٤.

خەڵکەکەدا ئەوانیش الله أكبريان دەکرد، وە لەگەڵ دوعاكانيان دوعايان دەکرد، بەئومێدی فەڕ و پاکێتی ئەو ڕۆژە بوون.

## ١٣- بابُ الصَّلاة إلى الحرْبَةِ يَوْمَ العيدِ

٩٧٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ تُرْكَزُ الحَرْبَةُ قُدَّامَهُ يَوْمَ الفِطْرِ وَالنَّحْرِ ثُمَّ يُصَلِّي[١].

## ١٣- باسی نوێژکردن ڕوو بە نێزە لە ڕۆژی جەژندا

٩٧٢- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا هەمیشە نێزەیەك لە پێشیەوە دادەچەقێنرا، پاشان نوێژی (جەژنی) دەکرد.

## ١٤- بابُ حَمْلِ العَنَزَةِ أَوِ الحَرْبَةِ بَيْنَ يَدَيِ الإِمَامِ يَوْمَ العِيدِ

٩٧٣- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَمْرٍو قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَغْدُو إِلَى المُصَلَّى، وَالعَنَزَةُ بَيْنَ يَدَيْهِ، تُحْمَلُ وَتُنْصَبُ بِالمُصَلَّى بَيْنَ يَدَيْهِ فَيُصَلِّي إِلَيْهَا[٢].

---

[١] بڕوانە: ٤٩٤.

[٢] بڕوانە: ٤٩٤.

## ١٤- باسی هەڵگرتنی داردەست و نێزە لەپێش ئیمامەوە لە ڕۆژی جەژندا

٩٧٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: هەمیشە پێغەمبەر ﷺ دەرۆیشت بۆ نوێژگە (لە دەرەوەی شار)، داردەستەکە لە پێشیەوە بوو، هەڵدەگیراو لە نوێژگە لە پێشیەوە دادەچەقێنرا، ئەویش ڕووبەڕووی نوێژی دەکرد.

## ١٥- بابُ خُرُوجِ النِّسَاءِ وَالحُيَّضِ إِلَى المُصَلَّى

٩٧٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: أُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ العَوَاتِقَ وَذَوَاتِ الخُدُورِ. وَعَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حَفْصَةَ بِنَحْوِهِ. وَزَادَ فِي حَدِيثِ حَفْصَةَ -قَالَ أَوْ قَالَتِ-: العَوَاتِقَ وَذَوَاتِ الخُدُورِ، وَيَعْتَزِلْنَ الحُيَّضُ المُصَلَّى[1].

## ١٥- باسی ڕۆیشتنی ئافرەتان (ی پاك) و حەیزداران بۆ نوێژگە (لە جەژندا)

٩٧٤- ئومو عەتییە ﷺ دەڵێ: فەرمانمان پێ کرا کە کچانی تازەپێگەشتوو و کچانی کەیبانووی ماڵ ببەینە دەرەوە(ی شار بۆ نوێژی جەژن). ئەیوب لە حەفصەوە وێنەی ئەم وتەی ئومو عەتییە دەگێڕێتەوە، وە لە فەرموودەکەی حەفصە ئەم زیادەشی هەیە -ئەیوب دەڵێ یان حەفصە دەڵێ-: کچانی تازەپێگەشتوو و کچانی کەیبانووی ماڵ، بەڵام حەیزدارەکان کەنارگیر دەبوون لە نوێژگە (و نوێژیان نەدەکرد).

---

[1] بڕوانە: ٣٢٤.

## ١٦- بابُ خُرُوجِ الصِّبْيَانِ إِلَى المُصَلَّى

٩٧٥- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَبَّاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ فِطْرٍ أَوْ أَضْحَى، فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ، وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ[1].

## ١٦- باسی ڕۆیشتنی منداڵان بۆ نوێژگە (لە جەژندا)

**٩٧٥- عەبدوڕەحمان دەڵێ: لە عەبدوڵای کوڕی عەباسم ﷺ بیست وتی: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان یان قوربان بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشتم (بۆ نوێژگە)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، پاشان وتاری دا (بۆ پیاوان)، پاشان هات بۆ لای ئافرەتان ئامۆژگاری کردن خوای بە بیر هێنانەوە و فەرمانی پێ کردن بەماڵبەخشین.**

## ١٧- بابُ اسْتِقْبَالِ الإِمَامِ النَّاسَ فِي خُطْبَةِ العِيدِ

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ مُقَابِلَ النَّاسِ.

٩٧٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ طَلْحَةَ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ البَرَاءِ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ أَضْحَى إِلَى البَقِيعِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ وَقَالَ: «إِنَّ أَوَّلَ نُسُكِنَا فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نَبْدَأَ بِالصَّلاَةِ، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ وَافَقَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلَ ذَلِكَ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْءٌ عَجَّلَهُ لأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ». فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي ذَبَحْتُ وَعِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ. قَالَ: «اذْبَحْهَا، وَلاَ تَفِي عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٩٨.

[2] بڕوانە: ٩٥١.

## ١٧- باسی ڕوو لە خەڵک کردنی ئیمام لە وتاری جەژندا

ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەستا ڕوو بە خەڵکەکە (وتاری دا).

٩٧٦- بەڕاو ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە جەژنی قوربانندا ڕۆیشت بۆ بەقیع و دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان ڕووی تێ کردین و فەرمووی: ((بێگومان یەکەم پەرستش لەم ڕۆژەماندا کە دەستی پێ دەکەین نوێژ (ی جەژن)ـە، پاشان دەگەڕێینەوە قوربانی سەر دەبڕین، جا هەر کەس ئەوە بکات ئەوە بێگومان پەیڕەوی سوننەتی ئێمەی کردووە، ئەو کەسەش پێش ئەو کاتە ئاژەڵی سەر بڕیبێ، ئەوە بێگومان شتێکە پێشی خستووە بۆ ماڵ و منداڵی، هیچ پەیوەندییەکی بە قوربانیەوە نییە))، جا پیاوێك هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من (پێش نوێژی جەژن) ئاژەڵەکەم سەر بڕیوە، بەڵام چتیرێکم هەیە لە مەڕێك چاکترە؟ فەرمووی: ((سەری ببڕە، بەڵام دوای تۆ بۆ کەسی دیکە دروست نییە)).

## ١٨- بابُ العَلَمِ الَّذي بِالمُصَلَّى

٩٧٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَابِسٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ قِيلَ لَهُ: أَشَهِدْتَ العِيدَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَوْلاَ مَكَانِي مِنَ الصِّغَرِ مَا شَهِدْتُهُ، حَتَّى أَتَى العَلَمَ الذِي عِنْدَ دَارِ كَثِيرِ بْنِ الصَّلْتِ فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ، وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَرَأَيْتُهُنَّ يُهْوِينَ بِأَيْدِيهِنَّ يَقْذِفْنَهُ فِي ثَوْبِ بِلاَلٍ، ثُمَّ انْطَلَقَ هُوَ وَبِلاَلٌ إِلَى بَيْتِهِ[١].

---

[١] بڕوانە: ٩٨.

## ١٨- باسی ئەو بەیداخە (نیشانە)ی کە لە نوێژگەدا بوو

٩٧٧- عەبدوڕەحمانی کوڕی عابیس دەڵێ: گوێم لێ بوو عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ پێی وترا: ئامادەی ڕۆیشتنەدەرەوە بووی (بۆ نوێژی جەژن) لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر لەبەر نزیکیم لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەبووایە لەبەر کەمی تەمەنم ئامادە نەدەبووم، (ڕۆیشت) تا چووە لای ئەو بەیداخەی لای ماڵی کەسیر کوڕی صەلتە و نوێژی کرد، پاشان وتاری دا (بۆ پیاوان)، ئینجا ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتان، بیلالیشی لەگەڵدا بوو، جا ئامۆژگاری و مۆچیاری کردن، وە فەرمانی پێ کردن بە ماڵبەخشین، جا ئافرەتانم بینی دەستیان دەبرد (بۆ ملوانکەکەی گەردنیان) و فڕێیان دەدایە پۆشاکەکەی بیلالەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ و بیلال ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ.

## ١٩- بابُ مَوْعِظَةِ الإِمَامِ النِّسَاءَ يَوْمَ الْعِيدِ

٩٧٨- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ نَصْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ الفِطْرِ، فَصَلَّى فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ ثُمَّ خَطَبَ، فَلَمَّا فَرَغَ نَزَلَ فَأَتَى النِّسَاءَ، فَذَكَّرَهُنَّ وَهْوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلاَلٍ، وَبِلاَلٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ، يُلْقِي فِيهِ النِّسَاءُ الصَّدَقَةَ. قُلْتُ لِعَطَاءٍ: زَكَاةَ يَوْمِ الفِطْرِ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ صَدَقَةً يَتَصَدَّقْنَ حِينَئِذٍ، تُلْقِي فَتَخَهَا وَيُلْقِينَ. قُلْتُ: أَتُرَى حَقًّا عَلَى الإِمَامِ ذَلِكَ وَيُذَكِّرُهُنَّ؟ قَالَ: إِنَّهُ لَحَقٌّ عَلَيْهِمْ، وَمَا لَهُمْ لاَ يَفْعَلُونَهُ[1].

---

[1] بڕوانە: ٩٥٨.

## ١٩- باسی ئامۆژگاریکردنی ئیمام بۆ ئافرەتان لە ڕۆژی جەژندا

**٩٧٨- عەتاو دەڵێ: لە جابیری کوڕی عەبدوڵام ﷺ بیست دەیوت: لە جەژنی ڕەمەزاندا پێغەمبەر ﷺ هەستا و نوێژی کرد، بە نوێژ دەستی پێ کرد، پاشان وتاری دا، جا کە لە وتارەکەی بۆیەوە، (لە دوانگەکەی) دابەزی و هات بۆ لای ئافرەتان و ئامۆژگاری کردن، لەوکاتەدا خۆی پاڵی دابۆیەوە بە دەستی بیلالەوە، بیلالیش پۆشاکەکەی ڕاخستبوو، ئافرەتان ئەو ماڵەی دەیانبەخشی فڕێیان دەدایە نێو پۆشاکەکە، بە عەتائم وت: زەکاتی سەرفیترەیان فڕێ دەدایە نێوی؟ وتی: نەخێر، ماڵبەخشینێك بوو لەو ڕۆژەدا بەخشییان، بازنە و خشڵەکانیان فڕێ دەدایە (پۆشاکەکەی بیلالەوە)، (ئیبنو جوڕەیج دەڵێ:) بە عەتائم وت: تۆ ڕات وایە لەسەر ئیمام پێویستە ئەو وتاردانە بۆ ئافرەتان و ئامۆژگاریکردنیان؟ عەتائیش وتی: بەڵێ پێویستە لەسەر ئیمامەکان، بۆچی نایکەن و چییانە؟**

٩٧٩- قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: وَأَخْبَرَنِي الحَسَنُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ الفِطْرَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ ﷺ يُصَلُّونَهَا قَبْلَ الخُطْبَةِ، ثُمَّ يُخْطَبُ بَعْدُ، خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ حِينَ يُجْلِسُ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ يَشُقُّهُمْ حَتَّى جَاءَ النِّسَاءَ مَعَهُ بِلاَلٌ فَقَالَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة. الآيَة، ثُمَّ قَالَ حِينَ فَرَغَ مِنْهَا «آنْتُنَّ عَلَى ذَلِكَ؟». قَالَتِ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ مِنْهُنَّ، لَمْ يُجِبْهُ غَيْرُهَا: نَعَمْ. لاَ يَدْرِى حَسَنٌ مَنْ هِيَ. قَالَ: «فَتَصَدَّقْنَ». فَبَسَطَ بِلاَلٌ ثَوْبَهُ ثُمَّ قَالَ هَلُمَّ لكن فِدَاءٌ أَبِي وَأُمِّي، فَيُلْقِينَ الفَتَخَ وَالخَوَاتِيمَ فِي ثَوْبِ بِلاَلٍ. قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: الفَتَخُ: الخَوَاتِيمُ العِظَامُ كَانَتْ فِي الجَاهِلِيَّةِ.

٩٧٩- حەسەنی کوڕی موسلیم لە تاوسەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷻ دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژنی ڕەمەزان بووم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان ﷺ، هەموویان پێش وتاردان نوێژیان دەکرد، پاشان دواتر وتار دەدرا، جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت (بۆ لای ئافرەتان) دەڵێی ئێستا بە پێش چاومەوەیە، کاتێ بە ئامازەی دەستی خەڵکەکەی دادەنیشاند، پاشان بە نێو پیاواندا ڕێگای خۆی دەکردەوە و هات، هەتا هاتە لای ئافرەتەکان و بیلالیشی لەگەڵدا بوو، جا ئەم ئایەتەی فەرموو: (ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئافرەتانی باوەڕدار هاتن بۆ لات، کە پەیمانت لەگەڵ ببەستن لەسەر ئەوەی کە هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی خوا، دزی و داوێنپیسی نەکەن و منداڵەکانیان نەکوژن، وە هیچ جۆرە بوختانێك هەڵنەبەست لە نێوان دەست و پێیاندا، وە لە هیچ کارێکی چاکەدا بێفەرمانیت نەکەن، ئەوە پەیمانیان لەگەڵدا ببەستە، وە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە لە خوا، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبووی میهرەبانە)، پاشان (کە لە خوێندنەوەی ئایەتەکە بۆیەوە) فەرمووی: ((ئێوە ئەوەی خوێندمەوە بۆتان پێوەی پابەند دەبن؟))، ئافرەتێك لەنێویاندا قسەی کرد، کە جگە لەو کەسیان وەڵامیان نەدایەوە وتی: بەڵێ: (پابەندی دەبین) -حەسەن نازانێ ئەو ئافرەتە کێ بوو!-، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دەی ماڵ ببەخشن))، بیلالیش پۆشاکەکەی ڕاخستبوو، پاشان بیلال وتی: دەی وەرن دایك و باوکم بەفیداتان بێ، جا ئافرەتان بازن و ئەنگوستیلەکانیان هەڵدەدایە پۆشاکەکەی بیلالەوە. عەبدوڕەزاق دەڵێ: (فَتَخ) ئەنگوستیلەی زۆر گەورەیە، کە لە سەردەمی نەفامیدا پێش ئیسلام هەبووە.

## ٢٠- بابٌ: إِذَا لَمْ يَكُنْ لهَا جِلْبَاب فِي العِيدِ

٩٨٠- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ قَالَتْ: كُنَّا نَمْنَعُ جَوَارِيَنَا أَنْ يَخْرُجْنَ يَوْمَ العِيدِ، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ فَنَزَلَتْ قَصْرَ بَنِي خَلَفٍ، فَأَتَيْتُهَا، فَحَدَّثَتْ أَنَّ زَوْجَ أُخْتِهَا غَزَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ غَزْوَةً، فَكَانَتْ أُخْتُهَا مَعَهُ فِي سِتِّ غَزَوَاتٍ. فَقَالَتْ فَكُنَّا نَقُومُ عَلَى المَرْضَى وَنُدَاوِي الكَلْمَى، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلَى إِحْدَانَا بَأْسٌ إِذَا لَمْ يَكُنْ لَهَا جِلْبَابٌ أَنْ لاَ تَخْرُجَ فَقَالَ: «لِتُلْبِسْهَا صَاحِبَتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا، فَلْيَشْهَدْنَ الخَيْرَ وَدَعْوَةَ المُؤْمِنِينَ». قَالَتْ حَفْصَةُ: فَلَمَّا قَدِمَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ أَتَيْتُهَا، فَسَأَلْتُهَا: أَسَمِعْتِ فِي كَذَا وَكَذَا؟ قَالَتْ: نَعَمْ، بِأَبِي -وَقَلَّمَا ذَكَرَتِ النَّبِيَّ ﷺ إِلاَّ قَالَتْ: بِأَبِي- قَالَ: «لِيَخْرُجِ العَوَاتِقُ ذَوَاتُ الخُدُورِ -أَوْ قَالَ: العَوَاتِقُ وَذَوَاتُ الخُدُورِ. شَكَّ أَيُّوبُ- وَالحُيَّضُ، وَيَعْتَزِلُ الحُيَّضُ المُصَلَّى، وَلْيَشْهَدْنَ الخَيْرَ وَدَعْوَةَ المُؤْمِنِينَ». قَالَتْ: فَقُلْتُ لَهَا: آلْحُيَّضُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، أَلَيْسَ الحَائِضُ تَشْهَدُ عَرَفَاتٍ وَتَشْهَدُ كَذَا وَتَشْهَدُ كَذَا؟[1]

## ٢٠- باسێک: ئەگەر ئافرەت لە جەژندا عەبای نەبوو

**٩٨٠- حەفصەی کچی سیرین دەڵێ: ئێمە کچانمان قەدەغە دەکرد بچنە دەرەوە بۆ جەژنەکان، ئینجا ئافرەتێك هات و لە کۆشکی بەنو خەلەف دابەزی، منیش ڕۆیشتم بۆ لای، جا گێڕایەوە کە مێردی خوشکێکی دوانزە غەزای لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردبوو، لە شەشیاندا خوشکەکەی لەگەڵیدا بووە، وتی: ئێمە سەرپەرشتی نەخۆشەکانمان دەکرد و بریندارەکانمان سارێژ دەکرد، خوشکەکەم**

[1] بڕوانە: ٣٢٤.

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا یەكێك لە ئێمە عەبای نەبوو هیچی لەسەرە نەچێتە دەرەوە (بۆ جەژن)؟ فەرمووی: ((با خوشكێكی موسوڵمان عەبایەكی پێ بدات و بیدات بەسەریدا، ئامادەی چاكە و نزای موسوڵمانان بێت))، حەفصە وتی: ئینجا كاتێ ئومو عەتییە ﵂ هات، ڕۆیشتم بۆ لای، پرسیارم لێ كرد: ئایا لەو بارەیەوە و هیچت بیستووە (لە پێغەمبەر ﷺ)؟ وتی: بەڵێ بە باوكەوە بەفیدای بم -ئومو عەتییە ﵂ كەمجار هەبوو ناوی پێغەمبەری ﷺ بهێنایە و نەیوتبا: باوكم بەفیدای بێت- وتی: (پێغەمبەر ﷺ ) فەرمووی ﷺ: ((كچانی تازەپێگەیشتووی كەیبانووی ماڵ -یان فەرمووی: كچانی پێگەیشتوو و كچانی كەیبانووی ماڵ، ئەیوب گومانی بردووە- حەیزدارەكانیش بچن بۆ نوێژی جەژن، بەڵام حەیزدارەكان دوور بكەونەوە لە نوێژگە، وە ئامادەی چاكە و نزای ئیمانداران ببن))، حەفصە دەڵێ: منیش وتم: حەیزدارەكانیش ئامادە بن؟ ئافرەتەكەش وتی: بەڵێ، ئایا حەیزدار ئامادەی وەستانی عەرەفات نابێ، ئامادەی ئەوە و ئەوە نابێ؟

## ٢١- بابُ اعْتِزَالِ الحُيَّضِ المُصَلَّى

٩٨١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: قَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: أُمِرْنَا أَنْ نَخْرُجَ، فَنُخْرِجَ الحُيَّضَ وَالعَوَاتِقَ وَذَوَاتِ الخُدُورِ. قَالَ ابْنُ عَوْنٍ: أَوِ العَوَاتِقَ ذَوَاتِ الخُدُورِ، فَأَمَّا الحُيَّضُ فَيَشْهَدْنَ جَمَاعَةَ المُسْلِمِينَ وَدَعْوَتَهُمْ، وَيَعْتَزِلْنَ مُصَلَّاهُمْ[1].

---

[1] بڕوانە: ٣٢٤.

## ٢١- باسی ئافرەتانی حەیزدار خۆیان دوور بگرن لە نوێژگە

٩٨١- ئومو عەتییە ﷺ دەڵێ: فەرمانمان پێ کرا کە لە شار بڕۆینە دەرەوە (بۆ نوێژی جەژن)، ئافرەتانی حەیزدار و کچانی تازەپێگەیشتوو و کچانی کەیبانووی ماڵەوە ببەینە دەرەوە. ئیبنو عەون دەڵێ: یان کچانی تازەپێگەیشتووی کەیبانووی ماڵ، جا ئافرەتانی حەیزدار ئامادەی کۆڕ و کۆمەڵی موسوڵمانان و نزایان دەبوون، بەڵام دووریان دەگرت لە نوێژگەیان (چونکە نوێژ ناکەن).

## ٢٢- بابُ النَّحْرِ وَالذَّبْحِ بِالمُصَلَّى يَوْمَ النَّحْرِ

٩٨٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي كَثِيرُ بْنُ فَرْقَدٍ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَنْحَرُ أَوْ يَذْبَحُ بِالمُصَلَّى[1].

## ٢٢- باسی سەربڕینی وشتر و ئاژەڵ لەنوێژگە لەڕۆژی جەژنی قورباندا

٩٨٢- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ وشتر یان ئاژەڵی لە نوێژگە سەر دەبڕی.

## ٢٣- باب كَلَامِ الإِمَامِ وَالنَّاسِ فِي خُطْبَةِ العِيدِ، وَإِذَا سُئِلَ الإِمَامُ عَنْ شَيْءٍ وَهُوَ يَخْطُبُ

٩٨٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ قَالَ: حَدَّثَنَا مَنْصُورُ بْنُ المُعْتَمِرِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ بَعْدَ الصَّلَاةِ

---

[1] بڕوانە: ١٧١٠، ١٧١١، ٥٥٥١، ٥٥٥٢.

فَقَالَ: «مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا وَنَسَكَ نُسْكَنَا فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَتِلْكَ شَاةُ لَحْمٍ». فَقَامَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَقَدْ نَسَكْتُ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ إِلَى الصَّلاَةِ، وَعَرَفْتُ أَنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ فَتَعَجَّلْتُ وَأَكَلْتُ، وَأَطْعَمْتُ أَهْلِي وَجِيرَانِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تِلْكَ شَاةُ لَحْمٍ». قَالَ: فَإِنَّ عِنْدِي عَنَاقَ جَذَعَةٍ، هِيَ خَيْرٌ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ، فَهَلْ تَجْزِي عَنِّي؟ قَالَ: «نَعَمْ، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[1].

## ٢٣- باسی قسەکردنی پێشنوێژ و خەڵک لە کاتی وتاری جەژندا، وە ئەگەر پێشنوێژ پرسیاری شتێکی لێ بکرێ لە کاتێکدا وتار دەدات[2]

**٩٨٣- بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قورباندا پاش نوێژکردن وتاری بۆ داین، فەرمووی: ((هەر کەس ئەم نوێژەی ئێمەی کرد، وە وەك ئێمە قوربانی سەر بڕی، ئەوە بێگومان قوربانی سەربڕینەکەی دروستە، بەڵام هەرکەس پێش نوێژی جەژن قوربانی سەر بڕیبێ، ئەوە سەربڕینی مەڕی گۆشتە (قوربانی نییە)))، جا ئەبو بوردەی کوڕی نیار هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵاهی بەڕاستی من پێش ئەوەی بێم بۆ نوێژ مەڕەکەم سەر بڕی، زانیم کە ئەمڕۆ ڕۆژی خواردن و خواردنەوەیە، بۆیە پەلەم کرد و لێم خوارد، دەرخواردی ماڵ و منداڵم و**

---

[1] بڕوانە: ٩٥١.

[2] وەڵام بداتەوە یان نا؟

**دراوسێکانم دا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەو مەڕە مەڕی گۆشتە))[1]، ئەبو بوردە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چتیرێکم هەیە لە دوو مەڕی گۆشت چاکترە، ئایا دروستە بۆم سەری ببڕم؟ فەرمووی: ((بەڵێ، بەڵام بۆ کەسی دیکە جگە لە تۆ دروست نییە)).**

٩٨٤- حَدَّثَنَا حَامِدُ بْنُ عُمَرَ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ خَطَبَ فَأَمَرَ مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاَةِ أَنْ يُعِيدَ ذَبْحَهُ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، جِيرَانٌ لِي -إِمَّا قَالَ: بِهِمْ خَصَاصَةٌ، وَإِمَّا قَالَ: بِهِمْ فَقْرٌ- وَإِنِّي ذَبَحْتُ قَبْلَ الصَّلاَةِ، وَعِنْدِي عَنَاقٌ لِي أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ. فَرَخَّصَ لَهُ فِيهَا[2].

**٩٨٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی جەژنی قوربان نوێژی جەژنی کرد، پاشان وتاری دا، وە فەرمانی کرد ئەوەی پێش نوێژی جەژن قوربانی سەربڕیوە، دووبارە قوربانییەك سەربڕێتەوە، جا پیاوێکی ئەنصاڕی هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ دراوسێم هەیە -یان وتی: برسین، یان وتی: هەژارن - منیش پێش نوێژ قوربانییەکەم سەر بڕی، بەڵام چتیرێکم هەیە لە دوو مەڕی دابەستە لام چاکترە، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگەی دا سەری ببڕێ.**

٩٨٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ قَالَ:حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ جُنْدُبٍ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ خَطَبَ، ثُمَّ ذَبَحَ فَقَالَ: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيَذْبَحْ أُخْرَى مَكَانَهَا، وَمَنْ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ بِاسْمِ اللَّهِ»[3].

---

[1] نەک قوربانی، ئەوە بە قوربانی دانانرێت.

[2] بڕوانە: ٩٥٤.

[3] بڕوانە: ٥٥٠٠، ٥٥٦٢، ٦٦٧٤، ٧٤٠٠.

٩٨٥- جوندوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قورباندا نوێژی کرد، پاشان وتاری دا، پاشان قوربانی سەر بڕی و فەرمووی: ((هەر کەس قوربانی سەر بڕیوە پێش ئەوەی نوێژ بکات، ئەوە با قوربانییەکی دیکە لە جێگایدا سەر ببڕێ، هەر کەسیش قوربانی سەر نەبڕیوە، ئەوە با بە ناوی خواوە سەری ببڕێت)).

## ٢٤- بابُ مَنْ خَالَفَ الطَّرِيقَ إِذَا رَجَعَ يَوْمَ العِيدِ

٩٨٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو تُمَيْلَةَ يَحْيَى بْنُ وَاضِحٍ، عَنْ فُلَيْحِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَانَ يَوْمُ عِيدٍ خَالَفَ الطَّرِيقَ. تَابَعَهُ يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ عَنْ فُلَيْحٍ. وَحَدِيثُ جَابِرٍ أَصَحُّ.

## ٢٤- باسی کەسێ ڕێگاکەی بگۆڕێ ئەگەر لە ڕۆژی جەژندا (لە نوێژ) گەڕایەوە

٩٨٦- جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ئەگەر جەژن بووایە ڕێگای دەگۆڕی (لە گەڕانەوەیدا لە نوێژی جەژن). یونوسی کوڕی موحەممەد لە فولەیحەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی فەرموودەکەی یەحیا دەکات، بەڵام فەرموودەکەی جابیر صەحیحترە (لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە).

## ٢٥- بابٌ: إِذَا فَاتَهُ العِيدُ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَكَذَلِكَ النِّسَاءُ، وَمَنْ كَانَ فِي البُيُوتِ وَالقُرَى

لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ((هَذَا عِيدُنَا أَهْلَ الإِسْلاَمِ)). وَأَمَرَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ مَوْلاَهُمُ ابْنَ أَبِي عُتْبَةَ بِالزَّاوِيَةِ، فَجَمَعَ أَهْلَهُ وَبَنِيهِ، وَصَلَّى كَصَلاَةِ أَهْلِ المِصْرِ وَتَكْبِيرِهِمْ. وَقَالَ عِكْرِمَةُ: أَهْلُ السَّوَادِ يَجْتَمِعُونَ فِي العِيدِ يُصَلُّونَ رَكْعَتَيْنِ كَمَا يَصْنَعُ الإِمَامُ. وَقَالَ عَطَاءٌ: إِذَا فَاتَهُ العِيدُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ.

## ٢٥- باسێک: ئەگەر پیاوێك نوێژی جەژنەکەی فەوتا دوو ڕکات نوێژ دەکات، ئافرەتانیش بە هەمان شێوە، ئەوانەش لە ماڵەوەن و ئەوانەش لە گوندەکانن[1]

**بە بەڵگەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ئەمە جەژنی ئێمەی موسوڵمانانە))، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە زاوییە فەرمانی کرد بە بەردەستەکەی کە ئیبنو ئەبو عوتبەیە، جا کەسوکاری و کوڕەکانی کۆ کردەوە و پیشنوێژی بۆ کردن، وەك نوێژی جەژنی خەڵکی شار و الله أکبرکردنی ئەوان. عیکریمە دەڵێ: خەڵکی دێهات لە جەژندا کۆ دەبنەوە و دوو ڕکات نوێژ دەکەن، بەو شێوەی پێشنوێژ دەیکات. عەتاو دەڵێ: ئەگەر کەسێك نوێژی جەژنی فەوتا، دوو ڕکات نوێژ دەکات لەجیاتی.**

٩٨٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا جَارِيَتَانِ فِي أَيَّامِ مِنًى تُدَفِّفَانِ وَتَضْرِبَانِ،

---

[1] ئەگەر نوێژی جەژنیان نەکرد و فریای نەکەوتن ئەوە خۆیان دوو ڕکات نوێژی جەژن دەکەن.

وَالنَّبِيُّ ﷺ مُتَغَشٍّ بِثَوْبِهِ، فَانْتَهَرَهُمَا أَبُو بَكْرٍ، فَكَشَفَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ وَجْهِهِ فَقَالَ: «دَعْهُمَايا أَبَا بَكْرٍ فَإِنَّهَا أَيَّامُ عِيدٍ». وَتِلْكَ الأَيَّامُ أَيَّامُ مِنًى[1].

**٩٨٧- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە ئەبو بەکر ﵁ هات بۆ ماڵیان، دوو کەنیزەکی لابوو لە ڕۆژانی جەژندا گۆرانییان دەوت و دەفیان لێ دەدا، پێغەمبەریش ﷺ بە پۆشاکەکەی خۆی داپۆشیبوو، جا ئەبو بەکر تورەبوو لە دوو کەنیزەکەکە و تێی خوڕین، پێغەمبەریش ﷺ پۆشاکەکەی لادا لەسەری و فەرمووی: ((ئەبو بەکر وازیان لێ بێنە، چونکە بێگومان ڕۆژانی جەژنە))، ئەو ڕۆژانەش ڕۆژانی مینا و جەژن بوو.**

٩٨٨- وَقَالَتْ عَائِشَةُ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَسْتُرُنِي، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى الحَبَشَةِ وَهُمْ يَلْعَبُونَ فِي المَسْجِدِ، فَزَجَرَهُمْ عُمَرُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «دَعْهُمْ، أَمْنًا بَنِي أَرْفِدَةَ». يَعْنِي: مِنَ الأَمْنِ[2].

**٩٨٨- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لە بەردەممدا وەستا، منیش سەیری حەبەشییەکانم دەکرد، لە کاتێکدا لە مزگەوتدا یارییان دەکرد، جا عومەر تێی خوڕین و لێیان تورە بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((عومەر لێیان گەڕێ، بەنو ئەرفیدە بەبێ ترس یاری خۆتان بکەن)). واتە: (أَمْنًا) لە (أَمْن)ـەوە وەرگیراوە کە بە مانای نەترسانە.**

## ٢٦- بابُ الصَّلَاةِ قَبْلَ العِيدِ وَبَعْدَهَا

وَقَالَ أَبُو المُعَلَّى: سَمِعْتُ سعيد بن جبير، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ كَرِهَ الصَّلاَةَ قَبْلَ العِيدِ.

---

[1] بڕوانە: ٩٤٩.

[2] بڕوانە: ٤٥٤.

٩٨٩- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَوْمَ الفِطْرِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا وَمَعَهُ بِلاَلٌ[1].

## ٢٦- باسی نوێژ (ی سوننەت) لە پێش و پاشی نوێژی جەژنەوە (دروستە)

**ئەبولوعەللا دەڵێ: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرم بیست لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ گێڕایەوە کە نوێژی سوننەتی پێش نوێژی جەژنی بەلاوە ناپەسەند بوو.**

**٩٨٩- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لە جەژنی ڕەمەزاندا لە شار دەرچوو (بۆ نوێژگە)، دوو ڕکاتی نوێژی جەژنی کرد، نە لە پێشیەوە و نە لە پاشیەوە نوێژی سوننەتی نەکرد، بیلالیشی لەگەڵدا بوو.**

---

[1] بڕوانە: ٩٨.

# ١٤- كِتابُ صلاةِ الوِترِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١٤- پەڕاوی نوێـژی ویتر

## ١- بابُ مَا جَاءَ فِي الوِتْرِ

٩٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى»(١).

## ١- باسی ئەوەی دەربارەی نوێژی ویتر هاتووە

**٩٩٠- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: كە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی شەونوێژ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((شەونوێژ دوو ڕكات دوو ڕكاتە، جا ئەگەر كەسێكتان ترسی هەبوو نوێژی بەیانی ببێ (بانگ بدات)، ئەوە یەك ڕكات نوێژ بكات، ئەو نوێژانەی (پێشتر) كردوویەتی بۆی دەكات بە نوێژی ویتر))[٢].**

٩٩١- وَعَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يُسَلِّمُ بَيْنَ الرَّكْعَةِ وَالرَّكْعَتَيْنِ فِي الوِتْرِ، حَتَّى يَأْمُرَ بِبَعْضِ حَاجَتِهِ.

---

[١] بروانە: ٤٧٢.

[٢] واتە: یەک ڕكاتەكە بری یازدە ڕكاتی ویتر دەكەوێ بۆی پاداشتی نوێژەكانی ویتری بۆ دەنووسرێت.

**٩٩١- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە نوێژی ویتردا لە نێوان یەك ڕکاتەکە و دوو ڕکاتەکەی پێشیدا سەلامی دەدایەوە، هەتا جاری وا بوو (لە کاتی سەلامدانەوەدا) فەرمانی دەکرد بە هەندێ شت کە پێویستی بوو.**

٩٩٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ مَخْرَمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ كُرَيْبٍ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ -وَهْيَ خَالَتُهُ- فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ وِسَادَةٍ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ حَتَّى انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَرِيبًا مِنْهُ، فَاسْتَيْقَظَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ، ثُمَّ قَرَأَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ، فَتَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي فَصَنَعْتُ مِثْلَهُ، فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي، وَأَخَذَ بِأُذُنِي يَفْتِلُهَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى جَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ، فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ، خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ[1].

**٩٩٢- کوڕەیب دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ بۆی گێڕایەوە کە (شەوێك) لە ماڵی مەیمونە مایەوە -کە پووری عەبدوڵا بوو-، (دەڵێ:) جا من ڕاکشام لەسەر باری پانی ڕاخەرەکە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ و خێزانی لەسەر باری درێژی ڕاکشان، ئینجا (پێغەمبەری خوا ﷺ) خەوت تا شەو نیوە بوو، یان نزیك بوو لە نیوەشەو، ئینجا هەستا لە خەو و دەستی هێنا بە دەموچاویدا، ئاسەواری خەوی لێ دەسڕی، پاشان دە ئایەتی لە سوورەتی ئالی عیمڕان خوێند، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و ڕۆیشت بۆ لای جەوەنەیەکی هەڵواسراو (ئاوی تیا بوو)، جا دەستنوێژێکی جوانی گرت، پاشان هەستا و دەستی کرد بە نوێژکردن، (عەبدوڵا وتی:) منیش هەستام وەك ئەوم کرد، جا لە تەنیشتیدا وەستام (و**

[1] بڕوانە: ١١٧.

**نوێژم دابەست)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەستی ڕاستی نایە سەر سەرم و گوێی گرتم و بایدا، پاشان پێغەمبەر ﷺ دوو ڕكات نوێژی كرد، پاشان دوو ڕكاتی دیكەی كرد، پاشان دووانی دیكەی كرد، ئینجا دوو ڕكاتی دیكەی كرد، پاشان دوو ڕكاتی دیكەی كرد، پاشان دوو ڕكاتی دیكەی كرد، ئینجا یەك ڕكاتی ویتری كرد، پاشان ڕاكشا هەتا بانگبێژەكە هات بۆ خزمەتی (ئاگاداری كرد)، ئیدی هەستا و دوو ڕكات نوێژی (سوننەتی) كرد، ئینجا ڕۆیشت و نوێژی بەیانی كرد (بە پێشنوێژ بۆ موسوڵمانان).**

٩٩٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ القَاسِمِ حَدَّثَهُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَنْصَرِفَ فَارْكَعْ رَكْعَةً تُوتِرُ لَكَ مَا صَلَّيْتَ». قَالَ القَاسِمُ: وَرَأَيْنَا أُنَاسًا مُنْذُ أَدْرَكْنَا يُوتِرُونَ بِثَلاَثٍ، وَإِنَّ كُلاًّ لَوَاسِعٌ، أَرْجُو أَنْ لاَ يَكُونَ بِشَيْءٍ مِنْهُ بَأْسٌ[1].

**٩٩٣- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((شەونوێژ دوو ڕكات دوو ڕكاتە، ئەگەر ویستت شەونوێژەكەت كۆتایی پێ بهێنی، ئەوە یەك ڕكات نوێژ بكە، ئەو نوێژانەی كردووتە بۆت دەكات بە نوێژی تاك)). قاسم دەڵێ: خەڵكانێكمان بینیوە لەو كاتەوەی پێگەیشتووین سێ ڕكات ویتر دەكەن، هەمووی دروستە و دەبێ، ئومێد دەكەم بە هەر شێوەیەك بكرێ قەیناكات و دروست بێ.**

٩٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، كَانَتْ تِلْكَ صَلاَتَهُ -تَعْنِي: بِاللَّيْلِ- فَيَسْجُدُ

---

[1] بروانه: ٤٧٢.

السَّجْدَةَ مِنْ ذَلِكَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الفَجْرِ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ حَتَّى يَأْتِيَهُ المُؤَذِّنُ لِلصَّلاَةِ[1].

**٩٩٤- عوروه دەڵێ: عائیشه ﵂ بۆی گێڕایەوه کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشه یازده ڕکات نوێژی دەکرد، نوێژکردنی بەو شێوەیه بوو- واته: به شەودا-، ئینجا سوژدەیەکی دەبرد لەو نوێژەدا بە ئەندازەی ئەوەی کەسێکتان پەنجا ئایەت بخوێنێ، پێش ئەوەی سەری بەرز کاتەوە، وە (دوای ویتر) دوو ڕکات نوێژی (سوننەتی) دەکرد پێش نوێژی بەیانی، پاشان لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا، هەتا بانگبێژ ئاگاداری دەکرد بۆ نوێژی بەیانی.**

## ٢- بَابُ سَاعَاتِ الوِتْرِ

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَوْصَانِي النَّبِيُّ ﷺ بِالوِتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ.

٩٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ سِيرِينَ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ: أَرَأَيْتَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الغَدَاةِ أُطِيلُ فِيهِمَا القِرَاءَةَ؟ فَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، وَيُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الغَدَاةِ، وَكَأَنَّ الأَذَانَ بِأُذُنَيْهِ. قَالَ حَمَّادٌ: أَيْ: سُرْعَةً[2].

## ٢- باسی کاتەکانی نوێژی ویتر

**ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەسییەتی بۆ کردم بەکردنی نوێژی ویتر پێش خەوتن.**

---

[1] بڕوانە: ٦١٩.

[2] بڕوانە: ٤٧٢.

٩٩٥- ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: بە عەبدوڵای کوڕی عومەرم ﷺ وت: پێم بڵێ دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی قورئانیان زۆر تێدا بخوێنم؟ عەبدوڵاش وتی: پێغەمبەر ﷺ لە شەودا دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی دەکرد، یەك ڕکاتیش نوێژی ویتری دەکرد، پێش نوێژی بەیانیش دوو ڕکات نوێژی (سوننەتی) دەکرد (ئەوەندە بەپەلە دەیکرد)، دەتوت گوێی لە قامەتە (و دەترسێ فریای سەرەتای نوێژی بەیانی نەکەوێت بەجەماعەت). حەماد دەڵێ: لە پەلەکردندا.

٩٩٦- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي مُسْلِمٌ، عَنْ مَسْرُوقٍ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُلَّ اللَّيْلِ أَوْتَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ.

٩٩٦- عائیشە ﷺ دەڵێ: لە هەموو کاتێکی شەودا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ویتری کردووە، هەتا کاتی وا هەبووە نوێژی ویترەکەی کەوتۆتە بەرەبەیان.

## ٣- بابُ إِيقاظِ النَّبِيِّ ﷺ أَهْلَهُ بِالوِتْرِ

٩٩٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي وَأَنَا رَاقِدَةٌ مُعْتَرِضَةً عَلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ أَيْقَظَنِي فَأَوْتَرْتُ[1].

## ٣- باسی پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی خەبەر کردۆتەوە لە خەو بۆ ئەنجامدانی نوێژی ویتر

٩٩٧- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد (لە شەودا) منیش لەسەر نوێنەکەی ڕاکشابووم، ئینجا کاتێ بیویستایە نوێژی ویتر بکات، خەبەری دەکردمەوە و نوێژی ویترم دەکرد.

---

[1] بڕوانە: ٣٨٢.

## ٤- بابٌ: لِيَجْعَلْ آخِرَ صَلاَتِهِ وِتْرًا

٩٩٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اجْعَلُوا آخِرَ صَلاَتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا»[1].

## ٤- باسێک: (موسوڵمان) با کۆتاهەمین نوێژی شەوی بکاتە نوێژی ویتر

**٩٩٨- نافیع لە عەبدوڵاوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کۆتاهەمین نوێژتان بە شەودا بکەنە ویتر)).**

## ٥- بابُ الوِتْرِ عَلَى الدَّابَّةِ

٩٩٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَسِيرُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بِطَرِيقِ مَكَّةَ. فَقَالَ سَعِيدٌ: فَلَمَّا خَشِيتُ الصُّبْحَ نَزَلْتُ فَأَوْتَرْتُ، ثُمَّ لَحِقْتُهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: أَيْنَ كُنْتَ؟ فَقُلْتُ: خَشِيتُ الصُّبْحَ، فَنَزَلْتُ فَأَوْتَرْتُ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَلَيْسَ لَكَ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ؟ فَقُلْتُ: بَلَى وَاللَّهِ. قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ عَلَى البَعِيرِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٤٧٢.

[2] بڕوانە: ١٠٠٠، ١٠٩٥، ١٠٩٦، ١٠٩٨، ١١٠٥.

## ٥- باسی نوێژی ویتر بەسەر وڵاخەوە بكرێ

٩٩٩- سەعیدی كوڕی یەسار دەڵێ: من لەگەڵ عەبدوڵای كوڕی عومەردا ﷺ بە ڕێگای مەككەدا دەڕۆیشتم، سەعید دەڵێ: جا كە ترسام نوێژی بەیانی بێت، لە وڵاخەكەم دابەزیم و نوێژی ویترم كرد، پاشان گەشتمەوە بە عەبدوڵا، ئینجا عەبدوڵای كوڕی عومەر وتی: لەكوێ بوویت؟ منیش وتم: ترسام نوێژی بەیانی بێت، بۆیە دابەزیم و نوێژی ویترەكەم كرد، عەبدوڵاش وتی: ئایا لە پێغەمبەردا ﷺ باشترین سەرمەشقی بۆ تۆ نییە؟ منیش وتم: بەرێ وەڵا، وتی: دە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر وشترەوە نوێژی ویتری دەكرد.

## ٦- بابُ الوِتْرِ فِي السَّفَرِ

١٠٠٠- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ بْنُ أَسْمَاءَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فِي السَّفَرِ عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِهِ، يُومِئُ إِيمَاءً، صَلاَةَ اللَّيْلِ إِلاَّ الفَرَائِضَ، وَيُوتِرُ عَلَى رَاحِلَتِهِ[1].

## ٦- باسی ئەنجامدانی نوێژی ویتر لە سەفەردا (دروستە)

١٠٠٠- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە سەفەردا بەسەر وڵاخەكەیەوە نوێژی دەكرد، ڕوو بە هەر كوێ بڕۆیشتایە، لە نوێژی شەونوێژدا بە ئاماژەكردن ئاماژەی دەكرد، جگە لە نوێژی فەرز (كە بەسەر وڵاخەكەوە نەیدەكرد)، وە نوێژی ویتریشی بەسەر وڵاخەكەیەوە دەكرد.

---

[1] بڕوانە: ٩٩٩.

## ٧- بابُ القُنُوتِ قَبْلَ الرُّكُوعِ وَبَعْدَهُ

١٠٠١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ سُئِلَ أَنَسٌ أَقَنَتَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الصُّبْحِ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَقِيلَ لَهُ: أَوَقَنَتَ قَبْلَ الرُّكُوعِ؟ قَالَ بَعْدَ الرُّكُوعِ يَسِيراً[١].

## ٧- باسی خوێندنی دوعای قونوت لەپێش کڕنوش و لەدواشیەوە (دروستە)

**١٠٠١- موحەممەد دەڵێ: پرسیار لە ئەنەس ﷺ کرا ئایا پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا قونوتی خوێندووە؟ ئەنەس وتی: بەڵێ، پێی وترا: ئایا پێش کڕنوش قونوتی خوێندووە؟ وتی: ماوەیەکی کەم[٢] پاش کڕنوش قونوتی خوێندووە.**

١٠٠٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَاصِمٌ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، عَنِ القُنُوتِ. فَقَالَ قَدْ كَانَ القُنُوتُ. قُلْتُ قَبْلَ الرُّكُوعِ أَوْ بَعْدَهُ؟ قَالَ: قَبْلَهُ. قَالَ: فَإِنَّ فُلاَنًا أَخْبَرَنِي عَنْكَ أَنَّكَ قُلْتَ: بَعْدَ الرُّكُوعِ. فَقَالَ: كَذَبَ، إِنَّمَا قَنَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَعْدَ الرُّكُوعِ شَهْرًا -أُرَاهُ- كَانَ بَعَثَ قَوْمًا يُقَالُ لَهُمُ القُرَّاءُ زُهَاءَ سَبْعِينَ رَجُلًا إِلَى قَوْمٍ مِنَ المُشْرِكِينَ دُونَ أُولَئِكَ، وَكَانَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَهْدٌ، فَقَنَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ شَهْرًا يَدْعُو عَلَيْهِمْ[٣].

---

[١] بڕوانە: ١٠٠٢، ١٠٠٣، ١٣٠٠، ٢٨٠١، ٢٨١٤، ٣٠٦٤، ٣١٧٠، ٤٠٨٨، ٤٠٨٩، ٤٠٩٠، ٤٠٩٢، ٤٠٩٤، ٤٠٩٥، ٤٠٩٦، ٦٣٩٤، ٧٣٤١.

[٢] مەبەستی ئەنەس ئەوەیە کە بۆ ماوەیەکی کەم قونوتی پاش کڕنوش خوێندووە، هەندێک دەڵێن: بۆ ماوەی مانگێک بووە قونوتی پاش کڕنوش خوێندووە وەک لە گێڕانەوەکەی عاصیمدا هاتووە لە فەرموودەی (١٠٠٢)دا. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٤/٣.

[٣] بڕوانە: ١٠٠١.

**١٠٠٢- عاصیم دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ کرد دەربارەی خوێندنی قونوت، ئەنەسیش وتی: بێگومان لە سەردەمی پێشوودا خوێندنی قونوت هەبوو، وتم: پێش کڕنوش یان لەپاشیەوە؟ وتی: پێش کڕنوش، (عاصیم) وتی: فلان کەس بۆی گێڕامەوە لە تۆوە کە تۆ وتووتە: پاش کڕنوش! ئەنەسیش وتی: وا نییە ڕاست ناکات! بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ مانگێك پاش کڕنوش قونوتی خوێندووە، ـوا دەزانم ـ کۆمەڵێکی نارد کە پێیان دەوترا: قورئانخوێنەکان، نزیکەی حەفتا پیاو دەبوون، ناردنی بۆ نێو کۆمەڵێ لە بتپەرستان، جگە لەوانەی (دوعای لێ کردن)، کە لە نێوان ئەو بتپەرستانە و پێغەمبەردا ﷺ پەیمان هەبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ یەك مانگ قونوتی خوێند، دوعای دەکرد لەو هاوبەشدانەرانە (ی قورئانخوێنەکانیان شەهید کرد).**

**١٠٠٣-** أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَنَتَ النَّبِيُّ ﷺ شَهْرًا يَدْعُو عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ[1].

**١٠٠٣- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ یەك مانگ قونوتی خوێند، دوعای دەکرد لە (هۆزەکانی) ریعل و زەکوان.**

**١٠٠٤-** حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ الْقُنُوتُ فِي الْمَغْرِبِ وَالْفَجْرِ.

**١٠٠٤- ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێشوودا قونوت لە نوێژی ئێوارە و بەیانیاندا هەبوو.**

[1] بڕوانە: ١٠٠١.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ١٥- كِتَابُ الإِسْتِسْقَاءِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١٥- پەڕاوی داواکردنی بارانبارین

## ١- بابُ الإِسْتِسْقَاءِ وَخُرُوجِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الاِسْتِسْقَاءِ

١٠٠٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يَسْتَسْقِي وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ[1].

## ١- باسی داواکردنی بارانبارین و ڕۆشتنەدەرەوەی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە بۆ نوێژەبارانە

**١٠٠٥- عەبادی کوڕی تەمیم لە مامەیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خودا ﷺ لە مەدینە چووە دەرەوە داوای بارانبارینی لە خودا دەکرد و پۆشاکەکەی هەڵگێڕایەوە (و دوو ڕکات نوێژی کرد)[2].**

## ٢- بابُ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ: «اجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ (عليه السلام)»

١٠٠٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا مُغِيرَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ عَيَّاشَ بْنَ أَبِي

---

[1] بڕوانە: ١٠٠١، ١٠١٢،١٠٢٣، ١٠٢٤، ١٠٢٥، ١٠٢٦، ١٠٢٧، ١٠٢٨، ٦٣٤٣.

[2] زیادەی نێو کەوانەکە ئیمام بوخاری لە صەحیحەکەیدا بەهەمان ڕشتە لە فەرموودەی ژمارە (١٠١٢)دا هێناویەتی.

رَبِيعَةَ، اللَّهُمَّ أَنْجِ سَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، اللَّهُمَّ أَنْجِ الوَلِيدَ بْنَ الوَلِيدِ، اللَّهُمَّ أَنْجِ المُسْتَضْعَفِينَ مِنَ المُؤْمِنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ». وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «غِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ». قَالَ ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ أَبِيهِ: هَذَا كُلُّهُ فِي الصُّبْحِ[1].

## ٢- باسی ئەم دوعایەی پێغەمبەر ﷺ: ((خوایە گرانی و قاتوقڕییان بە سەردا بێنی وەک قاتوقڕی سەردەمی یوسف (علیه السلام)))

**١٠٠٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز دەکردەوە لە کڕنوشی ڕکاتی کۆتایی نوێژدا دەیفەرموو: ((خوایە عەیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە ڕزگار بکەیت، خوایە سەلەمەی کوڕی هیشام ڕزگار بکەیت، خوایە وەلیدی کوڕی وەلید ڕزگار بکەیت، خوایە ئیمانداره لاواز و بێدەسەلاتەکان ڕزگار بکەیت، خوایە تۆڵە و سزای خۆت بەتوندی بدەی بەسەر هۆزی موزەڕدا، خوایە گرانی و قاتوقڕییان بەسەردا بێنی، وەك قاتوقڕی سەردەمی یوسف ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هۆزی غیفار خوا لێیان خۆش بێ و ئەسلەمیش خوا سەلامەتیان بکات))، ئیبنو ئەبو زیناد لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەمەی باس کرا هەمووی لە نوێژی بەیانیاندا بووە (ئەو قونوتخوێندنە).**

١٠٠٧- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ فَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا رَأَى مِنَ النَّاسِ إِدْبَارًا قَالَ: «اللَّهُمَّ سَبْعٌ كَسَبْعِ يُوسُفَ». فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى أَكَلُوا الجُلُودَ وَالمَيْتَةَ وَالجِيَفَ، وَيَنْظُرَ أَحَدُهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى الدُّخَانَ مِنَ الجُوعِ، فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّكَ تَأْمُرُ بِطَاعَةِ اللَّهِ وَبِصِلَةِ الرَّحِمِ، وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا، فَادْعُ اللَّهَ لَهُمْ.

---

[1] بڕوانە: ٨٠٤.

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ الدخان. فَالبَطْشَةُ: يَوْمَ بَدْرٍ، وَقَدْ مَضَتِ الدُّخَانُ وَالبَطْشَةُ وَاللِّزَامُ وَآيَةُ الرُّومِ[1].

**١٠٠٧- مەسڕوق دەڵێ: ئێمە لای عەبدوڵا ﷺ بووین، عەبدوڵا وتی: بێگومان پێغەمبەر ﷺ کاتێ پشتهەڵکردنی خەڵکی بینی لە ئایینی خوا فەرمووی: ((خوایە حەوت ساڵی گرانی و قاتوقڕییان بە سەردا بێنە وەك حەوت ساڵەکەی سەردەمی یوسف ﷺ، جا ئەو بێباوەڕانە گرانییەکیان تووش بوو هەموو شتێکی لەناو برد، هەتا وایان لێ هات پێستە و مردارەوەبوو و کەلاکیان دەخوارد، کەسی وا هەبوو کە سەیری ئاسمانی دەکرد لە برسانا، وای دەزانی دووکەڵ بە ئاسمانەوەیە، جا ئەبو سوفیان هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی موحەممەد تۆ فەرمان دەکەیت بە گوێڕایەڵی خوا و بەجێهێنانی مافی خزمایەتی، وە بێگومان گەلەکەت هەموو تیا چوون، لە خوا بپاڕێرەوە بۆیان.**

**(ئیبنو مسعود دەڵێ:) خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: (جا چاوەڕوان بە ڕۆژێ ئاسمان دووکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ، هەموو ئادەمی دادەگرێ، (دەڵێن:) ئەمە بەڵایەکی سەختە ئەی پەروەردگارمان، ئەم سزایەمان لەسەر لابە، بەڕاستی ئێمە باوەڕ دێنین، چۆن ئەوانە تەمێ دەبن و ئامۆژگاری وەردەگرن؟! کە بێگومان پێغەمبەرێکی ڕوون و ئاشکرایان بۆ هاتووە، لە پاشان گوێیان پێ نەدا و وتیان: فێرکراوێکی شێتە،**

---

[1] بروانە: ١٠٢٠، ٤٦٩٣، ٤٧٦٧، ٤٧٧٤، ٤٨٠٩، ٤٨٢٠، ٤٨٢١، ٤٨٢٢، ٤٨٢٣، ٤٨٢٤، ٤٨٢٥.

ئێمە ئەم بەڵایەیان بۆ ماوەیەكی كەم لەسەر لادەبەین، بێگومان ئێوە دەگەڕێنەوە (بۆ بێباوەڕی)، ڕۆژێك دێت پەلامارێكی بەهێز و گەورەیان بۆ دەبەین، بەڕاستی ئێمە تۆڵە دەسەنین (لە كافران لە جەنگی بەدردا)، (ئیمام بوخاری دەڵێ:) وشەی: (البَطْشَةُ) لە ئایەتەكەدا مەبەست پێی ڕۆژی بەدرە، دووكەڵەكە و تۆڵەلێسەندنیان لە جەنگی بەدردا و ئەوەی خوا پێویستی كردبوو لەسەر خۆی كە تۆڵەیان لێ بسەنێ، وە سەركەوتنی ڕۆمەكان بەسەر فارسەكاندا (هەموویان هاتنە دی و ڕابوردن).

## ٣- بابُ سُؤَالِ النَّاسِ الإِمَامَ الاِسْتِسْقَاءَ إِذَا قَحَطُوا

١٠٠٨- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَتَمَثَّلُ بِشِعْرِ أَبِي طَالِبٍ:

وَأَبْيَضَ يُسْتَسْقَى الغَمَامُ بِوَجْهِهِ ... ثِمَالُ اليَتَامَى عِصْمَةٌ لِلأَرَامِلِ[1].

## باسی خەڵكی داوای دوعای بارانبارین لە ئیمام بكەن ئەگەر تووشی بێبارانی بوون

١٠٠٨- عەبدوڵای كوڕی دینار لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە عەبدوڵای كوڕی عومەرم ﷺ بیست ئەم شیعرەی ئەبو تالیبی دەخوێندەوە[2]:

بەڕووخساری سپی و درەوشاوە داوای بارانبارین لە هەورەكان دەكرێ كە پەنای هەتیوان و پارێزەری بێوەژنانە[3].

---

[1] بروانە: ١٠٠٩.

[2] مەبەست پێی پێغەمبەری خودایە ﷺ.

[3] ئەوە مانای شیعرەكەیە بە كوردی نەك شیعرەكە.

١٠٠٩- وَقَالَ عُمَرُ بْنُ حَمْزَةَ: حَدَّثَنَا سَالِمٌ، عَنْ أَبِيهِ: رُبَّمَا ذَكَرْتُ قَوْلَ الشَّاعِرِ وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى وَجْهِ النَّبِيِّ ﷺ يَسْتَسْقِي، فَمَا يَنْزِلُ حَتَّى يَجِيشَ كُلُّ مِيزَابٍ: وَأَبْيَضَ يُسْتَسْقَى الغَمَامُ بِوَجْهِهِ ... ثِمَالَ اليَتَامَى عِصْمَةٌ لِلأَرَامِلِ وَهْوَ قَوْلُ أَبِي طَالِبٍ[1].

**١٠٠٩- سالیم لە عەبدوڵای باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەیوت: زۆر جار کە سەیری پێغەمبەرم دەکرد ﷺ کە داوای بارانبارینی دەکرد (لەسەر دوانگەکەی لە مەدینە)، لە دوانگەکەی دانەدەبەزی هەتا بلوسکەکان دەخرۆشان و لافاو هەڵدەستا، ئەم شیعرەی شاعیرم بیر دەکەوتەوە کە دەڵێ:**

**بە ڕوخساری سپی و درەوشاوە داوای بارانبارین لە هەورەکان دەکرێ کە پەنای هەتیوان و پارێزەری بێوەژنانە.**

**ئەم شیعرەش شیعری ئەبو تالیبە[2].**

١٠١٠- حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ المُثَنَّى، عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ كَانَ إِذَا قَحَطُوا اسْتَسْقَى بِالعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ المُطَّلِبِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا، وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا. قَالَ فَيُسْقَوْنَ[3].

**١٠١٠- ئەنەس دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ ئەگەر تووشی بێبارانی و گرانی بوونایە بە خاتری عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب لە خوا دەپاڕایەوە و دەیوت: ئەی خوایە! ئێمە جاران پێغەمبەرمان ﷺ دەکرد بە تکاکار لای تۆ تۆش بارانت بۆ دەباراندین، ئێستاش عەباسی مامی پێغەمبەر ﷺ دەکەینە تکاکارمان، بارانمان بۆ ببارێنە، (ئەنەس دەڵێ:) ئیدی بارانیان بۆ دەباری.**

---

[1] بڕوانە: ١٠٠٨.

[2] کە مامی پێغەمبەرە ﷺ.

[3] بڕوانە: ٣٧١٠.

## ٤- بابُ تَحْوِيلِ الرِّدَاءِ فِي الإِسْتِسْقَاءِ

١٠١١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَسْقَى فَقَلَبَ رِدَاءَهُ[1][2].

## ٤- باسی هەڵگەڕاندنەوەی پۆشاک لە کاتی دوعای بارانباریندا

**١٠١١- عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ داوای بارانبارینی کرد و پۆشاکەکەی هەڵگێڕایەوە.**

١٠١٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ أَنَّهُ سَمِعَ عَبَّادَ بْنَ تَمِيمٍ يُحَدِّثُ أَبَاهُ، عَنْ عَمِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ إِلَى المُصَلَّى فَاسْتَسْقَى، فَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ: كَانَ ابْنُ عُيَيْنَةَ يَقُولُ: هُوَ صَاحِبُ الأَذَانِ، وَلَكِنَّهُ وَهْمٌ، لأَنَّ هَذَا عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ المَازِنِيُّ، مَازِنُ الأَنْصَارِ.

**١٠١٢- عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە دەرەوە بۆ نوێژگە و داوای بارانبارینی کرد، جا ڕووی کردە قیبلە و عەباکەی هەڵگەڕاندەوە و دوو ڕکات نوێژی کرد. ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: ئیبنو عویەینە دەڵێ: ئەو (عەبدوڵای کوڕی زەید) ئەو کەسە بوو بانگدانی (لە خەودا بینی)، ئەو قسەی ئیبنو عویەینە هەڵەیە، چونکە ئەو عەبدوڵایە، عەبدوڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمی مازینییە، کە مازینیی ئەنصاڕییە.**

---

[1] بە عەبا و جوببە دەوترێ کە لەسەر پۆشاکەوە لەبەر دەکرێت، هەروەها بە پۆشاکێکیش دەوترێ کە بەشی سەرەوەی لاشە دادەپۆشێ، لەسەر و ئیزارەوەیە، بەڵام ئیزار بەشی خوارەوەی لاشە دادەپۆشێ. بڕوانە: معجم الوسيط: ٣٦٤.

[2] بڕوانە: ١٠٠٥.

## ٥- بابُ انْتِقامِ الرَّبِّ جَلَّ وَعَزَّ مِنْ خَلْقِه بِالقَحْطِ إِذَا انْتُهِكَ مَحَارِمُ اللَّهِ

## ٥- باسی تۆڵەی پەروەردگاری بەرز و بەدەسەڵات لە دروستکراوەکانی بەبێبارانی و وشکەساڵی، کاتێ سنوورەکانی خوا بشکێنرێ[١]

## ٦- بابُ الإسْتِسْقاءِ فِي المَسْجِدِ الجَامِعِ

١٠١٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو ضَمْرَةَ أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَرِيكُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَذْكُرُ أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ يَوْمَ الجُمُعَةِ مِنْ بَابٍ كَانَ وُجَاهَ المِنْبَرِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَائِمًا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَتِ المَوَاشِي، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ يُغِيثُنَا. قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اسْقِنَا، اللَّهُمَّ اسْقِنَا، اللَّهُمَّ اسْقِنَا». قَالَ أَنَسٌ: وَلاَ وَاللَّهِ مَا نَرَى فِي السَّمَاءِ مِنْ سَحَابٍ وَلاَ قَزَعَةً وَلاَ شَيْئًا، وَمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ سَلْعٍ مِنْ بَيْتٍ وَلاَ دَارٍ، قَالَ: فَطَلَعَتْ مِنْ وَرَائِهِ سَحَابَةٌ مِثْلُ التُّرْسِ، فَلَمَّا تَوَسَّطَتِ السَّمَاءَ انْتَشَرَتْ ثُمَّ أَمْطَرَتْ. قَالَ: وَاللَّهِ مَا رَأَيْنَا الشَّمْسَ سِتًّا، ثُمَّ دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ ذَلِكَ البَابِ فِي الجُمُعَةِ المُقْبِلَةِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَهُ قَائِمًا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَتِ الأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ يُمْسِكْهَا، قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا، اللَّهُمَّ عَلَى الآكَامِ وَالجِبَالِ وَالآجَامِ وَالظِّرَابِ وَالأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ». قَالَ: فَانْقَطَعَتْ وَخَرَجْنَا نَمْشِي فِي الشَّمْسِ. قَالَ شَرِيكٌ: فَسَأَلْتُ أَنَسًا أَهُوَ الرَّجُلُ الأَوَّلُ؟ قَالَ: لَا أَدْرِي[٢].

---

[١] ئەم سەرباسە ئیمام بوخاری هیچ فەرموودەیەکی بۆ نەهێناوە و تەنها لە ڕیوایەتی (الحمّوي)دا هاتووە. فتح الباري: ٣/٦٣٦.

[٢] بڕوانە: ٩٣٢.

# ٦- باسی دوعای بارانبارین كردن لەو مزگەوتەی نوێژی هەینی تێدا دەكرێ

١٠١٣- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی هەینیدا پیاوێك لەو دەرگایەی بەرانبەری دوانگەكەیە هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، لەو كاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، جا ئەو پیاوە ڕوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئاژەڵەكانمان مردن و ڕێگاكان (بۆ ژیان) بڕاون[1]، داوا بكە لە خوا بارانمان بۆ ببارێنێ. ئەنەس دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرز كردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: ((خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان بۆ ببارێنە))، ئەنەس دەڵێ: سوێند بە خوا پەڵەیەك هەورمان بە ئاسمانەوە نەدەبینی، یان شتێك كە نیشانەی باران بێت، لە نێوان ئێمە و كێوی سەلعدا خانوو و ماڵ نەبوو (كە نەهێڵێ بەچاكی ببینین)، جا لەپشت كێوی سەلعەوە پارچە هەورێك بەشێوەی قەڵغان دەركەوت، ئینجا كاتێ گەیشتە نێوەڕاستی ئاسمان بڵاو بۆیەوە، پاشان بارانی لێ باری، ئەنەس دەڵێ: سوێند بە خوا شەش ڕۆژ خۆرمان نەبینی، پاشان لە هەینی داهاتوودا پیاوێك لە هەمان دەرگای ڕوو بە دوانگەكەوە هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، پێغەمبەری خواش ﷺ وەستابوو وتاری دەدا، جا ئەو پیاوە ڕوو بە پێغەمبەر ﷺ بەپێوە وەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵ و ماڵاتمان هەموو فەوتان (بەهۆی بارانەوە)، ڕێگاكانمان لێ داخران و پچڕان، داوا بكە لە خوا ئەو بارانە بگرێتەوە، ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەریش ﷺ هەردوو دەستی بەرز كردەوە، پاشان فەرمووی: ((خوایە لە دەوروبەرمان ببارێنە، بە سەرماندا

---

[1] یان هاتوچۆ نەماوە بەهۆی مردنی وشترەكانەوە، یان خواردن و بژێوی نەماوە بیهێنن بۆ بازاڕەكان.

مەیبارێنە، بەسەر دەشت و کێو و یاڵ و دۆڵ و شیو و لەوەڕگاکاندا بیبارێنە))، ئەنەس دەڵێ: ئیتدی بارانەکە خۆشی کرد، لە نوێژ بووینەوە (و لە مزگەوت) دەرچووین، خۆرەتاو بوو کە دەڕۆشتینەوە بۆ ماڵەوە، شەریك دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەس کرد، ئەو پیاوەی کە بۆ جاری دووەم داوای کرد هەر پیاوەکەی هەینی پێشوو بوو؟ وتی: نازانم.

## ٧- بابُ الإسْتِسْقاءِ فِي خُطْبَةِ الجُمُعَةِ غَيْرَ مُسْتَقْبِلِ القِبْلَةِ

١٠١٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ المَسْجِدَ يَوْمَ جُمُعَةٍ مِنْ بَابٍ كَانَ نَحْوَ دَارِ القَضَاءِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَائِمًا، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكَتِ الأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ يُغِيثُنَا. فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا». قَالَ أَنَسٌ: وَلاَ وَاللَّهِ مَا نَرَى فِي السَّمَاءِ مِنْ سَحَابٍ وَلاَ قَزَعَةً، وَمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ سَلْعٍ مِنْ بَيْتٍ وَلاَ دَارٍ. قَالَ: فَطَلَعَتْ مِنْ وَرَائِهِ سَحَابَةٌ مِثْلُ التُّرْسِ، فَلَمَّا تَوَسَّطَتِ السَّمَاءَ انْتَشَرَتْ ثُمَّ أَمْطَرَتْ، فَلاَ وَاللَّهِ مَا رَأَيْنَا الشَّمْسَ سِتًّا، ثُمَّ دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ ذَلِكَ البَابِ فِي الجُمُعَةِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَهُ قَائِمًا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَتِ الأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ يُمْسِكْهَا عَنَّا. قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا، اللَّهُمَّ عَلَى الآكَامِ وَالظِّرَابِ وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ». قَالَ: فَأَقْلَعَتْ وَخَرَجْنَا نَمْشِي فِي الشَّمْسِ. قَالَ شَرِيكٌ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: أَهُوَ الرَّجُلُ الأَوَّلُ؟ فَقَالَ مَا أَدْرِي[1].

[1] بڕوانە: ٩٣٢.

## ٧- باسی دوعای بارانبارین کردن
## له وتاری ڕۆژی هەینیدا بێ ڕووکردنه قیبله

**١٠١٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: له ڕۆژی هەینیدا پیاوێك لەو دەرگایەی که بەرانبەری خانووی (فرۆشراو بۆ) دانەوەی قەرز بوو[1] هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، جا ئەو پیاوە ڕوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئاژەڵەکانمان مردن و ڕێگاکان بۆ ژیان بڕاون[2]، داوا بکە لە خوا بارانمان بۆ ببارێنێ، ئەنەس دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: ((خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، خوایە بارانمان بۆ ببارێنە))، ئەنەس دەڵێ: سوێند بە خوا پەڵەیەك هەورمان بە ئاسمانەوە نەدەبینی، یان شتێك نیشانەی باران بێت، وە لە نێوان ئێمە و کێوی سەلعدا خانوو و ماڵ نەبوو (کە نەهێڵێ بەچاکی ببینین)، جا لەپشت کێوی سەلعەوە پارچە هەورێك بەشێوەی قەڵغان دەرکەوت، ئینجا کاتێ گەیشتە نێوەڕاستی ئاسمان بڵاو بۆیەوە، پاشان بارانی لێ باری، ئەنەس دەڵێ: سوێند بە خوا شەش ڕۆژ (باران بوو) خۆرمان نەبینی، پاشان پیاوێك لە ڕۆژی هەینی داهاتوودا لە هەمان دەرگاوە هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، پێغەمبەری خواش ﷺ بەپێوە بوو وتاری دەدا، جا ئەو پیاوە ڕوو بە پێغەمبەر ﷺ بەپێوە وەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵ و ماڵاتمان هەموو فەوتان**

---

[1] (دار القضاء) هەندێ مانایان کردووە بە خانووی ئەمیر و کاربەدەستان، ئەم مانایە هەڵەیە، بەڵکوو خانووی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بوو، بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە چونکە فرۆشراوە بۆ بژاردن و دانەوەی قەرزی عومەر ﷺ. فتح الباري: ٦٣٨/٣.

[2] یان هاتوچۆ نەماوە بە هۆی مردنی وشترەکانەوە، یان خواردن و بژێوی نەماوە بیهێنن بۆ بازاڕەکان.

(بەهۆی بارانەوە)، ڕێگاکانمان لێ داخران و پچڕان، داوا بکە لە خوا ئەو بارانە بگرێتەوە، ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە، پاشان فەرمووی: ((خوایە لە دەوروبەرمان ببیارێنە، بە سەرماندا مەیبارێنە، بەسەر دەشت و کێو و یاڵ و دۆڵ و شیو و لەوەڕگاکاندا ببیارێنە))، ئەنەس دەڵێ: ئیدی بارانەکە خۆشی کرد و لە نوێژ بووینەوە، (لە مزگەوت) دەرچووین خۆرەتاو بوو دەرۆشتینەوە بۆماڵەوە، شەریك دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەس کرد ئەو پیاوەی کە بۆ جاری دووەم پرسیاری کرد هەر پیاوەکەی هەینی پێشوو بوو؟ وتی: نازانم.

## ٨- بابُ الإِسْتِسْقَاءِ عَلَى المِنْبَرِ

١٠١٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَحَطَ المَطَرُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَسْقِيَنَا. فَدَعَا، فَمُطِرْنَا، فَمَا كِدْنَا أَنْ نَصِلَ إِلَى مَنَازِلِنَا، فَمَا زِلْنَا نُمْطَرُ إِلَى الجُمُعَةِ المُقْبِلَةِ. قَالَ: فَقَامَ ذَلِكَ الرَّجُلُ أَوْ غَيْرُهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَصْرِفَهُ عَنَّا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا». قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ السَّحَابَ يَتَقَطَّعُ يَمِينًا وَشِمَالًا يُمْطَرُونَ وَلاَ يُمْطَرُ أَهْلُ المَدِينَةِ[1].

## ٨- باسی دوعای بارانبارین کردن لەسەر دوانگە

١٠١٥- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا وتاری دەدا، لەپڕ پیاوێك هاتە ژوورەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

---

[1] بروانە: ٩٣٢.

وشکەساڵی و بێبارانییە، داوا بکە لە خوا بارانمان بۆ ببارێنێ، ئەویش دوعای کرد و بارانمان بۆ باری، بە جۆرێك نزیك بوو نەتوانین بگەینەوە بۆ ماڵەکانمان، جا بەردەوام بارانمان بۆ باری تا هەینی داهاتوو، ئەنەس وتی: جا (هەینی داهاتوو) ئەو پیاوە (ی پێشوو) یان کەسێکی دیکە هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوا بکە لە خوا کە ئەو بارانەمان لێ لادات، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((خوایە ئەم بارانە بەدەوروبەرماندا ببارێنە، لەسەرمان مەیبارێنە))، ئەنەس دەڵێ: جا سوێند بە خوا هەورەکەم بینی بە لای ڕاست و چەپدا بڵاو بۆیەوە، لە دەرەوەی مەدینە باران دەباری، بەڵام باران بەسەر خەڵکی مەدینەدا نەدەباری.

## ٩- بابُ مَنِ اكْتَفَى بِصَلَاةِ الجُمُعَةِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ

١٠١٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: هَلَكَتِ المَوَاشِي، وَتَقَطَّعَتِ السُّبُلُ. فَدَعَا، فَمُطِرْنَا مِنَ الجُمُعَةِ إِلَى الجُمُعَةِ، ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: تَهَدَّمَتِ البُيُوتُ وَتَقَطَّعَتِ السُّبُلُ، وَهَلَكَتِ المَوَاشِي، فَادْعُ اللَّهَ يُمْسِكْهَا. فَقَامَ ﷺ فَقَالَ: .اللَّهُمَّ عَلَى الآكَامِ وَالظِّرَابِ وَالأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ. فَانْجَابَتْ عَنِ المَدِينَةِ انْجِيَابَ الثَّوْبِ[1].

## ٩- باسی ئەوەی بۆ داوای بارانبارین تەنها نوێژی هەینی کرد

١٠١٦- ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئاژەڵەکان مردن و تیا چوون، ڕێگاکانیش بڕان، پێغەمبەریش ﷺ دوعای (بارانبارینی) کرد، ئیدی بارانمان بۆ باری لە ڕۆژی هەینییەوە بۆ هەینی داهاتوو، پاشان (هەینی داهاتوو) کابرا هاتەوە و وتی: خانووەکان ڕووخان و

---

[1] بڕوانە: ٩٣٢.

ڕێگاکان بڕان، ئاژەڵەکان مردن و تیا چوون، داوا بکە خوا بارانەکە ڕاگرێت و خۆش بکات، پێغەمبەریش ﷺ هەستایەوە و فەرمووی: ((خوایە لە کێو و یاڵ و شیوەکان و لەوەڕگاکاندا ببیارێنە))، ئیدی هەورەکە لەسەر مەدینە لاچوو و نەما، وەك چۆن پۆشاكێك لەبەری خاوەنەكەی دادەكەنرێ و لادەچێ[1].

## ١٠- بابُ الدُّعَاءِ إِذَا تَقَطَّعَتِ السُّبُلُ مِنْ كَثْرَةِ المَطَرِ

١٠١٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَتِ المَوَاشِي، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللهَ، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَمُطِرُوا مِنْ جُمُعَةٍ إِلَى جُمُعَةٍ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَهَدَّمَتِ البُيُوتُ، وَتَقَطَّعَتِ السُّبُلُ، وَهَلَكَتِ المَوَاشِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ عَلَى رُءُوسِ الجِبَالِ وَالآكَامِ وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ». فَانْجَابَتْ عَنِ المَدِينَةِ انْجِيَابَ الثَّوْبِ[2].

## ١٠- باسی دوعا و پاڕانەوە، ئەگەر هەموو ڕێگایەک بڕا لەبەر زۆری بارانبارین

١٠١٧- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵەکان مردن و تیا چوون، ڕێگاکانیش بڕان، داوا (ی بارانبارین) لە خوا بکە، پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای کرد، جا بارانیان بۆ

---

[1] یان هەورەکە پارچە پارچە بوو، وەک چۆن پۆشاک پارچە پارچە دەبێ، واتە: هەورەکە لە ئاسمانی مەدینەدا نەما بوو بە سایەقە و بڵاو بۆیەوە بە لاکانی دیکەدا.

[2] بڕوانە: ٩٣٢.

بارێنرا له (ڕۆژی) هەینییەوه بۆ هەینی داهاتوو، ئینجا پیاوێك هاته خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خانووەكان ڕووخان، ڕێگاكان بڕان، ئاژاڵەكان مردن و تیا چوون، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((خوایه له سەر لوتكەی شاخەكان و یاڵ و شیو و لەوەڕگاكاندا ببیارێنه))، جا هەورەكه له ئاسمانی مەدینه ڕەوییەوه و نەما، به وێنەی پۆشاكێك له نێوەڕاستەكەیدا بڕابێ بەشێوەی بازنەیی.

## ١١- بابُ مَا قِيلَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُحَوِّلْ رِدَاءَهُ فِي الإِسْتِسْقَاءِ يَوْمَ الجُمُعَةِ

١٠١٨- حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ بِشْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَافَى بْنُ عِمْرَانَ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَجُلًا شَكَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ هَلاَكَ المَالِ وَجَهْدَ العِيَالِ، فَدَعَا اللَّهَ يَسْتَسْقِي، وَلَمْ يَذْكُرْ أَنَّهُ حَوَّلَ رِدَاءَهُ وَلاَ اسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ[1].

## ١١- باسی ئەوەی وتراوه: كه پێغەمبەر ﷺ پۆشاكەكەی هەڵنەگێڕایەوه له ڕۆژی هەینیدا كه دوعای بارانبارینی كرد

١٠١٨- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوه: كه پیاوێك لای پێغەمبەر ﷺ سكاڵای تیاچوونی ماڵ و ئاژەڵ و برسیبوونی منداڵ و خێزانی كرد، پێغەمبەریش ﷺ داوای بارانبارینی له خودا كرد، باسی ئەوەی نەكرد كه پۆشاكەكەی هەڵگێڕابێتەوه، وه باسی ئەوەشی نەكرد كه ڕووی له قیبله كردبێ.

---

[1] بڕوانه: ٩٣٢.

## ١٢- بابٌ: إِذَا اسْتَشْفَعُوا إِلَى الإِمَامِ لِيَسْتَسْقِيَ لَهُمْ لَمْ يَرُدُّهُمْ

١٠١٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَتِ المَوَاشِي، وَتَقَطَّعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللَّهَ. فَدَعَا اللَّهَ، فَمُطِرْنَا مِنَ الجُمُعَةِ إِلَى الجُمُعَةِ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَهَدَّمَتِ البُيُوتُ، وَتَقَطَّعَتِ السُّبُلُ وَهَلَكَتِ المَوَاشِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ عَلَى ظُهُورِ الجِبَالِ وَالآكَامِ وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ». فَانْجَابَتْ عَنِ المَدِينَةِ انْجِيَابَ الثَّوْبِ[1].

## ١٢- باسێک: ئەگەر خەڵکانێک تکایان لە ئیمام کرد دوعای بارانبارینیان بۆ بکات، (ئیمام) دەست نەنێ بە ڕوویانەوە

**١٠١٩- شەریکی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبو نەمیر لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵەکان مردن و تیا چوون، ڕێگاکانیش بڕان، داوای (بارانبارین) لە خودا بکە، پێغەمبەریش ﷺ دوعای (بارانبارینی) لە خودا کرد، جا بارانمان بۆ باری لە (ڕۆژی) هەینییەوە بۆ هەینی داهاتوو، ئینجا (هەینی داهاتوو) پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خانووەکان ڕووخان، ڕێگاکان بڕان، ئاژەڵەکان مردن و تیا چوون، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((خوایە لە سەر کێو و یاڵ و شیو و لەوەڕگاکاندا بیبارێنە))، ئیدی هەورەکە لەسەر مەدینە لاچوو و نەما، وەك چۆن پۆشاکێك لەبەری خاوەنەکەی دادەکەنرێ و لادەچێ[2].**

---

[1] بڕوانە: ٩٣٢.

[2] یان هەورەکە پارچە پارچە بوو، وەک چۆن پۆشاک پارچە پارچە دەبێ، واتە: هەورەکە لە ئاسمانی مەدینەدا نەما و بوو بە سایەقە و بڵاو بۆیەوە بەلاکانی دیکەدا، قەستەلانی بە هەردوو ماناکەمانی (فانجابت عن المدينة إنجياب الثوب)ی مانا کردووە. إرشاد الساري: ٧٣/٣.

## ١٣- بابٌ: إِذَا اسْتَشْفَعَ الْمُشْرِكُونَ بِالْمُسْلِمِينَ عِنْدَ الْقَحْطِ

١٠٢٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ سُفْيَانَ حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ وَالأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: أَتَيْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ فَقَالَ: إِنَّ قُرَيْشًا أَبْطَئُوا عَنِ الإِسْلَامِ. فَدَعَا عَلَيْهِمُ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَتَّى هَلَكُوا فِيهَا وَأَكَلُوا المَيْتَةَ وَالعِظَامَ، فَجَاءَهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، جِئْتَ تَأْمُرُ بِصِلَةِ الرَّحِمِ، وَإِنَّ قَوْمَكَ هَلَكُوا، فَادْعُ اللهَ. فَقَرَأَ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الدخان. ثُمَّ عَادُوا إِلَى كُفْرِهِمْ فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ الدخان. يَوْمَ بَدْرٍ. قَالَ أبو عَبدُالله: وَزَادَ أَسْبَاطٌ، عَنْ مَنْصُورٍ: فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَسُقُوا الغَيْثَ، فَأَطْبَقَتْ عَلَيْهِمْ سَبْعًا، وَشَكَا النَّاسُ كَثْرَةَ المَطَرِ، قَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا». فَانْحَدَرَتِ السَّحَابَةُ عَنْ رَأْسِهِ، فَسُقُوا النَّاسُ حَوْلَهُمْ[1].

## ١٣- باسێک: ئەگەر بتپەرستان تكايان لە موسوڵمانان كرد لە كاتی بێبارانیدا

**١٠٢٠- مەسرووق دەڵێ: ڕۆشتم بۆ لای عەبدوڵای كوڕی مەسعود ﷺ وتی: بێگومان قوڕەیش درەنگ موسوڵمان بوون، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ دوعای لێ كردن، ئەوانیش تووشی گرانی و قاتوقڕی بوون، هەتا لەو گرانییەدا زۆریان تیا چوون، وە مردارەوەبوو و ئێسكیان دەخوارد، جا ئەبو سوفیان هات و وتی: ئەی موحەممەد تۆ هاتوویت فەرمان دەكەیت بە پەیوەندی خزمایەتی، بێگومان هۆزەكەت هەموو تیا چوون، لە خوا بپاڕێرەوە، پێغەمبەریش ﷺ[2] ئەم ئایەتەی خوێند: (جا چاوەڕوان بكە ڕۆژێك ئاسمان دووكەڵێكی ئاشكرای لێ پەیدا دەبێ)، (لەو كاتەدا باوەڕ دێنن)، پاشان (كە سزاكەیان لەسەر لابرا)**

---

[1] بڕوانە: ١٠٠٧.

[2] پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندووەتەوە نەک عەبدوڵای كوڕی مەسعود ﷺ. بڕوانە: إرشاد الساري: ٤١/٣.

**دەگەڕێنەوە بۆ بێباوەڕی، ئەوە مەبەستی ئەم فەرمایيشتەی خوايە: (ڕۆژێك دێت پەلاماری بەهێز و هەرە گەورەيان بۆ دەبەين) كە (تێشكانی) جەنگی بەدرە، ئەبو عەبدولا (ئيمام بوخاری) دەڵێ: ئەسبات لە مەنصورەوە فەرموودەكەی گێڕاوەتەوە و ئەمەی بۆ زياد كردووە: جا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای بارانبارينی كرد و بارانيان بۆ باری، حەوت ڕۆژی سەرەمڕ بارانيان بۆ باری، جا خەڵكی سكالايان بۆ پێغەمبەر برد ﷺ لە دەستی بارانبارينی زۆر، پێغەمبەريش ﷺ فەرمووی: ((خوايە لە دەوروبەرمان ببارێنە، بە سەرماندا مەيبارێنە))، ئيدی هەورەكە لە ڕاسەری ڕۆيشت و نەما، جا باران بۆ خەڵكانی ديكەی دەوروبەريان باری.**

## ١٤- بابُ الدُّعَاءِ إِذَا كَثُرَ المَطرُ: حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا

١٠٢١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ جُمُعَةٍ، فَقَامَ النَّاسُ فَصَاحُوا فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، قَحَطَ المَطَرُ وَاحْمَرَّتِ الشَّجَرُ، وَهَلَكَتِ البَهَائِمُ، فَادْعُ اللهَ يَسْقِينَا. فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اسْقِنَا». مَرَّتَيْنِ، وَايْمُ اللهِ مَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَةً مِنْ سَحَابٍ، فَنَشَأَتْ سَحَابَةٌ وَأَمْطَرَتْ، وَنَزَلَ عَنِ المِنْبَرِ فَصَلَّى، فَلَمَّا انْصَرَفَ لَمْ تَزَلْ تُمْطِرُ إِلَى الجُمُعَةِ الَّتِي تَلِيهَا، فَلَمَّا قَامَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ صَاحُوا إِلَيْهِ: تَهَدَّمَتِ البُيُوتُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللهَ يَحْبِسُهَا عَنَّا. فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا». فَكُشِطَتِ المَدِينَةُ، فَجَعَلَتْ تُمْطِرُ حَوْلَهَا وَلاَ تُمْطِرُ بِالمَدِينَةِ قَطْرَةً، فَنَظَرْتُ إِلَى المَدِينَةِ وَإِنَّهَا لَفِي مِثْلِ الإِكْلِيلِ[1].

---

[1] بڕوانە: ٩٣٢.

## ١٤- باسی ئەگەر باران زۆر باری دوعا بكرێ و بوترێ: له دەوروبەرمان ببیارێنه نەك لەسەرمان

١٠٢١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ له ڕۆژی هەینیدا وتاری دەدا، ئینجا خەڵكی هەڵسان و هاواریان كرد و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێبارانییە، درەختەكان سوور هەڵگەڕاون، ماڵات و ئاژەڵەكان تیا چوون و مردار بوونەوە، له خوا بپاڕێرەوە بارانمان بۆ ببارێنێ، ئەویش دووجار فەرمووی: ((خوایه بارانمان بۆ ببارێنه))، ئەنەس دەڵێ: سوێند به خوا به ئاسمانەوە پەڵەیەك هەورمان نەدەبینی، ئینجا هەور دروست بوو، باران باری و پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگەكە هاته خوارەوە و نوێژی كرد، كه له نوێژەكەی بۆیەوە بەردەوام باران دەباری، هەتا هەینی داهاتوو، جا كه پێغەمبەر ﷺ هەستا وتار بدات، خەڵكی هاواریان بۆ هێنا وتیان: خانووەكانمان ڕووخا، ڕێگاكان بڕان (ماڵاتەكانمان فەوتان)، داوا بكه خوا بیگرێتەوه لێمان و خۆش بكات، پێغەمبەریش ﷺ زەردەخەنەیەكی كرد، پاشان فەرمووی: ((خوایه له دەوروبەرمان ببیارێنه و به سەرماندا مەیبارێنه))، ئیدی (هەورەكه نەما) ئاسمانی مەدینه دەركەوت، ئینجا له دەوروبەری مەدینه دەستی به بارین كرد، له مەدینه یەك دڵۆپ نەدەباری، ئەنەس دەڵێ: سەیری شاری مەدینەم كرد وەك گومەزی وا بوو[1].

## ١٥- بابُ الدُّعَاءِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ قَائِمًا

١٠٢٢- وَقَالَ لَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ زُهَيْرٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: خَرَجَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ الأَنْصَارِيُّ، وَخَرَجَ مَعَهُ البَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ وَزَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ ﷺ فَاسْتَسْقَى، فَقَامَ بِهِمْ عَلَى رِجْلَيْهِ عَلَى

---

[1] ئاسمانی مەدینه سایەقه بوو، هەورەكه به چواردەوریدا وەک گومەزی وا بوو، نێوەڕاستەكەی شین بوو، چواردەوری سپی بوو.

غَيْرِ مِنْبَرٍ فَاسْتَغْفَرَ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ يَجْهَرُ بِالقِرَاءَةِ وَلَمْ يُؤَذِّنْ، وَلَمْ يُقِمْ. قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: وَرَأَى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ النَّبِيَّ ﷺ.

## ١٥- باسی دوعای بارانبارین بەڕاوەستانەوە

**١٠٢٢- ئەبو ئیسحاق دەڵێ: عەبدوڵای كوڕی یەزیدی ئەنصاڕی چووە دەرەوە لە شار، بەڕائی كوڕی عازیب و زەیدی كوڕی ئەرقەمیش ﷺ لەگەڵیدا چوونە دەرەوە، جا دوعای بارانبارینی كرد (لەگەڵیاندا)، لەسەر هەردوو قاچی بەپێوە وەستابوو، بێئەوەی عەبدوڵا لەسەر دوانگە بێت، وە داوای لێخۆشبوونی لە خوا كرد، پاشان دوو ڕكات نوێژی كرد، بەدەنگی بەرز قورئانی خوێند تێیدا، نە بانگی دا و نە قامەتی كرد، ئەبو ئیسحاق دەڵێ: عەبدوڵای كوڕی یەزید پێغەمبەری ﷺ بینیوە (واتە: صەحابەیە).**

١٠٢٣- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبَّادُ بْنُ تَمِيمٍ، أَنَّ عَمَّهُ -وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ بِالنَّاسِ يَسْتَسْقِي لَهُمْ، فَقَامَ فَدَعَا اللَّهَ قَائِمًا، ثُمَّ تَوَجَّهَ قِبَلَ القِبْلَةِ، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، فَأُسْقُوا[1].

**١٠٢٣- عەبادی كوڕی تەمیم دەڵێ: مامەی كە لە هاوەڵانی پیغەمبەر ﷺ بوو، بۆی گێڕایەوە كە پێغەمبەر ﷺ خەڵكی بردە دەرەوەی شار، نوێژەبارانەی بۆ كردن، جا بەپێوە وەستا و (لەسەر دوانگە) لە خوا پاڕایەوە، پاشان ڕووی كردە قیبلە و پۆشاكەكەی هەڵگێڕایەوە، ئیدی بارانیان بۆ باری.**

---

[1] بڕوانە: ١٠٠٥.

## ١٦- بابُ الجَهْرِ بِالقِرَاءَةِ فِي الإِسْتِسْقَاءِ

١٠٢٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يَسْتَسْقِي فَتَوَجَّهَ إِلَى القِبْلَةِ يَدْعُو، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ فِيهِمَا بِالقِرَاءَةِ[1].

## ١٦- باسی قورئانخوێندن بەدەنگی بەرز لە نوێژەبارانەدا

**١٠٢٤- عەبادی کوڕی تەمیم لە مامەیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە شار چووە دەرەوە بۆ نوێژەبارانە، ئینجا ڕووی کردە قیبلە و پاڕایەوە و پۆشاکەکەی هەڵگێڕایەوە، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد بەدەنگی بەرز قورئانی تێدا خوێند.**

## ١٧- بابٌ: كَيْفَ حَوَّلَ النَّبِيُّ ﷺ ظَهْرَهُ إِلَى النَّاسِ؟

١٠٢٥- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ خَرَجَ يَسْتَسْقِي، قَالَ: فَحَوَّلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ، وَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ يَدْعُو، ثُمَّ حَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى لَنَا رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ فِيهِمَا بِالقِرَاءَةِ[2].

## ١٧- باسێک: چۆن پێغەمبەر ﷺ پشتی کردە خەڵکەکە؟

**١٠٢٥- عەبادی کوڕی تەمیم لە مامەیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لەو ڕۆژەدا کە چووە دەرەوە لە شار، داوای بارانبارینی دەکرد، دەڵێ: جا پشتی کردە خەڵکەکە و ڕووی کردە قیبلە و دەپاڕایەوە، پاشان عەباکەی**

---

[1] بڕوانە: ١٠٠٥.

[2] بڕوانە: ١٠٠٥.

هەڵگێڕایەوە، ئینجا دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین، بە دەنگی بەرز قورئانی تیایاندا خوێند.

## ١٨- بابُ صَلاةِ الإِسْتِسْقاءِ رَكْعَتَيْنِ

١٠٢٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَسْقَى فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ[1].

## ١٨- باسی نوێژەبارانە دوو ڕکاتە

**١٠٢٦- عەبادی کوڕی تەمیم لە مامەیەوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ داوای بارانبارینی کرد، جا دوو ڕکات نوێژی کرد و عەباکەی هەڵگێڕایەوە.**

## ١٩- بابُ الإِسْتِسْقاءِ فِي المُصَلَّى

١٠٢٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، سَمِعَ عَبَّادَ بْنَ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى المُصَلَّى يَسْتَسْقِي، وَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ. قَالَ سُفْيَانُ: فَأَخْبَرَنِي المَسْعُودِيُّ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ قَالَ: جَعَلَ اليَمِينَ عَلَى الشِّمَالِ[2].

## ١٩- باسی داوا کردنی بارانبارین لە نوێژگە

**١٠٢٧- عەبادی کوڕی تەمیم لە مامەیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوە بۆ نوێژگە، داوای بارانبارینی کرد و ڕووی کردە قیبلە، جا دوو**

---

[1] بڕوانە: ١٠٠٥.

[2] بڕوانە: ١٠٠٥.

ڕكات نوێژی كرد و پۆشاكەكەی هەڵگێڕایەوە، سوفیان دەڵێ: مەسعودی بۆی گێڕامەوە لە ئەبو بەكرەوە، وتی: پێغەمبەر ﷺ لای ڕاستی عەباكەی دا بەسەر شانی چەپیدا (لە نوێژەكەیدا).

## ٢٠- بابُ اسْتِقْبَالِ القِبْلَةِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ

١٠٢٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَنَّ عَبَّادَ بْنَ تَمِيمٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ الأَنْصَارِيَّ أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ إِلَى المُصَلَّى يُصَلِّي، وَأَنَّهُ لَمَّا دَعَا -أَوْ أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ- اسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ ابْنُ زَيْدٍ هَذَا مَازِنِيٌّ، وَالأَوَّلُ كُوفِيٌّ هُوَ ابْنُ يَزِيدَ[1].

## ٢٠- باسی ڕووكردنە قیبلە لە كاتی داوا كردنی بارانباریندا

١٠٢٨- عەبادی كوڕی تەمیم دەڵێ: عەبدوڵای كوڕی یەزیدی ئەنصاڕی بۆی گێڕایەوە: كە پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوە بۆ نوێژگە نوێژ بكات، جا كاتێ پاڕایەوە -یان ویستی بپاڕێتەوە- ڕووی كردە قیبلە و پۆشاكەكەی هەڵگێڕایەوە، ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: ئەم عەبدوڵای كوڕی زەیدە مازینییە، بەڵام عەبدوڵاكەی یەكەم[2] خەڵكی كوفەیە، ناوی عەبدوڵای كوڕی یەزیدە.

## ٢١- بابُ رَفْعِ النَّاسِ أَيْدِيَهُمْ مَعَ الإِمَامِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ

١٠٢٩- قَالَ أَيُّوبُ بْنُ سُلَيْمَانَ: حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بِلَالٍ، قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ أَعْرَابِيٌّ مِنْ أَهْلِ البَدْوِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

---

[1] بڕوانە: ١٠٠٥.

[2] كە لە فەرموودەی ژمارە (١٠١٢)دایە ئەوە كوفییە و ناوی عەبدوڵای كوڕی یەزیدە.

يَوْمَ الجُمُعَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَتِ المَاشِيَةُ، هَلَكَ العِيَالُ، هَلَكَ النَّاسُ. فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ يَدْعُو، وَرَفَعَ النَّاسُ أَيْدِيَهُمْ مَعَهُ يَدْعُونَ، قَالَ: فَمَا خَرَجْنَا مِنَ المَسْجِدِ حَتَّى مُطِرْنَا، فَمَا زِلْنَا نُمْطَرُ حَتَّى كَانَتِ الجُمُعَةُ الأُخْرَى، فَأَتَى الرَّجُلُ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَشِقَ المُسَافِرُ، وَمُنِعَ الطَّرِيقُ[1].

## ٢١- باسی خەڵک لەگەڵ پێشنوێژدا دەستیان بەرز بکەنەوە لە کاتی پاڕانەوە بۆ بارانبارین

**١٠٢٩- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی خەڵکی بیابان لە ڕۆژی هەینیدا هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵەکانمان هەمووی مردن و تیا چوون، ماڵ و منداڵمان تیا چوون، خەڵکی فەوتان، پێغەمبەریش ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە و پاڕایەوە، خەڵکەکەش لەگەڵیدا دەستیان بەرز کردەوە و پاڕانەوە، ئەنەس دەڵێ: جا لە مزگەوت نەهاتبووینە دەرەوە باران باری، ئیدی بەردەوام بارانمان بۆ دەباری هەتا هەینی دواتر، جا پیاوەکە هاتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێبوار بێتوانا بووە، ناتوانێ سەفەر بکات و ڕێگاش گیراوە (بەهۆی زۆری بارانبارینەوە).**

١٠٣٠- وَقَالَ الأُوَيْسِيُّ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ وَشَرِيكٍ، سَمِعَا أَنَسًا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ[2].

**١٠٣٠- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە، هەتا سپیایی هەردوو بنباڵیم بینی.**

---

[1] بروانە: ٩٣٢.

[2] بروانە: ١٠٣١، ٣٥٦٥، ٦٣٤١.

## ٢٢- بَابُ رَفْعِ الإِمَامِ يَدَهُ فِي الاِسْتِسْقَاءِ

١٠٣١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى وَابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ[1] إِلاَّ فِي الاِسْتِسْقَاءِ، وَإِنَّهُ يَرْفَعُ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ[2].

## ٢٢- باسی دەستبەرزکردنەوەی پێشنوێژ لە پاڕانەوەی بارانباریندا

**١٠٣١- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هیچ کام لە پاڕانەوەکانیدا دەستەکانی بەرز نەدەکردەوە، جگە لە پاڕانەوەی بارانبارین، کە بێگومان ئەوەندە دەستەکانی بەرز دەکردەوە، هەتا سپییەتی هەردوو بنباڵی دەبینرا.**

## ٢٣- بَابُ مَا يُقَالُ إِذَا أَمْطَرَتْ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﴿كَصَيِّبٍ ﴿١٩﴾﴾ البقرة. المَطَرُ. وَقَالَ غَيْرُهُ: صَابَ يَصُوبُ وَأَصَابَ.

١٠٣٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ -هُوَ ابْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الحَسَنِ المَرْوَزِيُّ - قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا رَأَى المَطَرَ قَالَ: «صَيِّبًا نَافِعًا». تَابَعَهُ القَاسِمُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ. وَرَوَاهُ الأَوْزَاعِيُّ وَعُقَيْلٌ عَنْ نَافِعٍ.

---

[1] سەرنج: ئەم فەرموودەیەی ئەنەس ﷺ مشتومڕی لەسەرە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆربەی کات لە دوعاکانیدا دەستی بەرز کردۆتەوە، جا هەندێک دەڵێن: ڕەنگە ئەنەس لەبیری کردبێ، یان جوان سەرنجی نەدابێ، یاخود مەبەستی ئەوەیە کە بەم شێوەیە کە بنباڵی دیار بێ، ئاوا دەستی بەرز نەکردۆتەوە. بڕوانە: فتح الباري: ٦٦٧/٢، عمدة القاري: ٧٥/٧.

[2] بڕوانە: ١٠٣٠.

## ٢٣- باسی ئەو دوعایەی لە کاتی بارانبارین دەوترێت

عەبدوڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: مانای: ﴿كَصَيِّبٍ ١٩﴾ بارانە، کەسانی دیکە دەڵێن: (صَابَ) کاری ڕابردووە، (يَصُوبُ) ڕانەبردووەکەیەتی، بەڵام (أَصَابَ) ڕابردووە، (يُصِيبُ) واتە: باران کاتێ دەبارێ و دەدات لە زەوی.

١٠٣٢- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە کە بارانی ببینیایە، دەیفەرموو: ((خوایە بیگێڕی بە بارانێکی بەسوود))، ئەم فەرموودەیە قاسیمی کوڕی یەحیا لە عوبەیدوڵاوە گێڕاویەتەوە، پاڵپشتی ئەو ڕێگەیە دەکات کە فەرموودەکەی پێ گێڕدراوەتەوە. هەروەها ئەوزاعی و عوقەیل لە نافیعەوە فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە.

## ٢٤- بابُ مَنْ تَمَطَّرَ فِي المَطَرِ حَتَّى يَتَحَادَرَ عَلَى لِحْيَتِهِ

١٠٣٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ المُبَارَكِ قَالَ: أَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ أَصَابَتِ النَّاسَ سَنَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَبَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى المِنْبَرِ يَوْمَ الجُمُعَةِ قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلَكَ المَالُ، وَجَاعَ العِيَالُ، فَادْعُ اللهَ لَنَا أَنْ يَسْقِيَنَا. قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ، وَمَا فِي السَّمَاءِ قَزَعَةٌ، قَالَ: فَثَارَ سَحَابٌ أَمْثَالُ الجِبَالِ، ثُمَّ لَمْ يَنْزِلْ عَنْ مِنْبَرِهِ حَتَّى رَأَيْتُ المَطَرَ يَتَحَادَرُ عَلَى لِحْيَتِهِ، قَالَ: فَمُطِرْنَا يَوْمَنَا ذَلِكَ، وَفِي الغَدِ وَمِنْ بَعْدِ الغَدِ وَالَّذِي يَلِيهِ إِلَى الجُمُعَةِ الأُخْرَى، فَقَامَ ذَلِكَ الأَعْرَابِيُّ أَوْ رَجُلٌ غَيْرُهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَهَدَّمَ البِنَاءُ وَغَرِقَ المَالُ، فَادْعُ اللهَ لَنَا. فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ وَقَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا». قَالَ: فَمَا جَعَلَ يُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ السَّمَاءِ إِلاَّ تَفَرَّجَتْ حَتَّى صَارَتِ المَدِينَةُ فِي مِثْلِ الجَوْبَةِ، حَتَّى سَالَ الوَادِي -وَادِي قَنَاةَ- شَهْرًا. قَالَ: فَلَمْ يَجِئْ أَحَدٌ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلاَّ حَدَّثَ بِالجَوْدِ[1].

---

[1] بڕوانە: ٩٣٢.

# ٢٤- باسی کەسێک لە کاتی بارانباریندا خۆی بداتە بەر بارانەکە هەتا بەڕیشیدا بێتە خوارەوە

١٠٣٣- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خەڵکی (مەدینە) تووشی قاتوقڕی و بێبارانی بوون، جا لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگە لە ڕۆژی هەینیدا وتاری دەدا، دەشتەکییەك هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵ و ماڵاتمان هەموو تیا چوون، ماڵ و منداڵمان برسی بوون، لە خوا بپاڕێرەوە بارانمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەری خواش ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە، لە کاتێکدا لە ئاسماندا هیچ پەڵەهەورێك نەبوو، (ئەنەس) وتی: ئیدی هەور بەوێنەی کێو کۆبۆیەوە، پاشان لەسەر دوانگەکەی نەهاتە خوارەوە هەتا بارانم بینی بە ڕیشیدا دەهاتە خوار، (ئەنەس) وتی: ئەو ڕۆژ و سبەینێ و دووسبەی و ڕۆژی دواتریش بارانمان بۆ باری هەتا هەینی دواتر، (جا هەینی داهاتوو) هەر ئەو عەرەبە دەشتەکییە، یان پیاوێکی دیکە بوو هەستایە سەرپێ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خانووەکان ڕووخان، ئاو ئاژەڵ و ماڵاتەکانی خنکاند و کردنی بەژێرەوە، دەی بپاڕێرەوە لە خوا بۆمان (خۆش بکات)، پێغەمبەریش ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی: ((خوایە لە دەوروبەرمان بیبارێنە، نەك بە سەرماندا)). (ئەنەس) وتی: جا بە دەستی ئاماژەی دەکرد بۆ هەر لایەکی ئاسمان (کە هەوری لێ بوو)، هەورەکە دەڕەوییەوە، ئیدی (ئاسمانی) مەدینە وەك بازنەیەك بۆیە سایەقە، (ئەوەندە باران باری) هەتا شیوەکەش -شیوی قەنات- تا یەك مانگ لافاوی پێدا دەڕۆیشت، (ئەنەس) دەڵێ: جا هەر کەس لە هەر لایەکی وڵاتەوە دەهات (بۆ مەدینە)، باسی ئەو بارانە زۆرە پڕبەرەکەتەی دەکرد.

## ٢٥- بابٌ: إِذَا هَبَّتِ الرِّيحُ

١٠٣٤- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي حُمَيْدٌ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسًا يَقُولُ: كَانَتِ الرِّيحُ الشَّدِيدَةُ إِذَا هَبَّتْ عُرِفَ ذَلِكَ فِي وَجْهِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ٢٥- باسێک: کاتێک با هەڵبکات

**١٠٣٤- حومەید گێڕایەوە کە لە ئەنەسی ﷺ بیست دەیوت: کاتێ بای توند هەڵی بکردایە، (شوێنەواری ئەو بایە توندە) لە دەموچاوی پێغەمبەردا ﷺ دەبینرا و دەزانرا[١].**

## ٢٦- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «نُصِرْتُ بِالصَّبَا»

١٠٣٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «نُصِرْتُ بِالصَّبَا، وَأُهْلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ»[٢].

## ٢٦- باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: ((من بە بای شەماڵ[٣] سەر خرام)).

**١٠٣٥- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((من بە بای خۆرهەڵات[١] سەر خرام[٢]، گەلی عادیش بە بای خۆرئاوا[٣] لەناو بران)).**

---

[١] واتە: دەترسا لەوەی کە زیانی هەبێ، یاخود سزا و تووڕەیی خودا بێ بۆ ئوممەتەکەی.

[٢] بڕوانە: ٣٢٠٥، ٣٣٤٣، ٤١٠٥.

[٣] لە فەرهەنگی خاڵدا دەڵێ: شەماڵ: بایەکە لەلای ڕاستی قیبلەوە دێ. فەرهەنگی خاڵ: ٣٧٤، قاموسی صادق: ٤١٦.

## ٢٧- بابُ مَا قِيلَ فِي الزَّلَازِلِ وَالآيَاتِ

١٠٣٦- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقْبَضَ العِلْمُ، وَتَكْثُرَ الزَّلاَزِلُ، وَيَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، وَتَظْهَرَ الفِتَنُ، وَيَكْثُرَ الهَرْجُ -وَهْوَ القَتْلُ- حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ المَالُ فَيَفِيضُ»[٤].

## ٢٧- باسی ئەوەی دەربارەی بومەلەرزە و نیشانەكان (ی قیامەت) وتراوە

**١٠٣٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قیامەت بەرپا نابێت، هەتا زانست و زانیاری هەڵنەگیرێ، بومەلەرزە زۆر نەبێ، كات نزیك نەبێتەوە، ئاژاوە پەیدا نەبێ و كوشتن زۆر نەبێ -الهَرْجُ: واتە: كوشتن- هەتا ئەوەندە ماڵ و سامان لەنێوتاندا زۆر دەبێ، لێتان دەڕژێ)).**

١٠٣٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ الحَسَنِ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، وَفِي يَمَنِنَا» قَالَ: قَالُوا: وَفِي نَجْدِنَا؟ قَالَ: قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا وَفِي يَمَنِنَا» قَالَ: قَالُوا: وَفِي نَجْدِنَا؟ قَالَ: قَالَ: «هُنَاكَ الزَّلاَزِلُ وَالفِتَنُ، وَبِهَا يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ».

---

[١] الصَّبَا: واتە: بای خۆرهەڵات، بای شەماڵیشی پێ دەوترێت، بەڵكوو لە كوردەواریدا هەر بای شەماڵی پێ دەوترێت. بڕوانە: ئەلمونجید بەكوردی: ١٨/٣.

[٢] لە غەزای خەندەقدا.

[٣] الدَّبُور: واتە: بای خۆرنشین، یان بای خۆرئاوا. بڕوانە: ئەلمونجید بەكوردی: ١٣/٢، ١٨/٣.

[٤] بڕوانە: ٨٥.

**١٠٣٧- نافیع لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: ((خوایە پیت و فەڕمان بۆ بخەیتە شام و یەمەنمانەوە))، نافیع دەڵێ: وتیان: (پیت و فەڕ بخەیتە) نەجدیشمانەوە؟ دەڵێ: ئینبو عومەر وتی: ((خوایە پیت و فەڕمان بۆ بخەیتە شام و یەمەنمانەوە))، نافیع دەڵێ: وتیان: (پیت و فەڕ بخەیتە) نەجدیشمانەوە؟ دەڵێ: عەبدوڵا وتی: ((لەوێدا بوومەلەزە و ئاژاوە پەیدا دەبێ، هەر لەوێشەوە شەیتان هێز و شوێنەکەوتەکانی بەدیار دەکەوێ))[1].**

## ٢٨- بَابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ الواقعة.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: شُكْرَكُمْ.

١٠٣٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالحُدَيْبِيَةِ عَلَى إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلَةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: «هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ. فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي، كَافِرٌ بِالكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ: بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا. فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي مُؤْمِنٌ بِالكَوْكَبِ».

## ٢٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (لەجیاتی سوپاسگوزاری لەسەر ڕۆزیتان ئێوە بە درۆی دەزانن و باوەڕ ناهێنن)

**عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لەجیاتی وشەی (رِزْقَكُمْ) وشەی (شُكْرَكُمْ) خوێندۆتەوە[2].**

---

[1] قابیسی دەڵێ: ئەمە فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ، وشەی پێغەمبەر نەنووسراوە لە دەستنووسەکاندا و لەبیر کراوە ئەگینا هەیە. بڕوانە: فتح الباري: ٣/٦٦٣.

[2] لەو کاتەدا مانای ئایەتەکە بەو جۆرە دەبێ کە ئێمە نووسیومانە، دروستیشە بڵێین: ئیبنو عەباس (رِزْقَكُمْ)ـی بە (شُكْرَكُمْ) مانا کردووە، واتە: شوکرانەبژێریتان، ئیبنولحەجەر هەردووکیانی هێناوە: خوێندنەوە بێت، یان مانا بێت، بڕوانە: فتح الباري: ٣/٦٦٤.

١٠٣٨- زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حودەیبییە پێشنوێژی نوێژی بەیانی بۆ کردین، پاش ئەوەی ئەو شەوە باران باریبوو، جا کاتێ لە نوێژەکە بۆیەوە، ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ((ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی فەرمووی؟))، وتیان خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەزانن، فەرمووی: ((ئەم بەیانییە هەندێ لە بەندەکانم باوەڕدار بوون بە من و هەندێکیان بێباوەڕ بوون بە من، جا ئەوەیان کە وتی: بەهۆی بەخشش و بەزەیی خواوە بارانمان بۆ باری، ئەوە ئەوەیان باوەڕی بە من هەیە و بێباوەڕە بە ئەستێرە، ئەوەشیان کە وتی: بەهۆی ئەو شتەوە و ئەو شتەوە بارانمان بۆ باری، ئەوە ئەوەشیان بێباوەڕ بوو بە من و باوەڕی بە ئەستێرە هەیە)).

## ٢٩- بَابٌ: لاَ يَدْرِي مَتَى يَجِيءُ المَطَرُ إِلَّا اللَّهُ

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهُنَّ إِلاَّ اللَّهُ».

١٠٣٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِفْتَاحُ الغَيْبِ خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ اللَّهُ لاَ يَعْلَمُ أَحَدٌ مَا يَكُونُ فِي غَدٍ، وَلاَ يَعْلَمُ أَحَدٌ مَا يَكُونُ فِي الأَرْحَامِ، وَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا، وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ، وَمَا يَدْرِي أَحَدٌ مَتَى يَجِيءُ المَطَرُ»[1].

## ٢٩- باسێک: کەس نازانێ کەی باران دەبارێ جگە لە خوا

وە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە ((پێنج شت هەن جگە لە خوا کەس نایانزانێ)).

---

[1] بڕوانە: ٤٦٢٧، ٤٦٩٧، ٤٧٧٨، ٧٣٧٩.

١٠٣٩- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((كلیلی نەزانراوەكان پێنجن، جگە لە خوا كەس نایانزانێ، كەس نازانێ سبەی چی دەبێ و چی ڕوو دەدات، كەس نازانێ ئەوەی لە منداڵدانداپە (ڕەگەزەكەی) چییە، وە كەس نازانێ سبەینێ چی دەكات، هەروەها كەس نازانێ لە چ زەوییەكدا دەمرێت، وە كەس نازانێ كەی باران دەبارێ)).

# ١٦- كِتابُ الكُسُوفِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١٦- پەڕاوی نوێـژی خۆرگیران

## ١- بابُ الصَّلاَةِ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ

١٠٤٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ عَنْ يُونُسَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَانْكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ: يَجُرُّ رِدَاءَهُ حَتَّى دَخَلَ المَسْجِدَ، فَدَخَلْنَا فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى انْجَلَتِ الشَّمْسُ فَقَالَ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَصَلُّوا وَادْعُوا، حَتَّى يُكْشَفَ مَا بِكُمْ»[1].

## ١- باسی نوێژكردن لە خۆرگیراندا

**١٠٤٠- ئەبو بەكرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین و خۆر گیرا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەستا و عەباكەی بەدوای خۆیدا ڕادەكێشا، هەتا ڕۆیشتە مزگەوتەوە، ئێمەش ڕۆیشتینە مزگەوتەوە، ئینجا دوو ڕكات نوێژ پێشنوێژی بۆ كردین هەتا خۆر بەربوو، جا فەرمووی: ((بێگومان خۆر و مانگ لەبەر مردنی هیچ كەس ناگیرێن، جا هەر كات بینیتان خۆر و مانگ گیران، ئەوە نوێژ بكەن و بپاڕێنەوە، هەتا ئەو گیرانەتان لەسەر لادەبرێت)).**

---

[1] بڕوانە: ١٠٤٨، ١٠٦٢، ١٠٦٣، ٥٧٨٥.

**١٠٤١-** حَدَّثَنَا شِهَابُ بْنُ عَبَّادٍ قال: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا مَسْعُودٍ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَقُومُوا فَصَلُّوا»[1].

**١٠٤١- ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خۆر و مانگ لەبەر مردنی هیچ کەس ناگیرێن، بەڵکوو هەردووکیان دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، جا هەر کاتێ گیرانی خۆر، یان مانگتان بینی، ئەوە هەستن و نوێژ بکەن)).**

**١٠٤٢-** حَدَّثَنَا أَصْبَغُ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ حَدَّثَهُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُخْبِرُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا فَصَلُّوا»[2].

**١٠٤٢- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان خۆر و مانگ لەبەر مردن یان ژیانی هیچ کەس ناگیرێن، بەڵکوو ئەو دووانە دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، جا هەر کات گیرانی خۆر یان مانگتان بینی، ئەوە نوێژ بکەن)).**

**١٠٤٣-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هَاشِمُ بْنُ القَاسِمِ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ، عَنِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ، فَقَالَ النَّاسُ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ فَصَلُّوا وَادْعُوا اللَّهَ»[3].

---

[1] بڕوانە: ١٠٥٧، ٣٢٠٤.

[2] بڕوانە: ٣٢٠١.

[3] بڕوانە: ١٠٦٠، ٦١٩٩.

**١٠٤٣- موغیرەی كوڕی شوعبه ﷺ دەڵێ: له سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەو ڕۆژەدا ئیبراهیم (ی كوڕی پێغەمبەر ﷺ) مرد خۆر گیرا، جا خەڵك وتیان: خۆر لەبەر مردنی ئیبراهیم گیراوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خۆر و مانگ لەبەر مردن یان ژیانی هیچ كەس ناگیرێن، جا هەر كاتێ ئەو گیرانەتان بینی، ئەوە نوێژ بكەن و له خوا بپاڕێنەوە)).**

## ٢- بابُ الصَّدَقَةِ فِي الكُسُوفِ

١٠٤٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّاسِ، فَقَامَ فَأَطَالَ القِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ القِيَامَ وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ مَا فَعَلَ فِي الأُولَى، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدِ انْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللَّهَ وَكَبِّرُوا، وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا». ثُمَّ قَالَ: «يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ أَوْ تَزْنِيَ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا»[1].

## ٢- باسی ماڵبەخشین له كاتی خۆرگیراندا

**١٠٤٤- عائیشه ﷺ دەڵێ: له سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی بۆ خەڵكەكه كرد، جا (نوێژی دابەست و)**

---

[1] بڕوانه: ١٠٤٦، ١٠٤٧، ١٠٥٠، ١٠٥٨، ١٠٦٤، ١٠٦٤، ١٠٦٥، ١٠٦٦، ١٢١٢، ٣٢٠٣، ٤٦٢٤، ٥٢٢١، ٦٦٣١.

بەڕاوەستانەوە زۆر وەستا (قورئانی خوێند)، پاشان کڕنوشی برد و زۆر لە کڕنوشدا مایەوە، پاشان هەستایەوە زۆر بەڕاوەستاوی وەستا، بەڵام لە وەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کڕنوشی برد و زۆر لە کڕنوشدا مایەوە، بەڵام لە کڕنوشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان سوژدەی برد و زۆر لە سوژدەدا مایەوە، پاشان لە ڕکاتی دووەمیشدا بەو جۆرەی کرد کە لە ڕکاتی یەکەمدا کردی، پاشان لێ بۆیەوە لەو کاتەدا خۆر بەربوو، جا وتاری دا بۆ خەڵکەکە، سوپاس و ستاییشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: ((بێگومان خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، لەبەر مردن یان لە دایکبوونی هیچ کەس ناگیرێن، جا کاتێ ئەو گیرانەتان بینی، ئەوە لە خوا بپاڕێنەوە و الله أكبر بکەن، نوێژ بکەن و ماڵ ببەخشن))، پاشان فەرمووی: ((ئەی ئوممەتی موحەممەد سوێند بە خوا هیچ کەس نییە بەئەندازەی خوا ڕێگر بێ و پێی ناخۆش بێ، کاتێ بەندەیەکی یان کەنیزەکێکی زینا بکات، ئەی ئوممەتی موحەممەد، ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانییایە، ئەوە بێگومان کەم پێ دەکەنین و زۆر دەگریان)).

## ٣- بابُ النِّدَاءِ بِـ(الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ) فِي الكُسُوفِ

١٠٤٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ سَلَّامِ بْنِ أَبِي سَلَّامٍ الحَبَشِيُّ الدِّمَشْقِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ الزُّهْرِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: لَمَّا كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نُودِيَ: إِنَّ الصَّلَاةَ جَامِعَةٌ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٠٥١.

## ٣- باسی بانگدان به (الصَّلاَةُ جَامِعَةٌ)[١] له کاتی خۆرگیراندا

**١٠٤٥- عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: لەو کاتەدا کە خۆر گیرا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە ڕستەی: (إِنَّ الصَّلاَةَ جَامِعَةٌ): بەڕاستی نوێژ کۆکەرەوەیە، بانگی بۆ درا.**

## ٤- بابُ خُطْبَةِ الإِمَامِ فِي الكُسُوفِ

وَقَالَتْ عَائِشَةُ وَأَسْمَاءُ خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ.

١٠٤٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ح وَحَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَنْبَسَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي عُرْوَةُ عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَخَرَجَ إِلَى المَسْجِدِ، فَصَفَّ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَكَبَّرَ فَاقْتَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». فَقَامَ وَلَمْ يَسْجُدْ، وَقَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، هِيَ أَدْنَى مِنَ القِرَاءَةِ الأُولَى، ثُمَّ كَبَّرَ وَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، وَهْوَ أَدْنَى مِنَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ». ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَالَ فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، فَاسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ، وَانْجَلَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ، ثُمَّ قَامَ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: «هُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلاَةِ». وَكَانَ يُحَدِّثُ كَثِيرُ بْنُ عَبَّاسٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ كَانَ يُحَدِّثُ يَوْمَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ بِمِثْلِ حَدِيثِ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ. فَقُلْتُ لِعُرْوَةَ: إِنَّ أَخَاكَ يَوْمَ خَسَفَتْ بِالمَدِينَةِ لَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ مِثْلَ الصُّبْحِ. قَالَ: أَجَلْ، لأَنَّهُ أَخْطَأَ السُّنَّةَ[٢].

---

[١] (الصَّلاَةُ جَامِعَةٌ) به (الصَّلاَةَ جَامِعَةً) ڕیوایەت کراوە، وە بە (الصَّلاَةِ جَامِعَةٌ) و بە (الصَّلاَةُ جَامِعَةٌ) ڕیوایەت کراوە. فتح الباري: ٦٧٧/٣.

[٢] بروانە: ١٠٤٤.

## ٤- باسی وتاردانی پێشنوێژ له خۆرگیراندا

**عائیشه و ئەسما ﵄ دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ له خۆرگیراندا وتاری داوه.**

**١٠٤٦- عائیشەی ﵂ خێزانی[1] پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: له سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ مزگەوت، خەڵکەکەش له دوایەوه ڕیز بوون، الله أکبری کرد (نوێژی دابەست)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانێکی زۆری خوێند، پاشان الله أکبری کرد و کڕنوشێکی درێژی برد، پاشان وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئینجا هەستایەوه سوژدەی نەبرد، قورئانێکی زۆر و درێژی خوێند، له قورئانخوێندنەکەی (وەستانی) یەکەم کەمتر بوو، پاشان الله أکبری کرد و کڕنوشێکی درێژی برد، که له کڕنوشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ)، پاشان سوژدەی برد، پاشان له ڕکاتی دووەمدا به وێنەی ڕکاتی یەکەم (قورئان)ی خوێند، جا چوار کڕنوش و چوار سوژدەی برد (له دوو ڕکاتدا)، وه خۆر بەربوو پێش ئەوەی نوێژەکه تەواو بکات، پاشان هەستایەوه و سوپاس و ستاییشی خوای کرد بەو جۆرەی شیاویەتی، پاشان فەرمووی: ((گیرانی خۆر و مانگ دوو نیشانەن له نیشانەکانی خوا، لەبەر مردن یان ژیان و لەدایکبوونی هیچ کەس ناگیرێن، جا کاتێ ئەو دوو گیرانەتان بینی، ئەوه پەنا ببەن بۆ نوێژکردن))، (ئیبنو شیهاب) دەڵێ: کەسیری کوڕی عەباس دەیگێڕایەوه که عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ ئەو ڕۆژەی خۆر دەگیرا، فەرموودەکەی دەگێڕایەوه، هاوشێوەی فەرموودەکەی عوروە له عائیشەوە، (ئیبنو شیهاب) دەڵێ: وتم به عوروە: براکەت (عەبدوڵای کوڕی زوبەیر) ئەو ڕۆژەی خۆر گیرا له مەدینه، دوو ڕکات زیاتری نەکرد وەك نوێژی بەیانی، وتی: بەڵێ وا بوو، هەڵەی کرد و سوننەتی نەپێکا.**

---

[1] ئیمام بوخاری ئەم فەرموودەیەی به دوو ڕشته و سەنەد گێڕاوەتەوه.

## ٥- بابٌ: هَلْ يَقُولُ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ أَوْ خَسَفَتْ؟

وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ۝٨ ﴾ القيامة.

**١٠٤٧-** حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ. أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى يَوْمَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ فَكَبَّرَ، فَقَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». وَقَامَ كَمَا هُوَ، ثُمَّ قَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، وَهْيَ أَدْنَى مِنَ القِرَاءَةِ الأُولَى، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، وَهْيَ أَدْنَى مِنَ الرَّكْعَةِ الأُولَى، ثُمَّ سَجَدَ سُجُودًا طَوِيلًا، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ سَلَّمَ وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ وَالقَمَرِ: «إِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلاَةِ»[1].

## ٥- باسێک: ئایا بۆ خۆرگیران وشەی (كَسَفَتْ) دەوترێ یان (خَسَفَتْ)؟

**خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: ﴿ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ۝٨ ﴾ وشەی (خَسَفَ)ی بۆ تاریکبوونی مانگ بەکار هێناوە.**

**١٠٤٧- عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژەی خۆر گیرا نوێژی کرد، جا هەستا الله أکبری کرد (و نوێژی دابەست و)، ئینجا قورئانێکی زۆرو درێژی خوێند، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، پاشان سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئینجا چۆن وەستابوو وەستا، پاشان قورئانێکی زۆری**

---

[1] بڕوانە: ١٠٤٤.

خوێند، کە لە قورئانخوێندنەکەی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، کە لە کڕنوشەکەی یەکەم کورتتر بوو، پاشان سوژدەیەکی درێژی برد، پاشان لەڕکاتی دووەمدا هاوشێوەی ئەوەی (یەکەمی) کرد، پاشان سەلامی دایەوە، لەو کاتەدا خۆر بەر بووبوو، ئینجا وتاری بۆ خەڵکەکە دا و دەربارەی گیرانی خۆر و مانگ فەرمووی: ((گیرانی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، لەبەر مردن یان ژیان و لەدایکبوونی هیچ کەس ناگیرێن، جا کاتێ ئەو دوو گیرانەتان بینی، ئەوە پەنا ببەن بۆ نوێژکردن)).

## ٦- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «يُخَوِّفُ اللَّهُ عِبَادَهُ بِالكُسُوفِ»

قَالَهُ أَبُو مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٠٤٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلَكِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُخَوِّفُ بِهَا عِبَادَهُ». وَقَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: لَمْ يَذْكُرْ عَبْدُ الوَارِثِ، وَشُعْبَةُ، وَخَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، وَحَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ يُونُسَ: «يُخَوِّفُ بِهَا عِبَادَهُ». وَتَابَعَهُ مُوسَى، عَنْ مُبَارَكٍ، عَنِ الحَسَنِ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُخَوِّفُ بِهِمَا عِبَادَهُ». وَتَابَعَهُ أَشْعَثُ، عَنِ الحَسَنِ[1].

## ٦- باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: ((خوا بە خۆرگیران بەندەکانی دەترسێنێ))

ئەم فەرموودەیە ئەبو موسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە.

١٠٤٨- ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، لەبەر مردنی هیچ کەس ناگیرێن،

---

[1] بڕوانە: ١٠٤٠.

بەڵکوو خوای بەرز و بڵند بەندەکانی خۆی پێ دەترسێنێ)). ئەبو عەبدوڵا (ئیمام بوخاری) دەڵێ: هیچ یەك لە عەبدولواریس و شوعبە و خالیدی کوڕی عەبدوڵا و حەمادی کوڕی سەلەمە کە لە یونوسەوە گێڕاویانەتەوە بڕگەی ((بەندەکانی خۆی پێ دەترسێنێ))یان نەگێڕاوەتەوە و باسیان نەکردووە. بەڵام موسا لە موبارەکەوە ئەویش لە حەسەنەوە دەڵێ: ئەبو بەکرە بۆی گێڕامەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ((بێگومان خوا بە خۆرگیران و مانگ گیران بەندەکانی دەترسێنێ))، ئەم گێڕانەوەیە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یونوس دەکات کە ئەو بڕگەی تێدایە، وە ئەشعەس لە حەسەنەوە گێڕاویەتەوە، پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یونوس دەکات کە ئەو بڕگەیەی تێدا نییە.

## ٧- بَابُ التَّعَوُّذِ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ فِي الكُسُوفِ

١٠٤٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ يَهُودِيَّةً جَاءَتْ تَسْأَلُهَا فَقَالَتْ لَهَا: أَعَاذَكِ اللَّهُ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ. فَسَأَلَتْ عَائِشَةُ ﵂ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُعَذَّبُ النَّاسُ فِي قُبُورِهِمْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَائِذًا بِاللَّهِ مِنْ ذَلِكَ[1].

## ٧- باسی پەناگرتن (بە خوا) لە سزای گۆڕ لە کاتی خۆرگیراندا

١٠٤٩- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: ئافرەتێکی جوولەکە هات داوای شتێکی لێ کرد، بە عائیشەی وت: خوا لە سزای گۆڕ بتپارێزێ . عائیشەش پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: ئایا خەڵك لەنێو گۆڕەکانیاندا سزا

---

[1] بروانە: ١٠٥٥، ١٣٧٢، ٦٣٦٦.

**دەدرێن؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((پەنا بگرە بە خوا لە سزای نێو گۆڕ بەپەناگرتنێکی چاك)).**

١٠٥٠- ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ غَدَاةٍ مَرْكَبًا، فَخَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَرَجَعَ ضُحًى، فَمَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ ظَهْرَانَيِ الحُجَرِ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، وَقَامَ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ، ثُمَّ قَامَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ قَامَ قِيَامًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ وَانْصَرَفَ، فَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَتَعَوَّذُوا مِنْ عَذَابِ القَبْرِ[١].

**١٠٥٠- پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەبەیانییەك سواری وڵاخێك بوو (ڕۆیشت)، جا خۆر گیرا، ئینجا چێشتەنگاو گەڕایەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە پشتی هۆدە(ی خێزانە)کانیدا ڕۆیشت، پاشان هەستا دەستی بە نوێژ کرد، خەڵکەکەش لە دوایەوە وەستان (و نوێژیان دابەست)، ئینجا بەڕاوەستانەوە زۆر وەستا (قورئانی خوێند)، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، پاشان هەستایەوە بەڕاوەستاوی زۆر وەستا، بەڵام لە وەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، بەڵام لە کڕنوشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان بەرز بۆیەوە جا سوژدەی برد، پاشان هەستایەوە و بەڕاوەستانەوە زۆر وەستا (قورئانی خوێند)، بەڵام لە وەستانی یەکەم کەمتربوو، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، بەڵام لە کڕنوشی یەکەم کورتتر بوو، پاشان هەستایەوە بەڕاوەستانەوە زۆر وەستا (قورئانی خوێند)،**

---

[١] بڕوانە: ١٠٤٤.

بەڵام لە وەستانی یەكەم كەمتر بوو، پاشان كڕنوشێكی درێژی برد، بەڵام لە كڕنووشی یەكەم كورتتر بوو، پاشان بەرز بۆیەوە، جا سوژدەی برد و كۆتایی هێنا بە نوێژەكە، ئینجا ئەوەی خوا حەز بكات بیڵێ فەرمووی، پاشان فەرمانی پێ كردن كە پەنا بگرن بە خوا لە سزای نێو گۆڕ.

## ٨- بابُ طُولِ السُّجُودِ فِي الكُسُوفِ

١٠٥١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّهُ قَالَ: لَمَّا كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نُودِيَ: إِنَّ الصَّلاَةَ جَامِعَةٌ. فَرَكَعَ النَّبِيُّ ﷺ رَكْعَتَيْنِ فِي سَجْدَةٍ، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِي سَجْدَةٍ، ثُمَّ جَلَسَ، ثُمَّ جُلِّيَ عَنِ الشَّمْسِ. قَالَ: وَقَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: مَا سَجَدْتُ سُجُودًا قَطُّ كَانَ أَطْوَلَ مِنْهَا[1].

## ٨- باسی درێژی سوژدە لە (نوێژی) خۆرگیراندا

١٠٥١- عەبدوڵای كوڕی عەمر ﵄ دەڵێ: كاتێ خۆر گیرا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بانگ درا بە ڕستەی (إِنَّ الصَّلاَةَ جَامِعَةٌ)، واتە: بێگومان نوێژ كۆكەرەوەی خەڵكە[2] (لە مزگەوتدا)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە یەك ڕكاتدا دوو كڕنوشی برد، پاشان هەستایەوە دوو كڕنوشی برد لە یەك ڕكاتدا، پاشان دانیشت، پاشان خۆر بەربوو، عەبدوڵا وتی: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەرگیز هیچ سوژدەیەكم نەبردووە لەو سوژدەیە درێژتر بێت.

---

[1] بڕوانە: ١٠٤٥.

[2] یان بێگومان نوێژ بەكۆمەڵ دەكرێ. بڕوانە: إرشاد الساري: ٧٧/٣.

# ٩- بابُ صَلاَةِ الكُسُوفِ جَمَاعَةً

وَصَلَّى ابْنُ عَبَّاسٍ لَهُمْ فِي صُفَّةِ زَمْزَمَ. وَجَمَعَ عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ. وَصَلَّى ابْنُ عُمَرَ.

# ٩- باسی نوێژی خۆرگیران بەکۆمەڵ

**(تاوس دەڵێ): عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ پێشنوێژی نوێژی خۆرگیرانی بۆ کردن لە کەپرەکەی پاڵ ئاوی زەمزەمدا، هەروەها عەلی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەباس بەجەماعەت نوێژی خۆرگیرانی بۆ کردن، وە عەبدوڵای کوڕی عومەریش ﷺ پێشنوێژی نوێژی خۆرگیرانی کردووە.**

١٠٥٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: انْخَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا نَحْوًا مِنْ قِرَاءَةِ سُورَةِ البَقَرَةِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ قِيَامًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَاذْكُرُوا اللهَ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ شَيْئًا فِي مَقَامِكَ، ثُمَّ رَأَيْنَاكَ كَعْكَعْتَ؟ قَالَ ﷺ: «إِنِّي رَأَيْتُ الجَنَّةَ، فَتَنَاوَلْتُ عُنْقُودًا، وَلَوْ أَصَبْتُهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا، وَأُرِيتُ النَّارَ، فَلَمْ أَرَ مَنْظَرًا كَاليَوْمِ قَطُّ أَفْظَعَ، وَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ». قَالُوا: بِمَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: «بِكُفْرِهِنَّ». قِيلَ: يَكْفُرْنَ بِاللهِ؟ قَالَ: «يَكْفُرْنَ العَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ كُلَّهُ، ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٢٩.

١٠٥٢- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی خۆرگیرانی کرد (نوێژی دابەست)، بەپێوە زۆر وەستا بەئەندازەی خوێندنی سورەتی بەقەرە، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، پاشان بەرز بۆیەوە، جا زۆر بەڕاوەستاوی مایەوە (قورئانی خوێند)، بەڵام لە وەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، بەڵام لە کڕنوشی یەکەم کورتتر بوو، پاشان سوژدەی برد، پاشان ڕاوەستا، زۆر بەڕاوەستاوی مایەوە، بەڵام لە ڕاوەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، بەڵام لە کڕنوشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان بەرز بۆیەوە و زۆر بەڕاوەستاوی مایەوە، بەڵام لە وەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کڕنوشێکی درێژی برد، بەڵام لە کڕنوشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان سوژدەی برد، پاشان نوێژەکەی تەواو کرد، لەو کاتەدا خۆر بەربوو، ئینجا فەرمووی: ((بێگومان خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، لەبەر مردن یان ژیان و لەدایکبوونی هیچ کەسێك ناگیرێن، جا هەر کات ئەو گیرانەتان بینی، ئەوە یادی خوا بکەن))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاومان لێت بوو لەو شوێنەی خۆتدا وەك دەست بۆ شتێك ببەیت، پاشان چاومان لێت بوو هاتیتە دواوە؟ فەرمووی: ((بێگومان بەهەشتم بینی دەستم برد بۆ هێشوویەك میوە، ئەگەر بمگرتایە هەتا دونیا مابوو لێتان دەخوارد (و تەواو نەدەبوو)، دۆزەخیشم نیشان درا، هیچ کات دیمەنی تۆقێنەر و ترسناکی وەك ئەمڕۆیم نەدیوە، بینیم زۆربەی خەڵکەکەی لە ئافرەتانە))، وتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟! فەرمووی: ((لەبەر پێنەزانینیان))، وترا: بە خوا بێباوەڕن؟ فەرمووی: ((دان بە چاکەی مێردیاندا نانێن، دان بە چاکەدا نانێن لەگەڵیاندا کراوە، ئەگەر بەدرێژایی ساڵ لەگەڵ ئافرەتێکیاندا چاکە بکەی، دوایی خراپەیەکت لێ ببینێ دەڵێ: هەرگیز چاکەم لێ نەبینیویت)).

# ١٠- بابُ صَلَاةِ النِّسَاءِ مَعَ الرِّجَالِ فِي الكُسُوفِ

١٠٥٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنِ امْرَأَتِهِ فَاطِمَةَ بِنْتِ المُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ أَنَّهَا قَالَتْ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ ﵂ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ- حِينَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَإِذَا النَّاسُ قِيَامٌ يُصَلُّونَ، وَإِذَا هِيَ قَائِمَةٌ تُصَلِّي فَقُلْتُ: مَا لِلنَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ بِيَدِهَا إِلَى السَّمَاءِ وَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللَّهِ! فَقُلْتُ: آيَةٌ؟ فَأَشَارَتْ أَيْ نَعَمْ. قَالَتْ: فَقُمْتُ حَتَّى تَجَلَّانِي الغَشْيُ، فَجَعَلْتُ أَصُبُّ فَوْقَ رَأْسِي المَاءَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ كُنْتُ لَمْ أَرَهُ إِلاَّ قَدْ رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي هَذَا حَتَّى الجَنَّةَ وَالنَّارَ، وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي القُبُورِ مِثْلَ -أَوْ قَرِيبًا مِنْ- فِتْنَةِ الدَّجَّالِ -لاَ أَدْرِي أَيَّتَهُمَا قَالَتْ أَسْمَاءُ-، يُؤْتَى أَحَدُكُمْ فَيُقَالُ لَهُ مَا عِلْمُكَ بِهَذَا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا المُؤْمِنُ -أَوِ المُوقِنُ. لاَ أَدْرِي أى ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ -فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، جَاءَنَا بِالبَيِّنَاتِ وَالهُدَى، فَأَجَبْنَا وَآمَنَّا وَاتَّبَعْنَا. فَيُقَالُ لَهُ نَمْ صَالِحًا، فَقَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُوقِنًا. وَأَمَّا المُنَافِقُ -أَوِ المُرْتَابُ. لاَ أَدْرِي أَيَّتَهُمَا قَالَتْ أَسْمَاءُ -فَيَقُولُ: لاَ أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ»[1].

## ١٠- نوێژکردنی ئافرەتان لەگەڵ پیاواندا لە نوێژی خۆرگیراندا

**١٠٥٣- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ خۆر گیرابوو، دەبینم خەڵکی بەپێوە وەستاون نوێژ دەکەن، عائیشەش وەستاوە نوێژ دەکات، منیش وتم: ئەو خەڵکە چییانە (نوێژ دەکەن)؟ عائیشە بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان و وتی: (سبحان الله)، وتم: نیشانەکە ڕووی داوە؟ ئەویش بە ئاماژە وتی: بەڵێ، ئەسماو دەڵێ: منیش نوێژم دابەست و وەستام (زۆر بەپێوە مامەوە)، هەتا نزیک بوو لەهۆش خۆم بچم، بۆیە دەستم کرد**

---

[1] بڕوانە: ٨٦.

بەئاوکردن بە سەرمدا، جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بۆیەوە سوپاس و ستاییشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: ((ئەوەی کە نەمدیبوو پێشتر، ئا لەم شوێنەی تێیدا وەستاوم بینیم، هەتا بەهەشت و دۆزەخیش، سوێند بە خوا نیگام بۆ هاتووە، ئێوە لەنێو گۆڕەکانتاندا بەوێنەی -یا نزیك لە- فیتنەی دەجال تاقی دەکرێنەوە - (فاتیمە دەڵێ): نازانم ئەسماو کامیانی وت-، هەرکەس لە ئێوە دەهێنرێ و پێی دەوترێ: دەربارەی ئەو پیاوە (موحەممەد ﷺ) چی زانیارییەکت هەیە؟ جا ئەگەر ئیماندار بێ -یان باوەڕی پتەوی هەبێ، نازانم ئەسماو کامیانی وت- ئەویش: دەڵێ موحەممەدە کە پێغەمبەری خوایە، ئایینی ڕۆشن و ڕێنموونی بۆ هێناوین، ئێمەش وەلاممان دایەوە و باوەڕمان پێ هێنا و شوێنی کەوتین. جا پێی دەوترێ: بخەوە بەخۆشی، بەڕاستی ئێمە دەمانزانی تۆ باوەڕی پتەوت هەیە. بەلام ئەوەی دووڕوو - یان بەگومان و دوودڵ بێت، نازانم ئەسماو کامیانی وت- ئەوە دەڵێ: نازانم (ئەو پیاوە کێیە؟)، گوێم لێ بوو خەڵك شتێکیان دەوت (لەبارەیەوە)، منیش دەموتەوە)).

## ١١- بابُ مَنْ أَحَبَّ العَتَاقَةَ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ

١٠٥٤- حَدَّثَنَا رَبِيعُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: لَقَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِالعَتَاقَةِ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ[1].

## ١١- باسی کەسێک حەزی لە کۆیلەئازادکردن بێت لە کاتی خۆرگیراندا

١٠٥٤- ئەسما ؓ دەڵێ: بێگومان لە کاتی خۆرگیراندا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە ئازادکردنی کۆیلە و بەندە کرد.

---

[1] بڕوانە: ٨٦.

## ١٢- بابُ صَلَاةِ الكُسُوفِ فِي المَسْجِدِ

١٠٥٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ يَهُودِيَّةً جَاءَتْ تَسْأَلُهَا فَقَالَتْ: أَعَاذَكِ اللَّهُ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ. فَسَأَلَتْ عَائِشَةُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُعَذَّبُ النَّاسُ فِي قُبُورِهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَائِذًا بِاللَّهِ مِنْ ذَلِكَ[1].

## ١٢- باسی نوێژی خۆرگیران لە مزگەوتدا

**١٠٥٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: ئافرەتێکی جوولەکە هات پرسیاری لێ بکات بە عائیشەی وت: خوا لە سزای گۆڕ بتپارێزێ، عائیشەش پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا خەڵك لەنێو گۆڕەکانیاندا سزا دەدرێن؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((پەنا بگرە بە خوا لە سزای نێو گۆڕ بەپەناگرتنێکی چاك)).**

١٠٥٦- ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ غَدَاةٍ مَرْكَبًا، فَكَسَفَتِ الشَّمْسُ فَرَجَعَ ضُحًى، فَمَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ ظَهْرَانَى الحُجَرِ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، وَقَامَ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ سُجُودًا طَوِيلًا، ثُمَّ قَامَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ قَامَ قِيَامًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ القِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلًا وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ وَهْوَ دُونَ السُّجُودِ الأَوَّلِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَتَعَوَّذُوا مِنْ عَذَابِ القَبْرِ[2].

---

[1] بروانە: ١٠٤٩.

[2] بروانە: ١٠٤٤.

١٠٥٦- پاشان پێغەمبەرى خوا ﷺ سەرلەبەيانييەك سوارى ولاخێك بوو (ڕۆيشت)، جا خۆر گيرا، ئينجا چێشتەنگاو گەڕايەوە، جا پێغەمبەرى خوا ﷺ بە پشتى هۆدە (ى خێزانە)كانيدا ڕۆيشت، پاشان هەستا دەستى بە نوێژ كرد، خەڵكەكەش لە دوايەوە وەستان (و نوێژيان دابەست)، ئينجا بەڕاوەستانەوە زۆر وەستا (قورئانى خوێند)، پاشان كڕنوشێكى درێژى برد، پاشان هەستايەوە بەڕاوەستاوى زۆر وەستا، بەلاّم لە وەستانى يەكەم كورتتر بوو، پاشان كڕنوشێكى درێژى برد، بەلاّم لە كڕنوشى يەكەم كورتتر بوو، پاشان بەرز بۆيەوە جا سوژدەيەكى درێژى برد، پاشان هەستايەوە و بەڕاوەستانەوە زۆر وەستا (قورئانى خوێند)، بەلاّم لە وەستانى يەكەم كورتتر بوو، پاشان كڕنوشێكى درێژى برد، بەلاّم لە كڕنوشى يەكەم كورتتر بوو، پاشان هەستايەوە، بەڕاوەستانەوە زۆر وەستا (قورئانى خوێند)، بەلاّم لە وەستانى يەكەم كورتتر بوو، پاشان كڕنوشێكى درێژى برد، بەلاّم لە كڕنوشى يەكەم كەمتر بوو، (پاشان بەرز بۆيەوە) جا سوژدەيەكى برد، بەلاّم لە سوژدەى يەكەم كورتتر بوو، پاشان كۆتايى هێنا بە نوێژەكە، ئينجا پێغەمبەرى خوا ﷺ ئەوەى خوا حەز بكات بيڵێ فەرمووى، پاشان فەرمانى پێ كردن پەنا بگرن بە خوا لە سزاى نێو گۆڕ.

## ١٣- بابٌ: لاَ تَنْكَسِفُ الشَّمْسُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ

رَوَاهُ أَبُو بَكْرَةَ وَالمُغِيرَةُ وَأَبُو مُوسَى وَابْنُ عَبَّاسٍ وَابْنُ عُمَرَ ﭫ.

١٠٥٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسٌ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشَّمْسُ وَالقَمَرُ لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَصَلُّوا»[1].

---

[1] بڕوانە: ١٠٤١.

## ١٣- باسێک: خۆر لەبەر مردن یان ژیانی هیچ کەس ناگیرێ

**ئەم فەرموودەیە ئەبو بەکرە و موغیرە و ئەبو موسا و عەبدوڵای کوڕی عەباس و عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ گێڕاویانەتەوە.[١]**

**١٠٥٧- ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خۆر و مانگ لەبەر مردن یان ژیانی هیچ کەس ناگیرێن، بەڵکوو هەردووکیان دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خودا، جا هەر کاتێ گیرانی ئەو دووانەتان بینی، ئەوە نوێژ بکەن)).**

١٠٥٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، وَهِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَأَطَالَ القِرَاءَةَ ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ القِرَاءَةَ وَهْيَ دُونَ قِرَاءَتِهِ الأُولَى، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ دُونَ رُكُوعِهِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَصَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَامَ فَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ يُرِيهِمَا عِبَادَهُ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلاَةِ»[٢].

**١٠٥٨- عائیشە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەریش ﷺ هەستا و پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، جا (نوێژی دابەست و) قورئانی زۆری خوێند، پاشان کڕنوشی برد و زۆر لە کڕنوشدا مایەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە (و هەستایەوە)، جا قورئانی زۆری خوێند، بەڵام لە قورئانخوێندنی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کڕنوشی برد و زۆر لە کڕنوشدا**

[١] لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

[٢] بڕوانە: ١٠٤٤.

مایەوە، بەڵام لە کڕنوشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان سەری بەرز کردەوە، پاشان دوو سوژدەی برد، پاشان هەستایە، ئینجا لە ڕکاتی دووەمدا هاوشێوەی ئەوەی (ڕکاتی یەکەمی) کرد، پاشان هەستایەوە و فەرمووی: ((بێگومان خۆر و مانگ لەبەر مردن یان ژیان و لەدایکبوونی هیچ کەس ناگیرێن، بەڵکوو هەردووکیان دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، خوا نیشانی بەندەکانی دەدات، جا کاتێ ئەو گیرانەتان بینی، ئەوە پەنا بۆ نوێژ بەرن)).

## ١٤- بَابُ الذِّكْرِ فِي الكُسُوفِ

رَوَاهُ ابْنُ عَبَّاسٍ.

١٠٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَزِعًا، يَخْشَى أَنْ تَكُونَ السَّاعَةُ، فَأَتَى المَسْجِدَ، فَصَلَّى بِأَطْوَلِ قِيَامٍ وَرُكُوعٍ وَسُجُودٍ رَأَيْتُهُ قَطُّ يَفْعَلُهُ وَقَالَ: «هَذِهِ الآيَاتُ التِي يُرْسِلُ اللَّهُ لاَ تَكُونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنْ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهِ عِبَادَهُ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ».

## ١٤- باسی یادی خوا لە خۆرگیراندا

ئەم فەرموودەیە عەبدوڵای کوڕی عەباس رضي الله عنهما گێڕاویەتەوە.

١٠٥٩- ئەبو موسا رضي الله عنه دەڵێ: خۆر گیرا، جا پێغەمبەر ﷺ بەشڵەژاوی و ترسەوە هەستا، دەترسا ڕۆژی دوایی بێت، بۆیە هات بۆ مزگەوت و نوێژی (خۆرگیرانی) کرد بەدرێژترین وەستان و کڕنوش و سوژدە کە من بینیبێتم کردبێتی لە نوێژدا، وە فەرمووی: ((ئەم نیشانانەی خوا دەینێرێ لەبەر مردن، یان ژیان و لەدایکبوونی هیچ کەسێك نییە، بەڵکوو خوا بەندەکانی خۆی پێ دەترسێنێ، جا

کاتێ هەر شتێ لەمانەتان بینی، ئەوە پەنا ببەن بۆ یادی خوا و پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوونکردن لێی)).

## ١٥- بابُ الدُّعَاءِ فِي الخُسُوفِ

قَالَهُ أَبُو مُوسَى وَعَائِشَةُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٠٦٠- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ عِلاَقَةَ قَالَ: سَمِعْتُ المُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ يَقُولُ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ يَوْمَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ، فَقَالَ النَّاسُ: انْكَسَفَتْ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَادْعُوا اللَّهَ وَصَلُّوا حَتَّى يَنْجَلِيَ»[1].

## ١٥- باسی پاڕانەوە لە کاتی خۆرگیراندا

ئەبو موسا و عائیشە ﵄ فەرموودەیەکیان لەم بارەیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

١٠٦٠- موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەو ڕۆژەدا ئیبراهیم (ی کوڕی پێغەمبەر ﷺ) مرد خۆر گیرا، بۆیە خەڵك وتیان: خۆر لەبەر مردنی ئیبراهیم گیراوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، لەبەر مردن یان ژیانی هیچ کەس ناگیرێن، جا هەر کاتێ (گیرانی) ئەو دووانەتان بینی، ئەوە لە خوا بپاڕێنەوە و نوێژ بکەن، هەتا بەرببێت)).

---

[1] بڕوانە: ١٠٤٣.

## ١٦- بابُ قَوْلِ الإِمَامِ فِي خُطْبَةِ الكُسُوفِ: أَمَّا بَعْدُ

١٠٦١- وَقَالَ أَبُو أُسَامَةَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي فَاطِمَةُ بِنْتُ المُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ فَانْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ فَخَطَبَ، فَحَمِدَ اللَّهَ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ»[1].

## ١٦- باسی پێشنوێژ لە وتاری خۆرگیراندا بڵێ: جا دوای ئەمە

**١٠٦١- ئەسماو ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی خۆرگیران بۆیەوە، لەو کاتەدا خۆر بەربوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ وتاری دا، سوپاس و ستاییشی خوای کرد بەو شێوەی شیاوی خوا بێت، پاشان فەرمووی: ((جا دوای ئەمە)).**

## ١٧- بابُ الصَّلَاةِ فِي كُسُوفِ القَمَرِ

١٠٦٢- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﵁ قَالَ انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ[2].

## ١٧- باسی نوێژی مانگگیران

**١٠٦٢- ئەبو بەکرە ﵁ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەی خوادا ﷺ خۆر گیرا، جا دوو ڕکات نوێژی کرد.**

١٠٦٣- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَخَرَجَ يَجُرُّ رِدَاءَهُ حَتَّى انْتَهَى إِلَى المَسْجِدِ، وَثَابَ النَّاسُ إِلَيْهِ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ، فَانْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ

---

[1] بڕوانە: ٨٦.

[2] بڕوانە: ١٠٤٠.

آيَاتِ اللَّهِ، وَإِنَّهُمَا لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَإِذَا كَانَ ذَاكَ فَصَلُّوا وَادْعُوا حَتَّى يُكْشَفَ مَا بِكُمْ». وَذَاكَ أَنَّ ابْنا لِلنَّبِيِّ ﷺ مَاتَ، يُقَالُ لَهُ: إِبْرَاهِيمُ، فَقَالَ النَّاسُ فِي ذَاكَ[1].

**١٠٦٣- ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ لەماڵ هاتە دەرەوە، پۆشاکەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا هەتا چووە نێو مزگەوت، وە خەڵکەکە لێی کۆ بوونەوە، جا دوو ڕکات پێشنوێژی بۆ کردن، ئەوسا خۆر بەربوو، جا فەرمووی: ((بێگومان خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، بێگومان هەردووکیان لەبەر مردنی هیچ کەس ناگیرێن، جا هەر کات ئەو (گیرانە) بوو ئەوە نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە، هەتا ئەو گیرانەتان لەسەر لادەبرێ))، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە کوڕێکی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی ئیبراهیم بوو مردبوو، خەڵکی وتیان: لەبەر مردنی ئیبراهیم خۆر گیراوە!**

## ١٨- بابٌ: الرَّكْعَةُ الأُولَى فِي الكُسُوفِ أَطْوَلُ

١٠٦٤- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِهِمْ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي سَجْدَتَيْنِ، الأَوَّلُ وَالأَوَّلُ أَطْوَلُ[2].

## ١٨- باسێک: ڕکاتی یەکەمی نوێژی خۆرگیران درێژترە (لە ڕکاتی دووەم)

**١٠٦٤- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی بۆ کردن لە خۆرگیراندا بە چوار کڕنوش لە دوو ڕکاتدا، یەکەمەکانیان درێژتر بوو لەوەی دوای ئەو دێت[1].**

---

[1] بڕوانە: ١٠٤٠.

[2] بڕوانە: ١٠٤٤.

## ١٩- بَابُ الجَهْرِ بِالقِرَاءَةِ فِي الكُسُوفِ

١٠٦٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مِهْرَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا الوَلِيدُ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ نَمِرٍ، سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂: جَهَرَ النَّبِيُّ ﷺ فِي صَلاَةِ الخُسُوفِ بِقِرَاءَتِهِ، فَإِذَا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَتِهِ كَبَّرَ فَرَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرَّكْعَةِ قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ» ثُمَّ يُعَاوِدُ القِرَاءَةَ فِي صَلاَةِ الكُسُوفِ، أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ[٢].

## ١٩- باسى قورئانخوێندن بەدەنگى بەرز لە نوێژى مانگگیراندا[٣]

**١٠٦٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژى مانگگیراندا بەدەنگى بەرز قورئانى خوێند، جا کە لە قورئانخوێندن بۆیەوە، الله أكبرى کرد و کڕنوشى برد، کاتێکیش لە کڕنوش بەرز دەبوویەوە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ)، پاشان دەستى دەکردەوە بە قورئانخوێندن لە نوێژى خۆرگیراندا، چوار کڕنوش و چوار سوژدەى دەبرد لە دوو ڕکاتدا.**

١٠٦٦- وَقَالَ الأَوْزَاعِيُّ وَغَيْرُهُ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ الشَّمْسَ خَسَفَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَعَثَ مُنَادِيًا بِالصَّلاَةُ جَامِعَةٌ، فَتَقَدَّمَ فَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ. وَأَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ نَمِرٍ، سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ مِثْلَهُ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَقُلْتُ: مَا صَنَعَ أَخُوكَ ذَلِكَ، عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الزُّبَيْرِ مَا صَلَّى إِلاَّ رَكْعَتَيْنِ مِثْلَ الصُّبْحِ إِذْ صَلَّى بِالْمَدِينَةِ. قَالَ: أَجَلْ، إِنَّهُ أَخْطَأَ السُّنَّةَ. تَابَعَهُ سُفْيَانُ بْنُ حُسَيْنٍ، وَسُلَيْمَانُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، فِي الجَهْرِ[٤].

---

[١] دەگونجێ مەبەست لەم درێژترە درێژى وەستانەکان و ڕکوعەکان و سوجدەکان بێ، واتە: یەکەمى هەموویان.

[٢] بڕوانە: ١٠٤٤.

[٣] یان خۆرگیران. فتح الباري: ٦٩٨/٣.

[٤] بڕوانە: ١٠٤٤.

**١٠٦٦- ئەوزاعی و جگە لەو وتوویانە: گوێم لە زوهری بوو لە عورووەوە گێڕایەوە، ئەویش لە عائیشەوە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەریش ﷺ بانگبێژێکی نارد بڵێ: ((الصَّلاَةُ جَامِعَةٌ)) واتە: بێگومان نوێژ کۆکەرەوەی خەڵکە[1] (لە مزگەوتدا)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە پێشەوە و چوار کڕنوش و چوار سوژدەی برد لە دوو ڕکات نوێژدا.**

**(وەلید دەڵێ[2] عەبدوڕەحمانی کوڕی نەمیر لە ئیبنو شیهابەوە، وێنەی ئەم فەرموودەیەی بیستووە.**

**زوهری دەڵێ: بە عورووەم وت: عەبدوڵای کوڕی زوبەیری برات ئەوەی نەکرد، ئەو هەر دوو ڕکاتی کرد وەك نوێژی بەیانی، کاتێ نوێژی خۆرگیرانی کرد لە مەدینە، عورووە وتی: بەڵێ وای کرد، ئەو هەڵەی کرد و سوننەتی نەپێکا.**

**سوفیانی کوڕی حوسەین و سولەیمانی کوڕی کەسیر لە زوهرییەوە لە بڕگەی دەنگ بەرزکردنەوەدا پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی نەمیر دەکەن.**

---

[1] یان بێگومان نوێژ بەکۆمەڵ دەکرێ. بڕوانە: إرشاد الساري: ٧٧/٣.

[2] ئەم بڕگەیە (وەلید دەڵێ:) لە یەکێک لە نوسخەکانی بوخاریدا هاتووە. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٠٩/٣.

# ١٧- كِتَابُ سُجُودِ القُرْآنِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١٧- پەڕاوی سوژدەكانی قورئان خوێندن

## ١- بابُ مَا جَاءَ فِي سُجُودِ الْقُرْآنِ وَسُنَّتِهَا

١٠٦٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ الأَسْوَدَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ ﷺ النَّجْمَ بِمَكَّةَ فَسَجَدَ فِيهَا، وَسَجَدَ مَنْ مَعَهُ، غَيْرَ شَيْخٍ أَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصًى أَوْ تُرَابٍ فَرَفَعَهُ إِلَى جَبْهَتِهِ وَقَالَ: يَكْفِينِي هَذَا. فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كَافِرًا[1].

## ١- باسی ئەوەی دەربارەی سوژدەكانی قورئان و سوننەت بوونیان هاتووە

**١٠٦٧- عەبدوڵای (كوڕی مەسعود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مەككە سورەتی نەجمی خوێندو سوژدەی تیا برد (لە كاتی خوێندنی ئایەتی سوژدە لە سوورەتەكەدا)، ئەوانەش لەگەڵیدا بوون سوژدەیان برد، جگە لە پیاوێكی پیری بە تەمەن كە مشتێ چەو (زیخ)، یان خۆڵی هەڵگرت و بەرزی كردەوە بۆ نزیك نێوچاوانی (سوژدەی لەسەر برد)، وتی: من ئەمەم بەسە، (عەبدوڵا) دەڵێ: جا دواتر بینیم بەكافری كوژرا.**

---

[1] بڕوانە: ١٠٧٠، ٣٨٥٣، ٣١٧٢، ٤٨٦٣.

## ٢- بابُ سَجْدَةِ تَنْزِيلُ السَّجْدَةُ

١٠٦٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الجُمُعَةِ فِي صَلَاةِ الفَجْرِ: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢﴾ السجدة. وَ ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ ۝١﴾ الإنسان[1].

## ٢- باسی سوژدەی سووڕەتی (السجدة)

**١٠٦٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیانی ڕۆژی هەینیدا سووڕەتی سەجدەو سووڕەتی ئینسانی دەخوێند (لە دوو ڕکاتەکەدا).**

## ٣- بابُ سَجْدَةِ (ص)

١٠٦٩- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ وَأَبُو النُّعْمَانِ قَالَا: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: (ص) لَيْسَ مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ، وَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَسْجُدُ فِيهَا[2].

## ٣- باسی سوژدەی سووڕەتی (ص)

**١٠٦٩- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: سوژدەی سووڕەتی صاد لە سوژدە فەرمان پێکراوەکان نییە، وە بێگومان پێغەمبەرم ﷺ بینیوە لە(کاتی خوێندنی سووڕەتی) صاددا سوژدەی دەبرد.**

---

[1] بڕوانە: ٨٩١.

[2] بڕوانە: ٣٤٢٢.

## ٤- بابُ سَجْدَةِ النَّجْمِ

قَالَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٠٧٠- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَرَأَ سُورَةَ النَّجْمِ فَسَجَدَ بِهَا، فَمَا بَقِيَ أَحَدٌ مِنَ القَوْمِ إِلاَّ سَجَدَ، فَأَخَذَ رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ كَفًّا مِنْ حَصًى أَوْ تُرَابٍ، فَرَفَعَهُ إِلَى وَجْهِهِ وَقَالَ: يَكْفِينِي هَذَا. فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ بَعْدُ قُتِلَ كَافِرًا[1].

## ٤- باسی سوژدەی سوورەتی (النَّجْمِ)

**ئەو فەرموودەیەی لەبارەیەوە هاتووە عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**١٠٧٠- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سوورەتی نەجمی خوێندو سوژدەی برد، ئینجا لە خەڵکەکەدا (کە لەگەڵیدا بوون) کەس نەما سوژدە نەبات، ئینجا پیاوێك لەنێو خەڵکەکەدا مشتێ چەو (زیخ)، یان خۆڵی هەڵگرت و بەرزی کردەوە بۆ نزیك نێوچاوانی (سوژدەی لەسەر برد)، وتی: من ئەمەم بەسە، عەبدوڵا دەڵێ: جا سوێند بەخوا دواتر بینیم بەکافری کوژرا.**

## ٥- بابُ سُجُودِ المُسْلِمِينَ مَعَ المُشْرِكِينَ، وَالمُشْرِكُ نَجَسٌ لَيْسَ لَهُ وُضُوءٌ

وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ يَسْجُدُ عَلَى وُضُوءٍ

١٠٧١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَجَدَ بِالنَّجْمِ، وَسَجَدَ مَعَهُ المُسْلِمُونَ وَالمُشْرِكُونَ وَالجِنُّ وَالإِنْسُ. وَرَوَاهُ ابْنُ طَهْمَانَ عَنْ أَيُّوبَ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٠٦٧.

## ٥- باسی سوژدەبردنی مسوڵمانان لەگەڵ هاوبەشدانەراندا، لەکاتێکدا بتپەرست پیسە - دەستنوێژی دروست نیە

عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ هەمیشە بە دەستنوێژەوە سوژدەی قورئان خوێندنی دەبرد.

١٠٧١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە خوێندنی سووڕەتی ﴿ وَٱلنَّجۡمِ ﴾ سوژدەی برد، وە مسوڵمانان و بتپەرست و جنۆکەو مرۆڤەکان لەگەڵیدا سوژدەیان برد.

ئیبنو تەهمانیش لە ئەیوبەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

## ٦- بابُ مَنْ قَرَأَ السَّجْدَةَ وَلَمْ يَسْجُدْ

١٠٧٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ أَبُو الرَّبِيعِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ خُصَيْفَةَ، عَنِ ابْنِ قُسَيْطٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَأَلَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ فَزَعَمَ أَنَّهُ قَرَأَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ: ﴿وَٱلنَّجۡمِ ۝١﴾ النجم. فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا[٢].

## ٦- باسی کەسێک (ئایەتی) سوژدە بخوێنێ و سوژدە نەبات

١٠٧٢- ئیبنو قوسەیت لە عەتای کوڕی یەسارەوە دەگێڕێتەوە، عەتا هەواڵی پێداوە پرسیاری لە زەیدی کوڕی سابیت ﷺ کردووە، زەید وتی: کە ئەو سووڕەتی ﴿ وَٱلنَّجۡمِ ﴾ بۆ پێغەمبەر ﷺ خوێندۆتەوە، پێغەمبەر ﷺ (لەکاتی خوێندنەوەیدا) سوژدەی نەبرد.

---

[١] بروانە: ٤٨٦٢.

[٢] بروانە: ١٠٧٣.

١٠٧٣- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قُسَيْطٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ ﴿وَٱلنَّجۡمِ ١﴾ النجم. فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا[1].

**١٠٧٣- عەتای کوڕی یەسار لە زەیدی کوڕی سابیتەوە دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: سووڕەتی ﴿وَٱلنَّجۡمِ﴾م بۆ پێغەمبەر ﷺ خوێندەوە، پێغەمبەر ﷺ لەکاتی خوێندنەوەیدا سوژدەی نەبرد.**

## ٧- باب سَجْدَةِ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾

١٠٧٤- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ وَمُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَا: أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَرَأَ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾ فَسَجَدَ بِهَا، فَقُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَلَمْ أَرَكَ تَسْجُدُ قَالَ: لَوْ لَمْ أَرَ النَّبِيَّ ﷺ يَسْجُدُ لَمْ أَسْجُدْ[2].

## ٧- باسی سوژدەی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾

**١٠٧٤- ئەبو سەلەمە دەڵێ: ئەبو هوڕەیرەم بینی ﷺ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾ی خوێندو سوژدەی برد بە خوێندنی، منیش وتم: ئەی ئەبو هوڕەیرە ئەوە چیبوو بینیم سوژدەت برد؟! ئەبو هوڕەیرە وتی: ئەگەر پێغەمبەرم ﷺ نەدیبایە سوژدەی دەبرد، منیش سوژدەم نەدەبرد.**

---

[1] بڕوانە: ١٠٧٢.

[2] بڕوانە: ٧٦٦.

## ٨- بَابُ مَنْ سَجَدَ لِسُجُودِ القَارِئ

وَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ لِتَمِيمِ بْنِ حَذْلَمٍ -وَهْوَ غُلَامٌ- فَقَرَأَ عَلَيْهِ سَجْدَةً، فَقَالَ: اسْجُدْ فَإِنَّكَ إِمَامُنَا.
١٠٧٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ عَلَيْنَا السُّورَةَ فِيهَا السَّجْدَةُ، فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ، حَتَّى مَا يَجِدُ أَحَدُنَا مَوْضِعَ جَبْهَتِهِ[1].

## ٨- باسى ئەو كەسەى سوژدە دەبات بەهۆى سوژدەى قورئان خوێنەوە

**عەبدوڵاى كوڕى مەسعود ﷺ بە تەميمى كوڕى حەزلەمى وت -كە مێردمنداڵێك بوو- كاتێك ئايەتێكى سوژدەى بۆ عەبدوڵا خوێندەوە عەبدوڵا وتى: سوژدە ببە، چونكە تۆ (لە سوژدەبردندا) ئيمامى ئێمەى.**
**١٠٧٥- عەبدوڵاى كوڕى عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێك سووڕەتێكى بۆ دەخوێندينەوە كە سوژدەى تێدا بوو، خۆى سوژدەى دەبردو ئێمەش سوژدەمان دەبرد، (ئەوەندە زۆر بووين) هەتا هەندێكمان شوێنێكى دەست نەدەكەوت نێوچاوانى لەسەر دانێ (و سوژدەى لەسەر ببات).**

## ٩- بَابُ ازْدِحَامِ النَّاسِ إِذَا قَرَأَ الإِمَامُ السَّجْدَةَ

١٠٧٦- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ آدَمَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ السَّجْدَةَ وَنَحْنُ عِنْدَهُ، فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ مَعَهُ، فَنَزْدَحِمُ حَتَّى مَا يَجِدُ أَحَدُنَا لِجَبْهَتِهِ مَوْضِعًا يَسْجُدُ عَلَيْهِ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٠٧٦، ١٠٧٩.

## ٩- باسی قەرەباڵغی خەڵک کاتێ ئیمام ئایەتی سوژدە دەخوێنێ

**١٠٧٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێك ئایەتی سوژدەی دەخوێندو ئێمەش لە خزمەتیدا بووین، خۆی سوژدەی دەبردو ئێمەش سوژدەمان دەبرد، (ئەوەندە قەرەباڵغ بووین) هەتا هەندێکمان شوێنێکی دەست نەکەوت بۆ نێوچاوانی سوژدەی لەسەر ببات.**

## ١٠- بابُ مَنْ رَأَى أَنَّ اللَّهَ لَمْ يُوجِبِ السُّجُودَ

وَقِيلَ لِعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: الرَّجُلُ يَسْمَعُ السَّجْدَةَ وَلَمْ يَجْلِسْ لَهَا. قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ قَعَدَ لَهَا؟ كَأَنَّهُ لاَ يُوجِبُهُ عَلَيْهِ. وَقَالَ سَلْمَانُ: مَا لِهَذَا غَدَوْنَا. وَقَالَ عُثْمَانُ: إِنَّمَا السَّجْدَةُ عَلَى مَنِ يسمَعَهَا. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: لاَ تَسْجُدْ إِلَّا أَنْ تَكُونَ طَاهِرًا، فَإِذَا سَجَدْتَ وَأَنْتَ فِي حَضَرٍ فَاسْتَقْبِلِ القِبْلَةَ، فَإِنْ كُنْتَ رَاكِبًا فَلاَ عَلَيْكَ حَيْثُ كَانَ وَجْهُكَ. وَكَانَ السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ لاَ يَسْجُدُ لِسُجُودِ القَاصِّ.

## ١٠- باسی ئەوەی ڕای وایە کە خوا سوژدەبردنی واجب نەکردووە

**بە عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ وترا: کەسێك گوێی لە (ئایەتی) سوژدە دەبێ، دانانیشێ سوژدەی بۆ ببات؟ وتی: پێم بڵێ ئەگەر دانیشت بۆی؟ وەك بڵێی سوژدە بردن بەلایەوە بە واجب نەزانێ لەسەری. وە سەلمان وتی: ئێمە بۆ ئەم سوژدە بردنە نەهاتووین[٢]، عوسمان ﷺ وتی: سوژدەبردن لەسەر کەسێك**

---

[١] بڕوانە: ١٠٧٥.

[٢] لە کاتێکدا بوو تێپەڕی بەلای کۆمەڵێکدا، ئایەتی سوژدەیان خوێندو سوژدەیان برد، ئەویش ئەو قسەی کرد.

**پێویسته گوێی بۆ بگرێ، هەروەها زوهری دەڵێ: سوژده مەبه بەدەستنوێژەوە نەبێت، ئەگەر سوژدەت برد و لەشاردا بوویت، ئەوە ڕوو له قیبله بکه، بەلام ئەگەر سواری ولاخ بوویت، ئەوە هیچت لەسەر نیه ڕووت لەهەر کوێ بێت (دروسته)، سائیبی کوڕی یەزید به بیستنی سوژده (لەزمانی) حکایەت خوان، یان مەوعیزەکەر سوژدەی نەدەبرد.**

١٠٧٧- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الهُدَيْرِ التَّيْمِيِّ - قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَكَانَ رَبِيعَةُ مِنْ خِيَارِ النَّاسِ عَمَّا حَضَرَ رَبِيعَةُ مِنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ، قَرَأَ يَوْمَ الجُمُعَةِ عَلَى المِنْبَرِ بِسُورَةِ النَّحْلِ، حَتَّى إِذَا جَاءَ السَّجْدَةَ نَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدَ النَّاسُ، حَتَّى إِذَا كَانَتِ الجُمُعَةُ القَابِلَةُ قَرَأَ بِهَا، حَتَّى إِذَا جَاءَ السَّجْدَةَ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا نَمُرُّ بِالسُّجُودِ فَمَنْ سَجَدَ فَقَدْ أَصَابَ، وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ. وَلَمْ يَسْجُدْ عُمَرُ ﷺ. وَزَادَ نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَفْرِضِ السُّجُودَ إِلَّا أَنْ نَشَاءَ.

**١٠٧٧- ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی هودەیری تەیمی دەگێڕێتەوە، که ئەبو بەکر وتی: ڕەبیعه له کەسه چاکەکان بوو، (بۆی گێڕامەوە) له بەسەرهاتی ئامادەبوونی (ڕەبیعه) له کۆڕی عومەری کوڕی خەتابدا ﷺ که له ڕۆژی هەینیدا لەسەر دوانگه سووڕەتی (النَّحْل)ی خوێند هەتا گەیشته ئایەتی سوژده، دابەزی لەسەر دوانگەکەو سوژدەی برد، خەڵکەکەش سوژدەیان برد، جا بۆ هەینی داهاتوو سووڕەتی (النَّحْل)ی خوێندەوە، هەتا گەیشته ئایەتی سوژده، وتی: خەڵکینه ئێمه سوژدەکانی قورئان دەخوێنینەوەو بەسەریاندا دەڕۆین، جا ئەوەی سوژده ببات، ئەوە چاکی کردووە، کەسێکیش سوژده نەبات، ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەر نییه، وه عومەر خۆی سوژدەی نەبرد، نافیع له عەبدوڵای**

کوڕی عومەرەوە ﷺ ئەم زیادەیەی هێناوە: بێگومان خوا سوژدەکانی پێویست نەکردووە (سوژدەیان بۆ ببردرێ)، مەگەر خۆمان بمانەوێ.

## ١١- بابُ مَنْ قرأَ السَّجْدَةَ في الصَّلَاةِ فَسَجَدَ بِهَا

١٠٧٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي بَكْرٌ عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ العَتَمَةَ فَقَرَأَ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ الانشقاق. فَسَجَدَ، فَقُلْتُ: مَا هَذِهِ؟ قَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِي القَاسِمِ ﷺ، فَلاَ أَزَالُ أَسْجُدُ فِيهَا حَتَّى أَلْقَاهُ[1].

## ١١- باسی کەسێک لە نوێژدا ئایەتی سوژدە بخوێنێ و بە هۆیەوە سوژدە ببات

١٠٧٨- ئەبو ڕافیع دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا ﷺ نوێژی عیشام کرد: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ی خوێندو سوژدەی برد، وتم: ئەمە چییە؟ وتی: لە دوای ئەبولقاسیمەوە (پێغەمبەر ﷺ) سوژدەم بردوە بە خوێندنی ئەم سوورەتە، بۆیە بەردەوام سوژدە دەبەم لەم سوورەتەدا هەتا (دەمرم و) دەگەم بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ.

## ١٢- بابُ مَنْ لمْ يَجِدْ مَوْضِعًا لِلسُّجُودِ مع الإمام مِنَ الزِّحَامِ

١٠٧٩- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ السُّورَةَ الَّتِي فِيهَا السَّجْدَةُ، فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ حَتَّى مَا يَجِدُ أَحَدُنَا مَكَانًا لِمَوْضِعِ جَبْهَتِهِ[1].

---

[1] بڕوانە: ٧٦٦

# ١٢- باسی کەسێک شوێنی نەبێ سوژدەی تێدا ببات لەبەر قەرەباڵغی

١٠٧٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوورەتێکی دەخوێندەوە کە سوژدەی تێدابوو، ئینجا خۆی سوژدەی دەبردو ئێمەش سوژدەمان دەبرد، (ئەوەندە قەرەباڵغ بوو) هەتا هەندێکمان شوێنێکی دەست نەدەکەوت بۆ دانانی نێوچاوانی (و سوژدە بردنەکەی)[1].

---

[1] بڕوانە: ١٠٧٥.

# ١٨- كِتَابُ تَقْصِيرِ الصَّلَاةِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١٨- پەڕاوی كورتكردنەوەی نوێــژ

## ١- بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّقْصِيرِ وَكَمْ يُقِيمُ حَتَّى يَقْصُرَ؟

١٠٨٠- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَاصِمٍ وَحُصَيْنٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: أَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ تِسْعَةَ عَشَرَ يَقْصُرُ، فَنَحْنُ إِذَا سَافَرْنَا تِسْعَةَ عَشَرَ قَصَرْنَا، وَإِنْ زِدْنَا أَتْمَمْنَا[١].

## ١- باسی ئەوەی دەربارەی نوێژ كورت كردنەوە هاتووە، وە گەشتیار چەند بمێنێتەوە (لە سەفەردا) نوێژ كورت دەكاتەوە؟

**١٠٨٠- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نۆزدە ڕۆژ مایەوە نوێژی كورت دەكردەوە، بۆیە ئێمەش ئەگەر سەفەرمان كرد تا نۆزدە ڕۆژ نوێژ كورت دەكەینەوە، وە ئەگەر لە نۆزدە ڕۆژ زیاتر ماینەوە، نوێژی تەواو دەكەین (كورتی ناكەینەوە).**

١٠٨١- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مِنَ المَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى المَدِينَةِ. قُلْتُ: أَقَمْتُمْ بِمَكَّةَ شَيْئًا؟ قَالَ: أَقَمْنَا بِهَا عَشْرًا[١].

---

[١] بڕوانە: ٤٢٩٨، ٤٢٩٩.

**١٠٨١- ئەبو ئیسحاق دەڵێ: لە ئەنەسم بیست ﷺ دەیوت: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە مەدینە دەرچووین دەڕۆشتین بۆ مەككە، جا پێغەمبەر ﷺ نوێژی دوو ڕكات دوو ڕكات دەكرد، هەتا گەڕاینەوە بۆ مەدینە، (ئەبو ئیسحاق دەڵێ:) وتم: هیچ لە مەككە مانەوە؟ ئەنەس وتی: دە ڕۆژ لە مەككە ماینەوە.**

## ٢- بابُ الصَّلَاةِ بِمِنًى

١٠٨٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَمَعَ عُثْمَانَ صَدْرًا مِنْ إِمَارَتِهِ، ثُمَّ أَتَمَّهَا[٢].

## ٢- باسی (حوكمی) نوێژكردن لە مینادا

**١٠٨٢- عەبدوڵای كوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: لە مینا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دوو ڕكاتم كردووە، هەروەها لەگەڵ ئەبو بەكرو عومەرو سەرەتای پێشەوایەتی عوسمان دوو ڕكاتم كردووە (لەجیاتی چوار)، پاشان عوسمان نوێژی تەواوی كرد (چوار ڕكاتی كرد بێ كورت كردنەوە).**

١٠٨٣- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَنْبَأَنَا أَبُو إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ آمَنَ مَا كَانَ- بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ[٣].

**١٠٨٣- حاریسەی كوڕی وەهب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مینادا پێشنوێژی دوو ڕكات نوێژی بۆ كردین -لە ئاسایشترین كاتدا بوو-.**

---

[١] بڕوانە: ٤٢٩٧.

[٢] بڕوانە: ١٦٥٥.

[٣] بڕوانە: ١٦٥٦.

١٠٨٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، عَنِ الأَعْمَشِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَزِيدَ يَقُولُ: صَلَّى بِنَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ بِمِنًى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، فَقِيلَ ذَلِكَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، فَاسْتَرْجَعَ ثُمَّ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، فَلَيْتَ حَظِّي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ رَكْعَتَانِ مُتَقَبَّلَتَانِ[١].

**١٠٨٤- عەبدوڕەحمانی كوڕی یەزید دەڵێ: عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ لە مینادا پێشنوێژی بۆ كردین و چوار ڕكات نوێژی كرد، ئەوەیان بە عەبدوڵای كوڕی مەسعود وت ﷺ، وتی:** (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ)، **پاشان وتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە مینا دوو ڕكات نوێژم كردووە، هەروەها لەگەڵ ئەبو بەكر ﷺ لە مینا دوو ڕكاتم كردووە، وە لەگەڵ عومەری كوڕی خەتابدا ﷺ لە مینا دوو ڕكاتم كردووە، جا خۆزگە بەشی من لە جیاتی (نوێژێكی) چوار ڕكاتی دوو ڕكاتی وەرگیراو بووایە.**

## ٣- بابٌ: كَمْ أَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فِي حَجَّتِهِ؟

١٠٨٥- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي العَالِيَةِ البَرَّاءِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ لِصُبْحِ رَابِعَةٍ يُلَبُّونَ بِالحَجِّ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً إِلاَّ مَنْ مَعَهُ الهَدْيُ. تَابَعَهُ عَطَاءٌ، عَنْ جَابِرٍ[٢].

## ٣- باسێك: پێغەمبەر ﷺ لە حەج كردنەكەیدا چەند ماوەتەوە؟

**١٠٨٥- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی لە بەیانی ڕۆژی چواری** (ذِي الْحِجَّة) **گەیشتنە مەككە، ئیحرامیان بە حەج بەست، ئینجا**

---

[١] بروانە: ١٦٥٧.

[٢] بروانە: ١٥٦٤، ٢٥٠٥، ٣٨٣٢.

**پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن کە بیکەن بە عومرە، مەگەر کەسێ ئاژەڵی دیاری پێ بێت. عەتاش لە جابیرەوە گێڕاویەتیەوە کە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەبولعالیە دەکات.**

## ٤- بابٌ: فِي كَمْ يَقْصُرُ الصَّلاَةَ؟

وَسَمَّى النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا وَلَيْلَةً سَفراَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ وَابْنُ عَبَّاسٍ يَقْصُرَانِ وَيُفْطِرَانِ فِي أَرْبَعَةِ بُرُدٍ، وَهْيَ سِتَّةَ عَشَرَ فَرْسَخًا.

١٠٨٦- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الحَنْظَلِيُّ قَالَ: قُلْتُ لأَبِي أُسَامَةَ: حَدَّثَكُمْ عُبَيْدُ اللَّهِ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُسَافِرِ المَرْأَةُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ»[1].

## ٤- باسێک: لە چەندێکدا نوێژ کورت دەکرێتەوە؟

**پێغەمبەر ﷺ (ڕێگای) شەوو ڕۆژێکی بەسەفەر ناوبردووە، وە عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ نوێژیان کورت دەکردەوەو ڕۆژوویان دەشکاند لە چوار بوردا، کە دەکاتە شانزە فەرسەخ[2].**

**١٠٨٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئافرەت سەفەرێك نەکات کە سێ ڕۆژ (ڕێگا) بێت، مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت)).**

١٠٨٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُسَافِرِ المَرْأَةُ ثَلاَثًا إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ». تَابَعَهُ أَحْمَدُ، عَنِ ابْنِ المُبَارَكِ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٠٨٧.

[2] کە نزیکەی (٨٨کم) هەشتاو هەشت کیلۆمەتر دەکات.

**١٠٨٧- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئافرەت سەفەرێك نەكات كە سێ ڕۆژ (ڕێگا) بێت، مەگەر مەحرەمێكی لەگەڵدا بێت))، ئەحمەد لە ئیبنو موبارەكەوە لە عوبەیدوڵاوە، لە نافیعەوە، لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ (ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە) پاڵپشتی گێڕانەوەكەی عوبەیدوڵا دەكات.**

١٠٨٨- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ المَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ لَيْسَ مَعَهَا حُرْمَةٌ». تَابَعَهُ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ وَسُهَيْلٌ وَمَالِكٌ، عَنِ المَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ.

**١٠٨٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((حەڵاڵ نیە بۆ ئافرەتێك باوەڕی بە خواو بەڕۆژی دوایی هەبێ، شەوو ڕۆژێك ڕێگا سەفەر بكات مەحرەمێكی لەگەڵدا نەبێ))، یەحیای كوڕی ئەبی كەسیر و سوهەیل و مالیك لە مەقبوریەوە گێڕاویانەتەوە، ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە، ئەم ڕێگایە پاڵپشتی گێڕانەوەكەی ئیبنو ئەبی زیئب دەكات.**

## ٥- بابٌ: يَقْصُرُ إِذَا خَرَجَ مِنْ مَوْضِعِهِ

وَخَرَجَ عَلِيٌّ فَقَصَرَ وَهْوَ يَرَى البُيُوتَ، فَلَمَّا رَجَعَ قِيلَ لَهُ: هَذِهِ الكُوفَةُ. قَالَ: لاَ، حَتَّى نَدْخُلَهَا.

[١] بڕوانە: ١٠٨٦.

١٠٨٩- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، وَإِبْرَاهِيمَ بْنِ مَيْسَرَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ الظُّهْرَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَبِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ[1].

## ٥- باسێک: هەرکات لە شوێنی خۆی دەرچوو نوێژ کورت دەکاتەوە

**عەلی ﷺ (لەکوفە) دەرچوو نوێژی کورتکردەوە، لەکاتێکدا خانووەکانی دەبینی، کاتێکیش گەڕایەوە پێی وترا: ئەمە کوفەیە (نوێژی تەواو بکە)، عەلی وتی: نەخێر هەتا نەچینە نێویەوە (نوێژی تەواو ناکەین).**

**١٠٨٩- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە مەدینە چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆم کرد، بەڵام لە (ذِي الحُلَيْفَة)[2] دوو ڕکاتم کرد لەگەڵیدا.**

١٠٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتِ: الصَّلاَةُ أَوَّلُ مَا فُرِضَتْ رَكْعَتَيْنِ، فَأُقِرَّتْ صَلاَةُ السَّفَرِ، وَأُتِمَّتْ صَلاَةُ الحَضَرِ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَقُلْتُ لِعُرْوَةَ: مَا بَالُ عَائِشَةَ تُتِمُّ؟ قَالَ: تَأَوَّلَتْ مَا تَأَوَّلَ عُثْمَانُ[3].

**١٠٩٠- عائیشە ﷺ دەڵێ: نوێژ کە یەکەم جار فەرز بوو دوو ڕکات بوو، جا نوێژی سەفەر بەدوو ڕکاتی جێگیر کرا، نوێژی شارو ئاوەدانی کرا بە چوار ڕکات. زوهری دەڵێ: بە عورِوەم ووت: بۆچی عائیشە نوێژی تەواو دەکات و کورتی ناکاتەوە؟ وتی: عائیشە وەڵام و پاساوی هەیە، هەر چۆنێ عوسمان وەڵام و پاساوی هێنایەوە بۆ کورت نەکردنەوەی نوێژ لە میتادا.**

---

[1] بڕوانە: ١٥٤٦، ١٥٤٧، ١٥٥١، ١٧١٢، ١٧١٤، ١٧١٥، ٢٩٥١، ٢٩٨٦.

[2] لەسەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ (ذِي الحُلَيْفَة) لە دەرەوەی مەدینە بووە، بەڵام ئێستا بووە بە بەشێک لە مەدینە.

[3] بڕوانە: ٣٥٠.

# ٦- بابٌ: يُصَلِّي المَغْرِبَ ثَلاَثًا فِي السَّفَرِ

١٠٩١- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَعْجَلَهُ السَّيْرُ فِي السَّفَرِ يُؤَخِّرُ المَغْرِبَ حَتَّى يَجْمَعَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ العِشَاءِ. قَالَ سَالِمٌ وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَفْعَلُهُ إِذَا أَعْجَلَهُ السَّيْرُ[1].

## ٦- باسێک: نوێژی ئێوارە لە سەفەردا سێ ڕکات دەکرێ

**١٠٩١- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر خوام ﷺ بینیوە ئەگەر لەڕۆیشتنی سەفەردا پەلەی بکردایە، نوێژی ئێوارەی دوادەخست هەتا لەگەڵ نوێژی عیشادا کۆی دەکردەوە، سالیم دەڵێ: عەبدوڵاش وای دەکرد ئەگەر لە ڕۆیشتن پەلەی بکردایە.**

١٠٩٢- وَزَادَ اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ سَالِمٌ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ المَغْرِبِ وَالعِشَاءِ بِالمُزْدَلِفَةِ. قَالَ سَالِمٌ: وَأَخَّرَ ابْنُ عُمَرَ المَغْرِبَ، وَكَانَ اسْتُصْرِخَ[2] عَلَى امْرَأَتِهِ صَفِيَّةَ بِنْتِ أَبِي عُبَيْدٍ، فَقُلْتُ لَهُ: الصَّلاَةُ. فَقَالَ: سِرْ. فَقُلْتُ الصَّلاَةُ. فَقَالَ: سِرْ. حَتَّى سَارَ مِيلَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي إِذَا أَعْجَلَهُ السَّيْرُ. وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ إِذَا أَعْجَلَهُ السَّيْرُ يُؤَخِّرُ المَغْرِبَ، فَيُصَلِّيهَا ثَلاَثًا ثُمَّ يُسَلِّمُ، ثُمَّ قَلَّمَا يَلْبَثُ حَتَّى يُقِيمَ العِشَاءَ فَيُصَلِّيَهَا رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ يُسَلِّمُ، وَلاَ يُسَبِّحُ بَعْدَ العِشَاءِ حَتَّى يَقُومَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ[3].

---

[1] بڕوانە: ١٠٩٢، ١١٠٦، ١١٠٩، ١٦٦٨، ١٦٧٣، ١٨٠٥، ٣٠٠٠.

[2] اسْتُصْرِخَ: لە (الصراخ )ـەوە وەرگیراوە، کە بەمانای داوای یارمەتی کردنە بەدەنگی بەرز، بەڵام لە فەرموودەکەدا بەمانای هەواڵ پێدانی مردنی هاوسەریەتی. بڕوانە: إرشاد الساري: ٣/١٤٠.

[3] بڕوانە: ١٠٩١.

**١٠٩٢- لەیس ئەمەی لە فەرموودەكەی پێشوو زیاد كردووە: یونس بۆی گێڕامەوە لە ئیبنو شیهابەوە دەڵێ: سالیم وتی: عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ لە موزدەلیفە نوێژی ئێوارەو عیشای كۆدەكردەوە، سالیم دەڵێ: عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ نوێژی ئێوارەی دواخست، وە هەواڵی مردنی صەفیەی كچی ئەبی عوبەیدی خێزانی پێدرا، منیش پێم وت: نوێژە، ئەویش وتی: بڕۆ، منیش وتم: نوێژە، وتی: بڕۆ هەتا دوو یان سێ میل ڕۆیشت، پاشان دابەزی و نوێژی كرد، پاشان فەرمووی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ئەگەر پەلەی ڕۆیشتنی بووایە ئاوای دەكرد، وە عەبدوڵا دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ئەگەر پەلەی ڕۆیشتنی بووایە، نوێژی مەغریبی دوادەخست، ئینجا سێ ڕكاتی (مەغریبی) دەكردو، پاشان سەلامی دەدایەوە، پاشان كەمێك دەمایەوە هەتا قامەتی دەكرد بۆ نوێژی عیشاو دوو ڕكاتی دەكرد، پاشان سەلامی دەدایەوە، وە لە دوای نوێژی عیشاوە نوێژی سوننەتی نەدەكرد، هەتا لە نیوەشەودا هەڵدەستا (بۆ شەونوێژ).**

## ٧- بابُ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ عَلَى الدابة حيثما تَوَجَّهَتْ بِهِ

١٠٩٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِهِ[1].

## ٧- باسی نوێژی سوننەت كردن بە سواری وڵاخەوە، وڵاخەكە ڕوو بە هەركوێ بیبات

**١٠٩٣- عەبدوڵای كوڕی عامیر لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی بە سواری وڵاخەكەیەوە نوێژی (سوننەتی) دەكرد بەرەو هەر لایەك بیبردایە.**

---

[1] بڕوانە: ١٠٩٧، ١١٠٤.

١٠٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَان، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي التَّطَوُّعَ وَهْوَ رَاكِبٌ فِي غَيْرِ القِبْلَةِ[1].

**١٠٩٤- جابیری کوڕی عەبدولا ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر نوێژی سوننەتی دەکرد بە سوار وڵاخەوە، بێ ئەوەی ڕووی لە قیبلە بێت.**

١٠٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ وَيُوتِرُ عَلَيْهَا، وَيُخْبِرُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَفْعَلُهُ[2].

**١٠٩٥- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ نوێژی (سوننەتی) بە سواری وڵاخەوە دەکرد، نوێژی ویتریشی بە سواریەوە دەکرد، دەیوت کە پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرەی دەکرد.**

## ٨- بَابُ الإِيمَاءِ عَلَى الدَّابَّةِ

١٠٩٦- حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ يُصَلِّي فِي السَّفَرِ عَلَى رَاحِلَتِهِ، أَيْنَمَا تَوَجَّهَتْ يُومِئُ. وَذَكَرَ عَبْدُ اللهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَفْعَلُهُ[3].

## ٨- باسی ئاماژە کردن (بۆ کڕنووش و سوژدە لە نوێژی سوننەتدا) بە سواری وڵاخەوە

**١٠٩٦-عەبدوڵای کوڕی دینار دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە سەفەردا بە سواری وڵاخەکەیەوە نوێژی (سوننەتی) دەکرد، وڵاخەکە ڕوو بەهەر کوێ**

---

[1] بڕوانە:٤٠٠.

[2] بڕوانە: ٩٩٩.

[3] بڕوانە: ٩٩٩.

بڕۆیشتایە، عەبدوڵا ئاماژەی دەکرد (بۆ کڕنووش و سوژدە). عەبدوڵا وتی: پێغەمبەر ﷺ کاتی خۆی وای دەکرد.

## ٩- بابٌ: يَنْزِلُ لِلْمَكْتُوبَةِ

١٠٩٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، أَنَّ عَامِرَ بْنَ رَبِيعَةَ أَخْبَرَهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ عَلَى الرَّاحِلَةِ يُسَبِّحُ، يُومِئُ بِرَأْسِهِ قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ ذَلِكَ فِي الصَّلاَةِ المَكْتُوبَةِ[1].

## ٩- باسێک: پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژی فەرز لە وڵاخەکەی دادەبەزی

**١٠٩٧- عەبدوڵای کوڕی ڕەبیعە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەسواری وڵاخەوە بوو نوێژی (سوننەتی) دەکرد، بەسەر ئاماژەی دەکرد وڵاخەکە ڕووی لەهەر کوێ بکردایە، نوێژی ویتریشی دەکرد بەسواری وڵاخەکەیەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە نوێژی فەرزی بە سواریەوە نەدەکرد.**

١٠٩٨- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: قَالَ سَالِمٌ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي عَلَى دَابَّتِهِ مِنَ اللَّيْلِ وَهْوَ مُسَافِرٌ، مَا يُبَالِي حَيْثُ مَا كَانَ وَجْهُهُ. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ قِبَلَ أَى وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يُصَلِّي عَلَيْهَا المَكْتُوبَةَ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٠٩٣.

[2] بڕوانە: ٩٩٩.

**١٠٩٨- ساليم دەڵێ: عەبدوڵا ﷺ بەشەودا بەسواری وڵاخەکیەوە نوێژی (سوننەتی) دەکرد، لە کاتێکدا گەشتیار بوو، بەلایەوە گرنگ نەبوو (وڵاخەکەی) ڕووی لە هەر کوێوە بووایە، ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەسواری وڵاخەوە بوو، نوێژی (سوننەتی) دەکرد وڵاخەکە ڕووی لە هەر کوێ بکردایە، بەڵام ئەوەندە هەیە نوێژی فەڕزی بەسواریەوە نەدەکرد.**

١٠٩٩- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَوْبَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ نَحْوَ المَشْرِقِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ المَكْتُوبَةَ نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ[1].

**١٠٩٩- جابيری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی (سوننەتی) دەکرد بە سواری وڵاخەکەیەوە ڕوو بە خۆرهەڵات، بەڵام کاتێ بیویستایە نوێژی فەڕز بکات، دادەبەزی و ڕووی دەکردە قیبلە.**

## ١٠- بابُ صَلاَةِ التَّطَوُّعِ عَلَى الحِمَارِ

١١٠٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَبَّانُ قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ سِيرِينَ قَالَ اسْتَقْبَلْنَا أَنَسًا حِينَ قَدِمَ مِنَ الشَّامِ، فَلَقِينَاهُ بِعَيْنِ التَّمْرِ، فَرَأَيْتُهُ يُصَلِّي عَلَى حِمَارٍ وَوَجْهُهُ مِنْ ذَا الجَانِبِ، يَعْنِي عَنْ يَسَارِ القِبْلَةِ. فَقُلْتُ: رَأَيْتُكَ تُصَلِّي لِغَيْرِ القِبْلَةِ! فَقَالَ: لَوْلاَ أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَهُ لَمْ أَفْعَلْهُ. رَوَاهُ ابْنُ طَهْمَانَ، عَنْ حَجَّاجٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ١٠- باسی (حوکمی) نوێژی سوننەت کردن بە سواری گوێدرێژەوە

**١١٠٠- ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: پێشوازیمان لە ئەنەس کرد ﷺ کاتێ لە شامەوە هات، لە (عَيْنِ التَّمْرِ)دا پێی گەشتین، جا بینیم نوێژی کرد بە سواری**

[1] بروانە: ٤٠٠.

گوێدرێژێکەوە، ڕووی ئا لەولاوە بوو -واتە: ڕووی لەلای چەپی قیبلەوە بوو-، منیش وتم: بینیم نوێژت کردو ڕووت لە قیبلە نەبوو! ئەویش وتی: لەبەر ئەوە نەبووایە پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کردوویەتی، منیش نەمدەکرد، هەروەها ئەم فەرموودەیە ئیبنو تەهمان گێڕاویەتیەوە لە حەجاجەوە، لە ئەنەسی کوڕی سیرینەوە، لە ئەنەسەوە ﷺ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

## ١١- بابُ مَنْ لَمْ يَتَطَوَّعْ فِي السَّفَرِ دُبُرَ الصَّلاَةِ وَقَبْلَهَا

١١٠١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَنَّ حَفْصَ بْنَ عَاصِمٍ حَدَّثَهُ قَالَ: سَافَرَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ فَقَالَ: صَحِبْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَلَمْ أَرَهُ يُسَبِّحُ فِي السَّفَرِ، وَقَالَ اللَّهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

## ١١- باسی ئەوەی نوێژی سوننەتی نەکردووە لەسەفەردا، نە لەپاشی نوێژی فەرزەوەو نە لەپێشیەوە

١١٠١- حەفصی کوڕی عاصیم ﷺ دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ سەفەری کردو وتی: هاوڕێیەتی پێغەمبەرم ﷺ کردووە، هەرگیز نەمدیوە نوێژی سوننەتی کردبێت لە سەفەردا، خوای گەورەش دەفەرموێ: (بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا جوانترین سەرمەشقی بۆ ئێوە هەیە).

١١٠٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عِيسَى بْنِ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ يَقُولُ: صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَكَانَ لاَ يَزِيدُ فِي السَّفَرِ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ كَذَلِكَ ﷺ[1].

---

[1] بڕوانە: ١١٠١.

**١١٠٢- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوام ﷺ كردووە، هەمیشە لە سەفەردا دوو ڕكات زیاتر نوێژی نەدەكرد، هەروەها ئەبو بەكرو عومەرو عوسمانیش ﷺ هەروایان دەكرد.**

## ١٢- بابُ مَنْ تَطَوَّعَ فِي السَّفَرِ فِي غَيْرِ دُبُرِ الصَّلَوَاتِ وَقَبْلَهَا

وَرَكَعَ النَّبِيُّ ﷺ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ فِي السَّفَرِ.

**١١٠٣-** حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: مَا أَنْبَأَ أَحَدٌ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الضُّحَى غَيْرُ أُمِّ هَانِئٍ، ذَكَرَتْ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ اغْتَسَلَ فِي بَيْتِهَا، فَصَلَّى ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، فَمَا رَأَيْتُهُ صَلَّى صَلاَةً أَخَفَّ مِنْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ[1].

## ١٢- باسی ئەوەی نوێژی سوننەت دەكات لە سەفەردا جگە لە پاش و پێشی فەرزەكان

**پێغەمبەر ﷺ دوو ڕكاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی دەكرد لە سەفەردا.**

**١١٠٣- ئیبنو ئەبی لەیلا دەڵێ: كەس بۆی نەگێڕاوینەتەوە كە پێغەمبەری ﷺ بینیبێ نوێژی چێشتەنگاوی كردبێ جگە لە ئوممو هانی، كە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی ئازادكردنی شاری مەككە لە ماڵی ئەودا خۆی شۆردو هەشت ڕكات نوێژی كرد، كە نەمدیوە هیچ نوێژێكی كردبێ، ئەوەندەی ئەو نوێژانە كورت بووبێ، بەڵام ئەوەندە هەبوو كڕنووش و سوژدەی بە چاكی و تەواو دەبرد.**

---

[1] بروانە: ١١٧٦، ٤٢٩٢.

١١٠٤- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَامِرٍ، أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى السُّبْحَةَ بِاللَّيْلِ فِي السَّفَرِ عَلَى ظَهْرِ رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِهِ[1].

**١١٠٤- عەبدوڵای كوڕی عامیر دەڵێ باوكی ﵁ بۆی گێڕایەوە: كە پێغەمبەری ﷺ بینیوە نوێژی سوننەتی شەوی لە سەفەردا بە سواری وڵاخەكەیەوە دەكرد، ڕوو بەهەر شوێنێك بیبردایە.**

١١٠٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُسَبِّحُ عَلَى ظَهْرِ رَاحِلَتِهِ حَيْثُ كَانَ وَجْهُهُ، يُومِئُ بِرَأْسِهِ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ[2].

**١١٠٥- سالیمی كوڕی عەبدوڵا دەڵێ: عەبدوڵای كوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی (سوننەتی) دەكرد بەسواری وڵاخەكەیەوە، ڕووی لە هەر كوێ بووایە، بەسەر ئاماژەی دەكرد (بۆ كڕنووش و سوژدە)، وە عەبدوڵای كوڕی عومەریش وای دەكرد.**

## ١٣- بَابُ الْجَمْعِ فِي السَّفَرِ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ

١١٠٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ عَنْ سَالِمٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ[3].

---

[1] بڕوانە: ١٠٩٣.

[2] بڕوانە: ٩٩٩.

[3] بڕوانە: ١٠٩١.

## ١٣- باسی کۆکردنەوەی نوێژی مەغریب و عیشا لە سەفەردا

**١١٠٦- سالیم لە (عەبدوڵای) باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر پەلەی ڕۆیشتنی بووایە، نوێژی مەغریب و عیشای بەیەکەوە کۆدەکردەوە.**

١١٠٧- وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، عَنِ الحُسَيْنِ المُعَلِّمِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاَةِ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ إِذَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ سَيْرٍ، وَيَجْمَعُ بَيْنَ المَغْرِبِ وَالعِشَاءِ.

**١١٠٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە سەفەردا بووایە (بڕۆیشتایە)، نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەیەکەوە کۆدەکردەوە[1]، هەروەها نوێژی مەغریب و عیشاشی کۆدەکردەوە.**

١١٠٨- وَعَنْ حُسَيْنٍ عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاَةِ المَغْرِبِ وَالعِشَاءِ فِي السَّفَرِ. وَتَابَعَهُ عَلِيُّ بْنُ المُبَارَكِ وَحَرْبٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ حَفْصٍ، عَنْ أَنَسٍ: جَمَعَ النَّبِيُّ ﷺ[2].

**١١٠٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەردا نوێژی مەغریب و عیشای کۆدەکردەوە، عەلی کوڕی موبارەك و حەرب لە یەحیاوە دەیگێڕنەوە، لە حەفصەوە، ئەویش لە ئەنەسەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی کۆدەکردەوە.**

---

[1] بە کۆکردنەوەی دواخستن (جَمْعُ تَأْخِير).

[2] بڕوانە: ١١١٠.

## ١٤- بابٌ: هَلْ يُؤَذِّنُ أَوْ يُقِيمُ إِذَا جَمَعَ بَيْنَ المَغْرِبِ وَالعِشَاءِ؟

**١١٠٩-** حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَعْجَلَهُ السَّيْرُ فِي السَّفَرِ يُؤَخِّرُ صَلاَةَ الْمَغْرِبِ حَتَّى يَجْمَعَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعِشَاءِ. قَالَ سَالِمٌ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَفْعَلُهُ إِذَا أَعْجَلَهُ السَّيْرُ، وَيُقِيمُ الْمَغْرِبَ فَيُصَلِّيهَا ثَلاَثًا ثُمَّ يُسَلِّمُ، ثُمَّ قَلَّمَا يَلْبَثُ حَتَّى يُقِيمَ الْعِشَاءَ فَيُصَلِّيهَا رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ يُسَلِّمُ، وَلاَ يُسَبِّحُ بَيْنَهَا بِرَكْعَةٍ وَلاَ بَعْدَ الْعِشَاءِ بِسَجْدَةٍ حَتَّى يَقُومَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ»[1].

## ١٤- باسێک: ئایا (نوێژخوێن) بانگ دەدات، یان قامەت دەکات ئەگەر نوێژی مەغریب و عیشا کۆبکاتەوە؟

**١١٠٩- سالیم دەڵێ عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە ئەگەر لە سەفەردا پەلەی ڕۆیشتنی بووایە، نوێژی مەغریبی دوادەخست هەتا نوێژی مەغریب و عیشای پێکەوە کۆدەکردەوە.**

**سالیم دەڵێ: عەبدوڵاش وای دەکرد[2] کاتێ پەلەی ڕۆیشتنی بووایە، قامەتی دەکرد بۆ نوێژی مەغریب و سێ ڕکاتی دەکرد، پاشان سەلامی دەدایەوە، پاشان ئەوەندە نەدەمایەوە هەتا قامەتی دەکرد بۆ نوێژی عیشاو دوو ڕکاتی ئەویشی دەکرد، پاشان سەلامی دەدایەوە، لە نێوانیاندا یەك ڕکاتیش نوێژی سوننەتی نەدەکرد، وە لە دوای عیشاشەوە سوننەتی نەدەکرد، هەتا لە نیوەی شەودا هەڵدەستا بۆ شەونوێژ.**

---

[1] بڕوانە: ١٠٩١.

[2] نوێژی مەغریبی دوا دەخست و لەگەڵ نوێژی عیشادا دەیکرد.

١١١٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا حَرْبٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنِي حَفْصُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسٍ، أَنَّ أَنَسًا ﷺ حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ هَاتَيْنِ الصَّلاَتَيْنِ فِي السَّفَرِ. يَعْنِي: المَغْرِبَ وَالعِشَاءَ[1].

**١١١٠- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دوو نوێژەی کۆدەکردەوە لە سەفەردا. مەبەستی مەغریب و عیشا بوو.**

## ١٥- بابٌ: يُؤَخِّرُ الظُّهْرَ إِلَى العَصْرِ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ

فِيهِ ابْنُ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١١١١- حَدَّثَنَا حَسَّانُ الوَاسِطِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا المُفَضَّلُ بْنُ فَضَالَةَ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ العَصْرِ، ثُمَّ يَجْمَعُ بَيْنَهُمَا، وَإِذَا زَاغَتْ صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَكِبَ[2].

## ١٥- باسێک: (گەشتیار) نوێژی نیوەڕۆ دوادەخات ئەگەر پێش کاتی نوێژی نیوەڕۆ دەستی بەڕۆیشتن کرد

**لەم باسەدا فەرموودەی عەبدوڵای کوڕی عەباس هەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە.**

**١١١١- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر پێش ئەوەی ڕۆژ لای بدایە لە نێوەڕاستی ئاسمان (و نوێژی نیوەڕۆ ببێت) دەستی بەڕۆیشتن بکردایە (لە سەفەردا)، ئەوە نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست بۆ کاتی نوێژی عەسر، پاشان کۆی دەکردنەوە و پێکەوە دەیکردن، بەڵام ئەگەر ڕۆژ لای بدایە لە**

---

[1] بڕوانە: ١١٠٨.

[2] بڕوانە: ١١١٢.

نێوەڕاستی ئاسمان (نوێژی نیوەڕۆ ببووایە)، نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، پاشان سوار (ی وڵاخەکەی) دەبوو (و دەڕۆیشت).

## ١٦- بابٌ: إِذَا ارْتَحَلَ بَعْدَ مَا زَاغَتِ الشَّمْسُ صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَكِبَ

١١١٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُفَضَّلُ بْنُ فَضَالَةَ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ العَصْرِ، ثُمَّ نَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا، فَإِنْ زَاغَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَكِبَ[1].

## ١٦- باسێک: ئەگەر دوای ئەوەی نوێژی نیوەڕۆ ببووایە دەستی بەڕۆشتن بکردایە نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، پاشان سواری وڵاخەکەی دەبوو (دەڕۆیشت)

**١١١٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر پێش ئەوەی ڕۆژ لای بدایە لە نێوەڕاستی ئاسمان (و نوێژی نیوەڕۆ ببێ) دەستی بەڕۆیشتن بکردایە (لە سەفەردا)، نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست بۆ کاتی نوێژی عەسر، پاشان لایدەداو پێکەوە هەردووکیانی دەکرد، بەڵام ئەگەر ڕۆژ لایبدایە (نوێژی نیوەڕۆ ببووایە)، پێش ئەوەی دەست بە ڕۆیشتن بکات نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، پاشان سوار (ی وڵاخەکەی) دەبوو دەڕۆیشت.**

---

[1] بڕوانە: ١١١١.

## ١٧- بابُ صَلَاةِ الْقَاعِدِ

١١١٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِهِ وَهْوَ شَاكٍ، فَصَلَّى جَالِسًا وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنِ اجْلِسُوا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا»[1].

## ١٧- باسی نوێژکردن بەدانیشتنەوە

**١١١٣- هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە گێڕایەوە، ئەویش لە عائیشەوە ﵂ گێڕایەوە، کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش بوو، لە ماڵی خۆیدا نوێژی کرد، جا بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، خەڵکانێکیش لە دوایەوە بەپێوە نوێژیان کرد، بۆیە ئاماژەی بۆ کردن کە دانیشن، جا کاتێ لە نوێژەکەی بوویەوە فەرمووی: ((بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە تا پەیڕەوی لێ بکرێ، کەوا بوو ئەگەر کڕنووشی برد ئێوەش کڕنووش ببەن، وە ئەگەر بەرز بوویەوە (لە کڕنوش) ئێوەش بەرز ببنەوە)).**

١١١٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: سَقَطَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ فَرَسٍ فَخُدِشَ -أَوْ فَجُحِشَ- شِقُّهُ الأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ نَعُودُهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَصَلَّى قَاعِدًا، فَصَلَّيْنَا قُعُودًا، وَقَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا: اللَّهمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[2].

---

[1] بروانە: ٦٨٨.

[2] بروانە: ٣٧٨.

**١١١٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سواری ئەسپێك کەوتەخوارەوەو لای ڕاستی بریندار بوو -یان پێستەکە ڕووشا-، ئێمەش ڕۆیشتین بۆ لای و سەردانمان کرد، کاتی نوێژ هات، پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە پێشنوێژی کردو ئێمەش بە دانیشتنەوە نوێژمان کرد، جا فەرمووی: ((بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە پەیڕەوی لێوە بکرێ، جا کاتێ ئەڵاهو ئەکبەری کرد، ئێوەش ئەڵاهو ئەکبەر بکەن، وە کاتێ کڕنووشی برد، ئێوەش کڕنووش ببەن، کاتێکیش بەرزبوویەوە (لە کڕنووش)، ئێوەش بەرزببنەوە، وە کاتێ وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش بڵێن: (اللَّهمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ).**

**١١١٥-** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، أَخْبَرَنَا حُسَيْنٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ أَنَّهُ سَأَلَ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ. أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ -وَكَانَ مَبْسُورًا- قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلاَةِ الرَّجُلِ قَاعِدًا فَقَالَ: «إِنْ صَلَّى قَائِمًا فَهْوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِدًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ، وَمَنْ صَلَّى نَائِمًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ»[1].

**١١١٥- عەبدوڵای کوڕی بوڕەیدە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ. ئیسحاق بۆی گێڕاینەوەو وتی: عەبدو صەمەد بۆی گێڕاینەوەو وتی: لە باوکم بیست وتی: حوسەین بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو بوڕەیدەوە وتی: عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ بۆی گێڕامەوە -کە نەخۆشی مایەسیری هەبوو- وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ دەربارەی نوێژکردنی مرۆڤ بە دانیشتنەوە، ئەویش فەرمووی: ((ئەگەر بەپێوە نوێژ بکات ئەوە چاکترە،**

---

[1] بڕوانە: ١١١٦، ١١١٧.

کەسێکیش بەدانیشتنەوە نوێژ بکات، ئەوە نیوەی پاداشتی ئەو نوێژخوێنەی هەیە کە بەپێوە نوێژ دەکات، ئەو کەسەشی بەپاڵکەوتنەوە نوێژ دەکات، ئەوە نیوەی پاداشتی ئەو نوێژخوێنەی هەیە کە بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات)).

## ١٨- بابُ صَلَاةِ الْقَاعِدِ بِالإِيمَاءِ

١١١٦- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الْمُعَلِّمُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ -وَكَانَ رَجُلًا مَبْسُورًا، وَقَالَ أَبُو مَعْمَرٍ مَرَّةً: عَنْ عِمْرَانَ- قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ صَلَاةِ الرَّجُلِ وَهْوَ قَاعِدٌ، فَقَالَ: «مَنْ صَلَّى قَائِمًا فَهْوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِدًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ، وَمَنْ صَلَّى نَائِمًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: نَائِمًا عِنْدِي مُضْطَجِعًا هَا هُنَا[1].

## ١٨- باسی نوێژی کەسی دانیشتوو بە ئاماژەکردن

١١١٦- عەبدوڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، کە عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ - پیاوێك بوو نەخۆشی مایەسیری هەبوو- ئەبو مەعمەڕ جارێك لە عیمرانەوە گێڕایەوە وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی نوێژکردنی مرۆڤ بەدانیشتنەوە، ئەویش فەرمووی: ((کەسێك بەپێوە نوێژ بکات ئەوە چاکترە، کەسێکیش بەدانیشتنەوە نوێژ بکات ئەوە نیوەی پاداشتی ئەو نوێژخوێنەی هەیە کە بەپێوە نوێژ دەکات، ئەو کەسەشی بەپاڵکەوتنەوە نوێژ دەکات، ئەوە نیوەی پاداشتی ئەو نوێژخوێنەی هەیە کە بەدانیشتنەوە نوێژ دەکات))، ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: وشەی (نَائِمًا) بەلای منەوە مانای ڕاکشاو و پاڵکەوتوو دەگەیەنێ ئا لێرەدا.

---

[1] بروانە: ١١١٥.

## ١٩- بَابٌ: إِذَا لَمْ يُطِقْ أَنْ يُصَلِّيَ قَاعِدًا صَلَّى عَلَى جَنْبٍ

وَقَالَ عَطَاءٌ: إِنْ لَمْ يَقْدِرْ أَنْ يَتَحَوَّلَ إِلَى الْقِبْلَةِ صَلَّى حَيْثُ كَانَ وَجْهُهُ.
١١١٧- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ عَنْ عَبْدِ اللهِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ طَهْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي الْحُسَيْنُ الْمُكْتِبُ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ بِي بَوَاسِيرُ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّلاَةِ، فَقَالَ: «صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ»[١].

## ١٩- باسێك: ئەگەر نەیتوانی بەدانیشتنەوە نوێژ بكات ئەوە لەسەر لا نوێژەكەی بكات

**١١١٧- عیمڕانی كوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: من مایەسیریم هەبوو، بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی نوێژكردن، ئەویش فەرمووی: ((بە پێوە نوێژ بكە، جا ئەگەر نەتتوانی ئەوە بەدانیشتنەوە نوێژەكەت بكە، جا ئەگەر ئەویشت نەتوانی، ئەوە لەسەر تەنیشت ڕاكشێ (و نوێژەكەت بكە.**

## ٢٠- بَابٌ: إِذَا صَلَّى قَاعِدًا ثُمَّ صَحَّ أَوْ وَجَدَ خِفَّةً تَمَّمَ مَا بَقِيَ

وَقَالَ الْحَسَنُ إِنْ شَاءَ الْمَرِيضُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَائِمًا وَرَكْعَتَيْنِ قَاعِدًا.
١١١٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا لَمْ تَرَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُصَلِّي صَلاَةَ اللَّيْلِ قَاعِدًا قَطُّ حَتَّى أَسَنَّ، فَكَانَ يَقْرَأُ قَاعِدًا حَتَّى إِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ، فَقَرَأَ نَحْوًا مِنْ ثَلاَثِينَ آيَةً أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً، ثُمَّ رَكَعَ[٢].

---

[١] بروانە: ١١١٥.

[٢] بروانە: ١١١٩، ١١٤٨، ٤٨٣٧.

## ٢٠- باسێک: ئەگەر کەسێک بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، پاشان چاک بوویەوە، یان سووکیەتی لە خۆیدا هەست پێکرد، ئەوەی ماوە لە نوێژەکەی تەواوی دەکات

**حەسەن دەڵێ: نەخۆش ئەگەر ویستی دەتوانێ دوو ڕکاتی نوێژەکەی بە پێوە بکات و، دوو ڕکاتی تری بەدانیشتنەوە بکات.**

**١١١٨- هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە گێڕایەوە، کە عائیشەی دایکی ئیمانداران ﵂ بۆی گێڕاوەتەوە، کە ئەو هەرگیز پێغەمبەری خوای ﷺ نەبینیوە شەونوێژی بەدانیشتنەوە کردبێ هەتا چووە تەمەنەوە[١]، ئەو بەدانیشتنەوە قوڕئانی دەخوێند (لە شەونوێژدا)، هەتا کاتێ دەیویست بڕوات بۆکڕنووش هەڵدەستایەوە، نزیکەی سی، یان چل ئایەتی دەخوێند (بەڕاوەستانەوە)، پاشان کڕنووشی دەبرد.**

**١١١٩-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ، وَأَبِي النَّضْرِ - مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي جَالِسًا فَيَقْرَأُ وَهْوَ جَالِسٌ، فَإِذَا بَقِيَ مِنْ قِرَاءَتِهِ نَحْوٌ مِنْ ثَلاَثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهَا وَهْوَ قَائِمٌ، ثُمَّ يَرْكَعُ ثُمَّ يَسْجُدُ، يَفْعَلُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، فَإِذَا قَضَى صَلاَتَهُ نَظَرَ، فَإِنْ كُنْتُ يَقْظَى تَحَدَّثَ مَعِي، وَإِنْ كُنْتُ نَائِمَةً اضْطَجَعَ[٢].

**١١١٩- عائیشەی دایکی ئیمانداران ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد، بەدانیشتنەوە قوڕئانی دەخوێند، جا کە سی یان**

---

[١] واتە: تەمەنی گەورە بوو، پیر بوو.

[٢] بڕوانە: ١١١٨.

چل ئایەتی بمایە لە قورئان خوێندنەکەی، ئەوە هەڵدەستایەوەو ئەو سی یان چل ئایەتەی بەڕاوەستانەوە دەخوێند، پاشان کڕنووشی دەبرد، پاشان سوژدەی دەبرد، لە ڕکاتی دووەمیشدا بەهەمان شێوەی دەکرد، ئینجا کە لە نوێژەکەی دەبوویەوە سەیری دەکرد، ئەگەر من بەخەبەر بوومایە قسەی دەکرد لەگەڵم، ئەگەر خەوتوو بوومایە ڕادەکشا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ١٩- كِتابُ التَّهجُّدِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ١٩- پەڕاوی شەو نوێژ

## ١- بابُ التَّهَجُّدِ بِاللَّيْلِ

وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ ﴿٧٩﴾ ﴾ الإسراء.

١١٢٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ أَبِي مُسْلِمٍ، عَنْ طَاوُسٍ، سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ ﭭ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَتَهَجَّدُ قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ لَكَ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ ﷺ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ» أَوْ «لاَ إِلَهَ غَيْرُكَ». قَالَ سُفْيَانُ: وَزَادَ عَبْدُ الْكَرِيمِ أَبُو أُمَيَّةَ: «وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ». قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ أَبِي مُسْلِمٍ: سَمِعَهُ مِنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

---

[1] بروانه: ٦٣١٧، ٦٣٨٥، ٧٤٤٢، ٧٤٩٩.

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ١- باسی شەونوێژ كردن لە شەودا

وە باسی ئەو فەرمایشتەی خوا ﷻ كە دەفەرموێ: (وە ئەی موحەممەد ﷺ) لە بەشێكی شەودا هەستە شەونوێژ بكە (بە قورئان خوێندن تێیدا)، ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە).

١١٢٠- تاووس دەڵێ: گوێی لە عەبدوڵای كوڕی عەباس بوو ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ لە شەودا هەڵسایە شەونوێژ بكات دەیفەرموو: ((خوایە هەموو سوپاس هەر بۆ تۆیە، تۆ بەڕێوەبەری ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەشی لە نێوانیاندایە، سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، موڵك و دەسەڵاتی ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە هەر بۆ تۆیە، سوپاس بۆ تۆ، هەر تۆی ڕووناكی ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەشی لە نێوانیاندایە، سوپاس بۆ تۆ، تۆ ڕاستی و هەقی، بەڵێنت ڕاست و دروستە، گەیشتن بە خزمەتت (لە قیامەتدا) ڕاستە، فەرموودەت ڕاستە، بەهەشت و دۆزەخ ڕاستن، پێغەمبەران هەق و ڕاستن، موحەممەدیش ﷺ ڕاستە، هەستانی قیامەت ڕاستە، خوایە گەردنكەچی تۆم، باوەڕم بەتۆ هێناوەو پشتم تەنها بەتۆ بەستووە، هەر بۆ لای تۆش گەڕامەوە، وە بە پشتیوانی تۆ دەچم بەگژ دوژمناندا، بڕیارو حوكم هەر لەتۆ وەردەگرم، ئەوەی كردوومە و ئەوەشی دەیكەم لە تاوان لێم خۆش بە، ئەوەشی پەنهانم كردووە، ئەوەشی ئاشكرام كردووە، تۆ پێش هەموو شتێك بوویت دوای هەموو شتێكیش دەمێنیت، هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لە تۆ))، یان ((بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە))، سوفیان دەڵێ: عەبدولكەریمی ناسراو بە ئەبو ئومەییە، ئەم زیادەی هێناوە ((هیچ پشت و پەناو هێزێك نییە جگە لە خوا))، سوفیان دەڵێ: سولەیمانی كوڕی ئەبو موسلیم دەڵێ: ئەم فەرموودەی لە تاووس بیستووە، ئەویش لە عەبدوڵای كوڕی عەباسەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.

## ٢- بابُ فَضلِ قِيَامِ اللَّيلِ

١١٢١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ. وَحَدَّثَنِي مَحْمُودٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا فَأَقُصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَكُنْتُ غُلَامًا شَابًّا، وَكُنْتُ أَنَامُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ، وَإِذَا لَهَا قَرْنَانِ، وَإِذَا فِيهَا أُنَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ، فَجَعَلْتُ أَقُولُ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ. قَالَ: فَلَقِيَنَا مَلَكٌ آخَرُ فَقَالَ لِي: لَمْ تُرَعْ[1].

## ٢- باسی گەورەیی شەونوێژ

**١١٢١- سالیم لە عەبدوڵای باوکیەوە دەگێڕێتەوە ﷺ دەڵێ: لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ ئەگەر کەسێك خەوێکی بینیبا دەیگێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆیە منیش ئاواتەخوازبووم کە خەوێ ببینم و بیگێڕمەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لەوکاتەدا من کوڕێکی گەنج بووم، وە من لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا دەخەوتم، لە خەومدا بینیم: دوو فریشتە گرتمیان و بردمیان بۆ دۆزەخ، بینیم وەك بیر هەڵبەستراوە و دیوار و چواردەوری بۆ کرابوو، دوو لا تەنیشتی هەبوو، وە بینیم خەڵکانێکی تێدایە کە پێشتر دەمناسین، منیش دەستم کرد بە وتنی پەنا دەگرم بەخوا لە ئاگری دۆزەخ، عەبدولا دەڵێ: ئینجا گەشتین بە فریشتەیەکی تر پێی وتم: مەترسە.**

---

[1] بروانە: ٤٤٠.

١١٢٢- فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ، لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ». فَكَانَ بَعْدُ لاَ يَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ إِلاَّ قَلِيلًا[1].

**١١٢٢- (عەبدوڵا دەڵێ:) جا ئەم خەوەم گێڕایەوە بۆ حەفصە ﵂، حەفصەش گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی: ((ئای چەند پیاوێکی چاکە عەبدوڵا ئەگەر (خۆزگە) شەونوێژی بکردایە))، (سالیم دەڵێ:) ئیتر دوای ئەوە عەبدوڵا کەمێك نەبێ بەشەودا نەدەخەوت (هەر شەونوێژی دەکرد).**

## ٣- بابُ طُولِ السُّجُودِ فِي قِيَامِ اللَّيْلِ

١١٢٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، كَانَتْ تِلْكَ صَلاَتَهُ، يَسْجُدُ السَّجْدَةَ مِنْ ذَلِكَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُنَادِي لِلصَّلاَةِ[2].

## ٣- باسی درێژی سوژدەکان لە شەونوێژدا

**١١٢٣- عوروە دەڵێ: عائیشە ﵂ بۆی گێڕایەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ (لە شەودا) یازدە ڕکات نوێژی دەکرد، هەمیشە ئەوە شێوەی شەونوێژی بوو، سوژدەیەکی دەبرد لەو نوێژانەدا بە ئەندازەی ئەوەی کەسێکتان پەنجا ئایەت بخوێنێ پێش ئەوەی سەر لە سوژدەکە بەرز بکاتەوە، وە لە پێش نوێژی بەیانیدا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد، پاشان لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا، هەتا بانگبێژەکە دەهات ئاگاداری دەکردەوە بۆ نوێژی بەیانی.**

---

[1] بڕوانە: ١١٥٧، ٣٧٣٩، ٣٧٤١، ٧٠١٦، ٧٠٣١.

[2] بڕوانە: ٦١٩.

# ٤- بابُ تَرْكِ الْقِيَامِ لِلْمَرِيضِ

١١٢٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: سَمِعْتُ جُنْدَبًا يَقُولُ: اشْتَكَى النَّبِيُّ ﷺ فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَةً أَوْ لَيْلَتَيْنِ[1].

# ٤- باسی وازهێنانی نەخۆش لە شەونوێژکردن

**١١٢٤- جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەخۆش بوو شەوێك یان دوو شەو هەڵنەدەستا بۆ شەونوێژ.**

١١٢٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: احْتَبَسَ جِبْرِيلُ ﷺ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْ قُرَيْشٍ: أَبْطَأَ عَلَيْهِ شَيْطَانُهُ. فَنَزَلَتْ: ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ ﴾ الضحى[2].

**١١٢٥- جوندەبی کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: جیبریل ﷺ (چەند ڕۆژێك) نەهات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، بۆیە ئافرەتێکی قورەیشی وتی: شەیتانەکەی دواکەتووە لێی و نەهاتووە بۆ لای، ئیتر بەوهۆیەوە ئەم ئایەتانە دابەزین:** ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ ﴾ الضحى[3].

---

[1] بڕوانە: ١١٢٥، ٤٩٥٠، ٤٩٥١، ٤٩٨٣.

[2] بڕوانە: ١١٢٤.

[3] واتە: سوێند بەچێشتەنگاو، وە سوێند بەشەو کاتێک کە ئارام دەگرێ، پەروەردگارت وازی لێ نەهێناویت و لێت دڵگیر نەبووە.

## ٥- بابُ تَحْرِيضِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى صَلَاةِ اللَّيْلِ وَالنَّوَافِلِ مِنْ غَيْرِ إِيجَابٍ وَطَرَقَ النَّبِيُّ ﷺ فَاطِمَةَ وَعَلِيًّا عليهما السلام لَيْلَةً لِلصَّلَاةِ

١١٢٦- حَدَّثَنَا ابْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ هِنْدٍ بِنْتِ الْحَارِثِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَيْقَظَ لَيْلَةً فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ! مَاذَا أُنْزِلَ اللَّيْلَةَ مِنَ الْفِتْنَةِ؟ مَاذَا أُنْزِلَ مِنَ الْخَزَائِنِ؟ مَنْ يُوقِظُ صَوَاحِبَ الْحُجُرَاتِ؟ يَا رُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ فِي الآخِرَةِ»[1].

## ٥- باسی هاندانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر شەونوێژ و نوێژە سوننەتەکان کە سوننەتن،پێغەمبەر ﷺ شەوێک ڕۆیشت بۆ ماڵی فاتیمەو عەلی (سەلامی خوایان لێ بێ) بۆ هاندانیان لەسەر شەونوێژ

**١١٢٦- ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ شەوێك لە خەو هەستاو فەرمووی: ((پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەم شەو چ ئاشووب و فیتنە دابارێنرا؟! وە چەند گەنجینەو خەزێنە دابەزێنرا (کە دەستی مسوڵمانان دەکەوێ و دەگیرێ)[2]؟ کێ ئافرەتانی ئەم ماڵانە (مەبەستی خێزانەکانی خۆیەتی ﷺ) خەبەردەکاتەوە (بۆ شەونوێژکردن)؟، چونکە زۆرکەس لە دونیادا پۆشتەیە، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا ڕووت و قووتە)).**

١١٢٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ، أَنَّ حُسَيْنَ بْنَ عَلِيٍّ أَخْبَرَهُ أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ بِنْتَ

---

[1] بڕوانە: ١١٥.

[2] یان چەند دەرگای ڕەحمەتی پەروەردگار کرایەوەو دابەزێنرا. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٧٦/٣.

النَّبِيِّ ﷺ لَيْلَةً فَقَالَ: «أَلاَ تُصَلِّيَانِ؟». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللَّهِ، فَإِذَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا. فَانْصَرَفَ حِينَ قُلْنَا ذَلِكَ وَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئًا. ثُمَّ سَمِعْتُهُ وَهْوَ مُوَلٍّ يَضْرِبُ فَخِذَهُ وَهْوَ يَقُولُ: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾﴾ الكهف.

**١١٢٧- عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك هات بۆ لای ئەو و فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺو فەرمووی: ((ئەوە هەردووکتان هەڵناستن شەونوێژ بکەن؟!))، عەلی دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا، گیانمان بەدەستی خوایە، ئەگەر ویستی خەبەرمان بکاتەوە ئەوە هەڵدەستین، ئیتر کە ئەوەمان وت پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، پاشان کە پشتی هەڵکردو ڕۆشت، گوێم لێ بوو دەیدا بەڕانیداو دەیفەرموو: ((بەڕاستی ئادەمیزاد لە هەموو شتێ زیاتر موجادەلەو دەمەدەمێ دەکات)).**

١١٢٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيَدَعُ الْعَمَلَ وَهْوَ يُحِبُّ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ خَشْيَةَ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ النَّاسُ فَيُفْرَضَ عَلَيْهِمْ، وَمَا سَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُبْحَةَ الضُّحَى قَطُّ، وَإِنِّي لأُسَبِّحُهَا[١].

**١١٢٨- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە کارێك دەهێنا لە کاتێکدا حەزی دەکرد بیکات، (ئەوەش) لە ترسی ئەوەی نەوەك خەڵك کاری پێ بکەن و ئەوسا فەرز بێت لەسەریان، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز نوێژی چێشتەنگاوی نەکردووە، وە بێگومان خۆم نوێژی چێشتەنگاو دەکەم.**

---

[١] بڕوانە: ١١٧٧.

**١١٢٩**- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي الْمَسْجِدِ فَصَلَّى بِصَلَاتِهِ نَاسٌ، ثُمَّ صَلَّى مِنَ الْقَابِلَةِ فَكَثُرَ النَّاسُ، ثُمَّ اجْتَمَعُوا مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ: «قَدْ رَأَيْتُ الذِي صَنَعْتُمْ وَلَمْ يَمْنَعْنِي مِنَ الْخُرُوجِ إِلَيْكُمْ إِلاَّ أَنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ». وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ[1].

**١١٢٩- عائیشەی دایکی ئیمانداران ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك لە مزگەوت شەونوێژی کرد، خەڵکێك لەدوای نوێژەکەیەوە بە جەماعەت نوێژیان کرد، پاشان لە شەوی داهاتوودا شەونوێژی کرد، جا خەڵکی زۆرتر بوون (لەگەڵی جەماعەتیان کرد)، پاشان لە شەوی سێیەم یان چوارەمدا خەڵکەکە کۆبوونەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نەڕۆیشت (بۆ مزگەوت) بۆ لایان، جا کە ڕۆژ بوویەوە فەرمووی: ((بەڕاستی ئەوەی کردتان بینیم هیچ شتێك ڕێگری نەکردم لەوەی بێم بۆ نێوتان، تەنها ئەوە نەبێ ترسام ئەو شەونوێژە فەرز ببێت لەسەرتان))، (عائیشە دەڵێ:) وە ئەوەی (باسکرا) لە ڕەمەزاندا بوو.**

## ٦- بابُ قِيَامِ النَّبِيِّ ﷺ حَتَّى تَرِمَ قَدَمَاهُ

وَقَالَتْ عَائِشَةُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى تَفَطَّرَ قَدَمَاهُ. وَالْفُطُورُ: الشُّقُوقُ. ﴿ انفَطَرَتْ ﴾ الانفطار: انْشَقَّتْ.

**١١٣٠**- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنْ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ الْمُغِيرَةَ ﵁ يَقُولُ إِنْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَيَقُومُ لِيُصَلِّيَ حَتَّى تَرِمُ قَدَمَاهُ -أَوْ سَاقَاهُ- فَيُقَالُ لَهُ، فَيَقُولُ: «أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا؟»[2].

---

[1] بروانە: ٧٣٩.

[2] بروانە: ٤٨٣٦، ٦٤٧١.

## ٦- باسی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە شەونوێژی دەکرد هەتا هەردوو قاچی شەقیان بردبوو

عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە شەونوێژی دەکرد هەتا پێیەکانی شەقیان بردبوو، وشەی (الْفُطُورُ)، واتە: درز و شەق بردن، وە ﴿ انفَطَرَتْ ﴿١﴾ ﴾ واتە: پارچە پارچە بوون شەق و پەق بوون.

١١٣٠- موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەڵدەسا بۆ شەونوێژکردن هەتا پێیەکانی- یان لاقەکانی - دەئاوسان، بۆیە پێیان دەوت: (بۆ ئەوەندە ئەزیەتی خۆت دەدەی)، ئەویش دەیفەرموو: ((دەی بەندەیەکی شوکرانەبژێری خوا نەبم؟!)).

## ٧- بابُ مَنْ نَامَ عِنْدَ السَّحَرِ

١١٣١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ أَوْسٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُ: «أَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ ﵇، وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَيَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا»[1].

## ٧- باسی ئەو کەسەی لەبەرەبەیاندا بخەوێ

١١٣١- عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﵄ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ((خۆشەویسترین نوێژ لای خوا نوێژی داوود پێغەمبەرە

[1] بڕوانە: ١١٥٢، ١١٥٣، ١٩٧٤، ١١٧٥، ١٩٧٦، ١٩٧٧، ١٩٧٨، ١٩٧٩، ١٩٨٠، ٣٤١٨، ٣٤١٩، ٣٤٢٠، ٥٠٥٢، ٥٠٥٣، ٥٠٥٤، ٥١٩٩، ٦١٣٤، ٦٢٧٧.

**ﷺ، وە خۆشەویستترین ڕۆژووگرتن لای خوا ڕۆژووگرتنی داوود پێغەمبەرە ﷺ، کە نیوەی شەو دەخەوت و سێیەکی شەو هەڵدەساو شەونوێژی دەکرد، وە شەش یەکی شەو دەخەوتەوە (لەبەرەبەیاندا)، وە ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو، ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو)).**

١١٣٢- حَدَّثَنِي عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَشْعَثَ، سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ مَسْرُوقًا قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَيُّ الْعَمَلِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَتِ: الدَّائِمُ. قُلْتُ: مَتَى كَانَ يَقُومُ؟ قَالَتْ: يَقُومُ إِذَا سَمِعَ الصَّارِخَ.

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو الأَحْوَصِ عَنِ الأَشْعَثِ قَالَ: إِذَا سَمِعَ الصَّارِخَ قَامَ فَصَلَّى[1].

**١١٣٢- مەسروق دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە رضي الله عنها چ کردەوەیەك بەلای پێغەمبەرەوە ﷺ خۆشەویستتر بوو؟ عائیشەش رضي الله عنها وتی: ئەو کردەوەی بەردەوام بێت، وتم: چ کاتێ پێغەمبەر ﷺ هەڵدەستا بۆ شەونوێژ؟ عائیشە وتی: کاتێ کەڵەشێر دەیخوێند هەڵدەستا بۆ شەونوێژ.**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) موحەممەدی کوڕی سەلام بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەبولئەحوەص بۆی گێڕاینەوە لە ئەشعەسەوە وتی: کاتێ گوێی لە خوێندنی کەڵەشێر دەبوو، هەڵدەستاو شەونوێژی دەکرد.**

١١٣٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: ذَكَرَ أَبِي، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: مَا أَلْفَاهُ السَّحَرُ عِنْدِي إِلاَّ نَائِمًا. تَعْنِي: النَّبِيَّ ﷺ.

**١١٣٣- عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: هەر کات لای من بووایە لە بەرەبەیاندا خەوتبوو، کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو.**

---

[1] بروانە: ٦٤٦١، ٦٤٦٢.

## ٨- بابُ مَنْ تَسَحَّرَ فَلَمْ يَنَمْ حَتَّى صَلَّى الصُّبْحَ

١١٣٤- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا رَوْحٌ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ وَزَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ تَسَحَّرَا، فَلَمَّا فَرَغَا مِنْ سَحُورِهِمَا قَامَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ إِلَى الصَّلاَةِ فَصَلَّى. قُلْنَا لأَنَسٍ: كَمْ كَانَ بَيْنَ فَرَاغِهِمَا مِنْ سَحُورِهِمَا وَدُخُولِهِمَا فِي الصَّلاَةِ؟ قَالَ: كَقَدْرِ مَا يَقْرَأُ الرَّجُلُ خَمْسِينَ آيَةً[1].

## ٨- باسی ئەو کەسەی پارشێو بکات و نەخەوێتەوە هەتا نوێژی بەیانیش دەکات

**١١٣٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺو زەیدی کوڕی سابیت ﷺ پارشێویان کرد، جا کاتێ لێبوونەوە لە پارشێوکردنەکەیان، پێغەمبەر ﷺ هەستا بۆ نوێژکردن و نوێژی بەیانی کرد. قەتادە دەڵێ: بە ئەنەسمان وت: نێوانی تەواوبوونیان لە پارشێوەکەیان و دەست کردنیان بە نوێژی بەیانییان چەند بوو؟ ئەنەس وتی: بە ئەندازەی ئەوەی کەسێك پەنجا ئایەتی قورئان بخوێنێ.**

## ٩- بابُ طُولِ الْقِيَامِ فِي صَلاَةِ اللَّيْلِ

١١٣٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ لَيْلَةً، فَلَمْ يَزَلْ قَائِمًا حَتَّى هَمَمْتُ بِأَمْرِ سَوْءٍ. قُلْنَا: وَمَا هَمَمْتَ؟ قَالَ: هَمَمْتُ أَنْ أَقْعُدَ وَأَذَرَ النَّبِيَّ ﷺ.

---

[1] بروانە: ٥٧٦.

## ٩- باسی زۆر ڕاوەستان بەپێوە لە شەونوێژدا[١]

**١١٣٥- عەبدوڵای (کوڕی مەسعود) ﷺ دەڵێ: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ شەونوێژم کرد، جا ئەوەندە بەپێوە وەستا (و قوڕئانی خوێند)، نیازی کارێکی خراپ هات بەدڵمدا، (ئەبو وائیل دەڵێ) وتمان: چی هات بە دڵتدا؟ عەبدوڵا وتی: نیازم وابوو کە دانیشم و واز لە پێغەمبەر ﷺ بێنم.**

١١٣٦- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا قَامَ لِلتَّهَجُّدِ مِنَ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ[٢].

**١١٣٦- حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە هەڵدەسا بۆ شەونوێژ لە شەودا، سیواکی دەهێنا بە دەم و ددانیدا.**

## ١٠- بابٌ: كَيفَ كانَ صَلاةُ النَّبيِّ ﷺ وَكَمْ كانَ النَّبيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ؟

١١٣٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ صَلَاةُ اللَّيْلِ؟ قَالَ: «مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خِفْتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ»[٣].

---

[١] وتە: قورئان زۆر خوێندن لەو ڕاوەستانەدا، چونکە وەستانەکە بۆ قورئان خوێندنە.

[٢] بڕوانە: ٢٤٥.

[٣] بڕوانە: ٤٧٢.

## ١٠- باسێك: شەونوێژی پێغەمبەر ﷺ چۆن بووە، وە لە شەودا چەند ڕكات نوێژی دەكرد؟

**١١٣٧- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا شەونوێژ چۆن دەكرێ؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دوو ڕكات دوو ڕكات، جا ئەگەر ترسایت نوێژی بەیانی ببێ، ئەوە یەك ڕكات نوێژی ویتر بكە)).**

١١٣٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو جَمْرَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ صَلاَةُ النَّبِيِّ ﷺ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً. يَعْنِي بِاللَّيْلِ.

**١١٣٨- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: هەمیشە نوێژی پێغەمبەر ﷺ سێزدە ڕكات بوو. مەبەستی لە شەونوێژدا.**

١١٣٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ وَثَّابٍ عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂ عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَقَالَتْ: سَبْعٌ، وَتِسْعٌ، وَإِحْدَى عَشْرَةَ، سِوَى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ.

**١١٣٩- مەسروق دەڵێ: پرسیارم كرد لە عائیشە ﵂ دەربارەی نوێژكردنی پێغەمبەر ﷺ لە شەودا؟ عائیشەش وتی: حەوت و نۆ و یازدە[1] ڕكاتی دەكرد، جگە لە دوو ڕكاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی.**

١١٤٠- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا حَنْظَلَةُ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، مِنْهَا الْوِتْرُ، وَرَكْعَتَا الْفَجْرِ[2].

---

[1] واتە: جاری وا هەبوو حەوت ڕكاتی دەكرد، جاری واش هەبووە نۆ یان یازدە ڕكاتی كردووە.

[2] بڕوانە: ١١٤٧.

١١٤٠- عائیشه ﵂ دەڵێ: هەمیشه پێغەمبەر ﷺ له شەودا سێزده ڕکات نوێژی دەکرد به ڕکاته ویترەکەوه، وه به دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانیش.

## ١١- بابُ قِيَامِ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ وَنَوْمِهِ، وَمَا نُسِخَ مِنْ قِيَامِ اللَّيْلِ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ۝٢ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ۝٣ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ۝٤ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ۝٥ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ۝٦ إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ۝٧﴾ المزمل. وَقَوْلِهِ: ﴿عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ ۝٢٠﴾ المزمل.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَشَأَ: قَامَ بِالحَبَشِيَّةِ، وِطَاءً: مُوَاطَأَةَ القُرْآنِ أَشَدُّ مُوَافَقَةً لِسَمْعِهِ وَبَصَرِهِ وَقَلْبِهِ ﴿لِّيُوَاطِـُٔوا۟ ۝٣٧﴾ التوبة. لِيُوَافِقُوا.

## ١١- باسی هەستانی پێغەمبەر ﷺ بۆ شەونوێژ و خەوتنی، هەروەها ئەوەی نەسخ بۆتەوه له شەونوێژ

وه ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند: (ئەی ئەو کەسەی خۆت داپۆشیوه، شەو هەسته (شەونوێژ بکه)کەمێکی نەبێ، نیوەی یان کەمتر له نیوەی، یان زیاتر له نیوەی دەوری قورئان بکەرەوه به لەسەرخۆیی، بێگومان ئێمه لەمەولا قورئانێکی قورس و گرانت بۆ دەنێرینه خوارەوه، بەڕاستی هەستانی شەو دوای

**خەوتن (بۆ خواپەرستی) کاریگەرترە لەڕووی کردارەوە (لە خواپەرستی ڕۆژ بۆ دڵ)، بێگومان تۆ لەڕۆژدا لە هاتوچۆکردنێکی زۆردایت). هەروەها ئەم فەرمایشتەی خواش: (بێگومان خوا چاك دەزانێ کە ئێوە ناتوانن ئەندازەی شەونوێژ ڕابگرن، بۆیە لێتان خۆش بوو، دەی ئەوەی بۆتان ئاسانە قورئان بخوێنن، خوا دەزانێ کە لەمەولا لێتان نەخۆش دەبێ، وە هەندێکی ترتان بەزەویدا دەگەڕێن بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزی و بەهرەی خوا، وە هەندێکی ترتان لەپێناوی خوادا دەجەنگن (لەدژی دوژمنانی ئیسلام)، ئینجا ئەوەندەی ئاسانە بۆتان قورئان بخوێنن و بەچاکی نوێژ بکەن و زەکات بدەن، قەرزی چاکیش بدەن بەخوا (لە پێناو خوادا ببەخشن)، وە هەر چاکەیەك پێش خۆتان بخەن (بۆ دوارۆژ)، لای خوا دەیبیننەوە و دەستان دەکەوێتەوە، ئەوەی لای خوایە چاکتر و گەورەترە (لەوەی دونیا) لەڕووی پاداشتەوە).**

**عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: وشەی (نَشَأَ) واتە: هەستا، بەزمانی حەبەشی، وە (وِطَاءً) واتە: ڕێکی و گونجاوی لەگەڵ قورئاندا، کاریگەرترە بۆ گوێ و چاو و دڵی، وە (لِيُوَاطِئُوا) یانی: تا بگونجێ، لەگەڵی پێك بێتەوە.**

١١٤١- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُفْطِرُ مِنَ الشَّهْرِ حَتَّى نَظُنَّ أَنْ لاَ يَصُومَ مِنْهُ، وَيَصُومُ حَتَّى نَظُنَّ أَنْ لاَ يُفْطِرَ مِنْهُ شَيْئًا، وَكَانَ لاَ تَشَاءُ أَنْ تَرَاهُ مِنَ اللَّيْلِ مُصَلِّيًا إِلاَّ رَأَيْتَهُ وَلاَ نَائِمًا إِلاَّ رَأَيْتَهُ. تَابَعَهُ سُلَيْمَانُ وَأَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ، عَنْ حُمَيْدٍ[١].

**١١٤١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگێکدا هەندێ جار ئەوەندە بەڕۆژوو نەدەبوو هەتا وامان دەزانی هیچی لێ بەڕۆژوو نەبووە، وە هەندێ جار ئەوەندە ڕۆژووی تیا دەگرت، هەتا وامان دەزانی ڕۆژێك نەبوو بەڕۆژوو نەبێ،**

[١] بڕوانە: ١٩٧٢، ١٩٧٣، ٣٥٦١.

وە لەشەودا هەرکاتێ بتویستایە لە شەونوێژدا بیبینی دەتبینی، وە لە هەر کاتێکدا بتویستایە بەخەوتوویی بیبینی دەتبینی. سولەیمان و ئەبو خالیدە سوور لە حومەیدەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوەو پاڵپشتی فەرموودەکەی پێشوو دەکات.

## ١٢- بابُ عَقْدِ الشَّيْطانِ عَلى قافِيَةِ الرَّأْسِ إِذَا لَمْ يُصَلِّ بِاللَّيْلِ

١١٤٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلاَثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ: عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلاَنَ».

## ١٢- باسی گرێدانی شەیتان لە پشتەسەری مرۆڤ ئەگەر شەونوێژ نەکات

١١٤٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان خەوت، شەیتان سێ گرێ دەدات لە پشتی سەری، دەماڵێ بە یەکە یەکەی گرێکانداو دەڵێ: شەوێکی درێژت لەبەرەو بخەوە، جا ئەگەر هەستاو یادی خوای کرد گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئینجا ئەگەر دەستنوێژی گرت گرێیەکی تریان دەکرێتەوە، ئەوسا ئەگەر نوێژی کرد گرێیەکی تریشیان دەکرێتەوە، ئینجا بە گورج و گۆڵی و دڵ خۆشییەوە ڕۆژ دەکاتەوە، ئەگەرنا بە دڵ گرانی و تەمبەڵی ڕۆژ دەکاتەوە)).

١١٤٣- حَدَّثَنَا مُؤَمَّلُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سَمُرَةُ بْنُ جُنْدَبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الرُّؤْيَا قَالَ: «أَمَّا الَّذِي يُثْلَغُ رَأْسُهُ بِالحَجَرِ فَإِنَّهُ يَأْخُذُ القُرْآنَ فَيَرْفِضُهُ وَيَنَامُ عَنِ الصَّلاَةِ المَكْتُوبَةِ»[1].

**١١٤٣- سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە(بەشێکی) خەوێکدا کە بینیویەتی فەرمووی: ((جا ئەو کەسەیان کە بەبەرد سەری دەشکێنرێ، ئەوە بێگومان کەسێکە شارەزای قورئان بووە و (لەبەری کردووە بەڵام کارپێکردنی) واز لێدەهێنێ و دەخەوێ و هەڵناسێ بۆ نوێژی فەرز)).**

## ١٣- بابٌ: إِذَا نَامَ وَلَمْ يُصَلِّ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنِه

١١٤٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ قَالَ: حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ رَجُلٌ فَقِيلَ: مَا زَالَ نَائِمًا حَتَّى أَصْبَحَ، مَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ. فَقَالَ: «بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنِهِ»[2].

## ١٣- باسێک: ئەگەر خەوت و شەونوێژی نەکرد شەیتان میز دەکاتە گوێیەوە

**١١٤٤- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ باسی پیاوێك کرا و وترا: بەردەوام خەوی لێدەکەوێ هەتا ڕۆژ دەبێتەوە، هەڵناسێ بۆ نوێژی بەیانی یان شەونوێژ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسە شەیتان میزی کردۆتە گوێیەوە)).**

---

[1] بڕوانە: ٨٤٥.

[2] بڕوانە: ٣٢٧٠.

## ١٤- بابُ الدُّعَاءِ وَالصَّلَاةِ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ

وَقَالَ تَعَالَى: ﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ أَيْ: مَا يَنَامُونَ. ﴿ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الذاريات ١٧ - ١٨.

١١٤٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَأَبِي عَبْدِ اللَّهِ الأَغَرِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ»[1].

## ١٤- باسی پاڕانەوە و نوێژكردن لە كۆتایی شەودا

**خوای بەرزو بڵند دەفەرموێ: (ئیمانداران) كەمێك لە شەودا دەخەوتن[2] (شەونوێژیان دەكرد)، وە لەبەرەبەیاندا داوای لێخۆشبوونیان دەكرد).**

**١١٤٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەموو شەوێك پەروەردگاری گەورەو بڵندمان دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دونیا كاتێ سێیەكی كۆتایی شەو ماوە، دەفەرموێ: كێ لێم دەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە؟ كێ داوام لێ دەكات تا داواكەی پێبدەم؟ كێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەكات تا لێی خۆش بـم؟)).**

---

[1] بروانە: ٦٣٢١، ٧٤٩٤.

[2] (ما يهجعون) لە ڕیوایەتی حەمویدا بەمجۆرەیە: (ما يهجعون) ينامون وما زائدة، واتە: دەخەون و (ما) زیادەیە. إرشاد الساري: ١٩٩/٣.

## ١٥- بابُ مَنْ نَامَ أَوَّلَ اللَّيْلِ وَأَحْيَا آخِرَهُ

وَقَالَ سَلْمَانُ لأَبِي الدَّرْدَاءِ: نَمْ. فَلَمَّا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ قَالَ: قُمْ الآن. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَدَقَ سَلْمَانُ»[1].

١١٤٦- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ. وَحَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂: كَيْفَ صَلاَةُ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَنَامُ أَوَّلَهُ وَيَقُومُ آخِرَهُ، فَيُصَلِّي ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَذَّنَ المُؤَذِّنُ وَثَبَ، فَإِنْ كَانَ بِهِ حَاجَةٌ اغْتَسَلَ، وَإِلَّا تَوَضَّأَ وَخَرَجَ.

## ١٥- باسی ئەو کەسەی سەرەتای شەو دەخەوێ و لە کۆتایی شەودا هەڵدەسێ شەونوێژ دەکات

**سەلمان بە ئەبو دەرِدائی وت ﵄: بخەوە، جا کاتێ لە کۆتایی شەودا بوو وتی: ئێستا هەستە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سەلمان ڕاستی وتووە)).**

**١١٤٦- ئەسوەد دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە کرد ﵂ نوێژ کردنی پێغەمبەر ﷺ لە شەودا چۆن بوو؟ عائیشە وتی: هەمیشە لە سەرەتای شەوەوە دەخەوت و لە کۆتایی شەودا هەڵدەساو شەونوێژی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ نێو جێگەی خەوتنەکەی، ئینجا کە بانگبێژەکە بانگی دەدا هەڵدەسا، جا ئەگەر پێویستی بە خۆشۆردن ببوایە خۆی دەشۆرد، ئەگەرنا دەستنوێژی دەگرت و دەردەچوو (بۆ مزگەوت).**

---

[1] بەشێکە لە فەرموودەیەک ئیمامی بوخاری لە (كتاب الأدب، بَابُ مَنْ أَقْسَمَ عَلَى أَخِيهِ لِيُفْطِرَ فِي التَّطَوُّعِ) بە ژمارە: ١٩٦٨.

## ١٦- بابُ قِيَامِ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ فِي رَمَضَانَ وَغَيْرِهِ

١١٤٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂: كَيْفَ كَانَتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلاَ فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلاَ تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلاَ تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلاَثًا، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي»[1].

## ١٦- باسی شەونوێژی پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزاندا

**١١٤٧- ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەڵێ: کە پرسیاری کرد لە عائیشە ﵂ شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزاندا چۆن بوو؟ عائیشەش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نە لە ڕەمەزان و، نە لە غەیری ڕەمەزاندا یازدە ڕکات زیاتری نەدەکرد، (لە پێشدا) چوار ڕکاتی دەکرد، مەپرسە چەند جوان دەیکردن و چەند درێژەی پێ دەدان، پاشان چوار ڕکاتی تری دەکرد، جا مەپرسە چەند جوان دەیکردن و چەند درێژەی پێ دەدان، پاشان سێ ڕکاتی تری دەکرد، جا عائیشە دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا پێش ئەوەی سوننەتی ویتر بکەیت دەخەوی؟ ئەویش فەرمووی: ((عائیشە بێگومان چاوەکانم دەخەون، بەڵام دڵم بە ئاگایەو ناخەوێ)).**

١١٤٨- حَدَّثَنَا محمدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحيَى بن سَعِيدٍ، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَت: مَا رَأَيتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ جَالِسًا، حَتَّى إِذَا كَبِرَ قَرَأَ جَالِسًا، فَإِذَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنَ السُّورَةِ ثَلاَثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهُنَّ، ثُمَ رَكَعَ[2].

---

[1] بروانە: ٢٠١٣، ٣٥٦٩، ١١٤٠.

[2] بروانە: ١١١٨.

**١١٤٨- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ نەبینیوە لە هیچ نوێژێکی شەودا بە دانیشتنەوە قورئانی خوێندبێ، هەتا ئەوکاتەی کە تەمەنی گەورە بوو بەدانیشتنەوە (نوێژی دەکردو) قورئانی دەخوێند، جا ئەگەر لە سوورەتەکە (کە دەیخوێند) سی، یان چل ئایەتی بمابایە، هەڵدەستایەوە بەپێوەی دەخوێند، پاشان کڕنووشی دەبرد.**

## ١٧- بَابُ فَضْلِ الطُّهُورِ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَفَضْلِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الوُضُوءِ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ

١١٤٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ أَبِي حَيَّانَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِبِلاَلٍ عِنْدَ صَلاَةِ الفَجْرِ: «يَا بِلاَلُ، حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإِسْلاَمِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الجَنَّةِ». قَالَ: مَا عَمِلْتُ عَمَلًا أَرْجَى عِنْدِي أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طُهُورًا فِي سَاعَةِ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إِلاَّ صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: «دَفَّ نَعْلَيْكَ» يَعْنِي: تَحْرِيكَ.

## ١٧- باسی گەورەیی دەستنوێژ بە شەو و بەڕۆژ، وە گەورەیی نوێژ پاش دەستنوێژ لە شەو و ڕۆژدا

**١١٤٩- ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی نوێژی بەیانیدا فەرمووی بە بیلال: ((بیلال پێم بڵێ چ کردەوەیەکت کردووە لە ئیسلامدا زیاتر ئومێدت پێی بێ، چونکە بە دڵنیاییەوە من گوێم لە خشەی نەعلەکانت بوو لە پێشمەوە (دەڕۆیشتیت) لە بەهەشتدا))، بیلالیش وتی: هیچ کردەوەیەکم نەکردووە زیاتر ئومێدم پێی بێت، جگە لەوەی کە هیچ کاتێك دەستنوێژم**

نەگرتووە نە لە شەودا، نە لە ڕۆژدا، ئیللا بەو دەستنوێژەوە ئەوەندەی لە چارەم نووسرابێ نوێژ بکەم، نوێژم کردووە، ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: وشەی: (دَفَّ نَعْلَيْكَ) یانی: جوڵە و خشەی نەعلەکانت.

## ١٨- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ التَّشْدِيدِ فِي العِبَادَةِ

١١٥٠- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ فَإِذَا حَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: «مَا هَذَا الحَبْلُ؟». قَالُوا: هَذَا حَبْلٌ لِزَيْنَبَ، فَإِذَا فَتَرَتْ تَعَلَّقَتْ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ، حُلُّوهُ، لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ».

## ١٨- باسی ئەوەی کە ناپەسەندە لە زیادەڕۆیی لە پەرستش دا

**١١٥٠- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت بینی گوریسێ بەستراوە بە دوو کۆڵەکەوە، ئەویش فەرمووی: ((ئەم گوریسە چییە؟)) وتیان: ئەمە گوریسی زەینەبە، کە لە نوێژکردن ماندوو بوو دەستی پێوە دەگرێ. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وا مەکەن بیکەنەوە، هەرکامتان چەند گورجوگۆڵ بوو، با نوێژە سوننەتەکان بە پێوە بکات، ئینجا کە ماندوو بوو با دانیشێت)).**

١١٥١- قَالَ: وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَتْ عِنْدِي امْرَأَةٌ مِنْ بَنِي أَسَدٍ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «مَنْ هَذِهِ؟». قُلْتُ: فُلاَنَةُ لاَ تَنَامُ بِاللَّيْلِ - تَذْكُرُ مِنْ صَلاَتِهَا-، فَقَالَ: «مَهْ، عَلَيْكُمْ مَا تُطِيقُونَ مِنَ الأَعْمَالِ، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا»[1].

[1] بڕوانە: ٤٣.

**١١٥١- هیشامی کوڕی عورِوه له باوکیەوه دەگێڕێتەوه ئەویش له عائیشەوه (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕایەوه، وتی: ئافرەتێکم لابوو که له بەنی ئەسەد بوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوه بۆ ماڵەوه، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەم ئافرەته کێیه؟)) وتم: فلاّنه ئافرەته به شەو ناخەوێ، -عائیشه باسی نوێژی ئەو ئافرەتەی کرد- پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وازبێنه! ئەوەنده پەرستش بکەن که له تواناتاندایه، چونکه بێگومان خوا (له پاداشت دانەوەتان) وەڕەس نابێ، هەتا ئێوه (لەبەندایەتی) وەڕەس دەبن)).**

## ١٩- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنْ تَرْكِ قِيَامِ اللَّيْلِ لِمَنْ كَانَ يَقُومُهُ

١١٥٢- حَدَّثَنَا عَبَّاسُ بْنُ الحُسَيْنِ، حَدَّثَنَا مُبَشِّرٌ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ. وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الحَسَنِ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ العَاصِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَبْدَ اللَّهِ، لاَ تَكُنْ مِثْلَ فُلاَنٍ، كَانَ يَقُومُ اللَّيْلَ فَتَرَكَ قِيَامَ اللَّيْلِ». وَقَالَ هِشَامٌ: حَدَّثَنَا ابن أَبِي العِشْرِينَ، حَدَّثَنَا الأوزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى، عَنْ عُمَرَ بْنِ الحَكَمِ بْنِ ثَوْبَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ مِثْلَهُ. وَتَابَعَهُ عَمْرُو بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ[1].

## ١٩- باسی ئەوەی که ناپەسەنده کەسێک شەونوێژ بکات و (دواتر) وازی لێ بێنێ

**١١٥٢- عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ به منی فەرموو: ((ئەی عەبدوڵا وەك فلاّن کەس مەبه، ئەوسا شەونوێژی دەکرد،**

---

[1] بڕوانه: ١١٣١.

**کەچی شەونوێژی واز لێ هێنا))، هیشام دەڵێ: ئیبنو ئەبی لعیشرین بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەوزاعی بۆی گێڕاینەوە وتی: یەحیا بۆی گێڕامەوە لە عومەری کوڕی حەکەمی کوڕی سەوبانەوە وتی: ئەبو سەلەمە وێنەی فەرموودەکەی پێشووی بۆ گێڕامەوە. بەم ڕێگەیەش: عەمری کوڕی ئەبی سەلەمە لە ئەوزاعییەوە ئەم فەرموودەی گێڕایەوەو، پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئیبنو لعیشرین دەکات.**

## ٢٠- بابٌ

١١٥٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي العَبَّاسِ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ؟» قُلْتُ: إِنِّي أَفْعَلُ ذَلِكَ. قَالَ: «فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ عَيْنُكَ وَنَفِهَتْ نَفْسُكَ، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ حَقٌّ، وَلأَهْلِكَ حَقٌّ، فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ»[1].

## ٢٠- باسێک

**١١٥٣- عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((ئەوە وایە پێم گەیشتووە کە تۆ هەموو شەو شەونوێژ دەکەیت، بە ڕۆژیش بەڕۆژوو دەبیت؟)) منیش وتم: بەڵێ ڕاستە من وادەکەم، فەرمووی: ((دەی بەڕاستی ئەگەر تۆ وا بکەیت، چاوت بە قوڵدا دەچێت و لاواز دەبێت، لاشەتماندوو دەبێت، بێگومان لاشەت مافی هەیە لەسەرت، خێزانت مافی هەیە لەسەرت، کەواتە بەڕۆژوو ببە و بەڕۆژووش مەبە، شەونوێژ بکەو بشخەوە)).**

---

[1] بروانە: ١١١٣.

## ٢١- بابُ فَضْلِ مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى

١١٥٤- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الفَضْلِ، أَخْبَرَنَا الوَلِيدُ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَيْرُ بْنُ هَانِئٍ قَالَ: حَدَّثَنِي جُنَادَةُ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ، حَدَّثَنِي عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الحَمْدُ لِلَّهِ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي. أَوْ دَعَا اسْتُجِيبَ، فَإِنْ تَوَضَّأَ وَصَلَّى قُبِلَتْ صَلاَتُهُ».

## ٢١- باسی گەورەیی ئەو کەسەی لە شەودا خەبەری بوویەوەو شەونوێژی کرد

**١١٥٤- عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەس لە شەودا خەبەری بوویەوەو وتی: هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوای تاك و تەنیا، کە هاوەڵی نییە، دەسەڵات و سوپاس هەر بۆ ئەوە، ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بە دەسەڵاتە، سوپاس بۆ ئەو خوایە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایە، وە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لەو، خوا لە هەموو شتێك گەورەترە، هەموو تواناو هێزێك بۆ خوایە. پاشان بڵێ: خوایە لێم خۆش بیت یان بپاڕێتەوە، داواکەی گیرا دەکرێت، ئینجا ئەگەر دەستنوێژ بگرێ و نوێژ بکات، نوێژەکەی گیرا دەبێ)).**

١١٥٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي الهَيْثَمُ بْنُ أَبِي سِنَانٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ وَهُوَ يَقْصُصُ فِي قَصَصِهِ- وَهُوَ يَذْكُرُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَخًا لَكُمْ لاَ يَقُولُ الرَّفَثَ». يَعْنِي بِذَلِكَ: عَبْدَ اللَّهِ بْنَ رَوَاحَةَ.

وَفِينَا رَسُولُ اللَّهِ يَتْلُو كِتَابَهُ ... إِذَا انْشَقَّ مَعْرُوفٌ مِنَ الفَجْرِ سَاطِعُ
أَرَانَا الهُدَى بَعْدَ العَمَى فَقُلُوبُنَا ... بِهِ مُوقِنَاتٌ أَنَّ مَا قَالَ وَاقِعُ

يَبِيتُ يُجَافِي جَنْبَهُ عَنْ فِرَاشِهِ ... إِذَا اسْتَثْقَلَتْ بِالْمُشْرِكِينَ الْمَضَاجِعُ
تَابَعَهُ عُقَيْلٌ. وَقَالَ الزُّبَيْدِيُّ: أَخْبَرَنِي الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَعِيدٍ وَالأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ[1].

**١١٥٥- هەیسەمی کوڕی ئەبو سینان گوێی لێبوو ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە کاتێکدا ئامۆژگارییەکی خۆی باس دەکرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((برایەکتان (مەبەستی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە بوو) کە قسەی هیچ و پووچ ناکات)) وتوویەتی:**

**پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێوماندایە لەگەڵ شەبەقی بەرەبەیاندا (پێش نوێژیمان بۆ دەکات)، قورئانمان بۆ دەخوێنێ کە نامەی خودایە، لە پاش کوێری بەرچاوڕوونی نیشاندایِن، جا بەدڵ باوەڕی پتەومان هێنا ئەوەی فەرموویەتی ڕاستەو دێتەدی، کاتێ بتپەرستان لەناو نوێنەکانیاندا خەوتوون، شەو بەشەونوێژ بەسەر دەبات و توخنی نێو جێگاو نوێن ناکەوێ.**

**عوقەیل لەڕێگەی خۆیەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوەو پاڵپشتی فەرموودەکەی یونسی کوڕی یەزید دەکات، زوبەیدی دەڵێ: زوهری بۆی گێڕامەوە لە سەعیدو ئەعرەجەوە هەردووکیان لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە، جا هەمان فەرموودەی پێشوو دێنێ.**

١١٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ كَأَنَّ بِيَدِي قِطْعَةَ إِسْتَبْرَقٍ، فَكَأَنِّي لاَ أُرِيدُ مَكَانًا مِنَ الجَنَّةِ إِلاَّ طَارَتْ إِلَيْهِ، وَرَأَيْتُ كَأَنَّ اثْنَيْنِ أَتَيَانِي أَرَادَا أَنْ يَذْهَبَا بِي إِلَى النَّارِ فَتَلَقَّاهُمَا مَلَكٌ فَقَالَ: لَمْ تُرَعْ، خَلِّيَا عَنْهُ[2].

---

[1] بروانە: ٦١٥١.

[2] بروانە: ٤٤٠.

**١١٥٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خەوم بینی لە خەومدا پارچەیەك ئاوریشمم بەدەستەوە بوو، جا حەزم لە هەر شوێنێك بووایە لە بەهەشت، (پارچەکە) منی لەگەڵ خۆی بەفڕین دەبردە ئەو شوێنەوە، لەو خەوەدا بینیم دوو فریشتە هاتن بۆ لام و ویستیان بمبەن بۆ نێو ئاگری دۆزەخ، ئینجا فریشتەیەکی تر بەوان گەشت و پێی وتم: مەترسە، (بەدوو فریشتەکەی وت:) وازی لێ بێنن.**

١١٥٧- فَقَصَّتْ حَفْصَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ إِحْدَى رُؤْيَايَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ». فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ[1].

**١١٥٧- ئینجا حەفصە ﷺ یەکێك لە خەوەکان کە من بینیبووم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((عەبدوڵا ﷺ باشترین پیاوبوو، ئەگەر شەونوێژی بکردایە)) نافیع دەڵێ: ئینجا لەوەدوا عەبدوڵا بەردەوام شەونوێژی دەکرد (کەمێك نەبووایە نەدەخەوت).**

١١٥٨- وَكَانُوا لاَ يَزَالُونَ يَقُصُّونَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ الرُّؤْيَا أَنَّهَا فِي اللَّيْلَةِ السَّابِعَةِ مِنَ العَشْرِ الأَوَاخِرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَتْ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ، فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيهَا فَلْيَتَحَرَّهَا مِنَ العَشْرِ الأَوَاخِرِ»[2].

**١١٥٨- جا هاوەڵان بەردەوام خەونەکانیان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەگێڕایەوە کە شەوی قەدر لە شەوی حەوتەمی دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندایە، پێغەمبەریش**

[1] بروانە: ١١٢٢.

[2] بروانە: ٢٠١٥، ٦٩٩١.

ﷺ فەرمووی: ((وا دەبینم خەوبینینی هەمووتان لە دە شەوی کۆتاییدا یەکی گرتۆتەوە، بۆیە هەر کەس بەشوێن شەوی قەدردا دەگەڕێ، با لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا بە شوێنیدا بگەڕێ)).

## ٢٢- بابُ الْمُدَاوَمَةِ عَلَى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ

١١٥٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ -هُوَ ابْنُ أَبِي أَيُّوبَ- قَالَ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الْعِشَاءَ، ثُمَّ صَلَّى ثَمَانَ رَكَعَاتٍ، وَرَكْعَتَيْنِ جَالِسًا، وَرَكْعَتَيْنِ بَيْنَ النِّدَاءَيْنِ، وَلَمْ يَكُنْ يَدَعُهُمَا أَبَدًا[1].

## ٢٢- باسی بەردەوام بوون لەسەر دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی

١١٥٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی عیشای کرد، پاشان هەشت ڕکات (شەونوێژ)ی کرد، دوو ڕکاتیشی بە دانیشتنەوە کرد، دوو ڕکاتیشی کرد لە نێوان بانگ و قامەتدا، کە هەرگیز وازی لەو دوو ڕکاتە (سوننەتی پێش بەیانی) نەدەهێنا.

## ٢٣- بابُ الضِّجْعَةِ عَلَى الشِّقِّ الْأَيْمَنِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ

١١٦٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الْأَسْوَدِ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ[1].

---

[1] بروانە: ٦١٩.

## ٢٣- باسی ڕاکشان لەسەر لای ڕاست دوای کردنی دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی

١١٦٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە کە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا.

## ٢٤- بَابُ مَنْ تَحَدَّثَ بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ وَلَمْ يَضْطَجِعْ

١١٦١- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الحَكَمِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمٌ أَبُو النَّضْرِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا صَلَّى فَإِنْ كُنْتُ مُسْتَيْقِظَةً حَدَّثَنِي، وَإِلاَّ اضْطَجَعَ حَتَّى يُؤْذَنَ بِالصَّلاَةِ[٢].

## ٢٤- باسی کەسێک پاش دوو ڕکاتە سوننەتەکە(ی پێش نوێژی بەیانی) قسە بکات و ڕانەکشێ

١١٦١- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە سوننەتی نوێژی بەیانی دەکرد، ئەگەر من بەخەبەر بوومایە قسەی لەگەڵ دەکردم، ئەگەرنا ڕادەکشا هەتا بانگی بەیانی دەدرا.

## ٢٥- بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّطَوُّعِ مَثْنَى مَثْنَى

وَيُذْكَرُ ذَلِكَ عَنْ عَمَّارٍ وَأَبِي ذَرٍّ وَأَنَسٍ وَجَابِرِ بْنِ زَيْدٍ وَعِكْرِمَةَ وَالزُّهْرِيِّ. وَقَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ: مَا أَدْرَكْتُ فُقَهَاءَ أَرْضِنَا إِلَّا يُسَلِّمُونَ فِي كُلِّ اثْنَتَيْنِ مِنَ صلاة النَّهَارِ.

---

[١] بڕوانە: ٦١٩.

[٢] بڕوانە: ٦١٩.

١١٦٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي المَوَالِي، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ المُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا الاِسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ، كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ القُرْآنِ يَقُولُ: «إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ العَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلاَّمُ الغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي -أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ- فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي -أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ- فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي -قَالَ: - وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ»[1].

## ٢٥- باسی نوێژی سوننەت دوو ڕكات دوو ڕكات سوننەته

**ئەم ڕایە گێڕدراوەتەوە لە عەممارو ئەبو زەڕو ئەنەس و جابیری کوڕی زەید و عیکریمە و زوهریەوە ﷺ. وە یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری دەڵێ: ئەوەی من پێی گەیشتووم لە شەرع زانانی وڵاتەکەم، لە هەموو دوو ڕکاتێکی سوننەتی ڕۆژدا سەلامیان دەدایەوە.**

**١١٦٢- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری ئیستیخارەی[2] دەکردین لە هەموو ئیش و کارێکدا، وەك چۆن فێری سووڕەتێك لە قوڕئانی دەکردین، دەیفەرموو: ((ئەگەر کەسێکتان نیازی کارێکی هەبوو، ئەوە با دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکات، پاشان بڵێ: خوایە! داوات لێ دەکەم چاکەو خێرم نیشان بدە بە زانیاری خۆت، داوای توانات لێ دەکەم بە توانای**

---

[1] بروانە: ٦٣٨٢، ٧٣٩٠.

[2] ئیستیخارە: واتە: شتێکە دوو باری هەیە، داوا بکەیت خێر و چاکە لەکامیاندایە، خوا ئەوەیانت بۆ بکات.

**خۆت، داوای چاکەت لێ دەکەم لە بەهرەی گەورەت، چونکە بە ڕاستی تۆ بە توانایت و من هیچ توانام نییە، تۆ هەموو شتێك دەزانی و من نازانم، تۆ زانایت بە هەموو شتە پەنهانەکان، خودایە ئەگەر دەزانی ئەم کارە چاکە بۆ ئایین و ژیان و دواڕۆژم -یان وتی: بۆ دونیا و دواڕۆژم-، ئەوە لە چارەمی بنووسە و بۆم ئاسان بکە، پاشان فەڕ و بەرەکەتی تێبخە بۆم، وە ئەگەر دەزانی ئەم کارە خراپە بۆ ئایین و ژیانم و دواڕۆژم -یان وتی: بۆ دونیا و دواڕۆژم-، ئەوە لایدە لێم و دوورم بخەوە لێی، وە خەیرو چاکە لە چارەم بنووسە لە هەر کوێیەك هەیە، پاشان ڕازیم بکە پێی)- فەرمووی:- ((ناوی کارەکەی بێنێ لە کاتی دوعاکەیدا)).**

١١٦٣- حَدَّثَنَا المَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ، سَمِعَ أَبَا قَتَادَةَ بْنَ رِبْعِيٍّ الأَنْصَارِيَّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلاَ يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ»[١].

**١١٦٣- ئەبو قەتادەی کوڕی ڕیبعی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان ڕۆیشتە مزگەوتەوە، ئەوە با دانەنیشێ تا دوو ڕکات نوێژ دەکات)).**

١١٦٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ[٢].

**١١٦٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات پێشنوێژی بۆ کردین، پاشان گەڕایەوە (بۆ ماڵی خۆیان).**

---

[١] بڕوانە: ٤٤٤.

[٢] بڕوانە: ٣٨٠.

**١١٦٥-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الجُمُعَةِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ المَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ[1].

**١١٦٥- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ لە پێش نوێژی نیوەڕۆدا دوو ڕکات نوێژی سوننەتم کرد، لەپاش نیوەڕۆش دوو ڕکاتم کرد، وە لە پاش نوێژی هەینی دوو ڕکاتم کرد، وە لە پاش نوێژی ئێوارەش دوو ڕکاتم کرد، وە لە پاش عیشاش دوو ڕکاتم کرد.**

**١١٦٦-** حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ -أَوْ قَدْ خَرَجَ- فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ»[2].

**١١٦٦- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان هات بۆ مزگەوت لەوکاتەدا ئیمام وتاری دەدا -یان ئیمام ڕۆیشتبووە سەر دوانگە-، ئەوە با دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکات)).**

**١١٦٧-** حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سَيْفُ بْنُ سُلَيْمَانَ المَكِّيُّ، سَمِعْتُ مُجَاهِدًا يَقُولُ: أُتِيَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ فِي مَنْزِلِهِ، فَقِيلَ لَهُ: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدْ دَخَلَ الكَعْبَةَ. قَالَ: فَأَقْبَلْتُ فَأَجِدُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ خَرَجَ، وَأَجِدُ بِلاَلًا عِنْدَ البَابِ قَائِمًا، فَقُلْتُ: يَا بِلاَلُ، صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الكَعْبَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ فَأَيْنَ؟ قَالَ: بَيْنَ هَاتَيْنِ الأُسْطُوَانَتَيْنِ. ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ فِي

---

[1] بروانە: ٩٣٧.

[2] بروانە: ٩٣٠.

وَجْهِ الكَعْبَةِ[1]. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: أَوْصَانِي النَّبِيُّ ﷺ بِرَكْعَتَيِ الضُّحَى[2]. وَقَالَ عِتْبَانُ: غَدَا عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ ﷺ بَعْدَ مَا امْتَدَّ النَّهَارُ، وَصَفَفْنَا وَرَاءَهُ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ[3].

**١١٦٧- موجاهید دەڵێ: هەواڵ هێنرا بۆ عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە ماڵی خۆیداو پێی وترا: ئەوە پێغەمبەری خوایە چووە نێو کەعبە، (عەبدوڵاش) وتی: منیش ڕۆیشتم، لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوەو بیلالم دی لەلای دەرگاکەی کەعبە وەستابوو، وتم: ئەی بیلال ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەعبەدا نوێژی کرد؟ وتی: بەڵێ، وتم: لە کوێدا؟ وتی: لە نێوان ئەو دوو کۆڵەکەیە، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە لە کەعبەو ڕوو بەکەعبە دوو ڕکات نوێژی کرد، ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری کردم بە کردنی دوو ڕکات سوننەتی چێشتەنگاو. وە عیتبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺو ئەبو بەکر ﷺ سەر لەبەیانییەك هاتن بۆ لام دوای ئەوەی خۆر بەرزبوو بوویەوە، ئێمەش دوای پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیز بووین و دوو ڕکات پێشنوێژی بۆ کردین.**

## ٢٦- بَابُ الحَدِيثِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ

**١١٦٨-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ: أَبُو النَّضْرِ حدَّثنِي أبي، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، فَإِنْ كُنْتُ مُسْتَيْقِظَةً حَدَّثَنِي وَإِلاَّ اضْطَجَعَ. قُلْتُ لِسُفْيَانَ: فَإِنَّ بَعْضَهُمْ يَرْوِيهِ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ. قَالَ سُفْيَانُ: هُوَ ذَاكَ[1].

---

[1] بروانە: ٣٩٧.

[2] بروانە: ١٩٨١.

[3] بروانە: ١١٨٦.

## ٢٦- باسی قسەکردن پاش دوو ڕکات سوننەتەکەی پێش بەیانی

١١٦٨- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتە سوننەتەکەی (پێش نوێژی بەیانی) دەکرد، جا ئەگەر من بەخەربوومایە قسەی دەکرد لەگەڵمدا، ئەگەرنا ڕادەکشا، (عەلی کوڕی عەبدوڵای مەدینی دەڵێ:) بە سوفیانم[٢] وت: هەندێ لە ڕاوییەکان بە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی (پێش نوێژی) بەیانی دەیگێڕنەوە؟ سوفیان وتی: هەروایە و ڕاستە.

## ٢٧- بابُ تَعَاهُدِ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ وَمَنْ سَمَّاهُمَا تَطَوُّعًا

١١٦٩- حَدَّثَنَا بَيَانُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُدًا عَلَى رَكْعَتَيِ الفَجْرِ[٣].

## ٢٧- باسی چاودێری و لەبیرنەکردنی دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی، وە ئەوەی بە سوننەت ناوی بردووە

١١٦٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر هیچ کام لە نوێژە سوننەتەکان وەك دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی بەردەوام لەبەرچاوگرتنی نەبووە[٤].

---

[١] بڕوانە: ٦١٩.

[٢] عەلی و سوفیان هەردووکیان گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیەن.

[٣] بڕوانە: ٦١٩، ١١١٩.

[٤] واتە: بەردەوام دەیکرد و بەهیچ جۆر وازی لێ نەدەهێنا.

## ٢٨- بَابُ مَا يُقْرَأُ فِي رَكْعَتَيِ الفَجْرِ؟

١١٧٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ يُصَلِّي إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ بِالصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ[1].

## ٢٨- باسی لە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش بەیانیدا چی دەخوێنرێ؟

**١١٧٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا سیازدە ڕکات نوێژی (سوننەتی) دەکرد، کاتێکیش گوێی لە بانگی نوێژی بەیانی دەبوو، ئینجا دوو ڕکاتی سوکەڵەی دەکرد.**

١١٧١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَمَّتِهِ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ ح[2]. وَحَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى -هُوَ ابْنُ سَعِيدٍ- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُخَفِّفُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ، حَتَّى إِنِّي لَأَقُولُ: هَلْ قَرَأَ بِأُمِّ الكِتَابِ؟![3].

**١١٧١- عائیشە ﵂ دەڵێ: هەمیشە پێغەمبەر ﷺ ئەو دوو ڕکات سوننەتەی پێش نوێژی بەیانی ئەوەندە بە کورتی دەکرد، هەتا من دەمووت: ئایا سوورەتی فاتیحەی تێدا خوێند؟**

---

[1] بڕوانە: ١١١٩.

[2] ئیمام بوخاری ئەم فەرموودەیەی بە دوو ڕشتە و سەنەد لە عائیشەوە ﵂ گێڕاوەتەوە.

[3] بڕوانە: ٦١٩.

## ٢٩- بَابُ التَّطَوُّعِ بَعْدَ المَكْتُوبَةِ

**١١٧٢-** حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا نَافِعٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ المَغْرِبِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ الجُمُعَةِ، فَأَمَّا المَغْرِبُ وَالعِشَاءُ فَفِي بَيْتِهِ. قَالَ ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ: بَعْدَ العِشَاءِ فِي أَهْلِهِ. تَابَعَهُ كَثِيرُ بْنُ فَرْقَدٍ وَأَيُّوبُ عَنْ نَافِعٍ[1].

## ٢٩- باسی نوێژی سوننەت کردن لەپاش نوێژە فەڕزەکان

**١١٧٢- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دوو ڕکاتی سوننەتم کرد لە پێش نوێژی نیوەڕۆدا، دوو ڕکاتیش لەپاش نیوەڕۆ، وە دوو ڕکات لە پاش نوێژی مەغریب، دوو ڕکاتیش لە پاش نوێژی عیشا، وە دوو ڕکات لە پاش نوێژی هەینی، بەڵام دوو ڕکاتەکەی پاش مەغریب و عیشا لەماڵەوە کردی، ئیبنو ئەبی زەناد لە مووسای کوڕی عوقبەوە لە نافیعەوە بەم شێوە گێڕاویەتیەوەو، وتی: دوو ڕکاتی کرد لە پاش عیشا لە ماڵەوە لەنێو خاو خێزانیدا، هەریەك لە کەسیری کوڕی فەرقەدو ئەیووب لە نافیعەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، کە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عوبەیدوڵا دەکەن.**

**١١٧٣-** وَحَدَّثَتْنِي أُخْتِي حَفْصَةُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي سَجْدَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ بَعْدَ مَا يَطْلُعُ الفَجْرُ، وَكَانَتْ سَاعَةً لاَ أَدْخُلُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِيهَا. تَابَعَهُ كَثِيرُ بْنُ فَرْقَدٍ وَأَيُّوبُ، عَنْ نَافِعٍ. وَقَالَ ابْنُ أَبِي الزِّنَاد، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ: بَعْدَ العِشَاءِ فِي أَهْلِهِ[2].

---

[1] بڕوانە: ٩٣٧.

[2] بڕوانە: ٦١٨.

**١١٧٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: حەفصەی خوشکم ﷺ بۆی گێڕامەوە: کە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی سپێدە هەڵدەهات[١]، دوو ڕکات نوێژی (سوننەتی) کورتی دەکرد، ئەو کاتە کاتێك بوو کە من نەدەڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ. کەسیری کوڕی فەرقەدو ئەیووب ئەم فەرموودەیان لە نافیعەوە گێڕاوەتەوە، کە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عوبەیدوڵا دەکەن. وە ئیبنو ئەبی زیناد لە مووسای کوڕی عوقبەو ئەویش لە نافیعەوە بەشێکی فەرموودەکەی پێشووی بەم شێوە گێڕاوەتەوە: (((دوو ڕکاتی دەکرد) لە پاش عیشا لەنێو ماڵ و منداڵیدا))، ئەم بەشە کەسیری کوڕی فەرقەدو ئەیووب لە نافیعەوە گێڕاویانەتەوە، کە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئیبنو ئەبی زیناد دەکات.**

## ٣٠- بابُ مَنْ لَمْ يَتَطَوَّعْ بَعْدَ المَكْتُوبَةِ

**١١٧٤-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الشَّعْثَاءِ جَابِرًا قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَمَانِيًا جَمِيعًا، وَسَبْعًا جَمِيعًا. قُلْتُ: يَا أَبَا الشَّعْثَاءِ، أَظُنُّهُ أَخَّرَ الظُّهْرَ وَعَجَّلَ العَصْرَ، وَعَجَّلَ العِشَاءَ وَأَخَّرَ المَغْرِبَ. قَالَ: وَأَنَا أَظُنُّهُ[٢].

## ٣٠- باسی ئەو کەسەی لە پاش نوێژە فەڕزەکان سوننەتی نەکردووە

**١١٧٤- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەشت ڕکات و حەوت ڕکات نوێژم کرد بە کۆکراوەیی پێکەوە[٣]، (سوفیان دەڵێ) وتم بە**

---

[١] نوێژی بەیانی دەبوو.

[٢] بڕوانە: ٥٤٣.

[٣] نوێژی مەغریب وعیشای کۆکردۆتەوە.

ئەبو شەعسا: وا گومان دەبەم نوێژی نیوەڕۆی دواخستووە[١] و نوێژی عەسری پێشخستووە[٢]، وە نوێژی عیشای پێشخستووەو نوێژی مەغریبی دواخستووە، ئەبو شەعساش وتی: منیش وا گومان دەبەم (کە وای کردبێ وەك تۆ دەڵێت).

## ٣١- بَابُ صَلَاةِ الضُّحَى فِي السَّفَرِ

١١٧٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ تَوْبَةَ، عَنْ مُوَرِّقٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ ﵄: أَتُصَلِّي الضُّحَى؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: فَعُمَرُ؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: فَأَبُو بَكْرٍ؟ قَالَ لاَ. قُلْتُ فَالنَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: لاَ إِخَالُهُ[٣].

## ٣١- باسی نوێژی چێشتەنگاو کردن لە سەفەردا

١١٧٥- مووەریق دەڵێ: بە عەبدوڵای کوڕی عومەرم ﵄ وت: ئایا نوێژی چێشتەنگاو دەکەیت؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەی عومەر کردوویەتی؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەی ئەبو بەکر؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەی پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی؟ وتی: گومان نابەم کردبێتی.

١١٧٦- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى يَقُولُ: مَا حَدَّثَنَا أَحَدٌ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى غَيْرَ أُمِّ هَانِئٍ، فَإِنَّهَا قَالَتْ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ بَيْتَهَا يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ فَاغْتَسَلَ وَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ فَلَمْ أَرَ صَلاَةً قَطُّ أَخَفَّ مِنْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ[٤].

---

[١] بۆ کۆتایی کاتەکەی تا بگاتە سەرەتای کاتی نوێژی عەسر.

[٢] عەسری پێش خستووە بۆ سەرەتای کاتەکەی، تا پێکەوە لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆدا بیانکات.

[٣] بڕوانە: ٧٧.

[٤] بڕوانە: ١١٠٣.

١١٧٦- ئیبنو ئەبی لەیلا دەڵێ: کەس بۆی نەگێڕاوینەتەوە کە پێغەمبەری ﷺ بینیبێ نوێژی چێشتەنگاوی کردبێ (لە سەفەردا) جگە لە ئوممو هانی، کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککە ڕۆیشتە ماڵی ئەو (ئوممو هانی)و خۆی شۆرد و هەشت ڕکات نوێژی کرد، کە نەمدیوە هیچ نوێژێکی کردبێ ئەوەندەی ئەو نوێژانە کورت کردبێتی، بەڵام ئەوەندە هەبوو کڕنووش و سوژدەکانی بەچاکی و تەواو دەبرد.

## ٣٢- بَابُ مَنْ لَمْ يُصَلِّ الضُّحَى وَرَآهُ وَاسِعًا

١١٧٧- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَبَّحَ سُبْحَةَ الضُّحَى، وَإِنِّي لأُسَبِّحُهَا[١].

## ٣٢- باسی ئەو کەسەی نوێژی چێشتەنگاوی نەکردووە و ڕای وایە دروستە بکرێ

١١٧٧- عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیووە نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کردبێ، بەڵام من دەیکەم.

## ٣٣- بابُ صَلَاةِ الضُّحَى فِي الحَضَرِ

قَالَهُ عِتْبَانُ بْنُ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١١٧٨- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ الجُرَيْرِيُّ -هُوَ ابْنُ فَرُّوخَ- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاثٍ لاَ أَدَعُهُنَّ حَتَّى أَمُوتَ: صَوْمِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَصَلَاةِ الضُّحَى، وَنَوْمٍ عَلَى وِتْرٍ[١].

---

[١] بڕوانە: ١١٢٨.

## ٣٣- باسی نوێژی چێشتەنگاوكردن لە شار و ئاوەدانیدا

**عیتبانی كوڕی مالیك ﷺ وتویەتی و لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە نوێژی چێشتەنگاوی لە شارو ئاوەدانیدا كردووە[٢].**

**١١٧٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری كردم بە سێ شت، كە وازیان لێ نەهێنم هەتا دەمرم: سێ ڕۆژ ڕۆژووگرتن لە هەموو مانگێكدا، نوێژی چێشتەنگاو، خەوتن دوای ئەنجامدانی (نوێژی) ویتر.**

١١٧٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الجَعْدِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ الأَنْصَارِيَّ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ -وَكَانَ ضَخْمًا- لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنِّي لاَ أَسْتَطِيعُ الصَّلاَةَ مَعَكَ. فَصَنَعَ لِلنَّبِيِّ ﷺ طَعَامًا، فَدَعَاهُ إِلَى بَيْتِهِ، وَنَضَحَ لَهُ طَرَفَ حَصِيرٍ بِمَاءٍ، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَكْعَتَيْنِ. وَقَالَ فُلاَنُ بْنُ فُلاَنِ بْنِ جَارُودٍ لأَنَسٍ ﷺ: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى؟ فَقَالَ: مَا رَأَيْتُهُ صَلَّى غَيْرَ ذَلِكَ اليَوْمِ[٣].

**١١٧٩- ئەنەسی كوڕی مالیكی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پیاوێكی ئەنصاری -كە لاشەی گەورەو قورس بوو- بە پێغەمبەری ﷺ وت: من ناتوانم لەگەڵت بە جەماعەت نوێژ بكەم! بۆیە نان و خواردنێكی دروست كرد بۆ پێغەمبەر ﷺو دەعوەتی كرد بۆماڵەوە، (پێغەمبەریش ﷺ ڕۆشت بۆ ماڵیان) ئاوی پرژاند لەلایەكی حەسیرێك بۆی، پێغەمبەریش ﷺ دوو ڕكات نوێژی لەسەر كرد، فلانی كوڕی فلانی كوڕی جاروود بە ئەنەسی وت: ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەكرد؟ ئەنەس وتی: جگە لەو ڕۆژە نەمدیوە نوێژی چێشتەنگاوی كردبێت.**

---

[١] بڕوانە: ١٩٨١.

[٢] ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی ئەودا نوێژی چێشتەنگاوی كردوە، ئەوانیش لە دوایەوە وەستان و بە كۆمەڵ نوێژیان كرد لە دوایەوە.

[٣] بڕوانە: ٦٧٠.

## ٣٤- بابٌ: الرَّكْعَتَانِ قَبْلَ الظُّهْرِ

١١٨٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: حَفِظْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ عَشْرَ رَكَعَاتٍ: رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ المَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَكَانَتْ سَاعَةً لاَ يُدْخَلُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِيهَا[1].

## ٣٤- باسێک: دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نیوەڕۆ

**١١٨٠- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: دە ڕکات نوێژی سوننەتم لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرتووەو لەبەرکردووە: دوو ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕکاتیش لە دوایەوە، وە دوو ڕکات لە پاش نوێژی مەغریب لە ماڵی خۆیان دەیکرد، وە دوو ڕکات لە پاش نوێژی عیشا لە ماڵی خۆیان دەیکرد، هەروەها دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، کە کاتێك بوو تێیدا کەس نەدەچووە لای پێغەمبەر ﷺ.**

١١٨١- حَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ أَنَّهُ كَانَ إِذَا أَذَّنَ المُؤَذِّنُ وَطَلَعَ الفَجْرُ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ[2].

**١١٨١- (عەبدوڵا دەڵێ:) حەفصە ﵂ بۆی گێڕامەوە: هەمیشە کاتێ بانگبێژەکە بانگی دەداو سپێدە هەڵدەهات (نوێژی بەیانی دەبوو)، پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات نوێژی (سوننەتی) دەکرد.**

---

[1] بڕوانە: ٩٣٧.

[2] بڕوانە: ٦١٨.

١١٨٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْتَشِرِ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لاَ يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الغَدَاةِ. تَابَعَهُ ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ وَعَمْرٌو عَنْ شُعْبَةَ.

**١١٨٢- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەر ﷺ چوار ڕكات نوێژى (سوننەتى) پێش نوێژى نیوەڕۆ و دوو ڕكاتى پێش نوێژى بەیانى واز لێ نەدەهێنا، ئیبنو ئەبى عەدى و عەمر لە شوعبەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوەو پاڵپشتى گێڕانەوەكەى یەحیا دەكەن، كە فەرموودەكەى پێشووى گێڕاوەتەوە.**

## ٣٥- بابُ الصَّلاَةِ قَبْلَ المَغْرِبِ

١١٨٣- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، عَنِ الحُسَيْنِ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ المُزَنِيُّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلُّوا قَبْلَ صَلاَةِ المَغْرِبِ». قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: «لِمَنْ شَاءَ». كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً[1].

## ٣٥- باسى نوێژى سوننەت پێش نوێژى مەغریب

**١١٨٣- عەبدوڵاى موزەنى ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە فەرموویەتى: ((پێش نوێژى مەغریب نوێژ (ى سوننەت) بكەن)) لە جارى سێیەمدا فەرمووى: ((بۆ كەسێك ویستى (سوننەت بكات) )) لە ترسى ئەوەى نەوەك خەڵك بیكەنە سوننەتێك (و بەردەوام بن لەسەرى).**

١١٨٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ أَبِي حَبِيبٍ قَالَ: سَمِعْتُ مَرْثَدَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ اليَزَنِيَّ قَالَ: أَتَيْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الجُهَنِيَّ فَقُلْتُ: أَلاَ

[1] بڕوانە: ٧٣٦٨.

أُعْجِبُكَ مِنْ أَبِي تَمِيمٍ، يَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ المَغْرِبِ. فَقَالَ عُقْبَةُ: إِنَّا كُنَّا نَفْعَلُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. قُلْتُ: فَمَا يَمْنَعُكَ الآنَ؟ قَالَ: الشُّغْلُ.

**١١٨٤- مەرسەدی کوڕی عەبدوڵای یەزەنیی دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی و وتم: ئایا ئەو کارەی ئەبی تەمیمت لا سەیر نییە؟ پێش نوێژی مەغریب دوو ڕکات نوێژ دەکات؟ عوقبەش وتی: بێگومان ئێمە ئەو نوێژەمان دەکرد لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، وتم: ئەی ئێستا چی ڕێگریت دەکات (لە کردنی)؟ وتی: سەرقاڵی.**

## ٣٦- بابُ صَلاَةِ النَّوَافِلِ جَمَاعَةً

ذَكَرَهُ أَنَسٌ وَعَائِشَةُ #، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١١٨٥- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ الأَنْصَارِيُّ أَنَّهُ عَقَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَعَقَلَ مَجَّةً مَجَّهَا فِي وَجْهِهِ مِنْ بِئْرٍ كَانَتْ فِي دَارِهِمْ[1].

## ٣٦- باسی کردنی نوێژە سوننەتەکان بەکۆمەڵ

**ئەنەس و عائیشە ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە نوێژی سوننەتی بەکۆمەڵ کردووە لەگەڵ مسوڵمانانداا.**

**١١٨٥- مەحمودی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری ﵁ دەڵێ: کە پێغەمبەری خوای ﷺ لە بیرە، هەروەها لە بیری دێت پێغەمبەر ﷺ دەمی پڕ ئاو کرد لە ئاوی بیرێك کە لە ماڵیاندا بوو، پرژاندی بە دەم و چاویدا[1].**

---

[1] بڕوانە: ٧٧.

١١٨٦- فَزَعَمَ مَحْمُودٌ أَنَّهُ سَمِعَ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ الأَنْصَارِيَّ ﷺ وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كُنْتُ أُصَلِّي لِقَوْمِي بِبَنِي سَالِمٍ، وَكَانَ يَحُولُ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ وَادٍ إِذَا جَاءَتِ الأَمْطَارُ، فَيَشُقُّ عَلَيَّ اجْتِيَازُهُ قِبَلَ مَسْجِدِهِمْ، فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ لَهُ: إِنِّي أَنْكَرْتُ بَصَرِي، وَإِنَّ الوَادِيَ الذِي بَيْنِي وَبَيْنَ قَوْمِي يَسِيلُ إِذَا جَاءَتِ الأَمْطَارُ، فَيَشُقُّ عَلَيَّ اجْتِيَازُهُ، فَوَدِدْتُ أَنَّكَ تَأْتِي فَتُصَلِّي مِنْ بَيْتِي مَكَانًا أَتَّخِذُهُ مُصَلًّى. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَأَفْعَلُ». فَغَدَا عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ ﷺ بَعْدَ مَا اشْتَدَّ النَّهَارُ فَاسْتَأْذَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَذِنْتُ لَهُ، فَلَمْ يَجْلِسْ حَتَّى قَالَ: «أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ مِنْ بَيْتِكَ؟». فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى المَكَانِ الذِي أُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ فِيهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَكَبَّرَ وَصَفَفْنَا وَرَاءَهُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ وَسَلَّمْنَا حِينَ سَلَّمَ، فَحَبَسْتُهُ عَلَى خَزِيرٍ يُصْنَعُ لَهُ، فَسَمِعَ أَهْلُ الدَّارِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِي، فَثَابَ رِجَالٌ مِنْهُمْ حَتَّى كَثُرَ الرِّجَالُ فِي البَيْتِ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْهُم: مَا فَعَلَ مَالِكٌ؟ لاَ أَرَاهُ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: ذَاكَ مُنَافِقٌ، لاَ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَقُلْ ذَاكَ، أَلاَ تَرَاهُ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ؟». فَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. أَمَّا نَحْنُ فَوَاللَّهِ لاَ نَرَى وُدَّهُ وَلاَ حَدِيثَهُ إِلاَّ إِلَى المُنَافِقِينَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ». قَالَ مَحْمُودٌ: فَحَدَّثْتُهَا قَوْمًا فِيهِمْ أَبُو أَيُّوبَ، صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَتِهِ التِي تُوُفِّيَ فِيهَا، وَيَزِيدُ بْنُ مُعَاوِيَةَ عَلَيْهِمْ بِأَرْضِ الرُّومِ، فَأَنْكَرَهَا عَلَيَّ أَبُو أَيُّوبَ قَالَ: وَاللَّهِ مَا أَظُنُّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ مَا قُلْتَ قَطُّ. فَكَبُرَ ذَلِكَ عَلَيَّ، فَجَعَلْتُ لِلَّهِ عَلَيَّ إِنْ سَلَّمَنِي حَتَّى أَقْفُلَ مِنْ غَزْوَتِي، أَنْ أَسْأَلَ عَنْهَا عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ إِنْ وَجَدْتُهُ حَيًّا فِي مَسْجِدِ قَوْمِهِ، فَقَفَلْتُ فَأَهْلَلْتُ بِحَجَّةٍ -أَوْ بِعُمْرَةٍ-، ثُمَّ سِرْتُ حَتَّى قَدِمْتُ المَدِينَةَ فَأَتَيْتُ بَنِي سَالِمٍ، فَإِذَا عِتْبَانُ شَيْخٌ أَعْمَى يُصَلِّي لِقَوْمِهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ مِنَ الصَّلاَةِ سَلَّمْتُ عَلَيْهِ وَأَخْبَرْتُهُ مَنْ أَنَا، ثُمَّ سَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ الحَدِيثِ، فَحَدَّثَنِيهِ كَمَا حَدَّثَنِيهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ[٢].

---

[١] ئەم کارەی پێغەمبەری خودا ﷺ وەک سوعبەت بووە لەگەڵیدا بۆ دڵخۆشکردنی دایک و باوکی، وە بۆ ڕێزگرتن لە ڕەبیع.

[٢] بڕوانە: ٤٢٤.

**١١٨٦- مەحمود ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە عیتبانی کوڕی مالیکی ئەنصاڕی ﷺ بیستووە کە لەو کەسانە بوو ئامادەی جەنگی بەدر بوو لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەیوت: من پێشنوێژیم دەکرد بۆ هۆزەکەم کە بەنو سالیمن، ئەگەر باران بباریایە لە نێوان من و ئەواندا شیوێك هەبوو ڕێگر بوو، بۆ من سەخت بوو لێی بپەڕمەوە بۆ مزگەوتەکەیان، بۆیە ڕۆیشتمە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ و پێم وت: بینینی چاوم خراپ بووە، ئەو شیوەش لە نێوان من و هۆزەکەمدایە، کە باران باری لافاوی لێ هەڵدەسێت، ئیتر پەڕینەوە بۆ من نارەحەتە، بۆیە ئاواتەخواز بووم کە جەنابت تەشریفت بهێنایەو لە جێگایەکی ماڵەکەمدا نوێژت بکردایە، بمکردایە بەشوێن نوێژ، دەڵێ پێغەمبەری خواش فەرمووی: ((بە زوویی ئەو کارە دەکەم))، عیتبان دەڵێ: کاتێ خۆر بەرزبوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر هاتن بۆ لام، جا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست، منیش مۆڵەتم دا، دانەنیشت هەتا فەرمووی: ((حەزدەکەیت لە چ جێگایەکی ماڵەکەتدا نوێژ بکەم؟))، منیش ئاماژەم بۆ ئەو جێگایە کرد کە پێم خۆش بوو نوێژی تێدا بکات، پێغەمبەری خواش ﷺ هەستاو ئەڵاهو ئەکبەری کرد، ئێمەش لەدوایەوە ڕیز بووین، ئینجا دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان سەلامی دایەوە، ئێمەش سەلاممان دایەوە کە ئەو سەلامی دایەوە، جا هێشتمانەوە بۆ (خواردنی) خواردنێك[1] کە بۆی دروست کرابوو، وە خەڵکی گەڕەکەکە[2] زانیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی منە، ئیتر چەند پیاوێکیان هاتن (ئەوەندە زۆر بوون) ماڵمان پڕ بوو لە پیاو، پیاوێکیان وتی: مالیك چی ئەکات؟ نایبینم.**

---

[1] خَزِير: خواردنێکە لە گۆشت و ئارد دروست دەکرێت. بڕوانە: إرشاد الساري: ٢٣٨/٣.

[2] قەستەلانی دەڵێ: (أهلُ الدار) أي: أَهلُ المحلة. واتە: (أهل الدار) بە واتای خەڵکی گەڕەکەکە. إرشاد الساري: ٢٣٨/٣.

پیاوێکیان وتی: ئەو (مالیك) دووڕووە خواو پێغەمبەرەکەی خۆش ناوێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((قسەی وا مەکە ئایا نابینی دەڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) مەبەستیشی پێی ڕەزامەنی خوایە؟!)) پیاوەکە وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، بەڵام سوێند بەخوا ئێمە دەبینین هەموو دڵسۆزی و قسەی بۆ بەرژەوەندی ناپاکانە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا ئەوەی بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) قەدەغەی دەکات لەچوونە دۆزەخ، کە مەبەست (لەو گوتنەوە)ی ڕەزامەندی خوا بێت))، مەحمود دەڵێ: ئەو باسەم بۆ کۆمەڵێك گێڕایەوە کە ئەبو ئەیووبی هاوەڵی پێغەمبەری خوای ﷺ تێدابوو، لەو غەزایەی ئەبو ئەیووب وەفاتی کرد تێیدا، وە یەزیدی کوڕی مەعاویە سەرکردەیان بوو لە خاکی ڕۆمدا، ئەبو ئەیووب نکوڵی کرد لەوەی من گێڕامەوە و وتی: گومانم وانییە ئەوەی تۆ وتت پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز فەرمووبێتی، ئەوەش زۆر قورس وگران بوو بەلامەوە، منیش نەزرم کرد لەسەر خۆم ئەگەر خوا نەممرێنێ تا دەگەڕێمەوە لەم غەزایە، دەبێ دووبارە پرسیار لە عیتبانی کوڕی مالیك ﷺ بکەم، ئەگەر لە ژیاندا مابێ بیبینیم لە مزگەوتی هۆزەکەی، جا گەڕامەوەو ئیحرامم بەست بە حەج -یان بە عومرە-، پاشان ڕۆیشتم تا گەیشتمە مەدینە، ڕۆیشتم بۆ نێو هۆزی بەنی سالیم، بینیم عیتبان پیاوێکی پیری کوێرەو پێشنوێژی بۆ هۆزەکەی دەکات، جا کە سەلامی دایەوە لە نویژەکەی، سەلامم لێ کردو خۆم پێ ناساند، پاشان پرسیارم لێکرد دەربارەی ئەو فەرموودەیە، ئەویش بۆی گێڕامەوە بەو شێوەی یەکەم جار بۆی گێڕامەوە.

## ٣٧- بابُ التَّطوُّعِ فِي البَيْتِ

١١٨٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ وَعُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلاَتِكُمْ، وَلاَ تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا». تَابَعَهُ عَبْدُ الوَهَّابِ، عَنْ أَيُّوبَ[1].

## ٣٧- باسی نوێژی سوننەت کردن لەماڵەوە

**١١٨٧- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەندێ لە نوێژەکانتان (سوننەتەکان) دانێن بۆ ماڵەکانتان، وە ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان))[2]، عەبدولوەهاب لە ئەیووبەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوەو، پاڵپشتی گێڕانەوەکەی وهەیب دەکات.**

---

[1] بڕوانە: ٤٣٢.

[2] واتە: نوێژە سوننەتەکان لە ماڵەوە بکەن و ماڵتان وەک گۆڕستان لێ مەکەن، کە نوێژی تێدا ناکرێ.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٢٠- پەڕاوی گەورەیی نوێـژکردن لە مزگەوتی مەککە و مەدینە

### ١- بابُ فَضْلِ الصَّلاةِ في مَسْجِدِ مَكَّةَ وَالمَدِينَةِ

١١٨٨- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ المَلِكِ بْنُ عُمَيْرٍ، عَنْ قَزَعَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ ﷺ أَرْبَعًا قَالَ: سَمِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَ غَزَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ غَزْوَةً[١].

### ١- باسی گەورەیی نوێژکردن لە مزگەوتی مەککە و مەدینەدا

**١١٨٨- قەزعە دەڵێ: چوار شتم[٢] لە ئەبو سەعید بیست ﷺ کە وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە، وە ئەبو سەعید لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دوازدە غەزای کردووە.**

١١٨٩- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: المَسْجِدِ الحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ ﷺ وَمَسْجِدِ الأَقْصَى».

**١١٨٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بۆ سێ مزگەوت نەبێ بنە و بارگە ناپێچرێتەوە[٣]، مزگەوتی حەڕام و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و مزگەوتی ئەقصا)).**

---

[١] بروانە: ٥٨٦.

[٢] لە فەرموودەی ژمارە: ١١٩٧ ئەو چوار شتە باس دەکات.

[٣] واتە: سەفەر ناکرێت.

١١٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ رَبَاحٍ، وَعُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الأَغَرِّ، عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الأَغَرِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ، إِلاَّ المَسْجِدَ الحَرَامَ».

**١١٩٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا لە هەزار نوێژی مزگەوتی تر پاداشتی زیاترە جگە لە مزگەوتی حەڕام)).**

## ٢- بابُ مَسْجِدِ قُبَاءٍ

١١٩١- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ - هُوَ: الدَّوْرَقِيُّ- حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ، عَنْ نَافِعٍ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لاَ يُصَلِّي مِنَ الضُّحَى إِلاَّ فِي يَوْمَيْنِ: يَوْمَ يَقْدَمُ بِمَكَّةَ، فَإِنَّهُ كَانَ يَقْدَمُهَا ضُحًى، فَيَطُوفُ بِالبَيْتِ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ خَلْفَ المَقَامِ، وَيَوْمَ يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ، فَإِنَّهُ كَانَ يَأْتِيهِ كُلَّ سَبْتٍ، فَإِذَا دَخَلَ المَسْجِدَ كَرِهَ أَنْ يَخْرُجَ مِنْهُ حَتَّى يُصَلِّيَ فِيهِ. قَالَ: وَكَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَزُورُهُ رَاكِبًا وَمَاشِيًا[1].

## ٢- باسی (گەورەیی) مزگەوتی قوبا

**١١٩١- نافیع دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ نوێژی لە چێشتەنگاودا نەدەکرد لە دوو ڕۆژدا نەبێ: ئەو ڕۆژەی دەگەیشتە مەککە، چونکە لە چێشتەنگاو دەهاتە مەککە، تەواڤی کەعبەی دەکرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی لە پشت مەقامی ئیبراهیمەوە دەکرد، وە لەو ڕۆژەدا کە دەهات بۆ مزگەوتی قوبا، چونکە لە هەموو شەممەیەکدا دەهات بۆ مزگەوتی قوبا، جا کە دەهاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت ناپەسند بوو بەلایەوە لە مزگەوتی قوبا بچێتە**

---

[1] بروانە: ١١٩٣، ١١٩٤، ٧٣٢٦.

دەرەوە هەتا نوێژی تێدا نەکات، نافیع لە عەبدوڵاوە دەیگێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی مزگەوتی قوبای دەکرد بە سواری و بە پیادە.

١١٩٢- قَالَ: وَكَانَ يَقُولُ: إِنَّمَا أَصْنَعُ كَمَا رَأَيْتُ أَصْحَابِي يَصْنَعُونَ، وَلاَ أَمْنَعُ أَحَدًا أَنْ يُصَلِّيَ فِي أَيِّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ، غَيْرَ أَنْ لاَ تَتَحَرَّوْا طُلُوعَ الشَّمْسِ وَلاَ غُرُوبَهَا[1].

١١٩٢- (نافیع) دەڵێ: عەبدوڵا دەیوت: بێگومان من ئەوە دەکەم کە هاوەڵانم دیوە کردوویانە، وە ڕێگری لە هیچ کەسێك ناکەم لە هەر کاتێکی شەو و ڕۆژدا نوێژ بکات، تەنها ئەوەندە هەیە نوێژەکانتان مەخەنە کاتی هەڵهاتنی خۆر و ئاوابوونی.

## ٣- بابُ مَنْ أَتَى مَسْجِدَ قُبَاءٍ كُلَّ سَبْتٍ

١١٩٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ كُلَّ سَبْتٍ مَاشِيًا وَرَاكِبًا. وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَفْعَلُهُ[2].

## ٣- باسی ئەوەی هەموو ڕۆژێکی شەممان دەهات بۆ مزگەوتی قوبا

١١٩٣- عەبدوڵای کوڕی دینار لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە رضي الله عنهما دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەموو ڕۆژانی شەممە بە پیادە و بەسواری دەهات بۆ مزگەوتی قوبا، وە عەبدوڵاش رضي الله عنه ئەم کارەی دەکرد.

---

[1] بڕوانە: ٥٨٢.

[2] بڕوانە: ١١٩١.

## ٤- بابُ إِتْيَانِ مَسْجِدِ قُبَاءٍ رَاكِبًا وَمَاشِيًا

١١٩٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْتِي قُبَاءً رَاكِبًا وَمَاشِيًا. زَادَ ابْنُ نُمَيْرٍ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ عَنْ نَافِعٍ: فَيُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ[1].

## ٤- باسی هاتن بۆ مزگەوتی قوبا بەپیادە و بەسواری

**١١٩٤- عەبدوڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەسواری و بەپیادە دەهات بۆ مزگەوتی قوبا، ئیبنو نومەیر ئەمەی بۆ زیاد کردووە: عوبەیدوڵا بۆی گێڕاینەوە لە نافیعەوە: دوو ڕکات نوێژی تێدا دەکرد.**

## ٥- بابُ فَضْلِ مَا بَيْنَ القَبْرِ وَالمِنْبَرِ

١١٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ المَازِنِيِّ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الجَنَّةِ».

## ٥- باسی پلەو پایەی نێوان قەبری پێغەمبەر ﷺ و دوانگەکەی

**١١٩٥- عەبدوڵای کوڕی زەیدی مازینی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەوەی لە نێوان ماڵی من و دوانگەکەم دایە، باخێکە لە باخەکانی بەهەشت)).**

---

[1] بڕوانە: ١١٩١.

١١٩٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ عَنْ يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي خُبَيْبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي»[1].

**١١٩٦- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەوەی لە نێوان ماڵی من و دوانگەکەم دایە، باغێکە لە باغەکانی بەهەشت، وە دوانگەکەم لەسەر حەوزەکەمە)).**

## ٦- بابُ مَسْجِدِ بَيْتِ المَقْدِسِ

١١٩٧- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ المَلِكِ، سَمِعْتُ قَزَعَةَ -مَوْلَى زِيَادٍ -قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ ﷺ يُحَدِّثُ بِأَرْبَعٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَعْجَبْنَنِي وَآنَقْنَنِي، قَالَ: «لاَ تُسَافِرِ المَرْأَةُ يَوْمَيْنِ إِلاَّ مَعَهَا زَوْجُهَا أَوْ ذُو مَحْرَمٍ. وَلاَ صَوْمَ فِي يَوْمَيْنِ: الفِطْرِ وَالأَضْحَى، وَلاَ صَلاَةَ بَعْدَ صَلاَتَيْنِ: بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ العَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ، وَلاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِ الحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى، وَمَسْجِدِي»[2].

## ٦- باسی مزگەوتی بەیتولمەقدیس

**١١٩٧- قەزەعە -ئازادکراوی زیاد- دەڵێ: لە ئەبو سەعیدی خودریم بیست ﷺ چوار شتی لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕایەوە زۆر سەرسام و دڵخۆشی کردم، فەرمووی: ((ئافرەت دوو ڕۆژ ڕێگا سەفەر نەکات، مەگەر مێردی یان مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت، نابێ لە دوو ڕۆژدا ڕۆژوو بگیرێ: ڕۆژی جەژنی**

---

[1] بڕوانە: ١٨٨٨، ٦٥٨٨، ٧٣٣٥.

[2] بڕوانە: ٥٨٦.

ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان، لەپاش دوو نوێژەوە نابێ نوێژ بکرێ: پاش نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵدێ، پاش نوێژی عەسر هەتا خۆر ئاوادەبێت، وە نابێ بنە و بارگە بپێچرێتەوە تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ: مزگەوتی حەڕام و مزگەوتی ئەقصاو مزگەوتی من))[1].

---

[1] واتە: مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٢١- كِتابُ العمل في الصَّلاةِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٢١- پەڕاوی جوڵان له كاتی نوێـژكردندا

## ١- بابُ اسْتِعَانَةِ اليَدِ فِي الصَّلَاةِ إِذَا كَانَ مِنْ أَمْرِ الصَّلَاةِ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَسْتَعِينُ الرَّجُلُ فِي صَلاَتِهِ مِنْ جَسَدِهِ بِمَا شَاءَ. وَوَضَعَ أَبُو إِسْحَاقَ قَلَنْسُوَتَهُ فِي الصَّلاَةِ وَرَفَعَهَا. وَوَضَعَ عَلِيٌّ كَفَّهُ عَلَى رُصْغِهِ الأَيْسَرِ، إِلاَّ أَنْ يَحُكَّ جِلْدًا أَوْ يُصْلِحَ ثَوْبًا.

## ١- باسی جوڵانی دەست له نوێژدا ئەگەر بۆ كاروباری نێو نوێژەكە بێت

**عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: مرۆڤ له نوێژەكەیدا هەر ئەندامێكی لاشەی ویست، دەتوانێ بەكاری بێنێ. ئەبو ئیسحاق (ی سوبەیعی) كڵاوەكەی داناوە له نوێژداو هەڵیگرتووە، وە عەلی ﷺ دەستی خستۆتە سەر مەچەكی چەپی، (نەیجوڵاندوە) مەگەر شوێنێكی لەشی خوراندبێ، یان پۆشاكەكەی چاككردبێ.**

١١٩٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ مَخْرَمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ كُرَيْبٍ - مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ

ﷺ -وَهْيَ: خَالَتُهُ- قَالَ: فَاضْطَجَعْتُ عَلَى عَرْضِ الوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى انْتَصَفَ اللَّيْلُ، أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ، أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَجَلَسَ، فَمَسَحَ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ العَشْرَ آيَاتٍ خَوَاتِيمَ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهَا، فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ ﷺ فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ اليُمْنَى عَلَى رَأْسِي، وَأَخَذَ بِأُذُنِي اليُمْنَى يَفْتِلُهَا بِيَدِهِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى جَاءَهُ المُؤَذِّنُ، فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ[1].

**١١٩٨- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە: كە شەوێك لە ماڵی مەیموونەی دایكی ئیمانداران ﷺ مایەوە -كە پووری عەبدوڵا بوو-، دەڵێ: جا من لەسەر باری پانی سەرینەكە ڕاكشام و پێغەمبەری خوا ﷺو خێزانی لەسەر باری درێژی سەرینەكە ڕاكشان، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت تا نیوەی شەو یان كەمێ پێش یان دوای نیوە شەو، ئینجا هەستا لە خەو و دانیشت و دەستی هێنا بە دەم و چاویدا، خەوی لە چاوەكانی زڕاند، پاشان دە ئایەتەكەی كۆتایی سووڕەتی ئالی عیمڕانی خوێند، پاشان هەستاو ڕۆیشت بۆ لای جەومنەیەكی هەڵواسراو (ئاوی تیابوو)، دەستنوێژی گرت لە ئاوی ئەو جەومنەیە بە دەستنوێژ گرتنێكی جوان، پاشان هەستاو دەستی كرد بە نوێژ كردن، عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: منیش هەستام وەك ئەوم كرد، پاشان لە تەنیشتیدا وەستام (و نوێژم دابەست)، پێغەمبەریش ﷺ دەستی ڕاستی نایە سەر سەرم و بە دەستی گوێی ڕاستی گرتم و بایدا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دوو ڕكات نوێژی كرد، پاشان دوو ڕكاتی تری كرد، پاشان دوو ڕكاتی تری كرد، ئینجا دوو ڕكاتی تری كرد، پاشان دوو ڕكاتی تری كرد، پاشان دوو ڕكاتی تری كرد، ئینجا یەك ڕكاتی**

---

[1] بڕوانە: ١١٧.

ویتری كرد، پاشان ڕاكشا هەتا بانگبێژەكە هات بۆ خزمەتی (ئاگاداری كرد)، جا هەستاو دوو ڕكات نوێژی (سوننەتی) سووكەڵەی كرد، ئینجا لە ماڵ دەرچوو بۆ مزگەوت و نوێژی بەیانی كرد (بە پێشنوێژی بۆ مسوڵمانان).

## ٢- بابُ مَا يُنْهَى عَنْهُ مِنَ الكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ

١١٩٩- حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ فَيَرُدُّ عَلَيْنَا، فَلَمَّا رَجَعْنَا مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ، سَلَّمْنَا عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْنَا وَقَالَ: «إِنَّ فِي الصَّلَاةِ شُغْلًا».

حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، حَدَّثَنَا هُرَيْمُ بْنُ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[1].

## ٢- باسی ئەوەی ڕێگری لێ کراوە لە قسەکردن لە نوێژدا

١١٩٩- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە جاران پێغەمبەر ﷺ كە لە نوێژدا بوو سەلاممان لێ دەكرد، ئەویش وەڵامی دەداینەوە، بەڵام كاتێ لەلای نەجاشی گەڕاینەوە (لە نوێژدا) سەلاممان لە پێغەمبەر كرد ﷺ، وەڵامی نەداینەوە و (دواتر) فەرمووی: ((بێگومان لەنێو نوێژدا سەرقاڵی هەیە (بەقوڕئان خوێندن و شتی ترەوە) )).

(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئیبنو نومەیر بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیسحاقی كوڕی مەنصور بۆی گێڕاینەوە وتی: هوڕەیمی كوڕی سوفیان لە ئەعمەشەوە، لە ئیبراهیمەوە، لە عەلقەمەوە، لە عەبدوڵاوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ وێنەی فەرموودەی پێشووی گێڕایەوە.

---

[1] بڕوانە: ١٢١٦، ٣٨٧٥.

١٢٠٠- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عِيسَى هُوَ ابْنُ يُونُسَ عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنِ الحَارِثِ بْنِ شُبَيْلٍ، عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ قَالَ قَالَ لِي زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ: إِنْ كُنَّا لَنَتَكَلَّمُ فِي الصَّلاَةِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، يُكَلِّمُ أَحَدُنَا صَاحِبَهُ بِحَاجَتِهِ حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ ﴾ البقرة. فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ[1].

**١٢٠٠- زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەنێو نوێژدا قسەمان دەکرد، کەسێکمان دەربارەی پێویستییەکەی لەگەڵ هاوڕێکەیدا قسەی دەکرد، هەتا ئەم ئایەتە دابەزی: (پارێزگاری لەنوێژەکانتان بکەن، (بە تایبەتی) نوێژی نێوەڕاست (کە نوێژی عەسرە)، وە لە نوێژدا بە گەردن کەچی بۆخوا بوەستن (واتە: قسەمەکەن)). ئیتر فەرمانمان پێکرا بەبێ دەنگی لە نوێژدا.**

## ٣- بابُ مَا يَجُوزُ مِنَ التَّسْبِيحِ وَالحَمْدِ فِي الصَّلاَةِ لِلرِّجَالِ

١٢٠١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ سَهْلٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يُصْلِحُ بَيْنَ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، وَحَانَتِ الصَّلاَةُ، فَجَاءَ بِلاَلٌ أَبَا بَكْرٍ ﷺ فَقَالَ: حُبِسَ النَّبِيُّ ﷺ، فَتَؤُمُّ النَّاسَ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِنْ شِئْتُمْ. فَأَقَامَ بِلاَلٌ الصَّلاَةَ، فَتَقَدَّمَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ فَصَلَّى، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ يَمْشِي فِي الصُّفُوفِ يَشُقُّهَا شَقًّا، حَتَّى قَامَ فِي الصَّفِّ الأَوَّلِ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِالتَّصْفِيحِ -قَالَ سَهْلٌ: هَلْ تَدْرُونَ مَا التَّصْفِيحُ؟ هُوَ التَّصْفِيقُ- وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ لاَ يَلْتَفِتُ فِي صَلاَتِهِ، فَلَمَّا أَكْثَرُوا التَفَتَ فَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ فِي الصَّفِّ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ مَكَانَكَ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ يَدَيْهِ، فَحَمِدَ اللَّهَ، ثُمَّ رَجَعَ القَهْقَرَى وَرَاءَهُ، وَتَقَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ فَصَلَّى[2].

---

[1] بڕوانە: ٤٥٣٤.

[2] بڕوانە: ٦٨٤.

## ٣- باسی ئەوەی کە (سبحان الله والحمد لله) کردن لەنوێژدا بۆ پیاوان دروستە

**١٢٠١- سەهل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ نێو بەنی عەمری کوڕی عەوف تا نێوانیان چاك بكات، كاتی نوێژ هاتە پێش و نوێژ بوو، بیلالیش هات بۆ لای ئەبو بەكر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ ماتەڵ كراوە (یان گیردراوە)، پێشنوێژی دەكەیت بۆ خەڵكەكە (قامەت بكەم)؟ ئەبو بەكریش وتی: بەڵێ، ئەگەر دەتانەوێ، بیلالیش قامەتی نوێژی كرد، ئەبو بەكریش ڕۆیشتە پێشەوەو دەستی بە پێش نوێژی كرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوەو (خەڵكەكەش لەنوێژدا بوون)، بە نێو ڕیزەكاندا دەڕۆیشت و بەینی تێ دەخستن تا لە ڕیزی یەكەمدا وەستا، نوێژخوێنەكان دەستیان كرد بەچەپڵە لێدان، - لێرەدا سەهل دەڵێ: ئایا دەزانن (التَّصْفِيحُ) چییە؟ چەپڵەلێدانە-، ئەبو بەكریش لە نوێژدا لای نەدەكردەوە، جا كاتێك چەپڵەیان زۆر لێدا، لایكردەوەو پێغەمبەری ﷺ بینی لەڕیزەكەدایە، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی بۆ كرد ((كە لە شوێنی خۆت بمێنەرەوە))، ئەبو بەكریش هەردوو دەستی بەرزكردەوەو سوپاسی خوای كرد[1]، پاشان ئەبو بەكر بە پشتدا گەڕایەوە دواوەی خۆی، وە پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە پێشەوەو پێشنوێژی كرد (بۆیان).**

## ٤- بابُ مَنْ سَمَّى قَوْمًا أَوْ سَلَّمَ فِي الصَّلَاةِ عَلَى غَيْرِهِ مُوَاجَهَةً وَهُوَ لَا يَعْلَمُ

١٢٠٢- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ الصَّمَدِ عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا حُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَقُولُ:

---

[1] لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد بەردەوام بێت لە پێش نوێژییەکەیدا.

التَّحِيَّةُ فِي الصَّلاَةِ وَنُسَمِّي، وَيُسَلِّمُ بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ، فَسَمِعَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «قُولُوا: التَّحِيَّاتُ للهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. فَإِنَّكُمْ إِذَا فَعَلْتُمْ ذَلِكَ فَقَدْ سَلَّمْتُمْ عَلَى كُلِّ عَبْدٍ للهِ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ»[1].

## ٤- باسی (حوکمی) ئەوەی لەنێو نوێژدا ناوی کەسانێک بهێنێ، یان سەلام بکات لە کەسێکی بەرانبەری بەنەزانین

**١٢٠٢- عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: ئێمە جاران لە نوێژدا دەمانوت: سەلام لە فلانەکەس بێت و ناویمان دەهێنا، وە هەندێکمان سەلامی دەکرد لەوانی تر، پێغەمبەری خواش ﷺ گوێی لێ بوو فەرمووی: ((بڵێن:** التَّحِيَّاتُ للهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ[2] **، جا ئەگەر ئەوەتان کرد، ئەوە سەلامتان کردووە لە هەموو بەندەیەکی صاڵحی خوا لە ئاسمان و لە زەویدا)).**

## ٥- بابٌ: التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ

**١٢٠٣-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ».

---

[1] بڕوانە: ٨٣١.

[2] واتە: موڵک و مانەوەو گەورەیی و درودو پاڕانەوەو لاڵانەوەو وشەی پاک وچاک هەر بۆ خودایە، سڵاوو ڕەحمەت و بەرەکەتی خودات لەسەر بێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سڵاو لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاکەکانی خودای گەورە، وە شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێک نییە بە هەق جگە لە (الله)، وە شایەتی ئەدەم کە موحەممەد ﷺ بەندەو نێردراوی خودایە.

## ٥- باسێک: چەپڵەلێدان بۆ ئافرەتانە

**١٢٠٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((سبحان الله وتن[1] بۆ پیاوانە، چەپڵەلێدانیش بۆ ئافرەتانە)).**

١٢٠٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ وَالتَّصْفِيحُ لِلنِّسَاءِ»[2].

**١٢٠٤- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سبحان الله کردن (لە کاتی هەڵەی پێشنوێژدا) بۆ پیاوانە، چەپڵەلێدانیش بۆ ئافرەتانە)).**

## ٦- بابُ مَنْ رَجَعَ القَهْقَرَى فِي صَلَاتِهِ، أَوْ تَقَدَّمَ بِأَمْرٍ يَنْزِلُ بِهِ

رَوَاهُ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٢٠٥- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ يُونُسُ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ المُسْلِمِينَ بَيْنَا هُمْ فِي الفَجْرِ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ، وَأَبُو بَكْرٍ ﷺ يُصَلِّي بِهِمْ، فَفَجَأَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ، قَدْ كَشَفَ سِتْرَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ ﷺ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمْ، وَهُمْ صُفُوفٌ، فَتَبَسَّمَ يَضْحَكُ، فَنَكَصَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ عَلَى عَقِبَيْهِ، وَظَنَّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُرِيدُ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى الصَّلاَةِ، وَهَمَّ المُسْلِمُونَ أَنْ يَفْتَتِنُوا فِي صَلاَتِهِمْ فَرَحًا بِالنَّبِيِّ ﷺ حِينَ رَأَوْهُ، فَأَشَارَ بِيَدِهِ أَنْ أَتِمُّوا، ثُمَّ دَخَلَ الحُجْرَةَ وَأَرْخَى السِّتْرَ، وَتُوُفِّيَ ذَلِكَ اليَوْمَ[3].

---

[1] لە کاتی ڕووداوێک یان ئاگادارکردنەوە یان ڕاستکردنەوەی هەڵەیەک بۆ پێشنوێژ لە نوێژەکەیدا.

[2] بڕوانە: ٦٨٤.

[3] بڕوانە: ٦٨٠.

## ٦- باسی ئەوەی پشتاو پشت بگەڕێتەوە لەنێو نوێژەکەیدا، یان پێشکەوێ لەبەر کارێک بۆی پێش هاتوە

**ئەم فەرموودەیە سەهلی کوڕی سەعد لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**١٢٠٥- زوهری دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە وتی: لەکاتێکدا مسوڵمانان لەنوێژی بەیانی ڕۆژی دووشەممەدا بوون، ئەبو بەکر ﷺ پێشنوێژی بۆ دەکردن، لە ناکاو پێغەمبەر ﷺ پەردەی ژوورەکەی عائیشەی لاداو سەیری کردن مسوڵمانان ڕیز بوو بوون، جا زەردەخەنەیەکی کردو پێکەنی، ئینجا ئەبو بەکر پاشەو پاش گەڕایە دواوە، وای زانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێ بێتە دەرەوە بۆ نوێژ، وە مسوڵمانان خەریك بوو نوێژەکەیان لێ تێك بچێت، لە خۆشی پێغەمبەردا ﷺ کە بینیان (حاڵی باشە)، پێغەمبەریش ﷺ بە دەستی ئاماژەی بۆ کردن ((کە نوێژەکەیان تەواو بکەن))، پاشان چوویەوە ژوورەوەو پەردەکەی دادایەوەو هەر لەو ڕۆژەدا وەفاتی کرد.**

## ٧- بابُ إِذَا دَعَتِ الأُمُّ وَلَدَهَا فِي الصَّلاَةِ

١٢٠٦- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَادَتِ امْرَأَةٌ ابْنَهَا، وَهْوَ فِي صَوْمَعَةٍ قَالَتْ: يَا جُرَيْجُ. قَالَ: اللَّهُمَّ أُمِّي وَصَلاَتِي. قَالَتْ: يَا جُرَيْجُ. قَالَ: اللَّهُمَّ أُمِّي وَصَلاَتِي. قَالَتْ: يَا جُرَيْجُ. قَالَ: اللَّهُمَّ أُمِّي وَصَلاَتِي. قَالَتِ: اللَّهُمَّ لاَ يَمُوتُ جُرَيْجٌ حَتَّى يَنْظُرَ فِي وَجْهِ الْمَيَامِيسِ. وَكَانَتْ تَأْوِي إِلَى صَوْمَعَتِهِ رَاعِيَةٌ تَرْعَى الغَنَمَ، فَوَلَدَتْ، فَقِيلَ لَهَا: مِمَّنْ هَذَا الوَلَدُ؟ قَالَتْ: مِنْ جُرَيْجٍ، نَزَلَ مِنْ صَوْمَعَتِهِ. قَالَ جُرَيْجٌ: أَيْنَ هَذِهِ التِي تَزْعُمُ أَنَّ وَلَدَهَا لِي؟ قَالَ: يَا بَابُوسُ مَنْ أَبُوكَ؟ قَالَ: رَاعِي الغَنَمِ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٢٤٨٢، ٣٤٣٦، ٣٤٦٦.

## ٧- باسی ئەگەر دایکێک کوڕەکەی بانگ بکات کاتێ (کوڕەکە) لەنوێژدا بێ

١٢٠٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئافرەتێك كوڕەكەی بانگ كرد، لە كاتێكدا لە خەڵوەتگەیەكدا بوو، ئافرەتەكە وتی: ئەی جورەیج، ئەویش وتی: خوایە (ماق) دایكم و نوێژەكەم (كۆبۆتەوە، تەوفیقم بدە باشترینیان بەجێبێنم)، ئافرەتەكە وتی: ئەی جورەیج، (جورەیج) وتی: خوایە (ماق) دایكم و نوێژەكەم (كۆبۆتەوە، تەوفیقم بدە باشترینیان بەجێبێنم)، ئافرەتەكە وتی: ئەی جورەیج . (جورەیج) وتی: خوایە (ماق) دایكم و نوێژەكەم (كۆبۆتەوە، تەوفیقم بدە باشترینیان بەجێبێنم)، ئافرەتەكە وتی: خوایە جورەیج نەمرێت هەتا تەماشای ڕووخساری ئافرەتانی داوێن پیس دەكات. وە ئافرەتێكی شوان كە مەڕی دەلەوەڕاند دەچوویە خەڵوەتگاكەی جورەیجەوە، ئینجا (ئافرەتە شوانەكە) مناڵێكی بوو[1]، پێی وترا: ئەم مناڵە (ی بوویەتی) لە چ پیاوێكە؟ ئافرەتەكە وتی: لە جورەیجە، لەخەڵوەتگاكەی هاتۆتە خوارەوە (و زینای كردووە لەگەڵیدا)، جورەیج وتی: ئەو ئافرەتە لە كوێیە كە دەڵێ مناڵەكەی لە منە؟ (داوای مناڵەكەی كردو هێنایان)، جورەیج وتی: بچكۆل كێ باوكتە؟ مناڵەكە وتی: پیاوی شوانی مەڕەكان)).

## ٨- بابُ مَسْحِ الحَصَى فِي الصَّلَاةِ

١٢٠٧- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي مُعَيْقِيبٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي الرَّجُلِ يُسَوِّي التُّرَابَ حَيْثُ يَسْجُدُ قَالَ: «إِنْ كُنْتَ فَاعِلًا فَوَاحِدَةً».

---

[1] پیاوێكی شوان زینای لەگەڵ كردبوو سكی پڕ بوو بوو.

## ٨- باسی دەستدان لە چەو (وردەبەرد) لە نوێژدا

**١٢٠٧- موعەیقیب ﷺ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پیاوێك كە خۆڵەكەی تەخت دەكرد، لەو شوێنەدا كە سوژدەی لەسەر دەبرد فەرمووی: ((ئەگەر ئەو كارەت كرد با یەك جار زیاتر نەبێت)).**

## ٩- بابُ بَسْطِ الثَّوْبِ فِي الصَّلَاةِ لِلسُّجُودِ

١٢٠٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرٌ، حَدَّثَنَا غَالِبٌ، عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي شِدَّةِ الحَرِّ، فَإِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أَحَدُنَا أَنْ يُمَكِّنَ وَجْهَهُ مِنَ الأَرْضِ بَسَطَ ثَوْبَهُ فَسَجَدَ عَلَيْهِ[1].

## ٩- باسی ڕاخستنی پۆشاك لەنێو نوێژدا بۆ سوژدەبردن لەسەری

**١٢٠٨- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئێمە لە ڕابردوودا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە تینی گەرمادا نوێژمان دەكرد، جا ئەگەر كەسێكمان نەیتوانیبایە نێوچاوانی بخاتە سەر زەوی، پۆشاكەكەی ڕادەخست و سوژدەی لەسەر دەبرد.**

## ١٠- بابُ مَا يَجُوزُ مِنَ العَمَلِ فِي الصَّلَاةِ

١٢٠٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ كُنْتُ أَمُدُّ رِجْلِي فِي قِبْلَةِ النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي فَرَفَعْتُهَا، فَإِذَا قَامَ مَدَدْتُهَا[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٨٥.

[2] بڕوانە: ٣٨٢.

# ١٠- باسی ئەو کردەوە و جوڵەی لەنێو نوێژدا دروستە

**١٢٠٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد، من قاچم درێژ دەکرد لەبەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ، جا کاتێ سوژدەی ببردایە تێی دەکوتام (نقورچکەی لێدەدام)، منیش قاچم دەهێنایە دواوە، کە هەڵدەستایەوە قاچم درێژ دەکردەوە.**

١٢١٠- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ صَلَّى صَلاَةً قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ عَرَضَ لِي، فَشَدَّ عَلَيَّ لِيَقْطَعَ الصَّلاَةَ عَلَيَّ، فَأَمْكَنَنِي اللَّهُ مِنْهُ، فَذَعَتُّهُ، وَلَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أُوثِقَهُ إِلَي سَارِيَةٍ حَتَّى تُصْبِحُوا فَتَنْظُرُوا إِلَيْهِ، فَذَكَرْتُ قَوْلَ سُلَيْمَانَ ﷺ: رَبِّ هَبْ لِي مُلْكًا لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي. فَرَدَّهُ اللَّهُ خَاسِيًا». ثُمَّ قَالَ النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ: «فَذَعَتُّهُ» بِالذَّالِ أَيْ: خَنَقْتُهُ، وَ«فَدَعَّتُّهُ» مِنْ قَوْلِ اللَّهِ: ﴿ يَوْمَ يُدَعُّونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الطور. أَيْ: يُدْفَعُونَ وَالصَّوَابُ: فَدَعَتُّهُ، إِلاَّ أَنَّهُ كَذَا قَالَ بِتَشْدِيدِ الْعَيْنِ وَالتَّاءِ[1].

**١٢١٠- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژێکی کرد فەرمووی: ((بێگومان (ئەمشەو) شەیتان (دێوێکی جنۆکە) خۆی پیشان دام، پەلاماری بۆ هێنام بۆ ئەوەی نوێژەکەم پێ ببڕێ، بەڵام خوا زاڵی کردم بەسەریداو، گرتم، ئینجا توند پاڵم پێوەنا، سوێند بە خوا بەڕاستی ویستم بیبەستمەوە بە پایەیەك (لە پایەکانی مزگەوت)ەوە، هەتا ڕۆژ بکەنەوەو هەمووتان سەیری بکەن، بەڵام نزاکەی سولەیمانی برام ﷺ بیرکەوتەوە کە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم پاشایەتییەکی وام پێبدە کە لەپاش من بۆ کەس نەلوێ.**

---

[1] بڕوانە: ٤٦١.

ئیتر خوا ئەو (شەیتانەکەی) بەڕیسوایی گەڕاندەوە))، پاشان نەزری کوڕی شومەیل وتی: (فَذَعَتُّهُ) بە ژال، واتە: خنکاندم، وە (فَدَعَتُّهُ) لە شێوەی ئەمەیە لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ يَوْمَ يُدَعُّونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الطور، واتە: پاڵیان پێوە دەنرێ، ئەم وشەیان ڕاسترە: (فَدَعَتُّهُ)، بەڵام ئەو (شوعبە) بە گرتنی پیتی عەین و تا (فَدَعَتُّهُ) هێناویەتی.

## ١١- بابٌ: إِذَا انْفَلَتَتِ الدَّابَّةُ فِي الصَّلَاةِ

وَقَالَ قَتَادَةُ: إِنْ أُخِذَ ثَوْبُهُ يَتْبَعُ السَّارِقَ وَيَدَعُ الصَّلَاةَ.

١٢١١- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا الأَزْرَقُ بْنُ قَيْسٍ قَالَ: كُنَّا بِالأَهْوَازِ نُقَاتِلُ الحَرُورِيَّةَ، فَبَيْنَا أَنَا عَلَى جُرُفِ نَهَرٍ إِذَا رَجُلٌ يُصَلِّي، وَإِذَا لِجَامُ دَابَّتِهِ بِيَدِهِ، فَجَعَلَتِ الدَّابَّةُ تُنَازِعُهُ، وَجَعَلَ يَتْبَعُهَا -قَالَ شُعْبَةُ: هُوَ أَبُو بَرْزَةَ الأَسْلَمِيُّ- فَجَعَلَ رَجُلٌ مِنَ الخَوَارِجِ يَقُولُ: اللَّهُمَّ افْعَلْ بِهَذَا الشَّيْخِ. فَلَمَّا انْصَرَفَ الشَّيْخُ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ قَوْلَكُمْ، وَإِنِّي غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سِتَّ غَزَوَاتٍ أَوْ سَبْعَ غَزَوَاتٍ أَوْثَمَانَ، وَشَهِدْتُ تَيْسِيرَهُ، وَإِنِّي إِنْ كُنْتُ أَنْ أُرَاجِعَ مَعَ دَابَّتِي، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَدَعَهَا تَرْجِعُ إِلَى مَأْلَفِهَا فَيَشُقَّ عَلَيَّ[1].

## ١١- باسێک: ئەگەر لەنێو نوێژەکەیدا وڵاخەکەی بەرەڵابێ و بڕوات (چی بکات؟)

قەتادە دەڵێ: ئەگەر کراسەکەی فڕێنرا لەنێو نوێژەکەیدا، شوێن دزەکە بکەوێ و واز لە نوێژەکەی بێنێت.

١٢١١- ئەزرەقی کوڕی قەیس دەڵێ: ئێمە لەئەهواز بووین لە دژی حەروریەکان (خەواریجەکان) دەجەنگاین، لە کاتێکدا من لە قەراغی ڕووبارێکدا بووم،

---

[1] بڕوانە: ٦١٢٧.

**پیاوێکم بینی نوێژی دەکردو ڕەشۆی ولاخەکەی بەدەستیەوە بوو، ولاخەکەی ڕایدەکێشاو پیاوەکەش شوێن ولاخەکە دەکەوت، -شوعبە دەڵێ: ئەو پیاوە ئەبو بەرزەی ئەسلەمی بوو-، ئینجا پیاوێك کە خەواریج بوو بەردەوام دەیوت: خوایە ئەو پیاوە پیرە وا لێ بکەیت[1]، جا کاتێ پیاوە پیرەکە (ئەبو بەرزە) لە نوێژەکەی بوویەوە وتی: بەڕاستی گوێم لە قسەکانتان بوو، من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ شەش یان حەوت یان هەشت غەزام کردووە، وە ئاسانکاری ئەوم بینیوە، بێگومان من کاتێ لەگەڵ ولاخەکەمدا یەکتریمان ڕادەکێشا، ئەوەم پێ باشتر بوو لەوەی وازی لێ بێنم بگەڕێتەوە بۆ ئەو جێگەی هۆگری بوو، کە ناڕەحەت و گران دەبوو بۆ من (بیهێنمەوە).**

١٢١٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَرَأَ سُورَةً طَوِيلَةً، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ اسْتَفْتَحَ بِسُورَةٍ أُخْرَى، ثُمَّ رَكَعَ حَتَّى قَضَاهَا وَسَجَدَ، ثُمَّ فَعَلَ ذَلِكَ فِي الثَّانِيَةِ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَصَلُّوا حَتَّى يُفْرَجَ عَنْكُمْ، لَقَدْ رَأَيْتُ فِي مَقَامِي هَذَا كُلَّ شَيْءٍ وُعِدْتُهُ، حَتَّى لَقَدْ رَأَيْتُ أُرِيدُ أَنْ آخُذَ قِطْفًا مِنَ الجَنَّةِ حِينَ رَأَيْتُمُونِي جَعَلْتُ أَتَقَدَّمُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُ جَهَنَّمَ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا حِينَ رَأَيْتُمُونِي تَأَخَّرْتُ، وَرَأَيْتُ فِيهَا عَمْرَو بْنَ لُحَيٍّ وَهُوَ الَّذِي سَيَّبَ السَّوَائِبَ»[2].

**١٢١٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: خۆرگیرا، ئینجا پێغەمبەریش ﷺ هەستاو نوێژی دابەست و سوورەتێکی درێژی خوێند، پاشان کڕنووشی بردو درێژەی پێدا،**

---

[1] دوعای لێ دەکرد و جنێوی بە ئەبو بەرزە دەدا.

[2] بروانە: ١٠٤٤.

پاشان سەری بەرزکردەوە (لە کڕنووش)، پاشان دەستی بەخوێندنی سوورەتێکی تر کرد، پاشان کڕنووشێکی تری برد (و درێژەی پێدا)، تا تەواوی کرد و سوژدەی برد، پاشان ئەمەی لە ڕکاتی دووەمیشدا دووبارە کردەوە، پاشان فەرمووی: ((بێگومان ئەم خۆر و مانگ گیرانە دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، جا هەر کات ئەوانەتان بینی ئەوە نوێژ بکەن، هەتا دەرووتان لێ بکرێتەوە، سوێند بەخوا ئا لەم جێگایەدا کە ڕاوەستاوم، ئەوەی بەڵێنم پێدرابوو هەموویم بینی، هەتا بینیم ویستم بۆشکێك میوەی بەهەشت لێبکەمەوە کاتێ منتان بینی (لە نوێژەکەمدا) بۆ پێشەوە دەڕۆیشتم، سوێند بەخوا دۆزەخم بینی هەندێکی هەندێکی تری تێك دەشکاند کاتێ منتان بینی هاتمە دواوە، وە عەمری کوڕی لوحەیم بینی لە دۆزەخدا (چونکە) ئەو بوو بەخشینی وشتری بەبتەکان داهێنا، کە سواریان نەبن و ڕێگری لەوەڕ و ئاویان لێ نەکرێ)).

## ١٢- بابُ مَا يَجُوزُ مِنَ البُصَاقِ وَالنَّفْخِ فِي الصَّلاَةِ

وَيُذْكَرُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو: نَفَخَ النَّبِيُّ ﷺ فِي سُجُودِهِ فِي كُسُوفٍ.

١٢١٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ المَسْجِدِ، فَتَغَيَّظَ عَلَى أَهْلِ المَسْجِدِ وَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قِبَلَ أَحَدِكُمْ، فَإِذَا كَانَ فِي صَلاَتِهِ فَلاَ يَبْزُقَنَّ» أَوْ قَالَ «لاَ يَتَنَخَّمَنَّ». ثُمَّ نَزَلَ فَحَتَّهَا بِيَدِهِ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ ﵄: إِذَا بَزَقَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْزُقْ عَلَى يَسَارِهِ[1].

---

[1] بڕوانە: ٤٠٦.

# ١٢- باسی ئەوەی کە دروستە لە تف و بەڵغەم و فووکردن لەنێو نوێژدا

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ﵄ دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە سوژدەی نوێژی خۆرگیراندا فووی کردووە.**

**١٢١٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە قیبلەی مزگەوتدا (بەدیوارەکەیەوە) بەڵغەمێکی بینی، بۆیە ڕقی هەستا لە خەڵکی مزگەوت و فەرمووی: ((بێگومان (لەنوێژدا) خوا بەرانبەر هەر یەکێکتانە، جا ئەگەر لە نوێژەکەیدا بوو ئەوە باتف نەکات))، یان فەرمووی: ((بەڵغەم فڕێ نەدات))، پاشان دابەزی لە دوانگەکەی و بەدەستی (بەبەردێك بەڵغەمەکەی) کڕاند و لای برد، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ وتی: ئەگەر کەسێکتان (لەنوێژدا) تفی کرد، با بیکاتە لای چەپییەوە.**

١٢١٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ ﷺ،عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ فِي الصَّلاَةِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ، فَلاَ يَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ، وَلَكِنْ عَنْ شِمَالِهِ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى»[1].

**١٢١٤- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێك لە نوێژدا بوو، ئەوە بێگومان لەگەڵ پەروەردگاریدا قسەدەکات، کەواتە با تف نەکاتە بەردەمیەوە، وە نەیکاتە لای ڕاستییەوە، بەڵکو بیکاتە لای چەپی و ژێر پێی چەپییەوە)).**

[1] بروانە: ٢٤١.

## ١٣- بَابٌ: مَنْ صَفَّقَ جَاهِلًا مِنَ الرِّجَالِ فِي صَلَاتِهِ لَمْ تَفْسُدْ صَلَاتُهُ

فِيهِ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ١٣- باسێک: ئەگەر کەسێک لە پیاوان بە نەزانی لە نوێژەکەیدا چەپڵەی لێدا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە

لەسەر ئەم باسە ئەو فەرموودەیە هاتووە کە سەهلی کوڕی سەعد لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە[١]

## ١٤- بَابٌ: إِذَا قِيلَ لِلْمُصَلِّي تَقَدَّمْ أَوِ انْتَظِرْ فَانْتَظَرَ فَلَا بَأْسَ

١٢١٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُصَلُّونَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَهُمْ عَاقِدُو أُزْرِهِمْ مِنَ الصِّغَرِ عَلَى رِقَابِهِمْ، فَقِيلَ لِلنِّسَاءِ: «لاَ تَرْفَعْنَ رُءُوسَكُنَّ حَتَّى يَسْتَوِيَ الرِّجَالُ جُلُوسًا»[٢].

## ١٤- باسێک: ئەگەر وترا بە نوێژکەر بڕۆرە پێشەوە، یان چاوەڕوان بە، ئەویش چاوەڕوان بوو قەینا کات.

**١٢١٥- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: خەڵکانێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژیان دەکرد، لەبەر بچووکی پۆشاکەکەیان بەستبوویان بە ملیانەوە، وە بە ئافرەتانیش وترا: (( (لە کاتی سوژدەدا) هەتا پیاوەکان بەتەواوی هەڵنەسنەوەو دانەنیشن، ئێوە سەرتان بەرز مەکەنەوە)).**

---

[١] بروانە فەرموودەی ژمارە: ٦٨٤.

[٢] بروانە: ٣٦٢.

## ١٥- بابٌ: لَا يَرُدُّ السَّلَامَ فِي الصَّلَاةِ

١٢١٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنْتُ أُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ فَيَرُدُّ عَلَيَّ، فَلَمَّا رَجَعْنَا سَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ وَقَالَ: «إِنَّ فِي الصَّلَاةِ شُغْلًا»[1].

## ١٥- باسێک: لەنێو نوێژدا وەڵامی سەلامکردن نادرێتەوە

**١٢١٦- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: من جاران پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا بوو، سەلامم لێ دەکرد، ئەویش وەڵامی دەدامەوە، بەڵام کاتێ گەڕاینەوە (لەلای نەجاشی، لەنوێژدا) سەلامم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، وەڵامی نەدامەوە و فەرمووی: ((بێگومان لەنێو نوێژدا سەرقاڵی هەیە (بەقورئان خوێندن و شتی ترەوە) )).**

١٢١٧- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا كَثِيرُ بْنُ شِنْظِيرٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَاجَةٍ لَهُ فَانْطَلَقْتُ، ثُمَّ رَجَعْتُ وَقَدْ قَضَيْتُهَا، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ، فَوَقَعَ فِي قَلْبِي مَا اللَّهُ أَعْلَمُ بِهِ، فَقُلْتُ فِي نَفْسِي: لَعَلَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَجَدَ عَلَيَّ أَنِّي أَبْطَأْتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ سَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ، فَوَقَعَ فِي قَلْبِي أَشَدُّ مِنَ المَرَّةِ الأُولَى، ثُمَّ سَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ عَلَيَّ فَقَالَ: «إِنَّمَا مَنَعَنِي أَنْ أَرُدَّ عَلَيْكَ أَنِّي كُنْتُ أُصَلِّي». وَكَانَ عَلَى رَاحِلَتِهِ مُتَوَجِّهًا إِلَى غَيْرِ القِبْلَةِ[2].

**١٢١٧- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ کارێکی خۆی، منیش ڕۆیشتم، پاشان کارەکەم بەئەنجام گەیاند و گەڕامەوە، ئنجا هاتم**

---

[1] بروانە: ١١٩٩.

[2] بروانە: ٤٠٠.

بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو سەلامم لێكرد، وەڵامی نەدامەوە، منیش شتێك لە دڵمدا دروست بوو، مەگەر هەر خوا بزانێ چەند ناخۆش بوو، لە دڵی خۆمدا وتم: لەوانەیە پێغەمبەری خوا ﷺ دڵگران بوو بێت لێم، چونكە درەنگ گەڕامەوە بۆ لای، پاشان سەلامم لێ كردەوە، هەر وەڵامی نەدامەوە، ئەمجارە لە جاری پێشوو زیاتر دڵگران بووم، پاشان جارێكی تر سەلامم لێ كرد، وەڵامی دامەوەو فەرمووی: ((بێگومان ئەوەی ڕێگر بوو كە وەڵامت بدەمەوە، ئەوە بوو كە من نوێژم دەكرد))، لەوكاتەدا پێغەمبەر ﷺ بە سواری وڵاخەكەیەوە بوو ڕووی لە قیبلە نەبوو.

## ١٦- بابُ رَفْعِ الأَيْدِي فِي الصَّلاَةِ لأَمْرٍ يَنْزِلُ بِهِ

١٢١٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: بَلَغَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَّ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ بِقُبَاءٍ كَانَ بَيْنَهُمْ شَيْءٌ، فَخَرَجَ يُصْلِحُ بَيْنَهُمْ فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَحُبِسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَحَانَتِ الصَّلاَةُ، فَجَاءَ بِلاَلٌ إِلَى أَبِي بَكْرٍ ﷺ فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ حُبِسَ وَقَدْ حَانَتِ الصَّلاَةُ، فَهَلْ لَكَ أَنْ تَؤُمَّ النَّاسَ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِنْ شِئْتَ. فَأَقَامَ بِلاَلٌ الصَّلاَةَ، وَتَقَدَّمَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ فَكَبَّرَ لِلنَّاسِ، وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْشِي فِي الصُّفُوفِ يَشُقُّهَا شَقًّا، حَتَّى قَامَ فِي الصَّفِّ، فَأَخَذَ النَّاسُ فِي التَّصْفِيحِ -قَالَ سَهْلٌ: التَّصْفِيحُ هُوَ التَّصْفِيقُ-. قَالَ: وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ لاَ يَلْتَفِتُ فِي صَلاَتِهِ، فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَفَتَ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَشَارَ إِلَيْهِ يَأْمُرُهُ أَنْ يُصَلِّيَ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ يَدَهُ، فَحَمِدَ اللَّهَ، ثُمَّ رَجَعَ القَهْقَرَى وَرَاءَهُ حَتَّى قَامَ فِي الصَّفِّ، وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى لِلنَّاسِ، فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، مَا لَكُمْ حِينَ نَابَكُمْ شَيْءٌ فِي الصَّلاَةِ أَخَذْتُمْ بِالتَّصْفِيحِ، إِنَّمَا التَّصْفِيحُ لِلنِّسَاءِ، مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلاَتِهِ فَلْيَقُلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ». ثُمَّ التَفَتَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ ﷺ فَقَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ لِلنَّاسِ حِينَ أَشَرْتُ إِلَيْكَ؟». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا كَانَ يَنْبَغِي لِابْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

---

[1] بڕوانە: ٦٨٤.

# ١٦- باسی بەرزکردنەوەی دەستەکان لەنێو نوێژدا لەبەر کارێک لێی ڕوودەدات

١٢١٨- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گەشتبوو کە هۆزی عەمری کوڕی عەوف لە قوبا ناکۆکی هەیە لە نێوانیاندا، بۆیە پێغەمبەری خواش ﷺ لەگەڵ چەند کەسێ لە هاوەڵانی ڕۆیشت تا نێوانیان چاك بکات، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دواخرا (هەر نەهاتەوە) و کاتی نوێژ هات، بیلال ﷺ هات بۆ لای ئەبو بەکر ﷺ وتی: ئەی ئەبو بەکر بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوت و کاتی نوێژە، دەی ئایا پێشنوێژی دەکەی بۆ خەڵکی؟ وتی: بەڵێ ئەگەر ویستت، بیلالیش ﷺ قامەتی نوێژی کرد، ئەبو بەکر ڕۆیشتە پێشەوە، ئەڵاهو ئەکبەری کرد بە پێشنوێژ بۆ خەڵکەکە، پێغەمبەری خواش ﷺ (گەڕایەوەو) بەنێوان ڕیزەکاندا دەڕۆیشت، بەینی تێدەخستن هەتا لە ڕیزی یەکەمدا وەستا، خەڵکەکەش دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان -سەهل وتی: (التَّصْفِيحُ) واتە: چەپڵەلێدان- دەڵێ: ئەبو بەکریش ﷺ لە نوێژدا لای نەدەکردەوە، جا کە خەڵکەکە زۆر چەپڵەیان لێدا، ئەبو بەکر لای کردەوەو پێغەمبەری خوای بینی ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژە بۆکرد و فەرمانی پێ کرد کە پێشنوێژییەکەی بکات، ئەبو بەکریش ﷺ هەردوو دەستی بەرزکردەوەو سوپاسی خوای کرد، ئینجا پشتاو پشت گەڕایەوە دواوە هەتا لە ڕیزەکەدا وەستا، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتە پێشەوە پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، جا کە لێ بوویەوە ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە! ئەوە چیتانە کاتێ لەنوێژدا ئاگاداریتان دا بۆ شتێ، دەستتان کرد بە چەپڵەلێدان؟ بێگومان چەپڵە لێدان بۆ ئافرەتانە، ئەگەر کەسێ ئاگاداری بەشتێ دا لەنوێژەکەیدا، ئەوە با بڵێت: (سبحان الله) ))، پاشان لای کردەوە بەلای ئەبو بەکردا ﷺ فەرمووی:

((ئەبو بەکر چی ڕێگری کردی لەوەی کە پێشنوێژی بکەیت بۆ خەڵکەکە کە من ئاماژەم بۆ کردیت؟)) ئەبو بەکریش ﷺ وتی: شیاو نییە بۆ کوڕی ئەبی قوحافە کە لە پێشی پێغەمبەری خواوە ﷺ نوێژ بکات.

## ١٧- بابُ الخَصْرِ فِي الصَّلَاةِ

١٢١٩- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نُهِيَ عَنِ الخَصْرِ فِي الصَّلَاةِ. وَقَالَ هِشَامٌ وَأَبُو هِلَالٍ: عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ١٧- باسی دەست خستنە کەلەکە لە نوێژدا

**١٢١٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: دەست خستنە کەلەکە لە نوێژدا قەدەغەکراوە. هیشام و ئەبو هیلال لە ئیبنو سیرینەوە، ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

١٢٢٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نُهِيَ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا[2].

**١٢٢٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ڕێگری کراوە لەوەی مرۆڤ کاتێ نوێژ دەکات، هەردوو دەستی بخاتە سەر کەلەکەی.**

---

[1] بڕوانە: ١٢٢٠.

[2] بڕوانە: ١٢١٩.

## ١٨- بابٌ: يُفْكِرُ الرَّجُلُ الشَّيْءَ فِي الصَّلاَةِ

وَقَالَ عُمَرُ ﷺ: إِنِّي لأُجَهِّزُ جَيْشِي وَأَنَا فِي الصَّلاَةِ.

١٢٢١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، حَدَّثَنَا رَوْحٌ، حَدَّثَنَا عُمَرُ -هُوَ ابْنُ سَعِيدٍ- قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الحَارِثِ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ العَصْرَ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ سَرِيعًا دَخَلَ عَلَى بَعْضِ نِسَائِهِ، ثُمَّ خَرَجَ وَرَأَى مَا فِي وُجُوهِ القَوْمِ مِنْ تَعَجُّبِهِمْ لِسُرْعَتِهِ فَقَالَ: «ذَكَرْتُ وَأَنَا فِي الصَّلاَةِ تِبْرًا عِنْدَنَا، فَكَرِهْتُ أَنْ يُمْسِيَ أَوْ يَبِيتَ عِنْدَنَا فَأَمَرْتُ بِقِسْمَتِهِ»[1].

## ١٨- باسێک: مرۆڤ لەنێو نوێژدا شتێکی بیر بکەوێتەوە

**عومەر ﷺ دەڵێ: بێگومان من سوپاکەم ڕێك دەخەم لەکاتێکدا کە لە نوێژدام.**

**١٢٢١- عوقبەی کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی عەسرم کرد، جا کە سەلامی دایەوە بە پەلە هەستا ڕۆیشت بۆ ماڵی یەکێك لە خێزانەکانی، پاشان هاتە دەرەوە، لەدەم و چاوی خەڵکەکەدا سەرسامی بەدیکرد لە پەلەکردنەکەی، بۆیە فەرمووی: ((لەنێو نوێژەکەدا بیرم کەوتەوە پارچە ئاڵتونێك[2] لە ماڵماندایە، حەزم نەکرد ئێوارە یان شەوی بەسەردا بێت لە لامان بمێنێتەوە، بۆیە فەرمانم کرد بە دابەشکردنی)).**

١٢٢٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ جَعْفَرٍ، عَنِ الأَعْرَجِ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُذِّنَ بِالصَّلاَةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ لَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا سَكَتَ المُؤَذِّنُ أَقْبَلَ، فَإِذَا ثُوِّبَ أَدْبَرَ، فَإِذَا سَكَتَ أَقْبَلَ، فَلاَ يَزَالُ بِالمَرْءِ يَقُولُ لَهُ: اذْكُرْ

---

[1] بڕوانە: ٨٥١.

[2] تِبْرًا: بە ئاڵتونێک دەوترێ نەکرابێ بەخشڵ و، نەکرابێ بەدراو و پارە، وە بە خۆڵی ئاڵتون و ئاڵتونی وردکراویش دەوترێ.

مَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ، حَتَّى لاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى. قَالَ أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: إِذَا فَعَلَ أَحَدُكُمْ ذَلِكَ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ قَاعِدٌ. وَسَمِعَهُ أَبُو سَلَمَةَ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁[1].

**١٢٢٢- ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کاتێ بانگدرا بۆ نوێژ شەیتان پشت هەڵدەکات و دەڕوات و تڕ لێدەدات، هەتا گوێی لە بانگدانەکە نەبێت، جا کە بانگبێژەکە بێدەنگ بوو دێتەوە، ئینجا کە قامەت کرا پشت هەڵدەکات و دەڕوات، ئینجا کە (قامەتبێژەکە) بێدەنگ بوو دێتەوە، بەردەوام لەگەڵ مرۆڤ هەوڵ دەدا پێی دەڵێ: بیربکەرەوە لە شتێ کە بیری لێ نەکردۆتەوە، هەتا وای لێ دەکات نازانێ چەند ڕکات نوێژی کردووە))، ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان وتی: ئەگەر کەسێکتان وای کرد، با دوو سوژدە ببات بەدانیشتنەوە. ئەبو سەلەمە ئەمەی لە ئەبو هورەیرە بیستووە ﵁.**

١٢٢٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﵁: يَقُولُ النَّاسُ أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ. فَلَقِيتُ رَجُلًا فَقُلْتُ: بِمَ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْبَارِحَةَ فِي الْعَتَمَةِ؟ فَقَالَ لاَ أَدْرِي. فَقُلْتُ: لَمْ تَشْهَدْهَا؟ قَالَ: بَلَى. قُلْتُ: لَكِنْ أَنَا أَدْرِي، قَرَأَ سُورَةَ كَذَا وَكَذَا.

**١٢٢٣- ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: خەڵکی دەڵێن ئەبو هورەیرە فەرموودەی زۆر دەگێڕێتەوە، جا بە پیاوێك گەیشتم و وتم: ئەم شەوی ڕابورد پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی عیشادا چ سووڕەتێکی خوێند؟ وتی: نازانم، ئینجا وتم: ئامادەی نوێژەکە نەبوویت؟ وتی: با ئامادە بووم، وتم: بەڵام من دەزانم چی خوێند، سووڕەتی ئەوەو ئەوەی خوێند.**

---

[1] بروانه: ٦٠٨.

# ٢٢- كِتَابُ السَّهْوِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٢٢- پەڕاوی هەڵەکردن

## ١- باب فِي السَّهْوِ إِذَا قَامَ مِنْ رَكْعَتَيِ الفَرْضِ

١٢٢٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ مِنْ بَعْضِ الصَّلَوَاتِ، ثُمَّ قَامَ فَلَمْ يَجْلِسْ، فَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ وَنَظَرْنَا تَسْلِيمَهُ كَبَّرَ قَبْلَ التَّسْلِيمِ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، ثُمَّ سَلَّمَ[١].

## ١- باسی ئەوەی لەبارەی (حوکمی) هەڵەکردنەوە هاتووە، ئەگەر نوێژخوێن لە دووەم ڕکاتی فەرزدا هەستایەوە (دانەنیشت بۆ تەحیات خوێندن)

**١٢٢٤- ئیبنو شیهاب لە عەبدوڕەحمانی ئەعرەجەوە گێڕایەوە ئەویش لە عەبدوڵای کوڕی بوحەینەوە ﷺ گێڕایەوە کە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژێك لە نوێژەکاندا دوو ڕکات پێشنوێژی بۆ کردین، پاشان هەستایەوەو دانەنیشت (تەحیاتی یەکەم بخوێنێ)، خەڵکەکەش لەگەڵیدا هەستانەوە (بەردەوام بوون)، ئینجا کە**

---

[١] بڕوانە: ٨٢٩.

نوێژەکەی تەواوکرد چاوەڕوانی سەلامدانەوەمان کرد، پێش سەلامدانەوە ئەڵاهو ئەکبەری کرد، جا بە دانیشتنەوە دوو سوژدەی برد، پاشان سەلامی دایەوە.

١٢٢٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ مِنِ اثْنَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ لَمْ يَجْلِسْ بَيْنَهُمَا، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ[1].

١٢٢٥- یەحیای کوڕی سەعید لە عەبدورەحمانی ئەعرەجەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە عەبدوڵای کوڕی بوحەینەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکاتی دووەمی نوێژی نیوەڕۆدا هەستایەوەو لە نێوانیاندا دانەنیشت (بۆ تەحیات خوێندن)، جا کە نوێژەکەی تەواو کرد دوو سوژدەی برد، پاشان دوای ئەوە سەلامی دایەوە.

## ٢- بابٌ: إِذَا صَلَّى خَمْسًا

١٢٢٦- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنْ عَلْقَمَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقِيلَ لَهُ: أَزِيدَ فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: «وَمَا ذَاكَ». قَالَ: صَلَّيْتَ خَمْسًا. فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ مَا سَلَّمَ[2].

## ٢- باسێک: گەر نوێژخوێن پێنج ڕکاتی کرد

١٢٢٦- عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ پێنج ڕکاتی کرد، ئینجا پێی وترا: ئایا نوێژ زیادکراوە؟ ئەویش فەرمووی: ((چی بووە؟)) وتی: پێنج ڕکاتت کرد، پێغەمبەریش ﷺ دوای ئەوەی سەلامی دابوویەوە دوو سوژدەی بر.

---

[1] بڕوانە: ٨٢٩.

[2] بڕوانە: ٤٠١.

## ٣- بابٌ: إِذَا سَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ أَوْ فِي ثَلاَثٍ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ مِثْلَ سُجُودِ الصَّلاَةِ أَوْ أَطْوَلَ

١٢٢٧- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ -أَوِ العَصْرَ- فَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ ذُو اليَدَيْنِ: الصَّلاَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَقَصَتْ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأَصْحَابِهِ: «أَحَقٌّ مَا يَقُولُ؟». قَالُوا: نَعَمْ. فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ. قَالَ سَعْدٌ: وَرَأَيْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ صَلَّى مِنَ المَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ، فَسَلَّمَ وَتَكَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى مَا بَقِيَ وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، وَقَالَ: هَكَذَا فَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ[1].

## ٣- باسێک: ئەگەر لە ڕکاتی دووەم، یان سێیەمدا سەلامی دایەوە و دوو سوژدەی برد، وەک سوژدەکانی نوێژ یان درێژتر

**١٢٢٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی نوێژێکی نیوەڕۆ - یان عەسر-ی بۆ کردین، پاشان سەلامی دایەوە، پیاوە دەستدرێژەکەش پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ کورت بۆتەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی بەهاوەڵانی: ((ئایا ئەوەی دەیڵێ ڕاستە؟))، ئەوانیش وتیان: بەڵێ وایە، ئینجا دوو ڕکاتی تریشی کرد، پاشان دوو سوژدەی برد، سەعد (ی کوڕی ئیبراهیم) دەڵێ: عوروەی کوڕی زوبەیرم بینی لە نوێژی مەغریبدا دوو ڕکاتی کرد، ئینجا سەلامی دایەوەو قسەی کرد، پاشان ڕکاتەکەی کە مابوو کردی و دوو سوژدەی (هەڵەکردنی) بردو، وتی: پێغەمبەر ﷺ ئاوەهای کرد.**

---

[1] بڕوانە: ٤٨٢.

## ٤- بابُ مَنْ لَمْ يَتَشَهَّدْ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ

وَسَلَّمَ أَنَسٌ وَالحَسَنُ وَلَمْ يَتَشَهَّدَا. وَقَالَ قَتَادَةُ لاَ يَتَشَهَّدُ.

١٢٢٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ أَبِي تَمِيمَةَ السَّخْتِيَانِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ انْصَرَفَ مِنِ اثْنَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ذُوالیَدَيْنِ: أَقُصِرَتِ الصَّلاَةُ أَمْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَصَدَقَ ذُو اليَدَيْنِ؟». فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ. فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى اثْنَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ ثُمَّ رَفَعَ[1].

## ٤- باسی ئەوەی لە بردنی دوو سوژدەکەی هەڵەکردندا تەحیات نەخوێنی

**ئەنەس و حەسەن (دوای سوژدەی هەڵەکردن) سەلامیان داوەتەوەو تەحیاتیان نەخوێندووە، قەتادە دەڵێ: تەحیات ناخوێنێ.**

**١٢٢٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دووەم ڕکاتدا نوێژەکەی کۆتایی پێهێنا، پیاوە دەستدرێژەکەش پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ کورت بۆتەوە، یان لە بیرت چوو؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دەستدرێژ ڕاست دەکات؟))، خەڵکەکەش وتیان: بەڵێ ڕاست دەکات، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو دوو ڕکاتی تری کرد، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان ئەڵاهو ئەکبەری کرد، جا بە وێنەی سوژدەی نوێژ دوو سوژدەی برد، یان درێژتر، پاشان سەری بەرزکردەوە.**

١٢٢٨م- حدثنا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ عَلْقَمَةَ قال: قُلْتُ لِمُحَمَّدٍ: فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ تَشَهُّدٌ؟ قَالَ: لَيْسَ فِي حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ.

---

[1] بڕوانە: ٤٨٢.

**١٢٢٨م- سولەیمانی كوڕی حەرب دەڵێ: حەمماد بۆی گێڕاینەوە لە سەلەمەی كوڕی عەلقەمەوە دەڵێ: بە موحەممەدم وت: ئایا لە دوو سوژدەكەی هەڵەكردندا تەحیات خوێندن هەیە؟ وتی: لە فەرموودەكەی ئەبو هورەیرەدا نیە.**

## ٥- بابُ مَنْ يُكَبِّرُ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ

١٢٢٩- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ إِحْدَى صَلاَتَيِ العَشِيِّ -قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَكْثَرُ ظَنِّي العَصْرَ- رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى خَشَبَةٍ فِي مُقَدَّمِ المَسْجِدِ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهَا، وَفِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ ﷺ فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ، وَخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ فَقَالُوا: أَقَصُرَتِ الصَّلاَةُ؟ وَرَجُلٌ يَدْعُوهُ النَّبِيُّ ﷺ ذُو اليَدَيْنِ فَقَالَ: أَنَسِيتَ أَمْ قَصُرَتْ؟ فَقَالَ: «لَمْ أَنْسَ وَلَمْ تُقْصَرْ». قَالَ: بَلَى قَدْ نَسِيتَ. فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَكَبَّرَ، ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ فَكَبَّرَ فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ[1].

## ٥- باسی ئەوەی لە دوو سوژدەكەی هەڵەكردندا ئەڵاهو ئەكبەر دەكات

**١٢٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ یەكێك لە دوو نوێژەكەی تاقی ئێوارەی كرد -موحەممەد (یەكێكە لە ڕاوییەكان) وتی: زۆرتر گومانم بەلای ئەوەدایە نوێژی عەسر بوو-، دوو ڕكاتی كرد، پاشان سەلامی دایەوە، جا هەڵساو ڕۆیشت بۆ لای ئەو تەختەی كە لە پێشەوەی مزگەوتدا دانرابوو، دەستی خستە سەری، ئەبو بەكر و عومەریش ﷺ لەنێو خەڵكەكەدا بوون، بەڵام شەرمیان**

---

[1] بڕوانە: ٤٨٢.

کرد قسە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکەن، وە ئەوانەی بە پەلەبوون لە مزگەوت ڕۆیشتنە دەرەوەو، وتیان: نوێژ کورت بۆتەوە؟ پیاوێك هەبوو پێغەمبەر ﷺ پێی دەوت دەستدرێژەکە، (ئەو پیاوە) وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) ئایا لە بیرت چوو (دوو ڕکاتت کرد)، یان نوێژ کورت بۆتەوە؟ فەرمووی: ((نە لەبیرم چووەو نەنوێژیش کورت بۆتەوە!)) وتی: بە دڵنیاییەوە بیرت چووە، ئینجا دوو ڕکاتی تری کرد، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان (الله أكبر)ی کردو سوژدەی برد وەك سوژدەی تر، یان درێژتر، پاشان سەری بەرزکردەوەو (الله أكبر)ی کرد. پاشان سەری نزم کردەوە و (الله أكبر)ی کردو سوژدەیەکی وەك سوژدەکانی تری برد یان درێژتر، پاشان سەری بەرزکردەوە و (الله أكبر)ی کرد.

١٢٣٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ الأَسْدِيِّ حَلِيفِ بَنِي عَبْدِ المُطَّلِبِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ فِي صَلاَةِ الظُّهْرِ وَعَلَيْهِ جُلُوسٌ، فَلَمَّا أَتَمَّ صَلاَتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، فَكَبَّرَ فِي كُلِّ سَجْدَةٍ وَهُوَ جَالِسٌ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، وَسَجَدَهُمَا النَّاسُ مَعَهُ مَكَانَ مَا نَسِيَ مِنَ الجُلُوسِ. تَابَعَهُ ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ فِي التَّكْبِيرِ[1].

١٢٣٠- عەبدوڵای کوڕی بوحەینەی ئەسەدی ﷺ کە هاوپەیمانی بنەماڵەی عەبدولموتەڵیبە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆدا هەستایەوە کە دەبوو دانیشتبایە (بۆ تەحیات)، جا کاتێ نوێژەکەی تەواوکرد، دوو سوژدەی (هەڵەکردنی) برد، جا لە هەر سوژدەیەکیاندا ئەڵاهو ئەکبەری کرد بە دانیشتنە[illegible]پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، خەڵکەکەش لەگەڵیدا ئەو دوو سوژدەیان برد [illegible]باتی ئەو دانیشتنەی لەبیری چوو دانیشێت. ئیبنو جورەیج

[1] بڕوانە: ٨٢٩.

لە ئیبنو شیهابەوە فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە، لە ئەلاهو ئەکبەرکردنەکەدا (بۆ سوژدەی هەڵەکردن) پاڵپشتی فەرموودەکەی لەیس دەکات لە ئیبنو شیهابەوە.

## ٦- بابٌ: إِذَا لَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى ثَلاَثًا أَوْ أَرْبَعًا، سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ

١٢٣١- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الدَّسْتَوَائِيُّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا نُودِيَ بِالصَّلاَةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ الأَذَانَ، فَإِذَا قُضِيَ الأَذَانُ أَقْبَلَ، فَإِذَا ثُوِّبَ بِهَا أَدْبَرَ، فَإِذَا قُضِيَ التَّثْوِيبُ أَقْبَلَ حَتَّى يَخْطِرَ بَيْنَ المَرْءِ وَنَفْسِهِ، يَقُولُ: اذْكُرْ كَذَا وَكَذَا. مَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ، حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ إِنْ يَدْرِي كَمْ صَلَّى، فَإِذَا لَمْ يَدْرِ أَحَدُكُمْ كَمْ صَلَّى ثَلاَثًا أَوْ أَرْبَعًا، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»[1].

## ٦- باسێک: ئەگەر کەسێک نەیزانی چەند ڕکاتی کردووە سێ یان چوار، بەدانیشتنەوە دوو سوژدە دەبات

١٢٣١- ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((ئەگەر بانگدرا بۆ نوێژ، شەیتان پشت هەڵدەکات و دەڕوا بەتڕلێدانەوە (بای لێ دەردەچێ)، بۆ ئەوەی بانگەکە نەبیستێ، جا کە بانگەکە تەواو بوو دێتەوە، ئینجا کە قامەت کرا پشت هەڵدەکات و دەڕوا، کە قامەتەکە تەواو کرا دێتەوە، هەتا دوودڵی و وەسوەسە بخاتە نێوان مرۆڤ و دڵیەوە و دەڵێ: بیری ئەوە و ئەوە بکە، کە بیری لێ نەکردووەتەوە، هەتا

[1] بڕوانە: ٦٠٨.

نوێژخوێنەكە وا لێ دەكات نازانێ چەند ڕكات نوێژی كردووە، جا ئەگەر كەسێكتان نەیزانی چەند ڕكات نوێژی كردووە سێ یان چوار، ئەوە با بەدانیشتنەوە دوو سوژدە ببات)).

## ٧- بابُ السَّهْوِ فِي الفَرْضِ وَالتَّطَوُّعِ

وَسَجَدَ ابْنُ عَبَّاسٍ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ وِتْرِهِ.

١٢٣٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي جَاءَ الشَّيْطَانُ فَلَبَسَ عَلَيْهِ حَتَّى لاَ يَدْرِيَ كَمْ صَلَّى، فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»[١].

## ٧- باسی هەڵەكردن لە نوێژی فەڕز و سوننەتدا

عەبدوڵای كوڕی عەباس ﵄ لە دوای سوننەتی ویترەكەی دوو سوژدەی (هەڵەكردنی) برد.

١٢٣٢- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان كەسێ لە ئێوە كاتێ هەستا نوێژ بكات، شەیتان دێت و سەری لێ تێك دەدات، هەتا نازانێ چەند ڕكات نوێژی كردووە، جا ئەگەر كەسێكتان ئەوەی هەست پێ كرد، ئەوە با بەدانیشتنەوە دوو سوژدەی (هەڵەكردنی) ببات)).

---

[١] بڕوانە: ٦٠٨.

## ٨- بابٌ: إِذَا كُلِّمَ وَهُوَ يُصَلِّي فَأَشَارَ بِيَدِهِ وَاسْتَمَعَ

**١٢٣٣-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ كُرَيْبٍ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ، وَالمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَزْهَرَ ﷺ أَرْسَلُوهُ إِلَى عَائِشَةَ ﷺ، فَقَالُوا: اقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلاَمَ مِنَّا جَمِيعًا وَسَلْهَا عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ صَلاَةِ العَصْرِ وَقُلْ لَهَا: إِنَّا أُخْبِرْنَا أَنَّكِ تُصَلِّينَهُمَا وَقَدْ بَلَغَنَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْهَا. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَكُنْتُ أَضْرِبُ النَّاسَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ عَنْهُمَا. فَقَالَ كُرَيْبٌ: فَدَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ﷺ فَبَلَّغْتُهَا مَا أَرْسَلُونِي. فَقَالَتْ: سَلْ أُمَّ سَلَمَةَ. فَخَرَجْتُ إِلَيْهِمْ فَأَخْبَرْتُهُمْ بِقَوْلِهَا، فَرَدُّونِي إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ بِمِثْلِ مَا أَرْسَلُونِي بِهِ إِلَى عَائِشَةَ. فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ ﷺ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَنْهَى عَنْهَا، ثُمَّ رَأَيْتُهُ يُصَلِّيهِمَا حِينَ صَلَّى العَصْرَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَيَّ وَعِنْدِي نِسْوَةٌ مِنْ بَنِي حَرَامٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَأَرْسَلْتُ إِلَيْهِ الجَارِيَةَ فَقُلْتُ: قُومِي بِجَنْبِهِ، قُولِي لَهُ: تَقُولُ لَكَ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، سَمِعْتُكَ تَنْهَى عَنْ هَاتَيْنِ وَأَرَاكَ تُصَلِّيهِمَا. فَإِنْ أَشَارَ بِيَدِهِ فَاسْتَأْخِرِي عَنْهُ. فَفَعَلَتِ الجَارِيَةُ فَأَشَارَ بِيَدِهِ فَاسْتَأْخَرَتْ عَنْهُ فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «يَا بِنْتَ أَبِي أُمَيَّةَ سَأَلْتِ عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ العَصْرِ وَإِنَّهُ أَتَانِي نَاسٌ مِنْ عَبْدِ القَيْسِ فَشَغَلُونِي عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، فَهُمَا هَاتَانِ»[1].

## ٨- باسێک: ئەگەر نوێژخوێن لەکاتی نوێژکردندا قسەی لەگەڵدا کرا ئەویش بەدەستی ئاماژەی کردو گوێی گرت

**١٢٣٣- کوڕەیب دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەباس و میسوەری کوڕی مەخرەمەو عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەزهەر ﷺ ناردیان بۆ لای عائیشە ﷺ و وتیان سەلامی هەمووومانی پێ بگەیەنە، وە پرسیاری لێ بکە دەربارەی دوو ڕکاتەکەی پاش**

---

[1] بروانە: ٤٣٧٠.

نوێژی عەسرو پێی بڵێ: ئێمە بۆیان گێڕاوینەتەوە کە تۆ ئەو دوو ڕکاتەی پاش نوێژی عەسر دەکەیت، لەکاتێکدا بەدڵنیاییەوە ئێمە پێمان گەشتووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ کردووە، وە عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ وتی: من لەگەڵ عومەری کوڕی خەتابدا لە خەڵکم دەدا لەسەر کردنی ئەو دوو ڕکاتە، کوڕەیبیش وتی: منیش ڕۆیشتم بۆماڵی عائیشە ﷺ ئەوەی بە مندا ناردیان پێم ڕاگەیاند، عائیشەش ﷺ وتی: پرسیار لە ئوممو سەلەمە بکە، منیش ڕۆیشتمە دەرەوە بۆ لایان و قسەکەی عائیشەم پێ وتن، ئەوانیش ناردمیانەوە بۆ لای ئوممو سەلەمە بۆ هەمان پرسیار کە ناردمیان بۆ لای عائیشە، ئوممو سەلەمەش ﷺ وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە ڕێگری کردووە لەو (دوو ڕکاتە) نوێژە، پاشان پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ئەو دوو ڕکاتەی دەکرد کاتێ نوێژی عەسری کرد، پاشان هات بۆ ماڵی من چەند ئافرەتێکم لە بەنو حەرامی ئەنصاریم لابوو، ئینجا کچێکم نارد بۆ لای وتم: لە تەنیشتیدا بوەستە و پێی بڵێ: ئوممو سەلەمە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا گوێم لێ بووە ئەم دوو ڕکاتە سوننەتەت قەدەغە کردووە، کەچی دەبینم خۆت دەیانکەیت؟ جا ئەگەر بەدەستی ئاماژەی بۆ کردی لێی دوورکەوە، کچەکەش وای کرد پێغەمبەر ﷺ بەدەستی ئاماژەی کرد و کچەکە لێی دوورکەوتەوە، جا کە لە نوێژەکە بوویەوە فەرمووی: ((ئەی کچی ئەبی ئومەییە دەربارەی ئەم دوو ڕکات نوێژەی پاش عەسر پرسیارت کردبوو، چەند کەسێکی هۆزی عەبدولقەیس هاتن بۆ لام سەرقاڵیان کردم لە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پاش نیوەڕۆ، ئەم دوو ڕکاتە ئەو دوو ڕکاتەیە (ئێستا دەیانکەم) )).

## ٩- بابُ الإِشَارَةِ فِي الصَّلاَةِ

قَالَهُ كُرَيْبٌ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٢٣٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَلَغَهُ أَنَّ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ كَانَ بَيْنَهُمْ شَيْءٌ فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصْلِحُ بَيْنَهُمْ فِي أُنَاسٍ مَعَهُ، فَحُبِسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَحَانَتِ الصَّلاَةُ فَجَاءَ بِلاَلٌ إِلَى أَبِي بَكْرٍ ﷺ فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ حُبِسَ وَقَدْ حَانَتِ الصَّلاَةُ فَهَلْ لَكَ أَنْ تَؤُمَّ النَّاسَ؟ قَالَ: نَعَمْ إِنْ شِئْتَ. فَأَقَامَ بِلاَلٌ وَتَقَدَّمَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ فَكَبَّرَ لِلنَّاسِ وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْشِي فِي الصُّفُوفِ حَتَّى قَامَ فِي الصَّفِّ، فَأَخَذَ النَّاسُ فِي التَّصْفِيقِ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ لاَ يَلْتَفِتُ فِي صَلاَتِهِ، فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَفَتَ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُهُ أَنْ يُصَلِّيَ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ يَدَيْهِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَرَجَعَ القَهْقَرَى وَرَاءَهُ حَتَّى قَامَ فِي الصَّفِّ، فَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى لِلنَّاسِ، فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: .يَا أَيُّهَا النَّاسُ مَا لَكُمْ حِينَ نَابَكُمْ شَيْءٌ فِي الصَّلاَةِ أَخَذْتُمْ فِي التَّصْفِيقِ، إِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ، مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلاَتِهِ فَلْيَقُلْ سُبْحَانَ اللَّهِ. فَإِنَّهُ لاَ يَسْمَعُهُ أَحَدٌ حِينَ يَقُولُ سُبْحَانَ اللَّهِ إِلاَّ التَفَتَ، يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ لِلنَّاسِ حِينَ أَشَرْتُ إِلَيْكَ؟.. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: مَا كَانَ يَنْبَغِي لاِبْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

## ٩- باسی ئاماژەکردن لەنێو نوێژدا

**کوڕەیب لە ئوممو سەلەمەوە ﷺ ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە (وەك لە فەرموودەی پێشوودا هاتووە).**

**١٢٣٤- سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گەشتبوو کە هۆزی عەمری کوڕی عەوف لە نێوانیاندا ناکۆکی هەیە، بۆیە پێغەمبەری خواش ﷺ لەگەڵ چەند کەسێ ڕۆشت تا نێوانیان چاك بکات، جا**

---

[1] بڕوانە: ٦٨٤.

پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوت و کاتی نوێژ هات، بیلال هات بۆ لای ئەبو بەکر ﷺ وتی: ئەی ئەبو بەکر بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوت و کاتی نوێژیشە، دەی ئایا پێشنوێژی دەکەی بۆ خەڵکی؟ ئەبو بەکریش وتی: بەڵێ ئەگەر ویستت، بیلالیش قامەتی کرد، ئەبو بەکر ڕۆیشتە پێشەوە ئەڵاهو ئەکبەری کرد بە پێشنوێژ بۆ خەڵکەکە، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە بەنێو ڕیزەکاندا دەڕۆیشت، هەتا لە ڕیزی یەکەمدا وەستا، خەڵکەکە دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان، ئەبو بەکریش لە نوێژدا لای نەدەکردەوە، جا کە خەڵکەکە زۆر چەپڵەیان لێ دا، ئەبو بەکر لای کردەوەو پێغەمبەزی خوای بینی، پێغەمبەری خواش ﷺ بەئاماژە بۆ کردن فەرمانی پێکرد کە پێشنوێژییەکەی بکات، ئەبو بەکریش هەردوو دەستی بەرزکردەوە سوپاسی خوای کرد، وە پشتاو پشت گەڕایەوە دواوە هەتا لە ڕیزەکەدا وەستا، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕۆیشتە پێشەوە پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، جا کە لێ بوویەوە ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە! ئەوە چیتانە کاتێ لە نوێژدا ئاگاداری دەدەن بۆ شتێ دەست دەکەن بە چەپڵەلێدان؟ بێگومان چەپڵە لێدان بۆ ئافرەتانە، ئەگەر کەسێ ئاگاداری بەشتێ دا لە نوێژەکەیدا، ئەوە با بڵێت: (سبحان الله)، چونکە بەڕاستی هەرکەسێ بیبیستێ کەسێ دەڵێ: (سبحان الله)، لادەکاتەوە، ئەی ئەبو بەکر چی ڕێگری کردی کە پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکەیت کە من ئاماژەم بۆ کردیت؟))، ئەبو بەکریش ﷺ وتی: شیاو نیە بۆ کوڕی ئەبی قوحافە نوێژ بکات لە پێش پێغەمبەری خواوە ﷺ.

١٢٣٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، حَدَّثَنَا الثَّوْرِيُّ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ﷺ وَهِيَ تُصَلِّي قَائِمَةً، وَالنَّاسُ قِيَامٌ فَقُلْتُ: مَا شَأْنُ النَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا إِلَى السَّمَاءِ. فَقُلْتُ آيَةٌ؟ فَقَالَتْ بِرَأْسِهَا أَيْ: نَعَمْ[1].

---

[1] بڕوانە: ٨٦.

**١٢٣٥- ئەسمائی (كچی ئەبو بەكر) ﵄ دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە لە كاتێكدا وەستا بوو نوێژی (خۆرگیرانی) دەكرد، خەڵكیش وەستابوون (لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژیان دەكرد)، وتم: ئەوە خەڵكی چییانە (شڵەژاون)؟ عائیشەش بە سەری ئاماژەی كرد بۆ ئاسمان (واتە: خۆرگیراوە). وتم: ئەم خۆرگیرانە نیشانەیەكە (خوا بەندەكانی پێ دەترسێنێ)؟ ئەویش بەسەر ئاماژەی كرد بەڵێ وایە.**

١٢٣٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ هِشَامٍ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِهِ وَهُوَ شَاكٍ جَالِسًا، وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنِ اجْلِسُوا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا»[1].

**١٢٣٦- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش بوو، لەماڵەوە بە دانیشتنەوە نوێژی كرد، كەسانێك لەدوایەوە بەپێوە نوێژیان كرد، ئەویش ئاماژەی بۆ كردن: ((كە دانیشن))، جا كاتێ لەنوێژەكەی بوویەوە فەرمووی: ((بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە تا پەیڕەوی لێ بكرێ، كەوا بوو ئەگەر كڕنووشی برد ئێوەش كڕنووش ببەن، وە ئەگەر بەرز بوویەوە ئێوەش بەرز ببنەوە))**

---

[1] بڕوانە: ٦٨٨.

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٢٣- پەڕاوی مردوو و جەنازە

## ١- بابٌ: فِي الجَنَائِزِ، وَمَنْ كَانَ آخِرُ كَلَامِهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ

وَقِيلَ لِوَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ: أَلَيْسَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مِفْتَاحُ الجَنَّةِ؟ قَالَ: بَلَى، وَلَكِنْ لَيْسَ مِفْتَاحٌ إِلاَّ لَهُ أَسْنَانٌ، فَإِنْ جِئْتَ بِمِفْتَاحٍ لَهُ أَسْنَانٌ فُتِحَ لَكَ، وَإِلَّا لَمْ يُفْتَحْ لَكَ.

١٢٣٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا مَهْدِيُّ بْنُ مَيْمُونٍ، حَدَّثَنَا وَاصِلٌ الأَحْدَبُ، عَنِ المَعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَانِي آتٍ مِنْ رَبِّي فَأَخْبَرَنِي -أَوْ قَالَ: بَشَّرَنِي- أَنَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الجَنَّةَ». قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟! قَالَ: «وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ»[1].

## ١- باسێک: دەربارەی جەنازە، وە هەرکەس کۆتا وتەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بێت

**بە وەهبی کوڕی مونەبیی وترا: ئایا (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) کلیلی بەهەشت نییە؟ وتی: بەڵێ، بەڵام کلیل نییە ددانی نەبێت، جا ئەگەر کلیلێکت هێنا ددانی هەبوو دەرگای بەهەشتت بۆ دەکرێتەوە، ئەگەر ددانی نەبوو ناکرێتەوە بۆت.**

**١٢٣٧- ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نێردراوێك (جیبریل) لەلایەن خوای گەورەوە هات بۆ لام، هەواڵی دامێ -یان مژدەی دامێ-**

[1] بڕوانە: ١٤٠٨، ٢٣٨٨، ٣٢٢٢، ٥٨٢٧، ٦٢٦٨، ٦٤٤٣، ٦٤٤٤، ٧٤٨٧.

كە هەركەس لە ئوممەتەكەم بمرێت، هیچ شتێكی نەكردبێتە هاوبەشی خوا، دەچێتە بەهەشتەوە))، ئەبو زەڕ دەڵێ وتم: ئەگەر زیناو دزیشی كردبێ؟ فەرمووی: ((ئەگەر زیناو دزیشی كردبێ)).

١٢٣٨- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا شَقِيقٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ». وَقُلْتُ أَنَا: مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الجَنَّةَ[1].

**١٢٣٨- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەركەس بمرێ شتێكی كردبێتە هاوبەشی خوا دەچێتە دۆزەخەوە))، عەبدوڵا دەڵێ: منیش وتم: هەركەس بمرێ هیچ شتێكی نەكردبێتە هاوبەشی خوا دەچێتە بەهەشتەوە.**

## ٢- بَابُ الأَمْرِ بِاتِّبَاعِ الجَنَائِزِ

١٢٣٩- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَشْعَثِ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ البَرَاءِ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ، أَمَرَنَا بِاتِّبَاعِ الجَنَائِزِ، وَعِيَادَةِ المَرِيضِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَنَصْرِ المَظْلُومِ، وَإِبْرَارِ القَسَمِ، وَرَدِّ السَّلاَمِ، وَتَشْمِيتِ العَاطِسِ. وَنَهَانَا عَنْ آنِيَةِ الفِضَّةِ، وَخَاتَمِ الذَّهَبِ، وَالحَرِيرِ، وَالدِّيبَاجِ، وَالقَسِّيِّ، وَالإِسْتَبْرَقِ[2].

## ٢- باسی فەرمان كردن بە شوێن كەوتنی تەرم

**١٢٣٩-بەڕا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی حەوت شتی پێ كردین و ڕێگری حەوت شتی لێ كردین، فەرمانی پێ كردین بەشوێن كەوتنی تەرم، سەردانی**

---

[1] بروانە: ٤٤٩٧، ٦٦٨٣.

[2] بروانە: ٢٤٤٥، ٥١٧٥، ٥٦٣٥، ٥٦٥٠، ٥٨٣٨، ٥٨٤٩، ٥٨٦٣، ٦٢٢٢، ٦٢٣٥، ٦٦٥٤.

**کردنی نەخۆش، وەڵامدانەوەی میوانداری، یارمەتی دانی ستەم لێکراو، نەشکاندنی سوێند، وەڵامدانەوەی سەلام، وتنی (یَرْحَمُكَ اللَّهُ) بەکەسێ دەپژمێ و دەڵێ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ)، وە ڕێگری لێ کردین لە بەکارهێنانی قاپ و قاچاغی زیو، ئەموستیلەی ئاڵتوون، ئاوریشم، دیباج[1]، قەسی[2] و ئاوریشمی ئەستوور.**

١٢٤٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ المُسَيَّبِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «حَقُّ المُسْلِمِ عَلَى المُسْلِمِ خَمْسٌ: رَدُّ السَّلاَمِ، وَعِيَادَةُ المَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الجَنَائِزِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَتَشْمِيتُ العَاطِسِ». تَابَعَهُ عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ. وَرَوَاهُ سَلاَمَةُ، عَنْ عُقَيْلٍ.

**١٢٤٠- ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: ((هەق و مافی مسوڵمان بەسەر مسوڵمانەوە پێنجە: وەڵامدانەوەی سەلام، سەردانی نەخۆش، شوێن تەرم کەوتن، وەڵامدانەوەی میوانداری، وتنی: (یَرْحَمُكَ اللَّهُ) بۆ ئەوەی دەپژمێ و دەڵێ (الْحَمْدُ لِلَّهِ) ))، عەبدوڕەزاق دەڵێ: مەعمەر بۆی گێڕاینەوە ئەم فەرموودە دەگێڕێتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەمری کوڕی سەلەمە دەکات، سەلامەش هەمان فەرموودە لە عوقەیلەوە دەگێڕێتەوە.**

## ٣- بابُ الدُّخُولِ عَلَى المَيِّتِ بَعْدَ المَوْتِ إِذَا أُدْرِجَ فِي أَكْفَانِهِ

١٢٤١- ١٢٤٢- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَعْمَرٌ وَيُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ- أَخْبَرَتْهُ قَالَتْ: أَقْبَلَ أَبُو

---

[1] دیباج جۆرێکە لە ئاوریشم.

[2] قەسی قوماشێکی کەتانە، ئاوریشمی تێکەڵە.

بَكْرٍ ﷺ عَلَى فَرَسِهِ مِنْ مَسْكَنِهِ بِالسُّنْحِ حَتَّى نَزَلَ، فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَلَمْ يُكَلِّمِ النَّاسَ حَتَّى نَزَلَ، فَدَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ ﷺ، فَتَيَمَّمَ النَّبِيَّ ﷺ -وَهُوَ مُسَجًّى بِبُرْدِ حِبَرَةٍ- فَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ، ثُمَّ أَكَبَّ عَلَيْهِ فَقَبَّلَهُ، ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا نَبِيَّ اللَّهِ، لاَ يَجْمَعُ اللَّهُ عَلَيْكَ مَوْتَتَيْنِ، أَمَّا الْمَوْتَةُ الَّتِي كُتِبَتْ عَلَيْكَ فَقَدْ مُتَّهَا[1].

قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: فَأَخْبَرَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ خَرَجَ وَعُمَرُ ﷺ يُكَلِّمُ النَّاسَ. فَقَالَ: اجْلِسْ. فَأَبَى. فَقَالَ اجْلِسْ. فَأَبَى، فَتَشَهَّدَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ، فَمَالَ إِلَيْهِ النَّاسُ وَتَرَكُوا عُمَرَ، فَقَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ يَعْبُدُ مُحَمَّدًا ﷺ فَإِنَّ مُحَمَّدًا ﷺ قَدْ مَاتَ، وَمَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران. وَاللَّهِ لَكَأَنَّ النَّاسَ لَمْ يَكُونُوا يَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ الآيَةَ حَتَّى تَلاَهَا أَبُو بَكْرٍ ﷺ، فَتَلَقَّاهَا مِنْهُ النَّاسُ، فَمَا يُسْمَعُ بَشَرٌ إِلاَّ يَتْلُوهَا[2].

## ٣- باسی ڕۆیشتن بۆ لای تەرم دوای مردنی کاتێ خرابێتە نێو کفنەکەیەوە

**١٢٤١- ١٢٤٢- ئەبو سەلەمە دەڵێ: عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە و وتی: ئەبو بەکر بەسوار ئەسپەکەیەوە هات بۆماڵمان لە ماڵی خۆیەوە کە لە سونح بوو، جا دابەزی و ڕۆیشتە مزگەوت و قسەی لەگەڵ کەس نەکرد، هەتا ڕۆیشت بۆ ماڵی عائیشە ﷺ، ڕوو بە پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت -کە بەپۆشاکێکی خەت خەتی یەمەنی داپۆشرابوو -، ئینجا پۆشاکەکەی لەسەر دەم و**

---

[1] بڕوانە: ٣٦٦٧، ٣٦٦٩، ٤٤٥٢، ٤٤٥٥، ٤٤٥٦، ٥٧٠٩، ٥٧١٠.

[2] بڕوانە: ٤٤٥٤، ٤٤٥٧، ٥٧١١.

**چاوی لادا و کەوت بەسەریدا و ماچی کرد، پاشان گریاو وتی: بەدایك و باوکەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا دوو مردنت لەسەر کۆناکاتەوە: جا ئەو مردنەی کە بۆت نووسرابوو چەشتت.**

**ئەبو سەلەمە دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ بۆی گێڕامەوە: کە ئەبو بەکر ﷺ هاتە دەرەوە، لەوکاتەدا عومەر ﷺ قسەی دەکرد بۆ خەڵکی، ئەبو بەکر وتی: دانیشە، عومەر بەگوێی نەکرد، جارێکی تر وتی: دانیشە، هەر بەگوێی نەکرد، ئینجا ئەبو بەکر وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، ئیتر خەڵکەکە ڕوویان کردە ئەبو بەکر و وازیان لە عومەر هێنا، جا ئەبو بەکر وتی: ئینجا دوای ئەمە ئەو کەسەتان موحەممەدی ﷺ پەرستووە، ئەوە بێگومان موحەممەد مردووە، هەرکەسێکیش خوا دەپەرستێ، ئەوە خوا زیندووە و نامرێ، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: (موحەممەد ﷺ تەنها پێغەمبەرێکە، کە لە پێش ئەودا زۆر پێغەمبەر هاتوون و ڕۆشتوون، جا ئەگەر مرد یان کوژرا، ئێوە پاشگەز دەبنەوە لە ئایینەکەتان، هەرکەس پاشگەز ببێتەوە لە ئایینەکەی، ئەوە ئەو کەسە هیچ زیانێك بەخوا ناگەیەنێت، وە بێگومان خوا پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە)، عەبدوڵا دەڵێ: سوێند بە خوا خەڵکەکە دەتوت نەیانزانیبوو خوا ئەو ئایەتەی دابەزاندووە، هەتا ئەبو بەکر خوێندیەوە، ئیتر خەڵکەکە لێیان وەرگرت، گوێت لە هەر کەس بوایە لەبەر خۆیەوە دەیخوێندەوە.**

**١٢٤٣-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي خَارِجَةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أَنَّ أُمَّ العَلَاءِ -امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ بَايَعَتِ النَّبِيَّ ﷺ- أَخْبَرَتْهُ أَنَّهُ اقْتُسِمَ المُهَاجِرُونَ قُرْعَةً، فَطَارَ لَنَا عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ، فَأَنْزَلْنَاهُ فِي أَبْيَاتِنَا، فَوَجِعَ وَجَعَهُ الذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، فَلَمَّا تُوُفِّيَ وَغُسِّلَ وَكُفِّنَ فِي أَثْوَابِهِ، دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ أَبَا السَّائِبِ، فَشَهَادَتِي عَلَيْكَ لَقَدْ أَكْرَمَكَ اللَّهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَمَا يُدْرِيكِ أَنَّ اللَّهَ قَدْ

كرَمَهُ؟». فَقُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَنْ يُكرِمُهُ اللَّهُ؟ فَقال: «أَمَّا هُوَ فَقَدْ جَاءَهُ اليَقِينُ، والله إِنِّي لأَرْجُو لَهُ الخَيْرَ، والله مَا أَدْرِي -وَأَنَا رَسُولُ اللَّهِ- مَا يُفْعَلُ بِي». قالتْ: فَوَاللَّهِ لَا أُزَكِّي أَحَدًا بَعْدَهُ أَبَدًا.

حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ مِثْلَهُ. وَقال نَافِعُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ عُقَيْلٍ: «مَا يُفْعَلُ بِهِ» وَتَابَعَهُ شعَيْبٌ وَعَمرُو بن دِينَارٍ وَمَعْمَرٌ[1].

**١٢٤٣- خاريجەی كوڕی زەيدی كوڕی سابيت دەگێڕێتەوە: ئوممو عەلا -كە ئافرەتێكی ئەنصاڕی بوو پەيمانی بە پێغەمبەر ﷺ دابوو- بۆی گێڕايەوە: كە كۆچەرييەكان بەتیر و پشك دابەشكران، عوسمانی كوڕی مەزعون بەر ئێمە كەوت، ئێمە لە خانوو و ماڵی خۆماندا نيشتەجێمان كرد، ئينجا نەخۆش كەوت بەو نەخۆشييەی كە پێی مرد، جا كە مرد و شۆردرا و كفن كرا لە پارچە قوماشەكانيدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە (بۆ سەر تەرمەكەی)، منيش وتم: ئەبو سائيب ڕەحمەتی خوات لێ بێ، شايەتيت بۆ دەدەم بێگومان خوا ڕێزی لێ گرتويت، پێغەمبەريش ﷺ فەرمووی: ((تۆ چۆن دەزانيت خوا ڕێزی لێ گرتووە؟))، وتم: باوكم بەقوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەی خوا ڕێز لە كێ دەگرێ؟ فەرمووی: ((بەڵام عوسمان مردنی بەسەردا هاتووە، وەڵاهی من ئومێدی خێری بۆ دەكەم، وە سوێند بە خوا -من كە پێغەمبەری خوام - نازانم چيم لێ دەكرێ و چيم بەسەردا دێت!)) ئوممو عەلا وتی: سوێند بە خوا لە دوای ئەو (عوسمانی كوڕی مەزعون) هەرگيز كەس بەچاك و بەهەشتی دانانێم. (ئيمامی بوخاری دەڵێ:) سەعيدی كوڕی عوفەير بۆی گێڕاينەوە وتی: لەيس وێنەی فەرموودەكەی پێشووی بۆ گێڕاينەوە. وە نافيعی كوڕی يەزيد لە**

---

[1] بروانە: ٢٦٨٧، ٣٩٢٩، ٧٠٠٣، ٧٠٠٤، ٧٠١٨.

**عوقەیلەوە گێڕایەوە فەرمووی: ((نازانم (عوسمان) چی لەگەڵدا دەکرێ))، شوعەیب و عەمری کوڕی دینار و مەعمەڕ بەم شێوەی عوقەیل گێڕاویانەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەو دەکەن.**

**١٢٤٤-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا قُتِلَ أَبِي جَعَلْتُ أَكْشِفُ الثَّوْبَ عَنْ وَجْهِهِ أَبْكِي، وَيَنْهَوْنِي عَنْهُ وَالنَّبِيُّ ﷺ لاَ يَنْهَانِي، فَجَعَلَتْ عَمَّتِي فَاطِمَةُ تَبْكِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَبْكِينَ أَوْ لاَ تَبْكِينَ، مَا زَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رَفَعْتُمُوهُ». تَابَعَهُ ابْنُ جُرَيْجٍ: أَخْبَرَنِي ابْنُ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ جَابِرًا ﷺ[1].

**١٢٤٤- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: کاتێ باوکم شەهید بوو دەستم کرد بە لادانی قوماشەکەی سەر دەم و چاوی و دەگریام، خەڵکیش ڕێگرییان دەکردم لە گریان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ نەکردم، جا فاتیمەی پوریشم دەستی کرد بەگریان، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی بە پورم: ((بگریت یان نەگریت بەردەوام فریشتەکان بەباڵیان دایان پۆشیبوو، هەتا هەڵتانگرت و بردتان))، ئیبنو جورەیج بەگێڕانەوەکەی پاڵپشتی ئەم گێڕانەوە دەکات و دەڵێ: ئیبنو مونکەدیر بۆی گێڕامەوە کە ئەم فەرموودەی لە جابیری بیستووە.**

---

[1] بروانە: ١٢٩٣، ٢٨١٦، ٤٠٨٠.

## ٤- بابُ الرَّجُلِ يَنْعَى إلي أهْلِ المَيِّتِ بِنَفْسِه

١٢٤٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَعَى النَّجَاشِيَّ فِي اليَوْمِ الذِي مَاتَ فِيهِ، خَرَجَ إِلَى المُصَلَّى، فَصَفَّ بِهِمْ وَكَبَّرَ أَرْبَعًا[١].

## ٤- باسی کەسێک بۆ خۆی مردنی مردوویەک بە کەس و کاری ڕادەگەیەنێ

**١٢٤٥- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی مردنی نەجاشی ڕاگەیاند لەو ڕۆژەدا کە تێیدا مرد بوو، ڕۆیشت بۆ نوێژگەو مسوڵمانانی ڕیز کردو چوار ئەڵاهو ئەکبەری کرد[٢] (نوێژی مردووی لەسەر کرد).**

١٢٤٦- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلَالٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَخَذَ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا جَعْفَرٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ فَأُصِيبَ -وَإِنَّ عَيْنَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَتَذْرِفَانِ- ثُمَّ أَخَذَهَا خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ مِنْ غَيْرِ إِمْرَةٍ فَفُتِحَ لَهُ»[٣].

**١٢٤٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((زەید ئاڵاکەی هەڵگرت و پێکرا، پاشان جەعفەر هەڵیگرت و پێکرا، پاشان عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە هەڵیگرت و پێکرا، -لەوکاتەدا هەردوو چاوی پێغەمبەر فرمێسکیان پێدا**

---

[١] بروانە: ١٣١٨، ١٣٢٧، ١٣٢٨، ١٣٣٣، ٣٨٨٠، ٣٨٨١.

[٢] کە لە نوێژی مردوودا دەکرێ، واتە: نوێژی مردوو بۆ مردنی نەجاشی کرد و چوار ئەڵاهو ئەکبەری تێداکرد.

[٣] بروانە: ٢٧٩٨، ٣٠٦٣، ٣٦٣٠،٣٧٥٧، ٤٢٦٢.

دەهاتە خوار-، پاشان خالیدی کوڕی وەلید ئاڵاکەی هەڵگرت، بێ ئەوەی کرابێ بە سەرکردە و ئەو کارەی پێ سپێردرابێ، ئینجا سەرخرا))[1].

## ٥- بابُ الإِذْنِ بِالجَنَازَةِ

وَقَالَ أَبُو رَافِعٍ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «أَلاَ آذَنْتُمُونِي»[2].

١٢٤٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَاتَ إِنْسَانٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُهُ فَمَاتَ بِاللَّيْلِ فَدَفَنُوهُ لَيْلًا، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: «مَا مَنَعَكُمْ أَنْ تُعْلِمُونِي؟». قَالُوا: كَانَ اللَّيْلُ فَكَرِهْنَا -وَكَانَتْ ظُلْمَةٌ- أَنْ نَشُقَّ عَلَيْكَ. فَأَتَى قَبْرَهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ[3].

## ٥- باسی ئاگادارکردنەوە (ی ئیمام) بە مردنی مردوویەک

ئەبو ڕافیع لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوە بۆ ئاگادارتان نەکردم لە مردنی؟)).

١٢٤٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: کەسێك مرد (کە نەخۆش بوو)، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرجار (پێش مردنی) سەردانی دەکرد، جا لە شەودا مردو هاوەڵان بەشەودا ناشتیان، کە ڕۆژ بوویەوە هەواڵیان دا بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((چی ڕێگر بوو لەوەی ئاگادارم بکەن؟)) هاوەڵان وتیان: شەو

---

[1] لێرەدا پێغەمبەر ﷺ لەنێو مزگەوتدا باسی جەنگی موئتە دەکات بۆ هاوەڵان، کە لەوکاتەدا لە نێوان مسوڵمانان و ڕۆمەکاندا ڕوویدا.

[2] بڕوانە: ٤٥٨.

[3] بڕوانە: ٨٥٧.

**بوو بۆیە -لەبەر تاریکی- حەزمان نەکرد ئەزیەتت بدەین، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر کرد.**

## ٦- بابُ فَضْلِ مَنْ مَاتَ لَهُ وَلَدٌ فَاحْتَسَبَ

وَقَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ (١٥٥)﴾ البقرة.

١٢٤٨- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا مِنَ النَّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ يُتَوَفَّى لَهُ ثَلاَثٌ لَمْ يَبْلُغُوا الحِنْثَ، إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ»[1].

## ٦- باسی گەورەیی ئەو کەسەی منداڵی بمرێت و چاوەڕوانی پاداشتی لای خوا بێت

**وە خوای گەورەو باڵادەست دەفەرموێ: (مژدە بدەن بە خۆڕاگران و ئارام گران).**

**١٢٤٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لەنێو خەڵکدا هیچ مسوڵمانێك نییە سێ منداڵی نابالغی بمرێت، ئیللا خوا بەهۆی ڕەحمی خۆی بەو منداڵانەدا دەیخاتە بەهەشتەوە))[2].**

١٢٤٩- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الأَصْبَهَانِيِّ، عَنْ ذَكْوَانَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ أَنَّ النِّسَاءَ قُلْنَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: اجْعَلْ لَنَا يَوْمًا. فَوَعَظَهُنَّ، وَقَالَ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ مَاتَ لَهَا ثَلاَثَةٌ مِنَ الوَلَدِ، كَانُوا حِجَابًا مِنَ النَّارِ». قَالَتِ امْرَأَةٌ: وَاثْنَانِ؟ قَالَ «وَاثْنَانِ»[1].

---

[1] بروانە: ١٣٨١.

[2] مەبەست دایک و باوکی منداڵەکانە بەچوونە بەهەشتەوە.

**١٢٤٩- زەكوان لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە ژنان بەپێغەمبەریان ﷺ وت: ڕۆژێكمان بۆ دابنێ (ئامۆژگاریمان بكە)، ئەویش ئامۆژگاری كردن و فەرمووی: ((هەر ژنێك سێ منداڵی بمرێت، (ئەو منداڵانە) دەبنە بەربەست بۆی لەچوونە دۆزەخ))، ژنێك وتی: دوو منداڵیش (دەبنە بەربەست)؟ فەرمووی: ((دووانیش )).**

١٢٥٠- وَقَالَ شَرِيكٌ، عَنِ ابْنِ الأَصْبَهَانِيِّ: حَدَّثَنِي أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: «لَمْ يَبْلُغُوا الحِنْثَ»[٢].

**١٢٥٠- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) شەریك لە ئیبنو ئەصبەهانیەوە گێڕایەوە وتی: ئەبو ساڵح لە ئەبو سەعید و ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕایەوە، هەردووكیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم ڕیوایەتەیان گێڕاوەتەوە، ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕایەوە: ((منداڵەكان باڵغ نەبووبن))[٣].**

١٢٥١- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَمُوتُ لِمُسْلِمٍ ثَلاَثَةٌ مِنَ الوَلَدِ، فَيَلِجَ النَّارَ إِلاَّ تَحِلَّةَ القَسَمِ».

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴿٧١﴾ ﴾ مريم[٤].

**١٢٥١- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((مسوڵمان نییە سێ منداڵی بمرێت و بڕواتە دۆزەخەوە، مەگەر بەخاتری سوێندەكەی پەروەردگار)).**

---

[١] بڕوانە: ١٠١.

[٢] بڕوانە: ١٠٢.

[٣] ئەم بڕگە: ((منداڵەكان باڵغ نەبووبن)) ئەبو هورەیرە بۆ فەرموودەكەی زیاد كردووە، واتە: قسەی خۆیەتی، دەشگونجێ بەشێكی فەرموودەكە بێت و، وتەی پێغەمبەر ﷺ بێت. إرشاد الساري: ٣٢٢/٣.

[٤] بڕوانە: ٦٦٥٦.

ئەبو عەبدولا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: مەبەست پێی ئەم ئایەتەیە: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴿٧١﴾ ﴾ مریم، (واتە: هەریەك لە ئێوە هەردەبێ بڕواتە نێویەوە، یان بڕواتە دیداری دۆزەخ).

## ٧- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ لِلْمَرْأَةِ عِنْدَ القَبْرِ: اصْبِرِي

١٢٥٢- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِامْرَأَةٍ عِنْدَ قَبْرٍ وَهِيَ تَبْكِي فَقَالَ: «اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي»[١].

## ٧- باسی ئەو پیاوەی بە ئافرەتێکی وت کە لای گۆڕێکدا دەگریا: ئارام بگرە

١٢٥٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای ئافرەتێکدا لای گۆڕێکدا دەگریا، فەرمووی: ((لە خوا بترسەو ئارام بگرە)).

## ٨- بابُ غُسْلِ المَيِّتِ وَوُضُوئِهِ بِالمَاءِ وَالسِّدْرِ

وَحَنَّطَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ ابنا لِسَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، وَحَمَلَهُ وَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: المُسْلِمُ لاَ يَنْجُسُ حَيًّا وَلاَ مَيِّتًا. وَقَالَ سَعْيدٌ: لَوْ كَانَ نَجِسًا مَا مَسِسْتُهُ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «المُؤْمِنُ لاَ يَنْجُسُ»[٢].

---

[١] بڕوانە: ١٢٨٣، ١٣٠٢، ٧١٥٤.

[٢] بڕوانە: ٢٨٣.

## ٨- باسی شۆردن و دەست نوێژگرتن بۆ مردوو بە ئاو و سیدر

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆنی خۆشی دا لە کوڕێکی سەعیدی کوڕی زەید و هەڵیگرت و نوێژی لەسەر کرد و دەست نوێژی نەگرت. عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: مسوڵمان پیس نابێ نە بەزیندوویی نە بەمردوویی. سەعید دەڵێ: ئەگەر مردوو پیس بووایە دەستم لێ نەدەدا. وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ئیماندار پیس نابێت)).**

١٢٥٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأَنْصَارِيَّةِ ﷺ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَتِ ابْنَتُهُ فَقَالَ: «اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي» فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ[١] فَقَالَ: «أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ» تَعْنِي: إِزَارَهُ[٢].

**١٢٥٣- ئوممو عەتییەی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کچەکەی مرد، هاتە لامان و فەرمووی: ((سێ جار، یان پێنج، یان زیاتر لەوە ئەگەر بە پێویستتان زانی بیشۆرن بە ئاو و سیدر، لە جاری کۆتاییدا کافور یان هەندێ کافوری تێکەن، جا کە لێبوونەوە ئاگادارم بکەن))، ئوممو عەتییە دەڵێ: جا کە لێبووینەوە ئاگادارمان کرد، حیقوەکەی خۆی پێداین و فەرمووی: ((تێوەی بپێچن))[٣]، مەبەستی ئیزارەکەی بوو.**

---

[١] حِقْوَهُ الحقو: لە بنەڕەتدا بەو شوێنە دەوترێ کە لە نێوقەدی مرۆڤ ئیزاری تێدا گرێ دەدرێ، بۆیە کراوە بەناو بۆ ئەو قوماشەی لە نێوقەدی مرۆڤ گرێ دەدرێ، (الحقو) لە زمانی هۆزی هوزەیلدا واتە: ئیزار، کە بە پۆشاکێک دەوترێ لە نێوقەدی مرۆڤ بۆ خوارەوە بێ، بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٢٦/٣. وە لە کوردیدا ئیزار دەڕپێ و شەڕواڵی پێدەوترێت.

[٢] بڕوانە: ١٦٧.

[٣] واتە: پێش کفنکردن ئەو قوماشەی پێوەپێچن.

## ٩- بابُ مَا يُسْتَحَبُّ أَنْ يُغْسَلَ وِتْرًا

١٢٥٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ نَغْسِلُ ابْنَتَهُ فَقَالَ: «اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي». فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ فَقَالَ: «أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ».

فَقَالَ أَيُّوبُ: وَحَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ بِمِثْلِ حَدِيثِ مُحَمَّدٍ، وَكَانَ فِي حَدِيثِ حَفْصَةَ: «اغْسِلْنَهَا وِتْرًا». وَكَانَ فِيهِ: «ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ سَبْعًا». وَكَانَ فِيهِ أَنَّهُ قَالَ: «ابْدَءُوا بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الوُضُوءِ مِنْهَا». وَكَانَ فِيهِ أَنَّ أُمَّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: وَمَشَطْنَاهَا ثَلاَثَةَ قُرُونٍ[1].

## ٩- باسی ئەوەی سوننەتە شۆردنی مردوو تاک بێت

**١٢٥٤- ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کچە(مردووە)کەیمان دەشۆری، هاتە لامان و فەرمووی: ((سێ جار، یان پێنج، یان زیاتر لەوە ئەگەر بەپێویستتان زانی بیشۆرن بە ئاو و سیدر، لەجاری کۆتاییدا کافور یان هەندێ کافوری تێکەن، جا کە لێبوونەوە ئاگادارم بکەن))، ئوممو عەتییە دەڵێ: جا کە لێبووینەوە ئاگادارمان کرد، ئیزارەکەی خۆی بۆ فڕێداین و فەرمووی: ((تێوەی بپێچن)).**

**ئەیووب دەڵێ: حەفصە فەرموودەیەکی وەك فەرموودەکەی موحەممەدی بۆ گێڕامەوە، لەگێڕانەوەکەی حەفصەدا ئەمانەی تێدایە: ((بە تاك بیشۆرن))، ئەمەشی تێدایە: ((سێ یان پێنج یان حەوت جار بیشۆرن))، هەروەها ئەمەشی تێدایە کە فەرمووی: ((لە ئەندامەکانی لای ڕاست و شوێنی دەستنوێژگرتنیەوە دەست پێ بکەن))، وە ئەمەشی تێدایە کە ئوممو عەتییە وتی: قژیمان شانەکرد و کردمان بە سێ پەلکە.**

---

[1] بروانە: ١٦٧.

## ١٠- بابٌ: يُبْدَأُ بِمَيَامِنِ المَيِّتِ

١٢٥٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي غَسْلِ ابْنَتِهِ: «ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الوُضُوءِ مِنْهَا»[١].

## ١٠- باسێک: لە ئەندامەکانی لای ڕاستی مردووەوە دەست بەشۆردنی بکرێت

**١٢٥٥- ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی شۆردنی زەینەبی کچیدا فەرمووی: ((لە ئەندامەکانی لای ڕاست و شوێنی دەستنوێژگرتنەوە دەست پێ بکەن)).**

## ١١- بابُ مَوَاضِعِ الوُضُوءِ مِنَ المَيِّتِ

١٢٥٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا غَسَّلْنَا بِنْتَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ لَنَا وَنَحْنُ نَغْسِلُهَا: «ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الوُضُوءِ»[٢].

## ١١- باسی (سوننەتە لە) شوێنی دەستنوێژگرتنی مردوو (ەوە دەست بە شۆردنی بکرێت)

**١٢٥٦- ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: کاتێ کچەکەی پێغەمبەرمان ﷺ شۆرد، فەرمووی پێمان لە کاتێکدا دەمانشۆرد: ((لە ئەندامەکانی لای ڕاست و شوێنی دەستنوێژگرتنیەوە دەست پێ بکەن)).**

---

[١] بڕوانە: ١٦٧.

[٢] بڕوانە: ١٦٧.

## ١٢- بابٌ: هَلْ تُكَفَّنُ المَرْأَةُ فِي إِزَارِ الرَّجُلِ؟

١٢٥٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ حَمَّادٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عَوْنٍ عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: تُوُفِّيَتْ بِنْتُ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَنَا: «اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي». فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَنَزَعَ مِنْ حِقْوِهِ إِزَارَهُ وَقَالَ: «أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ»[1].

## ١٢- باسێک: ئایا ئافرەت بە کراسی پیاو کفن دەکرێ؟

**١٢٥٧- ئوممو عەتییە ؓ دەڵێ: کچێکی پێغەمبەر ﷺ مرد، فەرمووی پێمان: ((سێ جار یان پێنج جار یان زیاتر لەوە بیشۆرن ئەگەر بە باشتان زانی، جا کە لێبوونەوە ئاگادارم بکەن))، جا کە تەواو بووین ئاگادارمان کرد، ئیزارەکەی[2] داکەند و فەرمووی: ((پێوەی پێچن)).**

## ١٣- بابٌ: يَجْعَلُ الكَافُورَ فِي آخِرِهِ

١٢٥٨- حَدَّثَنَا حَامِدُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: تُوُفِّيَتْ إِحْدَى بَنَاتِ النَّبِيِّ ﷺ فَخَرَجَ فَقَالَ: «اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي». قَالَتْ: فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ فَقَالَ: «أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ». وَعَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حفْصَةَ، أمَّ عَطِيَّةَ ؓ بنَحوِهِ[3].

---

[1] بڕوانە: ١٦٧.

[2] ئیزار: بە پۆشاکێک دەوترێ لە نێوقەدی مرۆڤ بۆ خوارەوە بێ، بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٢٦/٣، لە کوردیدا ئیزار دەرپێ و شەرواڵی پێدەوترێ.

[3] بڕوانە: ١٦٧.

## ١٣- باسێک: ئاوی شۆردنەکە لە دواجاردا کافوری تێبکرێت

**١٢٥٨- ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەر ﷺ مرد، هاتە لامان و فەرمووی: ((سێ جار یان پێنج یان زیاتر لەوە ئەگەر بەپێویستتان زانی بیشۆرن بە ئاو و سیدر، لەجاری کۆتاییدا کافور یان هەندێ کافوری تێکەن، جا کە لێبوونەوە ئاگادارم بکەن))، ئوممو عەتییە دەڵێ: جا کە لێبووینەوە ئاگادارمان کرد، ئیزارەکەی خۆی بۆ فڕێداین و فەرمووی: ((تێوەی پێچن))، وە ئەیووب لە حەفصەوە ئەویش لە ئوممو عەتییەوە ﵂ وێنەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕاوەتەوە.**

١٢٥٩- وَقَالَتْ: إِنَّهُ قَالَ: «اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ سَبْعًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ». قَالَتْ حَفْصَةُ: قَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ ﵂: وَجَعَلْنَا رَأْسَهَا ثَلاَثَةَ قُرُونٍ[1].

**١٢٥٩- ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سێ یان پێنج یان حەوت یان زیاتر لەوە بیشۆرن ئەگەر بە چاکتان زانی))، حەفصە دەڵێ: ئوممو عەتییە ﵂ وتی: قژی سەریمان کرد بە سێ پەلکە.**

## ١٤- بابُ نَقْضِ شَعَرِ المَرْأَةِ

وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ: لاَ بَأْسَ أَنْ يُنْقَضَ شَعَرُ المَيِّتِ.

١٢٦٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ أَيُّوبُ: وَسَمِعْتُ حَفْصَةَ بِنْتَ سِيرِينَ قَالَتْ: حَدَّثَتْنَا أُمُّ عَطِيَّةَ ﵂ أَنَّهُنَّ جَعَلْنَ رَأْسَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَلاَثَةَ قُرُونٍ نَقَضْنَهُ، ثُمَّ غَسَلْنَهُ، ثُمَّ جَعَلْنَهُ ثَلاَثَةَ قُرُونٍ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٦٧.

## ١٤- باسی کردنەوەی پەلکەی ئافرەت

ئیبنو سیرین دەڵێ: هیچی تێدا نییە پەلکەی ئافرەتی مردوو بکرێتەوەو هەڵوەشێنرێتەوە.

١٢٦٠- ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: ئەوان قژی زەینەبی کچی پێغەمبەریان ﷺ کرد بە سێ پەلکە، کردیانەوە، پاشان شۆردیان، ئینجا کردیانەوە بە سێ پەلکە.

## ١٥- بابٌ: كَيْفَ الإِشْعَارُ لِلْمَيِّتِ؟

وَقَالَ الحَسَنُ: الخِرْقَةُ الخَامِسَةُ تَشُدُّ بِهَا الفَخِذَيْنِ وَالوَرِكَيْنِ تَحْتَ الدِّرْعِ.

١٢٦١- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ أَنَّ أَيُّوبَ أَخْبَرَهُ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ سِيرِينَ يَقُولُ: جَاءَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ ﵂ -امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ مِنَ اللاَّتِي بَايَعْنَ- قَدِمَتِ البِصْرَةَ، تُبَادِرُ ابْنًا لَهَا فَلَمْ تُدْرِكْهُ فَحَدَّثَتْنَا قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ وَنَحْنُ نَغْسِلُ ابْنَتَهُ فَقَالَ: «اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي». قَالَتْ: فَلَمَّا فَرَغْنَا أَلْقَى إِلَيْنَا حَقْوَهُ فَقَالَ: «أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ». وَلَمْ يَزِدْ عَلَى ذَلِكَ، وَلاَ أَدْرِي أَيُّ بَنَاتِهِ. وَزَعَمَ أَنَّ الإِشْعَارَ: الْفُفْنَهَا فِيهِ، وَكَذَلِكَ كَانَ ابْنُ سِيرِينَ يَأْمُرُ بِالمَرْأَةِ أَنْ تُشْعَرَ وَلاَ تُؤْزَرَ[٢].

## ١٥- باسێک: چۆنیەتی پۆشاک پێچان بە مردووەوە؟

حەسەن دەڵێ پارچەی پێنجەم هەردوو ڕان و هەردوو سمتی پێدەبەسترێ لە ژێر کراسەکەیەوە.

---

[١] بڕوانە: ١٦٧.

[٢] بڕوانە: ١٦٧.

**١٢٦١- ئیبنو سیرین دەڵێ: ئوممو عەتییە ﷺ -كە ئافرەتێكی ئەنصاڕی بوو لەو ئافرەتانە بوو پەیمانی (بەپێغەمبەر ﷺ) دابوو- هات بۆ بەصرە، لەبەر كوڕێكی پەلەی دەكرد بیبینێ، بەڵام فریای نەكەوت (نەیبینی ڕۆیشتبوو یان مردبوو)، بۆی گێڕاینەوە و وتی: لە كاتێكدا ئێمە كچەكەی پێغەمبەرمان ﷺ دەشۆرد، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان و فەرمووی: ((سێ جار یان پێنج جار یان زیاتر لەوە بیشۆرن بەئاو و سیدر ئەگەر بەباشتان زانی، لەدوا جاری شۆردنەكەدا كافور بكەنە ئاوەكەوە، ئینجا كە لێبوونەوە ئاگادارم بكەن))، ئوممو عەتییە دەڵێ: جا كە لێبووینەوە (ئاگادارمان كرد)، ئیزارەكەی خۆی بۆ هەڵداین و فەرمووی: ((پێوەی بپێچن))، لەوە زیاتر هیچی نەوت، (ئەیووب) وتی: نازانم كام كچی پێغەمبەر بوو ﷺ، وە دەڵێ: وشەی (الإِشْعَارَ) یانی: بیپێچن پێیەوە، هەروەها ئیبنو سیرینیش فەرمانی كرد بەئافرەتەوە بپێچرێ، نەكرێتە كراس بۆی.**

## ١٦- بابٌ: هَلْ يُجْعَلُ شَعَرُ المَرْأَةِ ثَلَاثَةَ قُرُونٍ؟

١٢٦٢- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أُمِّ الهُذَيْلِ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﷺ قَالَتْ: ضَفَرْنَا شَعَرَ بِنْتِ النَّبِيِّ ﷺ. تَعْنِي ثَلَاثَةَ قُرُونٍ. وَقَالَ وَكِيعٌ: قَالَ سُفْيَانُ: نَاصِيَتَهَا وَقَرْنَيْهَا[1].

## ١٦- باسێك: ئایا قژی ئافرەت بكرێتە سێ پەلكە؟

**١٢٦٢- ئوممو عەتییە ﷺ دەڵێ: قژی سەری كچەكەی پێغەمبەرمان ﷺ كرد بەپەلكە -مەبەستی سێ پەلكەیە-، وەكیع دەڵێ: سوفیان دەڵێ: (سێ پەلكەكە بۆ) پێشی سەری و ئەملاولای سەری بوو.**

---

[1] بڕوانە: ١٦٧.

## ١٧- بابٌ: يُلْقَى شَعَرُ المَرْأَةِ خَلْفَهَا

١٢٦٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَتْنَا حَفْصَةُ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﷺ قَالَتْ: تُوُفِّيَتْ إِحْدَى بَنَاتِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «اغْسِلْنَهَا بِالسِّدْرِ وِتْرًا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي». فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ، فَضَفَرْنَا شَعَرَهَا ثَلاَثَةَ قُرُونٍ وَأَلْقَيْنَاهَا خَلْفَهَا[1].

## ١٧- باسێک: قژی سەری ئافرەت بخرێتە پشتییەوە

**١٢٦٣- ئوممو عەتییە ﷺ دەڵێ: یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەر ﷺ مرد، جا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان (کاتێ دەمانشۆرد) و فەرمووی: ((بەئاو و سیدر چەند جارێکی تاك بیشۆرن، سێ جار یان پێنج جار یان زیاتر لەوە ئەگەر بەپێویستتان زانی، وە کۆتاجار کافور یان هەندێ کافوری تێکەن، ئینجا کە لێبوونەوە ئاگادارم بکەن))، جا کە لێبووینەوە ئاگادارمان کردەوە، ئەویش کراسەکەی بۆ هەڵداین (و پێمانەوە پێچا)، قژی سەریمان کرد بە سێ پەلکەو خستمانە پشتییەوە.**

## ١٨- بابُ الثِّيَابِ البِيضِ لِلْكَفَنِ

١٢٦٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بنُ المبَارَكِ، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كُفِّنَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ يَمَانِيَةٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ، لَيْسَ فِيهِنَّ قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٦٧.

[2] بڕوانە: ١٢٧١، ١٢٧٢، ١٢٧٣، ١٣٨٧.

## ١٨- باسى قوماشى سپى بۆ كفن كردن

**١٢٦٤- عائيشه ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەرى خوا ﷺ له سێ لۆ قوماشى يەمەنى سپى پاكى لۆكەدا كفن كرا، له نێوياندا نەكراس نه مێزەرى تێدا نەبوو.**

## ١٩- بابُ الكَفَنِ فِي ثَوْبَيْنِ

١٢٦٥- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ إِذْ وَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِهِ فَوَقَصَتْهُ -أَوْ قَالَ: فَأَوْقَصَتْهُ- قَالَ: النَّبِيُّ ﷺ: «اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلاَ تُحَنِّطُوهُ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ القِيَامَةِ مُلَبِّيًا»[١].

## ١٩- باسى كفن كردن (ى مردوو) له دوو بەرگدا

**١٢٦٥- عەبدوڵاى كوڕى عەباس ﵄ دەڵێ: لەكاتێكدا پياوێك له عەرەفەدا وەستابوو له وڵاخەكەى كەوتە خوارەوە، ملى شكاند (و مرد) -يان وتى: ملى شكاند-، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: ((بەئاو و سيدر بيشۆرن، له دوو پۆشاكدا كفنى بكەن، بۆنى خۆشى لێ مەدەن، سەرى دامەپۆشن، چونكە بێگومان له ڕۆژى دواييدا بە (پۆشاكى ئيحرام و) تەلبيەكردنەوە[٢] زيندوو دەكرێتەوە)).**

---

[١] بروانه: ١٢٦٦، ١٢٦٧، ١٢٦٨، ١٨٣٩، ١٨٤٩، ١٨٥٠، ١٨٥١.

[٢] تەلبيەكردن: بريتيه له وتنى: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ.

## ٢٠- باب الحَنُوطِ لِلْمَيِّتِ

**١٢٦٦-** حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ وَاقِفٌ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعَرَفَةَ إِذْ وَقَعَ مِنْ رَاحِلَتِهِ فَأَقْصَعَتْهُ -أَوْ قَالَ: فَأَقْعَصَتْهُ- فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلاَ تُحَنِّطُوهُ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُهُ يَوْمَ القِيَامَةِ مُلَبِّيًا»[1].

## ٢٠- بۆنی خۆش بەکارهێنان بۆ مردوو

**١٢٦٦- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پیاوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە عەرەفەدا وەستابوو، لە وڵاخەکەی کەوتە خوارەوە و ملی شکاند (و مرد) - یان: یەکسەر کوشتی و مرد -، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بە ئاو و سیدر بیشۆرن، لە دوو لۆ پۆشاکدا کفنی بکەن، بۆنی خۆشی لێ مەدەن، سەری دامەپۆشن، چونکە بێگومان خوا لە ڕۆژی دواییدا بە(پۆشاکی ئیحرام و) تەلبیەکردنەوە زیندووی دەکاتەوە))**

## ٢١- بابٌ: كَيْفَ يُكَفَّنُ المُحْرِمُ

**١٢٦٧-** حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، أَخْبَرَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَجُلًا وَقَصَهُ بَعِيرُهُ -وَنَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ- وَهْوَ مُحْرِمٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلاَ تُمِسُّوهُ طِيبًا، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُهُ يَوْمَ القِيَامَةِ مُلَبِّدًا»[2].

---

[1] بروانە: ١٢٦٥.

[2] بروانە: ١٢٦٥.

## ٢١- باسێک: کەسێک لە ئیحرامدا بمرێ چۆن کفن دەکرێ؟

**١٢٦٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووین، پیاوێك وشترەکەی ملی شکاند، لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەئاو وسیدر بیشۆرن، لە دوو بەرگدا کفنی بکەن، بۆنی خۆشی لێ مەدەن، سەری دامەپۆشن، چونکە بێگومان خوا لە ڕۆژی دواییدا بە تەلبیەکردنەوە زیندووی دەکاتەوە)).**

١٢٦٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرٍو وَأَيُّوبَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ وَاقِفٌ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِعَرَفَةَ فَوَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِهِ - قَالَ أَيُّوبُ: فَوَقَصَتْهُ، وَقَالَ عَمْرٌو: فَأَقْصَعَتْهُ- فَمَاتَ، فَقَالَ: «اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلاَ تُحَنِّطُوهُ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ القِيَامَةِ» قَالَ أَيُّوبُ: «يُلَبِّي». وَقَالَ عَمْرٌو: «مُلَبِّيًا»[1].

**١٢٦٨- سەعیدی کوڕی جوبەیر لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێك لە عەرەفە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ وەستابوو، لە وڵاخەکەی کەوتە خوارەوە - ئەیووب دەڵێ: جا ملی شکاند، وە عەمر دەڵێ: ئێسکەکانی ورد کرد- و مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بە ئاو و سیدر بیشۆرن، لە دوو بەرگدا کفنی بکەن، بۆنی خۆشی لێ مەدەن، سەری دامەپۆشن، چونکە بێگومان لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێتەوە))، ئەیووب وتی: ((لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ ...)) دەڵێ، عەمریش دەڵێ: ((بەدەم لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ))ەوە.**

---

[1] بڕوانە: ١٢٦٥.

## ٢٢- بابُ الكَفَنِ فِي القَمِيصِ الذِي يُكَفُّ أَوْ لا يُكَفُّ، وَمَنْ كُفِّنَ بِغَيْرِ قَمِيصٍ

١٢٦٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ لَمَّا تُوُفِّيَ جَاءَ ابْنُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَعْطِنِي قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فِيهِ، وَصَلِّ عَلَيْهِ وَاسْتَغْفِرْ لَهُ، فَأَعْطَاهُ النَّبِيُّ ﷺ قَمِيصَهُ فَقَالَ: «آذِنِّي أُصَلِّي عَلَيْهِ». فَآذَنَهُ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ جَذَبَهُ عُمَرُ ﷺ فَقَالَ: أَلَيْسَ اللهُ نَهَاكَ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَى المُنَافِقِينَ؟! فَقَالَ: «أَنَا بَيْنَ خِيرَتَيْنِ، قَالَ: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٨٠﴾﴾ التوبة. فَصَلَّى عَلَيْهِ، فَنَزَلَتْ: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا ﴿٨٤﴾﴾ التوبة[1].

## ٢٢- باسی کردنی کراس بە کفن بۆ مردوو سزا لابدات یان لای نەبات، وە ئەوەی بە بێ کراس کفن بکرێ([2])

١٢٦٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کاتێ عەبدوڵای کوڕی ئوبەی مرد، کوڕەکەی هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کراسەکەی خۆتم بدەرێ با بیکەمە کفن بۆ باوکم، نوێژیشی لەسەر بکە و داوای لێ خۆشبوونی بۆ بکە، پێغەمبەریش ﷺ کراسەکەی خۆی دایە و فەرمووی: ((ئاگادارم بکە با نوێژی لەسەر بکەم))، ئەویش ئاگاداری کرد، جا کاتێ ویستی نوێژی لەسەر بکات عومەر ڕایکێشا وتی: ئایا خوا ڕێگری لێ نەکردووی لەوەی نوێژ بکەیت لەسەر دووڕووان؟ فەرمووی: ((من سەرپشك کراوم لە نێوان دوو

[1] بڕوانە: ٤٦٧٠، ٤٦٧٢، ٥٧٩٦.

[2] کفنی مردوو چەند پارچەیەکە، یەکێکیان کراسە، جا ئەگەر کفن کراو کراسی تیا نەبوو، حوکمی چییە؟

شتدا، خوا دەفەرمووێ: (داواى لێ خۆش بوونيان بۆ بكەيت يان داواى لێ خۆش بوونيان بۆ نەكەيت، ئەگەر حەفتا جاريش داواى لێ خۆشبوونيان بۆ بكەيت، ئەوە خوا لێيان خۆش نابێ))، جا پێغەمبەر ﷺ نوێژى لەسەر كرد، ئيتر بەو هۆيەوە ئەم ئايەتە دابەزى: (هەرگيز نوێژ مەكە لەسەر هيچ كام لەو دووڕووانە كە مرد).

١٢٧٠- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرٍو سَمِعَ جَابِرًا ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ بَعْدَ مَا دُفِنَ فَأَخْرَجَهُ، فَنَفَثَ فِيهِ مِنْ رِيقِهِ وَأَلْبَسَهُ قَمِيصَهُ.

١٢٧٠- عەمر دەڵێ: لە جابيرى بيست ﷺ وتى: دواى ئەوەى عەبدوڵاى كوڕى ئوبەى خرابۆيە گۆڕەوە، پێغەمبەر ﷺ هات و لەگۆڕەكەى دەريهێنا، تفى كرد و تفەكەى دا لە لاشەى و كراسەكەى كردە بەرى.

## ٢٣- بابُ الكَفَنِ بِغَيْرِ قَمِيصٍ

١٢٧١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كُفِّنَ النَّبِيُّ ﷺ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ سَحُولَ كُرْسُفٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ[١].

## ٢٣- باسى كفن كردنى مردوو بەبێ كراس

١٢٧١- عائيشە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەرى خوا ﷺ لەسێ لۆ قوماشى يەمەنى سپى پاكى لۆكەدا كفن كرا، لە نێوياندا نەكراس نەمێزەرى تێدا نەبوو.

١ بڕوانە: ١٢٦٤.

١٢٧٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كُفِّنَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ[1].

**١٢٧٢- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سێ بەرگدا كفن كرا، كە نەكراس نەمێزەری تێدا نەبوو.**

## ٢٤- بابُ الكَفَنِ وَلاَ عِمَامَةٌ

١٢٧٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كُفِّنَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ[2].

## ٢٤- باسی كفن كردنی مردوو بەبێ مێزەر

**١٢٧٣- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سێ قوماشی یەمەنی سپی پاكی لۆكەدا كفن كرا، لە نێویاندا نەكراس نەمێزەری تێدا نەبوو.**

## ٢٥- بابٌ: الكَفَنِ مِنْ جَمِيعِ المَالِ

وَبِهِ قَالَ عَطَاءٌ وَالزُّهْرِيُّ وَعَمْرُو بْنُ دِينَارٍ وَقَتَادَةُ. وَقَالَ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ: الحَنُوطُ مِنْ جَمِيعِ المَالِ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: يُبْدَأُ بِالكَفَنِ، ثُمَّ بِالدَّيْنِ، ثُمَّ بِالوَصِيَّةِ. وَقَالَ سُفْيَانُ: أَجْرُ القَبْرِ وَالغَسْلِ هُوَ مِنَ الكَفَنِ.

---

[1] بڕوانە: ١٢٦٤

[2] بڕوانە: ١٢٦٤.

# ٢٥- باسێک: کفن کردن له هەموو ماڵ و سامانی مردووەکه دەکرێ[١]

ئەمه ڕای عەتاو زوهری و عەمری کوڕی دینار و قەتادەیه (دەڵێن: کفن له هەموو سامانی مردووەکه دەکرێ)، عەمری کوڕی دینار دەڵێ: بۆنی خۆش له هەموو سامانی مردووەکه دەکڕدرێ، ئیبراهیم دەڵێ: له پێشدا له سامانەکەی کفنی دەکرێ، پاشان قەرزەکەی دەدرێتەوه، پاشان وەسیەت جێ بەجێ دەکرێ، سوفیان دەڵێ: کرێی گۆڕ و ناشتن و شۆردنی هەر لەگەڵ کفنه (واته: ئەمانەش وەك کفنەکه له سامانی گشتی مردووەکه دەدرێ، ئەگەر سامانی هەبوو).

١٢٧٤- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْمَكِّيُّ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أُتِيَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ يَوْمًا بِطَعَامِهِ فَقَالَ: قُتِلَ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ، وَكَانَ خَيْرًا مِنِّي، فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ مَا يُكَفَّنُ فِيهِ إِلاَّ بُرْدَةٌ، وَقُتِلَ حَمْزَةُ -أَوْ رَجُلٌ آخَرُ- خَيْرٌ مِنِّي، فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ مَا يُكَفَّنُ فِيهِ إِلاَّ بُرْدَةٌ، لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يَكُونَ قَدْ عُجِّلَتْ لَنَا طَيِّبَاتُنَا فِي حَيَاتِنَا الدُّنْيَا، ثُمَّ جَعَلَ يَبْكِي[٢].

**١٢٧٤- سەعد له باوکیەوه (ئیبراهیم) دەگێڕێتەوه و دەڵێ: ڕۆژێك خواردنێك هێنرا بۆ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: موصعەبی کوڕی عومەیر کوژرا که له من چاکتر بوو، بەڵام هیچ نەبوو بکرێته کفن بۆی عەبایەك نەبێ، حەمزە - یان پیاوێکی تر- کوژرا له من چاکتر بوو، هیچ نەبوو بۆ کفن کردنی عەبایەك نەبێ، بەڕاستی ترسم هەیه پاداشت و چاکەمان پێشخرابێت بۆمان له ژیانی دونیاماندا، پاشان دەستی کرد بەگریان.**

---

[١] واته: له سێ یەک ناکرێ، که دروسته مردووەکه تا سێیەکی ماڵەکەی وەسیەت بکات، بەڵکو له کۆی ماڵەکەی دەکرێ.

[٢] بڕوانه: ١٢٧٥، ٤٠٤٥.

## ٢٦- بَابٌ: إِذَا لَمْ يُوجَدْ إِلاَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ

١٢٧٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِيهِ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ ﷺ أُتِيَ بِطَعَامٍ وَكَانَ صَائِمًا، فَقَالَ: قُتِلَ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَهُوَ خَيْرٌ مِنِّي، كُفِّنَ فِي بُرْدَةٍ، إِنْ غُطِّيَ رَأْسُهُ بَدَتْ رِجْلاَهُ، وَإِنْ غُطِّيَ رِجْلاَهُ بَدَا رَأْسُهُ -وَأُرَاهُ قَالَ:- وَقُتِلَ حَمْزَةُ وَهُوَ خَيْرٌ مِنِّي، ثُمَّ بُسِطَ لَنَا مِنَ الدُّنْيَا مَا بُسِطَ -أَوْ قَالَ: أُعْطِينَا مِنَ الدُّنْيَا مَا أُعْطِينَا- وَقَدْ خَشِينَا أَنْ تَكُونَ حَسَنَاتُنَا عُجِّلَتْ لَنَا. ثُمَّ جَعَلَ يَبْكِي حَتَّى تَرَكَ الطَّعَامَ[1].

## ٢٦- باسێك: ئەگەر تەنها یەك پۆشاك هەبوو (بۆ كفن)

**١٢٧٥- ئیبڕاهیم دەگێڕێتەوە: خواردنێكیان بۆ عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف هێنا، لەوكاتەدا بەڕۆژوو بوو، ئینجا وتی: موصعەبی كوڕی عومەیر ﷺ كوژرا كە لە من چاكتر بوو بە عەبایەك كفن كرا، كە سەری دادەپۆشرا قاچەكانی دەردەكەوت، كە قاچەكانی دادەپۆشرا سەری دەردەكەوت، - وابزانم وتی- وە حەمزە كوژرا كە لەمن چاكتر بوو، پاشان ئەوەندە سامان و دونیا ڕژێنراوە بەسەرماندا -یان وتی: ئەوەندە دونیامان پێ دراوە -، كە بەڕاستی ترسمان هەیە لەوەی پاداشتی چاكەكانمان پێشخرابێ بۆمان لە دونیادا، پاشان دەستی كرد بە گریان بەجۆرێ وازی لە خواردنەكە هێنا.**

## ٢٧- بَابٌ: إِذَا لَمْ يَجِدْ كَفَنًا إِلَّا مَا يُوَارِي رَأْسَهُ أَوْ قَدَمَيْهِ غَطَّى رَأْسَهُ

١٢٧٦- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا شَقِيقٌ، حَدَّثَنَا خَبَّابٌ ﷺ قَالَ: هَاجَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ نَلْتَمِسُ وَجْهَ اللَّهِ، فَوَقَعَ أَجْرُنَا عَلَى اللَّهِ، فَمِنَّا مَنْ مَاتَ لَمْ

---

[1] بڕوانە: ١٢٧٤.

يَأْكُلْ مِنْ أَجْرِهِ شَيْئًا مِنْهُمْ: مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ -وَمِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ فَهُوَ يَهْدِبُهَا- قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ، فَلَمْ نَجِدْ مَا نُكَفِّنُهُ إِلاَّ بُرْدَةً، إِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رَأْسَهُ خَرَجَتْ رِجْلاَهُ، وَإِذَا غَطَّيْنَا رِجْلَيْهِ خَرَجَ رَأْسُهُ، فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نُغَطِّيَ رَأْسَهُ، وَأَنْ نَجْعَلَ عَلَى رِجْلَيْهِ مِنَ الإِذْخِرِ[1].

## ٢٧- باسێک: ئەگەر کفن نەبوو بۆ مردوویەک تەنها ئەوەندە نەبێ کە سەری یان قاچەکانی داپۆشێ، ئەوە سەری پێ دادەپۆشرێ

**١٢٧٦- خەبباب ﷺ دەڵێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کۆچمان کرد، وە مەبەستمان تەنها ڕەزامەندی خوا بوو، ئیتر پاداشتمان کەوتە لای خوا، جا کەسی وامان هەبوو مردو هیچی لە بەرهەمی پاداشتەکەی نەخوارد، لەوانە موصعەبی کوڕی عومەیر ﷺ - هەشمان بوو بەروبوومی پاداشتەکەی پێگەشت ئەوەتا لێی دەکاتەوە- لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو[2]، هیچ نەبوو پێوەی کفن بکەین عەبایەك نەبێ، کە سەریمان پێ دادەپۆشی هەردوو قاچی دەردەکەوت، کە قاچەکانیمان پێ دادەپۆشی سەری دەردەکەوت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین کە سەری داپۆشین، وە بەگەڵای ئیزخیریش[3] قاچەکانی داپۆشین.**

## ٢٨- بابُ مَنِ اسْتَعَدَّ الكَفَنَ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَلَمْ يُنْكَرْ عَلَيْهِ

**١٢٧٧-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلٍ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ بِبُرْدَةٍ مَنْسُوجَةٍ فِيهَا حَاشِيَتُهَا -أَتَدْرُونَ مَا البُرْدَةُ؟ قَالُوا: الشَّمْلَةُ؟ قَالَ:

---

[1] بروانە: ٣٨٩٧، ٣٩١٣، ٤٠٤٧، ٤٠٨٢، ٦٤٣٢، ٦٤٤٨.

[2] واتە: موصعەبی کوڕی عومەیر ﷺ.

[3] گیایەکە وەک کاروتە.

نَعَمْ- قَالَتْ: نَسَجْتُهَا بِيَدِي، فَجِئْتُ لأَكْسُوَكَهَا. فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ ﷺ مُحْتَاجًا إِلَيْهَا، فَخَرَجَ إِلَيْنَا وَإِنَّهَا إِزَارُهُ، فَحَسَّنَهَا فُلاَنٌ فَقَالَ: اكْسُنِيهَا، مَا أَحْسَنَهَا. قَالَ القَوْمُ: مَا أَحْسَنْتَ، لَبِسَهَا النَّبِيُّ ﷺ مُحْتَاجًا إِلَيْهَا، ثُمَّ سَأَلْتَهُ وَعَلِمْتَ أَنَّهُ لاَ يَرُدُّ. قَالَ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا سَأَلْتُهُ لأَلْبَسَهَا، إِنَّمَا سَأَلْتُهُ لِتَكُونَ كَفَنِي. قَالَ سَهْلٌ: فَكَانَتْ كَفَنَهُ[1].

## ٢٨- باسی ئەو کەسەی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کفنی بۆ خۆی ئامادەکردووە ڕەخنەشی لێ نەگیراوە

**١٢٧٧- سەهل ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێك بالاپۆشێکی شاڵی چنراوی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، هێشتا ڕیشووەکانی پێوەبوو (تازەبوو نەبڕابوو)، -دەزانن بالاپۆش چییە؟ وتیان: عابایە، سەهل وتی: بەڵێ وایە- ئافرەتەکە وتی: بەدەستی خۆم چنیومە و هاتووم تا پێت بدەم لەبەری بکەیت. پێغەمبەریش لێی وەرگرت، چونکە پێویستی بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ نێومان ئەو شاڵەی پۆشیبوو، جا فلان (کەسێك) شاڵەکەی پێ جوان بوو وتی: بیدە بە من لەبەری بکەم، ئای چەند جوانە! خەڵکەکەش وتیان: چاکت نەکرد، پێغەمبەر ﷺ بۆیە لەبەری کرد پێویستی پێی بوو، پاشان تۆش داوات لێ کرد و زانیت دەست نانێت بەڕووی کەسەوە، پیاوەکە وتی: دڵنیابن سوێند بەخوا من بۆ ئەوە داوام نەکرد لەبەری بکەم و بیپۆشم، بەڕاستی بۆ ئەوە داوام کرد تا ببێتە کفنم، سەهل دەڵێ: وا دەرچوو بوو بە کفنی.**

---

[1] بڕوانە: ٢٠٩٣، ٥٨١٠، ٦٠٣٦.

## ٢٩- بابُ اتِّبَاعِ النِّسَاءِ الجَنَائِزَ

١٢٧٨- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ بْنُ عُقْبَةَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ أُمِّ الهُذَيْلِ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها قَالَتْ: نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الجَنَائِزِ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا[1].

## ٢٩- باسی ئافرەتان شوێن تەرم بکەون

**١٢٧٨- ئوممو عەتییە رضي الله عنها دەڵێ: ئێمە ڕێگری کراین لە شوێنکەوتنی تەرم، بەڵام لێمان یاساغ نەکرا[2].**

## ٣٠- بابُ إِحْدَادِ المَرْأَةِ عَلَى غَيْرِ زَوْجِهَا

١٢٧٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ المُفَضَّلِ، حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ عَلْقَمَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: تُوُفِّيَ ابْنٌ لِأُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها، فَلَمَّا كَانَ اليَوْمُ الثَّالِثُ دَعَتْ بِصُفْرَةٍ، فَتَمَسَّحَتْ بِهِ وَقَالَتْ: نُهِينَا: أَنْ نُحِدَّ أَكْثَرَ مِنْ ثَلاَثٍ إِلاَّ بِزَوْجٍ[3].

## ٣٠- باسی پرسەباری ئافرەت بۆ جگە لە مێردەکەی

**١٢٧٩- موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێ: کوڕێکی ئوممو عەتییە مرد رضي الله عنها، جا کاتێ سێیەم ڕۆژی پرسەکەی بوو، ئوممو عەتییە داوای بۆنێکی خۆشی کرد کە زەرد بوو بەدەستی دای لە خۆی و وتی: ڕێگریمان لێ کراوە لە سێ ڕۆژ زیاتر پرسە بگێڕین مەگەر بۆ مێرد.**

---

[1] بڕوانە: ٣١٣.

[2] واتە: ڕێگریەکە بۆ یاساغ و حەرامێتی نییە، بەڵکو باش نییەو بۆ کەراهەتە.

[3] بڕوانە: ٣١٣.

١٢٨٠- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنِي حُمَيْدُ بْنُ نَافِعٍ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَتْ: لَمَّا جَاءَ نَعْيُ أَبِي سُفْيَانَ مِنَ الشَّأْمِ دَعَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ ﵂ بِصُفْرَةٍ فِي اليَوْمِ الثَّالِثِ، فَمَسَحَتْ عَارِضَيْهَا وَذِرَاعَيْهَا وَقَالَتْ: إِنِّي كُنْتُ عَنْ هَذَا لَغَنِيَّةً، لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا تُحِدُّ عَلَيْهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[1].

**١٢٨٠- زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە دەڵێ: کاتێ هەواڵی مردنی ئەبو سوفیان هات لە شامەوە، ئوممو حەبیبە ﵂[2] لە ڕۆژی سێیەمی پرسەکەیدا داوای بۆنی خۆشی کرد کە زەرد بوو، وە بەدەستی هێنای بەلاجاینی و هەردوو باڵیداو، وتی: من پێویستیم بەم بۆنی خۆش لەخۆدان نییە، لەبەر ئەوە نەبووایە کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((دروست نیە بۆ ئافرەتێك باوەڕی بە خوا و بەڕۆژی دوایی هەبێت پرسە و ماتەم بگرێ زیاد لە سێ ڕۆژ مەگەر بۆ مێردی، ئەوە بێگومان (بۆ مێردی) چوار مانگ و دە ڕۆژ ماتەم دەگرێ)).**

١٢٨١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ- فَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[3].

**١٢٨١- حومەیدی کوڕی نافیع دەڵێ: زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە بۆی گێڕایەوە وتی: ڕۆیشتم بۆ ماڵی ئوممو حەبیبەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: لە**

---

[1] بڕوانە: ١٢٨١، ٥٣٣٤، ٥٣٣٩، ٥٣٤٥.

[2] ئوممو حەبیبە کچی ئەبو سوفیانە ﵄. إرشاد الساري: ٣/٣٥٤.

[3] بڕوانە: ١٢٨٠.

**پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((دروست نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی بەخوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێ زیاتر لە سێ ڕۆژ ماتەم بگرێت بۆ هیچ مردوویەك، مەگەر بۆ مێردی چوار مانگ و دە ڕۆژ ماتەم دەگرێ)).**

١٢٨٢- ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا، فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ، ثُمَّ قَالَتْ: مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى المِنْبَرِ يَقُول: «لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[1].

**١٢٨٢-(زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە دەڵێ): پاشان ڕۆیشتم بۆ لای زەینەبی کچی جەحش کاتێ براکەی مرد، جا داوای بۆنی خۆشی کردو لە خۆی دا، پاشان وتی: من پێویستیم بە بۆنی خۆش نیە، تەنها ئەوەندە هەیە گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لەسەر دوانگە دەیفەرموو: ((دروست نیە بۆ هیچ ئافرەتێك باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێت، زیاد لە سێ ڕۆژ ماتەم بگرێ بۆ هیچ مردوویەك، جگە لە مێرد کە چوار مانگ و دە ڕۆژ دروستە)).**

## ٣١- بابُ زِيَارَةِ القُبُورِ

١٢٨٣- حَدَّثَنَا آدَمُ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِامْرَأَةٍ تَبْكِي عِنْدَ قَبْرٍ فَقَالَ: «اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي». قَالَتْ: إِلَيْكَ عَنِّي، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَبْ بِمُصِيبَتِي وَلَمْ تَعْرِفْهُ. فَقِيلَ لَهَا: إِنَّهُ النَّبِيُّ ﷺ. فَأَتَتْ بَابَ النَّبِيِّ ﷺ فَلَمْ تَجِدْ عِنْدَهُ بَوَّابِينَ فَقَالَتْ: لَمْ أَعْرِفْكَ. فَقَالَ: «إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى»[2].

---

[1] بڕوانە: ٥٣٣٥.

[2] بڕوانە: ١٢٥٢.

## ٣١- باسی سەردانی گۆڕستان (دروستە)

**١٢٨٣- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای ئافرەتێكدا تێپەڕی لەلای گۆڕێكدا دەگریا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لە خوا بترسەو ئارام بگرە))، ئافرەتەكەش وتی: وازم لێ بێنە، بەڕاستی تۆ بەڵای وەك منت بەسەر نەهاتووە! ئافرەتەكە پێغەمبەری ﷺ نەناسی، ئینجا بە ئافرەتەكە وترا: بێگومان ئەو پیاوە پێغەمبەر بوو ﷺ، ئەویش هات بۆ بەردەرگایماڵی پێغەمبەر ﷺ، هیچ پاسەوانێك یان دەرگاوانێكی لەبەر دەرگای ماڵیدا نەبینی[1]، ئینجا بە پێغەمبەری ﷺ وت: من تۆم نەناسی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئارامگرتنێ (كە خوا پێی ڕازییە) لە سەرەتای لێقەومانەكەومیە)).**

## ٣٢- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «يُعَذَّبُ المَيِّتُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ» إِذَا كَانَ النَّوْحُ مِنْ سُنَّتِه

لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ قُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا ﴿٦﴾ ﴾ التحريم. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»[2]. فَإِذَا لَمْ يَكُنْ مِنْ سُنَّتِهِ، فَهُوَ كَمَا قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٦٤﴾ ﴾ الأنعام. وَهُوَ كَقَوْلِهِ: ﴿ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ ﴿١٨﴾ ﴾ فاطر. وَمَا يُرَخَّصُ مِنَ البُكَاءِ فِي غَيْرِ نَوْحٍ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا إِلاَّ كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا»[3]. وَذَلِكَ لأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ القَتْلَ.

---

[1] واتە: كە پێیان وت: ئەوە پێغەمبەرە ﷺ، وایزانی وەک پادشاکان دەرگاوان یان پاسەوانی هەیە، کەچی کە هات بۆچوونەکەی ڕاست دەرنەچوو.

[2] بڕوانە: ٨٩٣.

[3] بڕوانە: ٣٣٣٥.

## ٣٢- باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: ((مردوو سزا دەدرێ بە هەندێ گریانی کەس و کاری لەسەری)) ئەگەر شین و شەپۆڕەکە مردووەکە خۆی هۆکار بوو کە بکرێ

بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند: (خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێ)، وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((هەمووتان شوانن و بەرپرسیارن لە شوانیەتییەکەتان))، جا ئەگەر مردووەکە خۆی هۆی ئەو شین و شەپۆڕە نەبوو، ئەوە بەو جۆرەیە کە عائیشە دەڵێ(بەڵگەشی ئەم ئایەتەیە): (کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ)، وە وەك ئەم ئایەتە وایە: (ئەگەر کەسێك باری تاوانی گران بێ، داوا بکات بەشێك لەو تاوانە کەسێکی تر بۆی هەڵگرێ، هیچێك لە تاوانەکەی هەڵناگیرێ)، وە باسی ئەوەی ڕێگەی پێدراوە لە گریان بەبێ شین و شەپۆڕ. وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هەرکەسێك بەستەم بکوژرێ، ئەوە بەشێکی خوێنەکەی لەسەر کوڕی یەکەمی ئادەمە))، چونکە یەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا.

١٢٨٤- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ وَمُحَمَّدٌ قَالَا: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا عَاصِمُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَرْسَلَتِ ابْنَةُ النَّبِيِّ ﷺ إِلَيْهِ: إِنَّ ابنا لِي قُبِضَ فَائْتِنَا. فَأَرْسَلَ يُقْرِئُ السَّلَامَ وَيَقُولُ: «إِنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ». فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ تُقْسِمُ عَلَيْهِ لَيَأْتِيَنَّهَا، فَقَامَ وَمَعَهُ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَرِجَالٌ، فَرُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ -قَالَ: حَسِبْتُهُ أَنَّهُ قَالَ- كَأَنَّهَا شَنٌّ. فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ. فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا هَذَا؟ فَقَالَ: «هَذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللَّهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ»[1].

[1] بڕوانە: ٥٦٥٥، ٦٦٠٢، ٦٦٥٥، ٧٣٧٧، ٧٤٤٨.

**١٢٨٤- ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: کچێکی پێغەمبەر ﷺ کەسێکی نارد بۆلای پێغەمبەر ﷺ (پێی بڵێت) کە کوڕێکم لە گیانکێشان دایە وەرە بۆ ماڵمان، پێغەمبەریش ﷺ کەسێکی نارد کە سەلامی لێ بکات و پێی بڵێ: ((بێگومان خوا ئەوەی دەیباتەوە و ئەوەی دەیدات هەر هی خۆیەتی، وە هەموو شتێکیش لای خوا بۆ ماوەیەکی دیاری کراوە، جا با ئارام بگرێ و چاوەڕوانی پاداشتی لای خوا بێت))، ئینجا کچەکەی ناردیەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ سوێندی لێ خوارد کە دەبێ بڕوات بۆ ماڵیان، ئەویش هەستا و ڕۆیشت و سەعدی کوڕی عوبادە و موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی سابیت و پیاوانێکی تری لەگەڵدا بوو، ئینجا منداڵەکە هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ گیانی دەداو بە ناڕەحەت هەناسەی دەدا، ئوسامە دەڵێ - وابزانم وتی:- دەتوت مەشکەیە، جا چاوەکانی پێغەمبەر ﷺ فرمێسکیان پیا هاتەخوار. سەعدیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چییە؟ ئەویش فەرمووی: ((ئەمە بەزەییە کە خوا لەدڵی بەندەکانیدا دروستی کردووە، وە بێگومان خوای گەورە لەنێو بەندەکانیدا ڕەحم بەوانەیان دەکات کە بە بەزەیین)).**

١٢٨٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ هِلاَلِ بْنِ عَلِيٍّ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: شَهِدْنَا بِنْتًا لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ عَلَى القَبْرِ، قَالَ: فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَدْمَعَانِ قَالَ: فَقَالَ: «هَلْ مِنْكُمْ رَجُلٌ لَمْ يُقَارِفِ اللَّيْلَةَ؟». فَقَالَ أَبُو: طَلْحَةَ أَنَا. قَالَ: «فَانْزِلْ». قَالَ: فَنَزَلَ فِي قَبْرِهَا[1].

**١٢٨٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئامادەی (ناشتنی) کچێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەدا لە قەراغی گۆڕەکەدا**

---

[1] بڕوانە: ١٣٤٢.

**دانیشتبوو، (ئەنەس) دەڵێ: بینیم چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دەهاتە خوارەوە، دەڵێ: جا فەرمووی: ((پیاوێکتان تێدایە ئەمشەو نزیکی خێزانی نەکەوتبێ؟))، ئەبو تەڵحە ﷺ وتی: من، فەرمووی: ((دابەزە نێو گۆڕەکە))، ئەنەس دەڵێ: ئەبو تەڵحەش دابەزییە نێو گۆڕی کچەکە.**

١٢٨٦- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: تُوُفِّيَتِ ابْنَةٌ لِعُثْمَانَ ﷺ بِمَكَّةَ وَجِئْنَا لِنَشْهَدَهَا، وَحَضَرَهَا ابْنُ عُمَرَ وَابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ، وَإِنِّي لَجَالِسٌ بَيْنَهُمَا -أَوْ قَالَ: جَلَسْتُ إِلَى أَحَدِهِمَا. ثُمَّ جَاءَ الآخَرُ، فَجَلَسَ إِلَى جَنْبِي- فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمَرَ ﷺ لِعَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ: أَلاَ تَنْهَى عَنِ البُكَاءِ؟ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ المَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ».

**١٢٨٦- عەبدوڵای کوڕی عوبەیدوڵای کوڕی ئەبی مولەیکە دەڵێ: کچێکی عوسمان لە مەککە مرد، ئێمەش هاتین بۆ ئەوەی ئامادەی ناشتنەکەی بین، عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ ئامادەی بوون، منیش لە نێوانیاندا دانیشتبووم -یان وتی: لەلای یەکێکیاندا دانیشتبووم، پاشان ئەوی تریان هات لە تەنیشتمدا دانیشت -، عەبدوڵای کوڕی عومەریش ﷺ بە عەمری کوڕی عوسمانی وت: بۆ ڕێگری (ئافرەتان) ناکەیت لەگریان؟ چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان مردوو بەهۆی گریانی کەس و کارییەوە سزا دەدرێ)).**

١٢٨٧- فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: قَدْ كَانَ عُمَرُ ﷺ يَقُولُ بَعْضَ ذَلِكَ. ثُمَّ حَدَّثَ قَالَ: صَدَرْتُ مَعَ عُمَرَ ﷺ مِنْ مَكَّةَ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالبَيْدَاءِ، إِذَا هُوَ بِرَكْبٍ تَحْتَ ظِلِّ سَمُرَةٍ، فَقَالَ: اذْهَبْ فَانْظُرْ مَنْ هَؤُلاَءِ الرَّكْبُ؟ قَالَ: فَنَظَرْتُ فَإِذَا صُهَيْبٌ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: ادْعُهُ لِي. فَرَجَعْتُ إِلَى صُهَيْبٍ فَقُلْتُ: ارْتَحِلْ فَالحَقْ أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ. فَلَمَّا أُصِيبَ عُمَرُ دَخَلَ صُهَيْبٌ

يَبْكِي يَقُولُ وَاأَخَاهُ، وَاصَاحِبَاهُ. فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: يَا صُهَيْبُ أَتَبْكِي عَلَيَّ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّ المَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ»؟![1].

**١٢٨٧- وە عەبدوڵای کوری عەباس ﷺ وتی: بەڕاستی عومەر ﷺ هەندێ لەو قسانەی دەکرد، پاشان گێڕایەوەو وتی: لەگەڵ عومەر لە پێشەوەی خەڵکەکەوە بووین لە مەککە دەرچووین هەتا گەیشتینە بەیدا، لەپڕ (لە ناکاو) چەند سوارێکی بینی لەژێر سێبەری دار مۆردێکدا وتی: بڕۆ سەیری ئەو سوارانەکە بزانە کێن؟ عەبدوڵا دەڵێ: منیش سەیرم کرد دەبینم صوهەیبە (لەگەڵ چەند کەسێکدا)و هەواڵەکەم پێدا، عومەریش وتی: صوهەیبم بۆ بانگ بکە، منیش گەڕامەوە بۆ لای صوهەیب و وتم: هەڵسە بڕۆ بگە بە پێشەوای ئیمانداران (عومەری کوڕی خەتاب)، (صوهەیبیش گەیشتەوە بە عومەر هەتا هەمووومان بەیەکەوە ڕۆیشتینە نێو مەدینە)، جا کاتێ عومەر لێیدرا[2]، صوهەیب ڕۆیشتە لای و دەستی کرد بەگریان و دەیوت: ئەی هاوار بۆ براکەم ئەی هاوار بۆ هاوڕێکەم، عومەریش وتی: ئەی صوهەیب چۆن دەگریت بۆم؟ لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان مردوو بەهۆی گریانی کەس و کارییەوە سزا دەدرێ)).**

١٢٨٨- قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: فَلَمَّا مَاتَ عُمَرُ ﷺ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ ﷺ فَقَالَتْ: رَحِمَ اللَّهُ عُمَرَ، وَاللَّهِ مَا حَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ لَيُعَذِّبُ المُؤْمِنَ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ. وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «إِنَّ اللَّهَ لَيَزِيدُ الكَافِرَ عَذَابًا بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ». وَقَالَتْ حَسْبُكُمُ القُرْآنُ ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٦٤﴾﴾ الأنعام. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: وَاللَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَى. قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: وَاللَّهِ مَا قَالَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ شَيْئًا[3].

---

[1] بڕوانە: ١٢٩٠، ١٢٩٢.

[2] ئیمامی عومەر ﷺ پاش ئەوەی لە سەفەری حەج گەڕایەوە بۆ مەدینە، لە مزگەوتدا لە کاتی نوێژدا لێی درا.

[3] بڕوانە: ١٢٨٩، ٣٩٧٨.

**١٢٨٨- عەبدوڵاى كوڕى عەباس ﵄ دەڵێ: كاتێ عومەر ﵁ مرد، ئەو قسەیەم گێڕایەوە بۆ عائیشە ﵂، عائیشەش وتی: خوا ڕەحم بە عومەر بكات، سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە: بێگومان مردوو بە هۆی گریانی كەس و كارییەوە سزا دەدرێ، بەڵكو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا سزای كافر زیاتر دەكات، بەهۆی گریانی كەس و كاری بۆی))، وە عائیشە وتی: قورئان بەسە بۆ ئێوە بیكەنە بەڵگە كە دەفەرموێ: (وە هیچ تاوانبارێك تاوانی كەسی تر هەڵناگرێ)، عەبدوڵای كوڕی عەباس ﵄ لەوێدا وتی: خوا مرۆڤ پێدەكەنێنێ و دەیگریێنێ[١]، ئیبنو ئەبی مولەیكە وتی: سوێند بە خوا عەبدوڵای كوڕی عومەر ﵄ هیچی نەوت.**

١٢٨٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ، أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ ﵂ -زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ- قَالَتْ: إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى يَهُودِيَّةٍ يَبْكِي عَلَيْهَا أَهْلُهَا فَقَالَ: «إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْهَا، وَإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ فِي قَبْرِهَا»[٢].

**١٢٨٩- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای تەرمی ئافرەتێكی جوولەكەدا، كەس و كارەكەی دەگریان بۆی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەوانە بەسەریدا دەگرین، ئەویش لە گۆڕەكەیدا (بەهۆی بێباوەڕییەكەیەوە) سزا دەدرێ)).**

١٢٩٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ خَلِيلٍ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ -وَهُوَ: الشَّيْبَانِيُّ- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا أُصِيبَ عُمَرُ ﵁ جَعَلَ صُهَيْبٌ يَقُولُ: وَاأَخَاهُ. فَقَالَ عُمَرُ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ المَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الحَيِّ»؟[٣]

---

[١] واتە: پێكەنین و گریان بە دەست مرۆڤ نیە، خوا ئەو حاڵەتانەی بەفیترەت لە لەشی مرۆڤدا دروست كردوە.

[٢] بڕوانە: ١٢٨٨.

[٣] بڕوانە: ١٢٨٨.

**١٢٩٠- ئەبو بوڕدە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێ عومەر لێی درا، صوهەیب دەستی کرد بە وتنی: ئەی هاوار بۆ براکەم، عومەریش وتی: ئایا نەتزانیوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان مردوو بە هۆی گریانی زیندووەکانەوە سزا دەدرێ)).**

## ٣٣- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ النِّيَاحَةِ عَلَى المَيِّتِ

وَقَالَ عُمَرُ رضي الله عنه: دَعْهُنَّ يَبْكِينَ عَلَى أَبِي سُلَيْمَانَ مَا لَمْ يَكُنْ نَقْعٌ أَوْ لَقْلَقَةٌ. وَالنَّقْعُ: التُّرَابُ عَلَى الرَّأْسِ، وَاللَّقْلَقَة الصَّوْتُ.

١٢٩١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنِ المُغِيرَةِ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ كَذِبًا عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ، مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ». سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ نِيحَ عَلَيْهِ يُعَذَّبُ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ».

## ٣٣- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە شین و شەپۆڕکردن بۆ مردوو

**وە عومەر رضي الله عنه وتی:[1] وازیان لێ بێنە با بگرین بەسەر ئەبو سولەیماندا (واتە: خالید)، بە مەرجێ خۆڵ نەکەن بەسەریانداو دەنگ بەرز نەکەنەوە، (النَّقْعُ): خۆڵ بەسەرخۆداکردن، (اللَّقْلَقَة): دەنگ بەرزکردنەوە.**

**١٢٩١- موغەیرە رضي الله عنه دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان درۆکردن بەدەم منەوە وەك درۆکردن نییە بەدەم هیچ کەسەوە، هەرکەس بە ئەنقەست درۆ بکات بەدەم منەوە، ئەوە با شوێنی خۆی لە**

[1] کاتێ خالیدی کوڕی وەلید مرد، ئافرەتانی خزمی دەگریان، وتیان بە عومەر: ڕێگریان بکە.

**دۆزەخدا ئامادە بكات))، وە گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ فەرمووی: ((هەركەس گریان و شەپۆڕی بۆ بكرێ، بەهۆی ئەو گریان و شەپۆڕەوە سزا دەدرێ)).**

١٢٩٢- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ». تَابَعَهُ عَبْدُ الأَعْلَى: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ. وَقَالَ آدَمُ، عَنْ شُعْبَةَ، «الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الْحَيِّ عَلَيْهِ»[1].

**١٢٩٢- عەبدولڵای كوڕی عومەر رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((مردوو لە گۆڕەكەیدا سزادەدرێ، بەهۆی ئەو گریان و شین و شەپۆڕەی بۆی كراوە))، وە لە گێڕانەوەكەی عەبدولئەعلا كە پاڵپشتی فەرموودەكەی پێشوو دەكات و دەڵێ: یەزیدی كوڕی زوڕەیع بۆی گێڕاینەوە، ئەویش دەڵێ: سەعید بۆی گێڕاینەوەو دەڵێ: قەتادە بۆی گێڕاینەوە. وە ئادەم لەڕێگەی شوعبەوە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مردوو سزا دەدرێ بە هۆی گریانی زیندووەوە بۆی)).**

## ٣٤- بابٌ

١٢٩٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما قَالَ: جِيءَ بِأَبِي يَوْمَ أُحُدٍ، قَدْ مُثِّلَ بِهِ حَتَّى وُضِعَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ سُجِّيَ ثَوْبًا، فَذَهَبْتُ أُرِيدُ أَنْ أَكْشِفَ عَنْهُ فَنَهَانِي قَوْمِي، ثُمَّ ذَهَبْتُ أَكْشِفُ عَنْهُ فَنَهَانِي قَوْمِي، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرُفِعَ فَسَمِعَ صَوْتَ صَائِحَةٍ، فَقَالَ: «مَنْ هَذِهِ؟». فَقَالُوا: ابْنَةُ عَمْرٍو -أَوْ أُخْتُ عَمْرٍو- قَالَ: «فَلِمَ تَبْكِي؟ -أَوْ لاَ تَبْكِي- فَمَا زَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رُفِعَ»[2].

---

[1] بڕوانە: ١٢٨٧.

[2] بڕوانە: ١٢٤٤.

## ٣٤- باسێک

١٢٩٣- جابيرى كوڕى عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژى غەزاى ئوحوددا (تەرمى) باوكم هێنرا كە بێگومان شێوێنرابوو، (هێنرا) هەتا لەبەردەمى پێغەمبەرى خوادا ﷺ دانرا، كە بە قوماشێك داپۆشرابوو، منيش ڕۆيشتم ويستم قوماشەكەى سەر ڕووخسارى لادەم، بەڵام خزمەكانم ڕێگرييان لێ كردم، پاشان دووبارە ڕۆيشتم ويستم قوماشەكەى سەر ڕووخسارى لادەم، بەڵام خزمەكانم ڕێگرييان لێ كردم، جا پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمانى كرد و (تەرمەكە) هەڵگيرا، ئينجا گوێى لەئافرەتێك بوو بەدەنگى بەرز دەگريا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: ((ئەو ئافرەتە كێيە؟))، عەرزيان كرد: كچەكەى عەمرە -يان خوشكەكەى عەمرە-، فەرموى: ((بۆچى دەگريت -يان مەگرى-، بەردەوام فريشتەكان بەباڵيان دايان پۆشيبوو هەتا هەڵگيرا و بردرا)).

## ٣٥- بابٌ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ شَقَّ الجُيُوبَ

١٢٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا زُبَيْدٌ اليَامِيُّ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الخُدُودَ، وَشَقَّ الجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الجَاهِلِيَّةِ»[1].

## ٣٥- باسێک: ئەو كەسەى يەخەى خۆى دادڕێ لە ئێمە نييە

١٢٩٤- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: ((ئەو كەسە لە ئێمە نييە لە ڕوومەتى خۆى بدات، يەخەى دادڕێت، هاوار بكات، وەك هاوارو قيژەى كەسانى سەردەمى نەفامى)).

---

[1] بڕوانە: ١٢٩٧، ١٢٩٨، ٣٥١٩.

## ٣٦- بابٌ: رِثَاءِ النَّبِيِّ ﷺ سَعْدَ ابْنَ خَوْلَةَ

١٢٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي عَامَ حَجَّةِ الوَدَاعِ مِنْ وَجَعٍ اشْتَدَّ بِي، فَقُلْتُ: إِنِّي قَدْ بَلَغَ بِي مِنَ الوَجَعِ وَأَنَا ذُو مَالٍ، وَلاَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَةٌ، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَى مَالِي؟ قَالَ: «لاَ». فَقُلْتُ: بِالشَّطْرِ؟ فَقَالَ: «لاَ» ثُمَّ قَالَ: «الثُّلُثُ وَالثُّلْثُ كَبِيرٌ -أَوْ كَثِيرٌ- إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلاَّ أُجِرْتَ بِهَا، حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُخَلَّفُ بَعْدَ أَصْحَابِي؟ قَالَ: «إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ فَتَعْمَلَ عَمَلًا صَالِحًا إِلاَّ ازْدَدْتَ بِهِ دَرَجَةً وَرِفْعَةً، ثُمَّ لَعَلَّكَ أَنْ تُخَلَّفَ حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ، اللَّهُمَّ أَمْضِ لأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ، وَلاَ تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، لَكِنِ البَائِسُ سَعْدُ ابْنُ خَوْلَةَ» يَرْثِي لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ مَاتَ بِمَكَّةَ[1].

## ٣٦- باسێک: بەزەیی هاتنەوەی پێغەمبەر ﷺ بە سەعدی کوڕی خەولەدا

**١٢٩٥- عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە سەعدی باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە وتی: لە ساڵی حەجیماڵئاواییدا زۆر نەخۆش بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردم، وە بە پێغەمبەرم ﷺ وت: بێگومان نەخۆشییەکەم گەیشتۆتە ئەوپەڕی، وە من خاوەن ماڵ و سامانم، وە تەنها کچێکم هەیە میراتم لێ ببات، ئایا دوو لەسەر سێی ماڵەکەم ببەخشم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نەخێر))، ئینجا وتم: نیوەی ببەخشم؟ فەرمووی: ((نەخێر))، پاشان فەرمووی: ((سێ یەکی ببەخشە، سێ یەکیش گەورەیە -یان زۆرە-، چونکە تۆ**

[1] بڕوانە: ٥٦.

میراتگرەكانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی، باشترە لەوەی كە بەهەژاری بەجێیان بهێڵی دەست لە خەڵك پان بكەنەوە، وە بێگومان تۆ هەر بەخشینێك ببەخشیت كە مەبەستت پێی ڕەزامەندی خوابێت، ئیللا پاداشتت دەدرێتەوە لەسەری، هەتا ئەو پاروەش دەیخەیتە دەمی خێزانەكەتەوە (بیخوات)))، ئەوسا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەپاش هاوڕێكانم (لە مەككە) بەجێ دەهێڵرێم (واتە نامرم)؟ فەرمووی: ((دڵنیابە كە بەجێ دەمێنی (نامری)، هەر كردەوەیەكی چاكە بكەیت، پلەو پایەت پێی بەرز دەبێتەوە، پاشان ئومێد دەكەم بەجێمانەكەت وابێت تا كەسانێك (كە مسوڵمانن) بەهۆی تۆوە سوودیان پێ بگات، وە كەسانێكیش (كە خراپن) بەهۆی تۆوە زیانیان پێ بگات، خوایە كۆچی هاوەڵانم گیرا بكە، پاشگەزیان نەكەیتەوە، بەڵام داماو و هەژار سەعدی كوڕی خەولەیە))[١]، پێغەمبەری خوا ﷺ غەمباربوو بۆی و دڵی بۆی سووتا كە لە مەككە مرد.

## ٣٧- بابُ مَا يُنْهَى مِنَ الحَلْقِ عِنْدَ المُصِيبَةِ

١٢٩٦- وَقَالَ الحَكَمُ بْنُ مُوسَى: ثَنَا يَحْيَى بْنُ حَمْزَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جَابِرٍ، أَنَّ القَاسِمَ بْنَ مُخَيْمِرَةَ حَدَّثَهُ: قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ بْنُ أَبِي مُوسَى قَالَ: وَجِعَ أَبُو مُوسَى وَجَعًا فَغُشِيَ عَلَيْهِ، وَرَأْسُهُ فِي حَجْرِ امْرَأَةٍ مِنْ أَهْلِهِ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَرُدَّ عَلَيْهَا شَيْئًا، فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: أَنَا بَرِيءٌ مِمَّنْ بَرِئَ مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَرِئَ مِنَ الصَّالِقَةِ وَالحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ.

---

[١] دوو سەرنج:

١- سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص لە مەككە بەو نەخۆشییە نەمرد و لەدوای خۆی بێجگە لەو كچەی بۆ پێغەمبەری ﷺ باس دەكات كە تەنها ئەو میراتگریەتی، چەند كوڕی تری بووە، لەوانە: عامیر كە ڕاوی ئەم ڕیوایەتەیە.

٢- سەعدی كوڕی خەولە لەو سەفەرەیاندا بۆ حەجیماڵئاوایی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە مەككە كۆچی دوایی كرد، پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵگران بوو بۆی، چونكە پێی ناخۆش بوو هاوەڵە موهاجیرەكان لە مەككە بمرن و جێگیر بن.

## ٣٧- باسی ئەوەی ڕێگری لێ کراوە لە قژڕنین لە کاتی لێقەوماندا

**١٢٩٦- ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسا دەڵێ: ئەبو مووسا ﷺ جارێك نەخۆش کەوت و بورایەوە، سەری لە کۆشی ئافرەتێکدا بوو لەکەس و کاری خۆی (ئافرەتەکە شین و شەپۆڕی دەکرد بۆی)، ئەبو مووساش نەیدەتوانی هیچ وەڵامێکی بداتەوە، جا کە هۆشی کردەوە وتی: من بەریم لەوکەسەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لێ بەری کردووە، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بەری کرد لەو ئافرەتەی بەدەنگی بەرز شین و شەپۆڕ دەکات، ئافرەتێ قژی دەڕنێ و ئافرەتێ یەخەی دادەدڕێ (لە کاتی لێقەومان و کارەساتدا).**

## ٣٨- بابٌ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الخُدُودَ

١٢٩٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الخُدُودَ، وَشَقَّ الجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الجَاهِلِيَّةِ»[1].

## ٣٨- باسێک: ئەو کەسەی لە ڕوومەتی خۆی دەدات (لەکاتی کارەساتدا) لە ئێمە نییە

**١٢٩٧- عەبدوڵا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((لە ئێمە نییە ئەو کەسەی لە ڕوومەتی خۆی دەدات، یەخەی دادەڕنێت و هاوار و قیژە قیژ دەکات وەك سەردەمی نەفامی)).**

[1] بڕوانە: ١٢٩٤.

## ٣٩- بابُ مَا يُنْهَى مِنَ الوَيْلِ وَدَعْوَى الجَاهِلِيَّةِ عِنْدَ المُصِيبَةِ

١٢٩٨- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الخُدُودَ، وَشَقَّ الجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الجَاهِلِيَّةِ»[1].

## ٣٩- باسی ئەوەی ڕێگری کراوە لە هاوار و قیژەی سەردەمی نەفامی لەکاتی لێقەوماندا

**١٢٩٨- عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسە لە ئێمە نییە کە لە ڕوومەتی خۆی دەدات و یەخەی دادەڕنێت، هاوار بکات وەك هاوار و قیژەی کەسانی سەردەمی نەفامی)).**

## ٤٠- بابُ مَنْ جَلَسَ عِنْدَ المُصِيبَةِ يُعْرَفُ فِيهِ الحُزْنُ

١٢٩٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ قَالَ: سَمِعْتُ يَحْيَى قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَمْرَةُ قَالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: لَمَّا جَاءَ النَّبِيَّ ﷺ قَتْلُ ابْنِ حَارِثَةَ وَجَعْفَرٍ وَابْنِ رَوَاحَةَ جَلَسَ يُعْرَفُ فِيهِ الحُزْنُ، وَأَنَا أَنْظُرُ مِنْ صَائِرِ البَابِ -شَقِّ البَابِ- فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّ نِسَاءَ جَعْفَرٍ، وَذَكَرَ بُكَاءَهُنَّ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَنْهَاهُنَّ، فَذَهَبَ ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ، لَمْ يُطِعْنَهُ فَقَالَ: انْهَهُنَّ. فَأَتَاهُ الثَّالِثَةَ قَالَ: وَاللَّهِ غَلَبْنَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَزَعَمَتْ أَنَّهُ قَالَ: «فَاحْثُ فِي أَفْوَاهِهِنَّ التُّرَابَ». فَقُلْتُ: أَرْغَمَ اللَّهُ أَنْفَكَ، لَمْ تَفْعَلْ مَا أَمَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَمْ تَتْرُكْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنَ العَنَاءِ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٢٩٤.

[2] بڕوانە: ١٣٠٥، ٤٢٦٣.

# ٤٠- باسی ئەوەی لە کاتی لێقەوماندا دانیشێ و خەفەت خواردنی پێوە دیار بێت

١٢٩٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێ هەواڵی کوژرانی زەیدی کوڕی حاریسە و جەعفەر و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت، دانیشت و خەفەتباری پێوە دیاربوو، لەوکاتە من لە درزی دەرگاکەوە سەیرم دەکرد -(صَائِرِ البَابِ)، واتە: درزی دەرگاکە-، ئینجا پیاوێك هات بۆ خزمەتی و وتی: ئافرەتەکانی خزمی جەعفەر، باسی شین و گریانیانی کرد (بۆ جەعفەر)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکرد کە ڕێگرییان لێ بکات، پیاوەکەش ڕۆیشت (پێی وتن)، پاشان بۆ جاری دووەم هاتەوەو ئافرەتەکان بە گوێیان نەکردبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەوە: ((ڕێگرییان لێبکە لەگریان))، (پیاوەکە ڕۆیشت و پێی وتن، بەڵام بە گوێیان نەکرد)، ئینجا بۆ جاری سێیەم هاتەوەو وتی: بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاریان ناکەین، عائیشە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((برۆ خۆڵ بکە دەمیان))، (عائیشە دەڵێ): منیش (بەو پیاوەم) وت: خوا سەرشۆڕت بکات، ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردی نەتکرد و کەمتەرخەمیت کرد، وازیشت لە ناڕەحەتکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهێنا.

١٣٠٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ الأَحْوَلُ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَهْرًا حِينَ قُتِلَ القُرَّاءُ، فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَزِنَ حُزْنًا قَطُّ أَشَدَّ مِنْهُ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٠٠١

**١٣٠٠- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ یەك مانگ قونوتی خوێند، كاتێ قوڕئان خوێنە (بانگخوازە)كان شەهید كران، جا هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیوە ئەوەندە خەمبار بووبێ.**

## ٤١- بابُ مَنْ لَمْ يُظْهِرْ حُزْنَهُ عِنْدَ المُصِيبَةِ

وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ كَعْبٍ القُرَظِيُّ: الجَزَعُ القَوْلُ السَّيِّئُ وَالظَّنُّ السَّيِّئُ. وَقَالَ يَعْقُوبُ: ﴿ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٨٦﴾ ﴾ يوسف.

١٣٠١- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الحَكَمِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: اشْتَكَى ابْنٌ لأَبِي طَلْحَةَ، قَالَ: فَمَاتَ وَأَبُو طَلْحَةَ خَارِجٌ، فَلَمَّا رَأَتِ امْرَأَتُهُ أَنَّهُ قَدْ مَاتَ هَيَّأَتْ شَيْئًا وَنَحَّتْهُ فِي جَانِبِ البَيْتِ، فَلَمَّا جَاءَ أَبُو طَلْحَةَ قَالَ: كَيْفَ الغُلاَمُ؟ قَالَتْ: قَدْ هَدَأَتْ نَفْسُهُ، وَأَرْجُو أَنْ يَكُونَ قَدِ اسْتَرَاحَ. وَظَنَّ أَبُو طَلْحَةَ أَنَّهَا صَادِقَةٌ، قَالَ: فَبَاتَ، فَلَمَّا أَصْبَحَ اغْتَسَلَ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ، أَعْلَمَتْهُ أَنَّهُ قَدْ مَاتَ، فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ أَخْبَرَ النَّبِيَّ ﷺ بِمَا كَانَ مِنْهُمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُبَارِكَ لَكُمَا فِي لَيْلَتِكُمَا». قَالَ سُفْيَانُ: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: فَرَأَيْتُ لَهُمَا تِسْعَةَ أَوْلاَدٍ كُلُّهُمْ قَدْ قَرَأَ القُرْآنَ[1].

## ٤١- باسی ئەو كەسەی لە كاتی لێقەوماندا خەفەت و پەژارەی دەرنەبڕێ

**موحەممەدی كوڕی كەعبی قورەزیی دەڵێ: وشەی (الجَزَعُ)[2] قسەی خراپ و گومانی خراپە، وە قوڕئان لەسەر زمانی یەعقوب دەفەرموێ: (بێگومان من باسی خەفەت و پەژارەی خۆم هەر لای خوا دەكەم).**

---

[1] بڕوانە: ٥٤٧٠.

[2] وشەی جزوعا لە سوورەتی المعارج ئایەتی ٢٠ دا هاتووە.

**١٣٠١- عەبدوڵای کوڕی ئەبو تەڵحە دەڵێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیکی ﷺ بیست دەیوت: منداڵێکی ئەبو تەڵحە نەخۆش بوو، جا لەکاتێکدا کە ئەبو تەڵحە لە ماڵەوە نەبوو منداڵەکە مرد، جا کە خێزانەکەی ئەبو تەڵحە زانی و دڵنیا بوو کە منداڵەکە مردووە، خواردنێکی ئامادەکرد (بۆ ئەبو تەڵحە)، وە لەگۆشەیەکی ماڵەکەدا منداڵەکەی دانا، ئینجا کاتێ ئەبو تەڵحە هاتەوە وتی: منداڵەکە چۆنە؟ (خێزانەکەی) وتی: بەڕاستی ئارام و بێ دەنگە، ئومێد دەکەم کە پشووی دابێت، ئەبو تەڵحە وای زانی ڕاست دەکات، ئەنەس دەڵێ: شەوی لەگەڵ خێزانیدا بەسەربرد، جا کاتێ نوێژی بەیانی ئەبو تەڵحە خۆی شۆری، ئینجا کە ویستی لە ماڵ بڕواتە دەرەوە پێی وت: کە منداڵەکەیان مردووە، ئینجا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نوێژی بەیانی کرد، پاشان ئەو دەنگ و باسەی خۆی و خێزانی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئومێدەوارم خوا گەورە بەرەکەت و فەڕ بڕژێنێ بەسەرتاندا لەو دروستبوونەی ئەم شەوتاندا))، سوفیان دەڵێ: پیاوێکی ئەنصاری وتی: بەچاوی خۆم بینیم ئەبو تەڵحە و خێزانی نۆ کوڕیان هەبوو، هەر نۆیان قورئان خوێن بوون.**

## ٤٢- بابُ الصَّبْرِ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى

وَقَالَ عُمَرُ ﷺ: نِعْمَ العِدْلاَنِ، وَنِعْمَ العِلاَوَةُ: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ البقرة.
وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ البقرة.

١٣٠٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى»[1].

## ٤٢- باسی ئارامگرتن لە سەرەتای کارەسات و لێقەومانەوە دەبێ

**عومەر ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتانە دەفەرمووێ: ئای چەند دووتابار و سەربارێکی جوانن ئەوەی لەم ئایەتەدا هاتووە: (ئەو کەسانەی کاتێ نارەحەتی و لێقەومانێکیان تووش دەبێ دەڵێن: ئێمە هەر هی خواین و تەنها بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، ئا ئەوانە درووود و بەزەیی بەسەریاندا دەبارێ لەلایەن پەروەردگاریانەوە، وە هەر ئەوانە لەسەر ڕێگای ڕاستن)، وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند: (پشت بەئارامگرتن و نوێژ ببەستن (بۆگەیشتن بەمەبەست)، بێگومان نوێژ ئەرکێکی گەورە و گرانە بەلای کەسانێکەوە نەبێ کە لە خوا دەترسن و خۆیان بەگەورە نازانن).**

**١٣٠٢- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((ئارامگرتن لە سەرەتای کارەسات و لێقەومانەوە دەبێ)).**

## ٤٣- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «إِنَّا بِكَ لَمَحْزُونُونَ»

وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «تَدْمَعُ العَيْنُ وَيَحْزَنُ القَلْبُ».

١٣٠٣- حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَسَّانَ، حَدَّثَنَا قُرَيْشٌ -هُوَ: ابْنُ حَيَّانَ- عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: دَخَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى أَبِي سَيْفٍ

---

[1] بڕوانە: ١٢٥٢.

الْقَيْنِ -وَكَانَ ظِئْرًا لإِبْرَاهِيمَ ﷺ- فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِبْرَاهِيمَ فَقَبَّلَهُ، وَشَمَّهُ، ثُمَّ دَخَلْنَا عَلَيْهِ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ، فَجَعَلَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَذْرِفَانِ. فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ رضي الله عنه: وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟! فَقَالَ: «يَا ابْنَ عَوْفٍ، إِنَّهَا رَحْمَةٌ». ثُمَّ أَتْبَعَهَا بِأُخْرَى فَقَالَ ﷺ: «إِنَّ العَيْنَ تَدْمَعُ، وَالقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلاَ نَقُولُ إِلاَّ مَا يَرْضَى رَبُّنَا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ». رَوَاهُ مُوسَى، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ المُغِيرَةِ عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ٤٣- باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ (کە بە ئیبراهیمی کوڕی فەرموو:) ((بێگومان ئێمە بە مردنت خەفەتبارین))

**وە عەبدوڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((چاو فرمێسك دەڕێژێ، دڵیش خەمبارو خەفەتبار دەبێ)).**

**١٣٠٣- ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتین بۆ لای ئەبو سەیفی ئاسنگەر -مێردی دایکی شیری ئیبراهیم[1] بوو-، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ باوەشی کرد بەئیبراهیمدا و ماچی کرد و بۆنی کرد، پاشان ئێمە دوای ئەوە ڕۆیشتینە لای ئیبراهیم لەگیانەڵادابوو (لەسەرەمەرگدا بوو)، وە چاوەکانی پێغەمبەری خوا فرمێسکیان پیادا دەهاتەخوار، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆش دەگریت؟ فەرمووی: ((ئەی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ئەوە سۆز و بەزەیی یە))، پاشان هەر چاوەکانی فرمێسکیان دەڕشت و فەرمووی: ((بێگومان چاو فرمێسك دەڕێژێ، دڵ خەمبارو خەفەتبار دەبێ، بەڵام شتێك ناڵێین پەروەردگارمان پێی ناخۆش بێت، وە**

---

[1] واتە: خێزانەکەی شیری دابوو بە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ.

بەڕاستی ئیبراهیم ئێمە بە جیابوونەوەو مردنت دلگرانین))، هەروەها مووسا لە سولەیمانی کوڕی موغیرەوە لە سابتەوە، ئەویش لە ئەنەسەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەمان فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

## ٤٤- بابُ البُكَاءِ عِنْدَ المَرِيضِ

١٣٠٤- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ عَنِ ابْنِ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الحَارِثِ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: اشْتَكَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ شَكْوَى لَهُ فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُهُ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ فَوَجَدَهُ فِي غَاشِيَةِ أَهْلِهِ فَقَالَ: «قَدْ قَضَى؟». قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَبَكَى النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا رَأَى القَوْمُ بُكَاءَ النَّبِيِّ ﷺ بَكَوْا، فَقَالَ: «أَلاَ تَسْمَعُونَ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُعَذِّبُ بِدَمْعِ العَيْنِ، وَلاَ بِحُزْنِ القَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا -وَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ- أَوْ يَرْحَمُ، وَإِنَّ المَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ». وَكَانَ عُمَرُ ﷺ يَضْرِبُ فِيهِ بِالعَصَا، وَيَرْمِي بِالحِجَارَةِ، وَيَحْثِي بِالتُّرَابِ.

## ٤٤- باسی گریان لە لای کەسی نەخۆش

١٣٠٤- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ بە نەخۆشییەك نەخۆش کەوتبوو، پێغەمبەریش ﷺ هات بۆ لای و سەردانی کرد لەگەڵ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڵای کوڕی مەسعوددا ﷺ، جا کاتێ ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای بینی بوراوەتەوە، کەس و کارەکەی دەورەیان داوە، بۆیە فەرمووی: ((مردووە؟))، وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ، گریا کاتێ خەڵکەکە پێغەمبەریان ﷺ بینی گریا ئەوانیش گریان، جا فەرمووی: ((ئەوە گوێ ناگرن؟ بێگومان خوای گەورە بە فرمێسکی چاوو خەفەت خواردنی دڵ سزای مرۆڤ

**نادات، بەڵام بە ئا ئەمە-ئاماژەی کرد بۆ زمانی[1] - سزای دەدات، یان ڕەحمی پێدەکات، وە بێگومان مردوو بەهۆی گریانی کەس و کارییەوە سزا دەدرێ))، وە عومەر ﷺ ئەوەی بگریایە بەدارو بەبەرد لێی دەداو خۆڵی پێدا دەکرد.**

## ٤٥- بابُ مَا يُنْهَى عَنِ النَّوْحِ وَالبُكَاءِ وَالزَّجْرِ عَنْ ذَلِكَ

١٣٠٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَوْشَبٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَمْرَةُ قَالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: لَمَّا جَاءَ قَتْلُ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ وَجَعْفَرٍ وَعَبْدِ اللهِ بْنِ رَوَاحَةَ، جَلَسَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْرَفُ فِيهِ الحُزْنُ، وَأَنَا أَطَّلِعُ مِنْ شَقِّ البَابِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ نِسَاءَ جَعْفَرٍ، وَذَكَرَ بُكَاءَهُنَّ، فَأَمَرَهُ بِأَنْ يَنْهَاهُنَّ، فَذَهَبَ الرَّجُلُ ثُمَّ أَتَى فَقَالَ: قَدْ نَهَيْتُهُنَّ، وَذَكَرَ أَنَّهُنَّ لَمْ يُطِعْنَهُ، فَأَمَرَهُ الثَّانِيَةَ أَنْ يَنْهَاهُنَّ، فَذَهَبَ ثُمَّ أَتَى، فَقَالَ: وَاللهِ لَقَدْ غَلَبْنَنِي -أَوْ غَلَبْنَنَا الشَّكُّ مِنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَوْشَبٍ- فَزَعَمَتْ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «فَاحْثُ فِي أَفْوَاهِهِنَّ التُّرَابَ». فَقُلْتُ: أَرْغَمَ اللهُ أَنْفَكَ، فَوَاللهِ مَا أَنْتَ بِفَاعِلٍ، وَمَا تَرَكْتَ رَسُولَ اللهِ ﷺ مِنَ العَنَاءِ[2].

## ٤٥- باسی ئەوەی ڕێگری لێکراوە لە شین و شەپۆڕ و گریان، وە هەڕەشە لەبارەیەوە

**١٣٠٥- عائیشە ﷺ دەڵێ: کاتێ هەواڵی کوژرانی زەیدی کوڕی حاریسە و جەعفەر و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە بەپێغەمبەر ﷺ گەیشت، دانیشت و خەفەتباری پێوە دیاربوو، لەوکاتە من لەدرزی دەرگاکەوە سەیرم دەکرد، ئینجا پیاوێك هات بۆ خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ئافرەتەکانی خزمی جەعفەر، ئیتر باسی شین و گریانیانی کرد (بۆ جەعفەر) پێغەمبەریش**

---

[1] واتە: بە شین و شەپۆڕ کە بە زمان دەکرێ.

[2] بڕوانە: ١٢٩٩.

فەرمانی پێکرد کە ڕێگرییان لێ بکات، پیاوەکەش ڕۆیشت (پێی وتن)، پاشان هاتەوە وتی: بێگومان ڕێگریم لێیان کرد، وە وتی: ئافرەتەکان بەگوێیان نەکردووە، پێغەمبەر ﷺ بۆ جاری دووەم فەرمانی پێکرد ڕێگرییان لێ بکات، پیاوەکەش ڕۆیشت، پاشان هاتەوەو وتی: سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوان زاڵبوون بەسەرمدا -یان زاڵبوون بەسەرماندا، گومانەکە لە موحەممەدی کوڕی حەوشەبەوە بووە-، جا عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خۆڵ بکەرە دەمیان))، (عائیشە دەڵێ): منیش (بەو پیاوەم) وت: خوا لوتت بکات بە خۆڵدا، دەی سوێند بەخوا ئەوەت نەکرد (کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردی)، وازیشت لە نارەحەتکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهێنا.

١٣٠٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها قَالَتْ: أَخَذَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ البَيْعَةِ أَنْ لاَ نَنُوحَ، فَمَا وَفَتْ مِنَّا امْرَأَةٌ غَيْرَ خَمْسِ نِسْوَةٍ: أُمِّ سُلَيْمٍ، وَأُمِّ العَلاَءِ، وَابْنَةِ أَبِي سَبْرَةَ امْرَأَةِ مُعَاذٍ وَامْرَأَتَيْنِ. أَوِ ابْنَةِ أَبِي سَبْرَةَ وَامْرَأَةِ مُعَاذٍ وَامْرَأَةٍ أُخْرَى[1].

١٣٠٦- ئوممو عەتییە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی پەیمان لێ وەرگرتندا پەیمانی لێ وەرگرتین کە شین وشەپۆڕ نەکەین، هیچ ئافرەتێکمان پەیمانەکەی نەبردە سەر جگە لە پێنج ئافرەت کە ئەمانەبوون: ئوممو سولەیم و ئوممولعەلاو کچی ئەبی سەبرە کە خێزانی موعاز بوو وە دوو ئافرەتی تر . یان وتی: کچی ئەبی سەبرە و خێزانی موعازو ئافرەتێکی تر.

---

[1] بروانە: ٤٨٩٢، ٧٢١٥.

## ٤٦- بابُ القِيَامِ لِلْجَنَازَةِ

١٣٠٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الجَنَازَةَ فَقُومُوا حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ». قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَامِرُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. زَادَ الحُمَيْدِيُّ: «حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ أَوْ تُوضَعَ»[1].

## ٤٦- باسی هەستان لەبەر تەرم

**١٣٠٧- عامیری کوڕی ڕەبیعە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر تەرمتان بینی (دەبرا بۆ گۆڕستان) ئەوە لەبەری هەستن هەتا لێتان تێدەپەڕێ)). (هەمان فەرموودە بەم ڕێگەش گێڕدراوەتەوە) سوفیان دەڵێ زوهری دەڵێ: سالیم بۆی گێڕامەوە لە باوکیەوە وتی: عامیری کوڕی ڕەبیعە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆی گێڕاینەوە . وە حومەیدی ئەو فەرموودەی گێڕاوەتەوەو ئەم زیادەشی هەیە: ((هەتا تێدەپەڕێ لێتان یان دادەنرێ)).**

## ٤٧- بابٌ: مَتَى يَقْعُدُ إِذَا قَامَ لِلْجَنَازَةِ؟

١٣٠٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ جَنَازَةً فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَاشِيًا مَعَهَا فَلْيَقُمْ حَتَّى يُخَلِّفَهَا -أَوْ تُخَلِّفَهُ -أَوْ تُوضَعَ مِنْ قَبْلِ أَنْ تُخَلِّفَهُ»[2].

---

[1] بڕوانە: ١٣٠٨.

[2] بڕوانە: ١٣٠٧.

## ٤٧- باسێک: ئەگەر کەسێ هەستا لەبەر تەرم کەی دانیشێتەوە؟

**١٣٠٨- عامیری کوڕی رەبیعە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان جەنازەیەکی بینی و ئەگەر لەگەڵ جەنازەکەدا نەدەڕۆیشت ئەوە با هەڵسێتە سەرپێ تا جەنازەکە تێدەپەڕێ لێی -یان ئەو لە جەنازەکە تێدەپەڕێ-، یان دادەنرێ پێش ئەوەی لێی تێپەڕێ)).**

١٣٠٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فَأَخَذَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ بِيَدِ مَرْوَانَ فَجَلَسَا قَبْلَ أَنْ تُوضَعَ، فَجَاءَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ فَأَخَذَ بِيَدِ مَرْوَانَ فَقَالَ: قُمْ فَوَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمَ هَذَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَانَا عَنْ ذَلِكَ. فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: صَدَقَ[1].

**١٣٠٩- سەعیدی کوڕی مەقبوریی لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: ئێمە لەگەڵ جەنازەیەکدا بووین، ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەستی مەڕوانی گرت، هەردووکیان دانیشتن پێش ئەوەی جەنازەکە دابنرێ، ئینجا ئەبو سەعید ﷺ هات دەستی مەڕوانی گرت، وتی: هەستە سوێند بە خوا بێگومان ئەو (واتە: ئەبو هوڕەیرە) دەزانێ پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی دانیشتنی لێ کردووین، ئەبو هوڕەیرەش وتی: ڕاست دەکات.**

---

[1] بڕوانە: ١٣١٠.

## ٤٨- بابُ مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً فَلاَ يَقْعُدُ حَتَّى تُوضَعَ عَنْ مَنَاكِبِ الرِّجَالِ، فَإِنْ قَعَدَ أُمِرَ بِالقِيَامِ

١٣١٠- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ -يَعْنِي: ابْنَ إِبْرَاهِيمَ- حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الجَنَازَةَ فَقُومُوا، فَمَنْ تَبِعَهَا فَلاَ يَقْعُدْ حَتَّى تُوضَعَ»[1].

## ٤٨- باسی کەسێک لەگەڵ جەنازەیەکدا بوو نابێ دانیشێ هەتا دادەنرێ لەسەر شانی ئەو پیاوانەی هەڵیان گرتووە، ئەگەر دانیشت پێی دەوترێ هەڵسێتەوە

**١٣١٠- ئەبو سەعیدی خودری ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر جەنازەتان بینی لەبەری هەستن، ئینجا ئەوەی لە گەڵیدا ڕۆشت ئەوە دانەنیشێت هەتا دادەنرێ)).**

## ٤٩- بابُ مَنْ قَامَ لِجَنَازَةِ يَهُودِيٍّ

١٣١١- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ مِقْسَمٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: مَرَّ بِنَا جَنَازَةٌ فَقَامَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ وَقُمْنَا لَهُ. فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا جَنَازَةُ يَهُودِيٍّ. قَالَ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الجَنَازَةَ فَقُومُوا».

---

[1] بڕوانە: ١٣٠٩.

# ٤٩- باسی ئەوەی لەبەر تەرمی جولەکە هەڵسێت

**١٣١١- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: تەرمێك بەلاماندا تێپەڕی، پێغەمبەریش ﷺ لەبەری هەستا و ئێمەش لەبەر ئەو[1] هەستاین، ئینجا وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە تەرمی پیاوێکی جولەکە بوو؟ فەرمووی: ((ئەگەر جەنازەتان بینی لەبەری هەستن)).**

١٣١٢- حَدَّثَنَا آدَمُ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى قَالَ: كَانَ سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ -وَقَيْسُ بْنُ سَعْدٍ- قَاعِدَيْنِ بِالْقَادِسِيَّةِ، فَمَرُّوا عَلَيْهِمَا بِجَنَازَةٍ فَقَامَا. فَقِيلَ لَهُمَا: إِنَّهَا مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، أَيْ: مِنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ فَقَالَا: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّتْ بِهِ جَنَازَةٌ فَقَامَ فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهَا جَنَازَةُ يَهُودِيٍّ. فَقَالَ: «أَلَيْسَتْ نَفْسًا؟»[2].

**١٣١٢- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا دەڵێ: سەهلی کوڕی حونەیف - و قەیسی کوڕی سەعد- لەقادسییە دانیشتبوون، تەرمێکیان بەلایاندا برد، هەردووکیان هەستانە سەرپێ، پێیان وترا: ئەو تەرمە خەڵکی ئەم وڵاتەیە- واتە: مسوڵمان نییە، لەوانەیە سەرانە دەدەن-، هەردووکیان وتیان: تەرمێك بەلای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی لەبەری هەستا، پێیان وت: ئەوە تەرمی پیاوێکی جولەکەیە، فەرمووی: ((ئایا مرۆڤ نییە؟!!)).**

١٣١٣- وَقَالَ أَبُو حَمْزَةَ: عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرٍو عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: كُنْتُ مَعَ قَيْسٍ وَسَهْلٍ ﷺ فَقَالَا: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ[3].

---

[1] لەبەر پێغەمبەر ﷺ یان لەبەر هەستانەکەی ئەو هەستاین.

[2] بڕوانە: ١٣١٣.

[3] بڕوانە: ١٣١٢.

قَالَ زَكَرِيَّاءُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى: كَانَ أَبُو مَسْعُودٍ وَقَيْسٌ يَقُومَانِ لِلْجِنَازَةِ.

**١٣١٣- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا دەڵێ: من لەگەڵ قەیس و سەهلدا بووم ﷺ هەردووکیان وتیان: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین[١] .**

**زەکەریا دەڵێ: شەعبی لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلاوە گێڕایەوە کە وتی: ئەبو مەسعودو قەیس ﷺ لەبەر تەرم هەڵدەستانەوە.**

## ٥٠- بابُ حَمْلِ الرِّجَالِ الجِنَازَةَ دُونَ النِّسَاءِ

١٣١٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا وُضِعَتِ الجِنَازَةُ وَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَالَتْ: قَدِّمُونِي. وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ صَالِحَةٍ قَالَتْ: يَا وَيْلَهَا، أَيْنَ يَذْهَبُونَ بِهَا؟ يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إِلاَّ الإِنْسَانَ، وَلَوْ سَمِعَهُ صَعِقَ»[٢] .

## ٥٠- باسی پیاوان تەرم هەڵدەگرن نەک ئافرەتان

**١٣١٤- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر تەرم دانرا و پیاوان خستیانە سەر شانیان، جا ئەگەر پیاوچاك بێت دەڵێ: زوو بمبەن، بەڵام ئەگەر پیاو خراپ بێت دەڵێ: ئەی هاوار ئەم نەفسە بۆ کوێ دەبەن؟ هەموو شتێك دەنگی دەبیستێ جگە لە مرۆڤ، ئەگەر (مرۆڤ) گوێی لە دەنگی بووایە، (لە ترسا) گیانی دەردەچوو)).**

---

[١] ئەم ڕێگەیەش پاڵپشتی فەرموودەکەی پێشوو دەکات و ئەو زیادەی تێدایە.

[٢] بڕوانە: ١٣١٦، ١٣٨٠.

## ٥١- بابُ السُّرْعَةِ بِالجِنَازَةِ

وَقَالَ أَنَسٌ: أَنْتُمْ مُشَيِّعُونَ، فامْشِوا بَيْنَ يَدَيْهَا، وَخَلْفَهَا وَعَنْ يَمِينِهَا، وَعَنْ شِمَالِهَا. وَقَالَ غَيْرُهُ قَرِيبًا مِنْهَا.

١٣١٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَفِظْنَاهُ مِنَ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَسْرِعُوا بِالجِنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا (إليهِ)[1]، وَإِنْ يَكُ سِوَى ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ».

## ٥١- باسی پەلەکردن لە بردنی تەرم بۆ گۆڕستان

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئێوە ئەگەر لەگەڵ تەرمدا بوون، لە پێشییەوەو لە دوایەوە، لە ڕاستییەوەو لە چەپییەوە بڕۆن. وە جگە لە ئەنەسیش وتوویانە: لە نزیکییەوە بڕۆن.**

**١٣١٥- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پەلە بکەن لە بردنی تەرمدا، چونکە ئەگەر چاك بێت، ئەوە چاکەیەکە زوو پێشکەش بەو مردووەی دەکەن، وە ئەگەر چاك نەبێ ئەوە خراپەیەکە و لە ملی خۆتانی دەکەنەوە)).**

## ٥٢- بابُ قَوْلِ المَيِّتِ وَهُوَ عَلَى الجِنَازَةِ قَدِّمُونِي

١٣١٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا وُضِعَتِ الجِنَازَةُ فَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَالَتْ: قَدِّمُونِي. وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ صَالِحَةٍ قَالَتْ لأَهْلِهَا: يَا وَيْلَهَا، أَيْنَ يَذْهَبُونَ بِهَا؟ يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إِلَّا الإِنْسَانَ، وَلَوْ سَمِعَ الإِنْسَانُ لَصَعِقَ»[2].

---

[1] إليهِ: ئیبنو حەجەر و عینی ئەم وشەیان زیاد کردووە بۆ فەرموودەکە، بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٩٧/٢.

[2] بڕوانە: ١٣١٤.

## ٥٢- باسی مردوو کاتێ بەسەر دارەمەیتەوەیە کە دەڵێ زوو بمبەن

**١٣١٦- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر تەرم دانرا و پیاوان خستیانە سەر شانیان، جا ئەگەر پیاوچاك بێت دەڵێ: زوو بمبەن، بەڵام ئەگەر پیاو خراپ بێت دەڵێ: ئەی هاوار ئەم نەفسە بۆ کوێ دەبەن؟ هەموو شتێك دەنگی دەبیستێ جگە لەمرۆڤ، ئەگەر (مرۆڤ) گوێی لە دەنگی بووایە، (لە ترسا) گیانی دەردەچوو)).**

## ٥٣- بابُ مَنْ صَفَّ صَفَّيْنِ أَوْ ثَلَاثَةً عَلَى الجِنَازَةِ خَلْفَ الإِمَامِ

١٣١٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ أَبِي عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى عَلَى النَّجَاشِيِّ، فَكُنْتُ فِي الصَّفِّ الثَّانِي أَوِ الثَّالِثِ[1].

## ٥٣- باسی کەسێک نوێژخوێنانی مردوو بکاتە دوو یان سێ ڕیزەوە لەدوای ئیمامەوە

**١٣١٧- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مردووی کرد لەسەر نەجاشی[2] من لە ڕیزی دووەم یان سێیەمدا بووم.**

---

[1] بڕوانە: ١٣٢٠، ١٣٣٤، ٣٨٧٧، ٣٨٧٨، ٣٨٧٩.

[2] نەجاشی مەلیکی حەبەشە بوو لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مسوڵمان بوو، هەر لەو سەردەمەدا مرد، پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە نوێژی غائیبی لەسەر کرد.

## ٥٤- بابُ الصُّفُوفِ عَلَى الجِنَازَةِ

١٣١٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَعَى النَّبِيُّ ﷺ إِلَى أَصْحَابِهِ النَّجَاشِيَّ، ثُمَّ تَقَدَّمَ فَصَفُّوا خَلْفَهُ فَكَبَّرَ أَرْبَعًا[1].

## ٥٤- باسی ڕیزەکانی (نوێژ کردن) لەسەر مردوو

**١٣١٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مردنی نەجاشی بە هاوەڵانی ڕاگەیاند، پاشان ڕۆیشتە پێشەوەو هاوەڵانیش لە دوایەوە ڕیز بوون، (نوێژی مردووی کردو تێیدا) چوار جار ئەڵاهو ئەکبەری کرد.**

١٣١٩- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ شَهِدَ النَّبِيَّ ﷺ أَنَّه أَتَى عَلَى قَبْرٍ مَنْبُوذٍ فَصَفَّهُمْ وَكَبَّرَ أَرْبَعًا. قُلْتُ مَنْ حَدَّثَكَ؟ قَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ[2].

**١٣١٩- (سولەیمانی) شەیبانی دەڵێ: لە شەعبیم بیست وتی: ئەو هاوەڵە بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی بەلای گۆڕێکی بەتەنیای پەڕدا، جا پێغەمبەر ﷺ ڕیزیکردن و(پێشنوێژی بۆ کردن و) چوار جار ئەڵاهو ئەکبەری کرد، (سولەیمان دەڵێ:) وتم: ئەبو عەبدوڕەحمان کێ ئەمەی بۆ گێڕایتەوە؟ وتی: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ.**

١٣٢٠- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: .قَدْ تُوُفِّيَ اليَوْمَ رَجُلٌ صَالِحٌ مِنَ الحَبَشِ، فَهَلُمَّ

[1] بروانە: ١٢٤٢.
[2] بروانە: ٨٥٧.

فَصَلُّوا عَلَيْهِ». قَالَ: فَصَفَفْنَا فَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْهِ وَنَحْنُ صُفُوفٌ. قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: عَنْ جَابِرٍ كُنْتُ فِي الصَّفِّ الثَّانِي[1].

**١٣٢٠- عەتا گێڕایەوە کە جابیری کوڕی عەبدوڵای ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەمڕۆ پیاوێکی چاکی حەبەشی مردووە، دەی وەرن نوێژی لەسەر بکەن))، جابیر دەڵێ: ئێمەش ڕیز بووین، پێغەمبەریش ﷺ نوێژی لەسەر کردو ئێمە لەگەڵیدا ڕیز ببووین (نوێژمان لەسەر کرد)، ئەبو زوبەیر لە جابیرەوە گێڕایەوە کە وتی: من لە ڕیزی دووەمدا بووم.**

## ٥٥- بابُ صُفُوفِ الصِّبْيَانِ مَعَ الرِّجَالِ

**١٣٢١-** حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ، عَنْ عَامِرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِقَبْرٍ قَدْ دُفِنَ لَيْلًا فَقَالَ: «مَتَى دُفِنَ هَذَا؟». قَالُوا: البَارِحَةَ. قَالَ: «أَفَلاَ آذَنْتُمُونِي». قَالُوا: دَفَنَّاهُ فِي ظُلْمَةِ اللَّيْلِ فَكَرِهْنَا أَنْ نُوقِظَكَ. فَقَامَ فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَنَا فِيهِمْ فَصَلَّى عَلَيْهِ[2].

## ٥٥- باسی ڕیزی منداڵان لەگەڵ ڕیزی پیاواندا (بۆ نوێژکردن لەسەر مردوو)

**١٣٢١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای گۆڕێکدا شەو نێژرابوو، فەرمووی: ((ئەم مردووە کەی نێژراوە؟))، وتیان: شەوی ڕابردوو، فەرمووی: ((ئەی بۆ ئاگادارتان نەکردم؟)) وتیان: لە تاریکی شەودا**

---

[1] بڕوانە: ١٣١٧.

[2] بڕوانە: ٨٥٧.

ناشتمان و حەزمان نەکرد لەخەو خەبەرت بکەینەوە، ئینجا (ڕوو بەقیبلە) وەستاو ئێمەش لە دوایەوە ڕیز بووین، عەبدوڵای کوڕی عەباس دەڵێ: من لەگەڵیاندا بووم، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر (گۆڕەکە) کرد.

## ٥٦- بابُ سُنَّةِ الصَّلاَةِ عَلَى الجَنَازَةِ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ صَلَّى عَلَى الجَنَازَةِ». وَقَالَ: «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ». وَقَالَ: «صَلُّوا عَلَى النَّجَاشِيِّ». سَمَّاهَا صَلاَةً، لَيْسَ فِيهَا رُكُوعٌ وَلاَ سُجُودٌ، وَلاَ يُتَكَلَّمُ فِيهَا، وَفِيهَا تَكْبِيرٌ وَتَسْلِيمٌ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ لاَ يُصَلِّي إِلَّا طَاهِرًا. وَلاَ يُصَلِّي عِنْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَلاَ غُرُوبِهَا، وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ، وَقَالَ الحَسَنُ: أَدْرَكْتُ النَّاسَ وَأَحَقُّهُمْ -يعني بالصَّلاةِ- عَلَى جَنَائِزِهِمْ مَنْ رَضُوهُمْ لِفَرَائِضِهِمْ. وَإِذَا أَحْدَثَ يَوْمَ العِيدِ أَوْ عِنْدَ الجَنَازَةِ يَطْلُبُ المَاءَ وَلاَ يَتَيَمَّمُ، وَإِذَا انْتَهَى إِلَى الجَنَازَةِ وَهُمْ يُصَلُّونَ يَدْخُلُ مَعَهُمْ بِتَكْبِيرَةٍ. وَقَالَ ابْنُ المُسَيَّبِ: يُكَبِّرُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالسَّفَرِ وَالحَضَرِ أَرْبَعًا. وَقَالَ أَنَسٌ: التَّكْبِيرَةُ الوَاحِدَةُ اسْتِفْتَاحُ الصَّلاَةِ. وَقَالَ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة. وَفِيهِ صُفُوفٌ وَإِمَامٌ.

## ٥٦- باسی چۆنیەتی نوێژکردن لەسەر مردوو

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەس نوێژ بکات لەسەر تەرم))، هەروەها فەرموویەتی: ((نوێژ بکەن لەسەر هاوڕێکەتان))، وە فەرموویەتی: ((نوێژ بکەن لەسەر نەجاشی))، لەم فەرموودانەدا نوێژی مردووی بە نوێژ ناوبردووە، نوێژی مردوو کڕنووش و سوژدەی تێدانییە، نابێ قسەی تێدا بکرێت، ئەڵاهو ئەکبەرو سەلامدانەوەی تێدایە، وە عەبدوڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما نوێژی مردووی نەدەکرد بە دەستنوێژەوە نەبێ، وە لە کاتی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆردا نوێژی مردووی نەدەکرد، (لە کاتی ئەڵاهو ئەکبەرەکاندا) هەردوو دەستی بەرزدەکردەوە، وە

**حەسەن دەڵێ: ئەوانەی من پێیان گەیشتووم (لە هاوەڵان)، شیاوترین کەسیان - بۆ پێشنوێژی نوێژ- لەسەر مردووانیان ئەو کەسانە بوون کە بۆ پێشنوێژی نوێژە فەرزەکانیان لێی ڕازی بوون. وە ئەگەر کەسێ بێ دەستنوێژ بوو لە ڕۆژی جەژندا، یان لە کاتی نوێژی مردوودا، بەدوای ئاودا بگەڕێ و تەیەمووم نەکات، وە ئەگەر لەکاتێکدا گەیشتە لای مردووەکە نوێژیان لەسەر دەکرد، ئەویش نوێژ دابەستێ لەگەڵیاندا بە ئەڵاهو ئەکبەر کردنێك، سەعیدی کوڕی موسەییەب دەڵێ: چ شەو بێ، یان ڕۆژ، لە سەفەردا بێت یان لەماڵەوە، چوار ئەڵاهو ئەکبەر دەکرێ، ئەنەس ﷺ دەڵێ: یەکێك لە ئەڵاهو ئەکبەرەکان دەبێتە دەستپێکی نوێژ دابەستن (لە نوێژی مردوودا)، وە خوای گەورە دەفەرموێ: (هەرگیز نوێژ مەکە لەسەر هیچ کام لە دووڕووان کاتێك کە مرد)[١]، وە لە نوێژی مردوودا ڕیزی نوێژخوێنان و پێشنوێژی هەیە[٢].**

١٣٢٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ مَرَّ مَعَ نَبِيِّكُمْ ﷺ عَلَى قَبْرٍ مَنْبُوذٍ، فَأَمَّنَا فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ. فَقُلْنَا: يَا أَبَا عَمْرٍو مَنْ حَدَّثَكَ؟ قَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما[٣].

**١٣٢٢- (سولەیمانی) شەیبانی دەڵێ لە شەعبیم بیست وتی: کەسێك بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ پێغەمبەرەکەتاندا ﷺ تێپەڕی بوو بەلای گۆڕێکی بە تەنیای لاپەڕدا، وتی: جا پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی بۆ کردن و ئێمەش لەدوایەوە**

---

١ واتە: یەکێکی تر لەو شتانەی پەیوەندی بە نوێژی مردووەوە هەیە ئەمەیە کە نوێژ لەسەر دووڕووان ناکرێ و دروست نییە.

٢ ئەم بڕگە پەیوەندی بەو بڕگەوەیە کە پێشتر وترا نوێژی مردوو ئەڵاهو ئەکبەرو سەلامدانەوەی تێدایە.

٣ بڕوانە: ٨٥٧.

ڕیزبووین (و نوێژمان لەسەر کرد)، (سولەیمان دەڵێ:) وتمان: ئەبو عەمر کێ ئەمەی بۆ گێڕاویتەوە؟ وتی: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄.

## ٥٧- بابُ فَضْلِ اتِّبَاعِ الجَنَائِزِ

وَقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: إِذَا صَلَّيْتَ فَقَدْ قَضَيْتَ الذِي عَلَيْكَ.

وَقَالَ حُمَيْدُ بْنُ هِلاَلٍ: مَا عَلِمْنَا عَلَى الجَنَازَةِ إِذْنًا، وَلَكِنْ مَنْ صَلَّى ثُمَّ رَجَعَ فَلَهُ قِيرَاطٌ.

**١٣٢٣-** حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ نَافِعًا يَقُولُ حُدِّثَ ابْنُ عُمَرَ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً فَلَهُ قِيرَاطٌ. فَقَالَ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَيْنَا[١].

## ٥٧- باسی گەورەیی پاداشتی شوێن کەوتنی تەرم

زەیدی کوڕی سابیت ﵁ دەڵێ: ئەگەر نوێژت کرد لەسەر مردوو، ئەوە بێگومان ئەرکی سەرشانت ئەنجام داوە.

حومەیدی کوڕی هیلال دەڵێ: ئێمە نەمانزانیوە دوای نوێژکردن لەسەر تەرم[٢] مۆڵەت وەرگرتن (لە کەس و کارەکەی) پێویست بێ بۆ گەڕانەوە، بەڵکو کەسێ نوێژ بکات لەسەری، پاشان بگەڕێتەوەو لەگەڵێدا نەڕوات بۆ گۆڕستان، ئەوە بە ئەندازەی قیراتێك پاداشتی هەیە.

**١٣٢٣-** عەبدوڵای کوڕی عومەر لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: هەرکەس شوێن تەرمێ بکەوێت، ئەوە قیراتێك پاداشتی بۆ هەیە، عەبدوڵا وتی: ئەبو هورەیرە پاداشتێکی زۆری بۆ باس کردین لەسەر ئەم کارە، یان فەرموودەی زۆری بۆ گێڕاینەوە.

---

[١] بڕوانە: ٤٧.

[٢] وە گەڕانەوە و نەڕۆیشتن بۆ گۆڕستان لەگەڵ تەرمەکەدا پێویست بەمۆڵەت وەرگرتن لە کەس ناکات، بەڵکو کارێکی ڕەوایە.

١٣٢٤- فَصَدَّقَتْ -يَعْنِى: عَائِشَةَ- أَبَا هُرَيْرَةَ وَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُهُ. فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: لَقَدْ فَرَّطْنَا فِي قَرَارِيطَ كَثِيرَةٍ، ﴿ فَرَّطتُ ﴿٥٦﴾ ﴾ الزمر. ضَيَّعْتُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ.

**١٣٢٤- ئەو -واتە: عائیشە رضي الله عنها- وتەکەی ئەبو هورەیرەی پشت ڕاست کردەوە و وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست ئەوەی فەرمووە کە ئەبو هورەیرە گێڕایەوە، عەبدوڵای کوڕی عومەریش رضي الله عنهما وتی: بەڕاستی زۆر قیراتمان لە کیس خۆمان دا، وشەی: ﴿ فَرَّطتُ ﴿٥٦﴾ ﴾ لە قورئاندا واتە: فەرمانی خوام فەوتاندو فەرامۆشم کرد.**

## ٥٨- بَابُ مَنِ انْتَظَرَ حَتَّى تُدْفَنَ

١٣٢٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ رضي الله عنه فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ.

- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ شَبِيبِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، حَدَّثَنَا يُونُسُ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَحَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجُ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ شَهِدَ الجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّيَ عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَ حَتَّى تُدْفَنَ كَانَ لَهُ قِيرَاطَانِ». قِيلَ: وَمَا القِيرَاطَانِ؟ قَالَ: «مِثْلُ الجَبَلَيْنِ العَظِيمَيْنِ»[1].

## ٥٨- باسی ئەو کەسەی لەگەڵ تەرمدا دەمێنێتەوە تا دەنێژرێت

**١٣٢٥- ئەبو سەعیدی مەقبوری لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کە ئەو پرسیاری کرد لە ئەبو هورەیرە رضي الله عنه ئەویش وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست.**

[1] بڕوانە: ٤٧.

- وە عەبدوڕەحمانی ئەعرەج دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك ئامادەی تەرمێك بێت تا نوێژی لە سەر دەکرێت، ئەوە قیراتێك پاداشتی هەیە، وە کەسێك ئامادەبێت هەتا دەنێژرێ، ئەوە دوو قیرات پاداشتی هەیە))، وترا: دوو قیرات چییە؟ فەرمووی: ((وەك دوو کێوی گەورە وایە)).

## ٥٩- بابُ صَلَاةِ الصِّبْيَانِ مَعَ النَّاسِ عَلَى الجَنَائِزِ

١٣٢٦- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيُّ، عَنْ عَامِرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبْرًا، فَقَالُوا: هَذَا دُفِنَ، أَوْ دُفِنَتِ البَارِحَةَ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: فَصَفَّنَا خَلْفَهُ ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا[1].

## ٥٩- باسی نوێژی منداڵان لەگەڵ خەڵکەکەدا لەسەر تەرم

١٣٢٦- عامیر لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتە سەر گۆڕێك، وتیان: ئەم پیاوە یان ئەم ئافرەتە شەوی ڕابردوو نێژراوە، عەبدوڵای کوڕی عەباس رضي الله عنهما وتی: ئینجا ئێمە لەدوایەوە ڕیز بووین، پاشان نوێژی (مردووی) لەسەر کرد (بە پێشنوێژ لەگەڵ ئێمەدا).

---

[1] بڕوانە: ٨٥٧.

## ٦٠- بابُ الصَّلَاةِ عَلَى الجَنَائِزِ بِالمُصَلَّى وَالمَسْجِدِ

١٣٢٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ أَنَّهُمَا حَدَّثَاهُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَعَى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّجَاشِيَّ صَاحِبَ الحَبَشَةِ يَوْمَ الذِي مَاتَ فِيهِ، فَقَالَ: «اسْتَغْفِرُوا لِأَخِيكُمْ»[١].

## ٦٠- باسی نوێژکردن لەسەر مردوو لە نوێژگەو مزگەوتدا

**١٣٢٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مردنی نەجاشی پادشای حەبەشەی پێ ڕاگەیاندین، لەو ڕۆژەدا کە تێیدا مرد فەرمووی: ((داوای لێ خۆش بوون بکەن بۆ براکەتان)).**

١٣٢٨- وَعَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ المُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَفَّ بِهِمْ بِالمُصَلَّى، فَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعًا[٢].

**١٣٢٨- سەعیدی کوڕی موسەییەب دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، وتوویەتی: بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە نوێژگە ڕیزی کردن (نوێژی لەسەر نەجاشی کرد)، چوار ئەڵاهو ئەکبەری لەسەر کرد.**

١٣٢٩- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَبُو ضَمْرَةَ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ اليَهُودَ جَاءُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِرَجُلٍ مِنْهُمْ وَامْرَأَةٍ زَنَيَا، فَأَمَرَ بِهِمَا، فَرُجِمَا قَرِيبًا مِنْ مَوْضِعِ الجَنَائِزِ عِنْدَ المَسْجِدِ[٣].

---

[١] بروانە: ١٢٤٥.

[٢] بروانە: ١٢٤٥.

[٣] بروانە: ٣٦٣٥، ٤٥٥٦، ٦٨١٩، ٦٨٤١، ٧٣٣٢، ٧٥٤٣.

**١٣٢٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە جوولەکەکان پیاو و ژنێکیان لەخۆیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە زینایان کردبوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد (بەبەردباران کردنیان)، ئینجا لە نزیکی ئەو شوێنەی نوێژی مردووی[1] تێدا دەکرا لەپاڵ مزگەوتدا بەرد باران کران.**

## ٦١- بابُ مَا يُكْرَهُ مِن اتِّخَاذِ المَسَاجِدِ عَلَى القُبُورِ

وَلَمَّا مَاتَ الحَسَنُ بْنُ الحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ضَرَبَتِ امْرَأَتُهُ القُبَّةَ عَلَى قَبْرِهِ سَنَةً، ثُمَّ رُفِعَتْ، فَسَمِعُوا صَائِحًا يَقُولُ: أَلاَ هَلْ وَجَدُوا مَا فَقَدُوا؟ فَأَجَابَهُ الآخَرُ: بَلْ يَئِسُوا فَانْقَلَبُوا.

**١٣٣٠-** حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ شَيْبَانَ، عَنْ هِلاَلٍ -هُوَ: الوَزَّانُ- عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ فِي مَرَضِهِ الذِي مَاتَ فِيهِ: «لَعَنَ اللهُ اليَهُودَ وَالنَّصَارَى؛ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسْجِدًا». قَالَتْ: وَلَوْلاَ ذَلِكَ لأَبْرَزُوا قَبْرَهُ غَيْرَ أَنِّي أَخْشَى أَنْ يُتَّخَذَ مَسْجِدًا[2].

## ٦١- باسی ئەوەی ناپەسەندە لەسەر گۆڕ مزگەوت دروست بکرێت

**کاتێ حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی مرد، خێزانەکەی یەك ساڵ خێوەتێکی لەسەر گۆڕەکەی هەڵدا، پاشان لابراو هەڵگیرا، ئینجا گوێیان لە دەنگێك بوو هاواری کردو وتی: ئایا ئەوەی لە دەستیاندا دەستیان کەوتەوە؟ یەکێکی تر وەڵامی دایەوە و وتی: نەخێر بەڵکو بێ ئومێد بوون و ئیتر گەڕانەوە.**

---

[1] بڕوانە: فتح الباري: ٤/٢٥٦.

[2] بڕوانە: ٤٣٥.

**١٣٣٠- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە لەو نەخۆشییەی تێیدا وەفاتی کرد فەرمووی: ((خوا نەفرینی کرد لە جوولەکە و گاورەکان، چونکە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بە مزگەوت))، عائیشە دەڵێ: لەبەر ئەو فەرموودەی خۆی نەبووایە گۆڕەکەی پێغەمبەریان بەرز دەکردەوە[1]، بەڵام من دەترسم گۆڕەکەی پێغەمبەر ﷺ بکرێ بە مزگەوت.**

## ٦٢- بابُ الصَّلَاةِ عَلَى النُّفَسَاءِ إِذَا مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا

**١٣٣١-** حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا، فَقَامَ عَلَيْهَا وَسَطَهَا.

## ٦٢- باسی نوێژکردن لەسەر ئافرەتی زەیسان ئەگەر لەکاتی زەیسانییەکەیدا بمرێ

**١٣٣١- سەمورە ﵁ دەڵێ: لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژم کرد لەسەر ئافرەتێك کە لە کاتی زەیسانییەکەیدا مردبوو، پێغەمبەر ﷺ لە نێوەڕاستی ئافرەتەکە وەستا (بۆ نوێژکردن لەسەری).**

## ٦٣- بابٌ: أَيْنَ يَقُومُ مِنَ الْمَرْأَةِ وَالرَّجُلِ؟

**١٣٣٢-** حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ، عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، حَدَّثَنَا سَمُرَةُ بْنُ جُنْدُبٍ ﵁ قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا فَقَامَ عَلَيْهَا وَسَطَهَا[2].

---

[1] کێل و شتی لەو جۆرەیان بۆ دروست دەکرد.

[2] بڕوانە: ٣٣٢.

## ٦٣- باسێک: ئیمام لە کوێی مردووی ئافرەت و پیاودا دەوەستێ بۆ نوێژکردن لەسەریان؟

**١٣٣٢- سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژم کرد لەسەر ئافرەتێك کە لەکاتی زەیسانییەکەیدا مردبوو، پێغەمبەر ﷺ لە نێوەڕاستی ئافرەتەکەدا وەستا (بۆ نوێژکردن لەسەری).**

## ٦٤- بابُ التَّكْبِيرِ عَلَى الجَنَازَةِ أَرْبَعًا

وَقَالَ حُمَيْدٌ بن هلال صَلَّى بِنَا أَنَسٌ فَكَبَّرَ ثَلاَثًا، ثُمَّ سَلَّمَ، فَقِيلَ لَهُ: فَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ، ثُمَّ كَبَّرَ الرَّابِعَةَ ثُمَّ سَلَّمَ.

١٣٣٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَعَى النَّجَاشِيَّ فِي اليَوْمِ الذِي مَاتَ فِيهِ، وَخَرَجَ بِهِمْ إِلَى المُصَلَّى، فَصَفَّ بِهِمْ، وَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ[1].

## ٦٤- باسی مردوو چوار ئەڵاهو ئەکبەری لەسەر دەکرێ[2]

**حومەیدی کوڕی هیلال دەڵێ: ئەنەس ﷺ پێشنوێژی نوێژی مردوویەکی بۆ کردین و سێ ئەڵاهو ئەکبەری کرد، پاشان سەلامی دایەوە، جا پێی وترا: (سێ ئەڵاهو ئەکبەرت کرد!)، بۆیە ڕووی کردە قیبلە، پاشان ئەڵاهو ئەکبەری چوارەمی کردو ئینجا سەلامی دایەوە.**

[1] بڕوانە: ١٢٤٥.

[2] یان: ئەڵاهو ئەکبەر کردن لەسەر مردوو چوارە.

**١٣٣٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ مردنی نەجاشی ڕاگەیاند لەو ڕۆژەدا کە تێیدا مرد، مسوڵمانانی برد بۆ نوێژگەو ڕیزی کردن و(نوێژی مردووی کرد)، چوار ئەڵاهو ئەکبەری لەسەر کرد.**

١٣٣٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا سَلِيمُ بْنُ حَيَّانَ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مِينَاءَ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى عَلَى أَصْحَمَةَ النَّجَاشِيِّ فَكَبَّرَ أَرْبَعًا. وَقَالَ يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ وَعَبْدُ الصَّمَدِ، عَنْ سَلِيمٍ: أَصْحَمَةَ. وَتَابَعَهُ عَبْدُ الصَّمَدِ[1].

**١٣٣٤- جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی مردووی لەسەر ئەصحەمەی[2] نەجاشی کردو چوار ئەڵاهو ئەکبەری کرد (لە نوێژەکەیدا)، یەزیدی کوڕی هاڕوون و عەبدوصەمەد لە سەلیمەوە گێڕاویانەتەوە بە: (أَصْحَمَةَ) ئەصحەمە، وە عەبدوصەمەدیش ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوەو پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یەزیدی کوڕی هاڕوون دەکات.**

## ٦٥- بابُ قراءَةِ فاتحَةِ الكتابِ علَى الجَنازَةِ

وَقَالَ الحَسَنُ: يَقْرَأُ عَلَى الطِّفْلِ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ لَنَا فَرَطًا وَسَلَفًا وَأجراً.

١٣٣٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدٍ، عَنْ طَلْحَةَ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَلَى جَنَازَةٍ فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ قَالَ: لِيَعْلَمُوا أَنَّهَا سُنَّةٌ.

---

[1] بروانە: ١٣١٧.

[2] نازناوی بەرپرس و دەسەڵاتدارانی حەبەشە بوو، وەک: پێشەوای ئیمانداران بۆ مسوڵمانان، قەیسەر بۆ ڕۆمەکان، کیسرا بۆ فارسەکان.

## ٦٥- باسی خوێندنی سوورەتی فاتیحە لەسەر تەرم (لە نوێژی مردوودا)

حەسەن دەڵێ: لە نوێژی مردوودا لەسەر منداڵ سوورەتی فاتیحە دەخوێندرێت و ئەم دوعایەش دەڵێ: خوایە بیکەرە پاداشتی پێشەکی و توێشوو و پاداشت بۆمان.

١٣٣٥- تەڵحە دەڵێ: لە دوای عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ نوێژی مردووم کرد، وە عەبدوڵای کوڕی عەوف دەڵێ: لە دوای عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ نوێژم کرد لەسەر مردوویەك، ئینجا سوورەتی فاتیحەی خوێند (لە نوێژەکەدا)و وتی: تا بزانن کە سوننەتە.

## ٦٦- بابُ الصَّلَاةِ عَلَى القَبْرِ بَعْدَ مَا يُدْفَنُ

١٣٣٦- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ الشَّيْبَانِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ مَرَّ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى قَبْرٍ مَنْبُوذٍ، فَأَمَّهُمْ وَصَلَّوْا خَلْفَهُ. قُلْتُ: مَنْ حَدَّثَكَ هَذَا يَا أَبَا عَمْرٍو؟ قَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ[1].

## ٦٦- باسی نوێژکردن لەسەر مردوو پاش ئەوەی دەنێژرێ

١٣٣٦- سولەیمانی شەیبانی دەڵێ: لە شەعبیم بیست وتی: ئەو هاوەڵە بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی بوو بەلای گۆڕێکی بەتەنیای پەڕدا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی بۆ کردن و ئەوانیش لە دوایەوە نوێژیان (لەسەر) کرد، (سولەیمان دەڵێ) وتم: ئەبوعەمر کێ ئەمەی بۆ گێڕایتەوە وتی: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ.

---

[1] بڕوانە: ٨٥٧.

**١٣٣٧-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الفَضْلِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ أَسْوَدَ -رَجُلًا أَوِ امْرَأَةً- كَانَ يَقُمُّ المَسْجِدَ فَمَاتَ، وَلَمْ يَعْلَمِ النَّبِيُّ ﷺ بِمَوْتِهِ، فَذَكَرَهُ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: «مَا فَعَلَ ذَلِكَ الإِنْسَانُ؟». قَالُوا: مَاتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «أَفَلاَ آذَنْتُمُونِي؟». فَقَالُوا: إِنَّهُ كَانَ كَذَا وَكَذَا -قِصَّتَهُ- قَالَ: فَحَقَرُوا شَأْنَهُ. قَالَ: «فَدُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ». فَأَتَى قَبْرَهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ[1].

**١٣٣٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ڕەش پێستێکی - پیاو یان ئافرەت- مزگەوتی پاك دەکردەوەو گسکی دەدا، جا مرد، پێغەمبەریش ﷺ ئاگاداری مردنەکەی نەبوو، ئینجا ڕۆژێکیان بیری کەوتەوە و فەرمووی: ((ئەو کەسە چی لێ هات؟))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مرد، فەرمووی: ((ئەی بۆ منتان ئاگادار نەکرد؟))، وتیان: -بەسەرهاتەکەی- ئاواو ئاوا بوو، ئەبو هورەیرە وتی: بەکەمیان زانی و گرنگیان پێ نەدا. فەرمووی: ((گۆڕەکەیم نیشاندەن))، (ئەوانیش گۆڕەکەیان نیشاندا)، پێغەمبەریش ﷺ ڕۆیشتە سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر کرد.**

## ٦٧- بابُ المَيِّتُ يَسْمَعُ خَفْقَ النِّعَالِ

**١٣٣٨-** حَدَّثَنَا عَيَّاشٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ قَالَ: وَقَالَ لِي خَلِيفَةُ: حَدَّثَنَا ابْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «العَبْدُ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتُوُلِّيَ[2] وَذَهَبَ أَصْحَابُهُ، حَتَّى إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ، أَتَاهُ مَلَكَانِ فَأَقْعَدَاهُ فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ مُحَمَّدٍ ﷺ؟ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ. فَيُقَالُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ

---

[1] بڕوانە: ٤٥٨.

[2] بەم جۆرە (وَتُوُلِّيَ) هاتووە لە (اليُونِينِيَّة)، بەڵام لە زۆربەی ڕیوایەتەکانی تری صەحیحی بوخاریدا بە (تَوَلَّى) هاتووە.

مِنَ النَّارِ، أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الجَنَّةِ -قَالَ النَّبِيُّ: ﷺ فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا- وَأَمَّا الكَافِرُ -أَوِ المُنَافِقُ- فَيَقُولُ: لاَ أَدْرِي، كُنْتُ أَقُولُ مَا يَقُولُ النَّاسُ. فَيُقَالُ: لاَ دَرَيْتَ وَلاَ تَلَيْتَ. ثُمَّ يُضْرَبُ بِمِطْرَقَةٍ مِنْ حَدِيدٍ ضَرْبَةً بَيْنَ أُذُنَيْهِ، فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا مَنْ يَلِيهِ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ»[1].

## ٦٧- باسی مردوو گوێی لە دەنگی پێڵاوەکانە

**١٣٣٨- ئەنەس ﷛ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((کاتێك مرۆڤ خرایە گۆڕەکەیەوە، ئەو کەسانەی لەگەڵیدا بوون پشتیان هەڵکردو ڕۆیشتن (ئاگاداریانە)، هەتا گوێی لە دەنگ و خشەی پێڵاوەکانیانە، دوو فریشتە دێن بۆ لای و هەڵی دەسێننەوە دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: تۆ دەربارەی ئەو پیاوە کە ناوی موحەممەدە چی دەڵێیت؟ ئەویش دەڵێ: شایەتی دەدەم کە بەندە و پێغەمبەری خوایە، جا پێی دەوترێ: سەیری جێگاکەت بکە لە دۆزەخدا، خوا بۆی گۆڕیت بە جێگایەك لە بەهەشتدا))، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەردوو جێگاکە دەبینێ پێکەوە، بەڵام بێباوەڕ -یان دووڕوو- (لە وەڵامی پرسیارەکەدا) دەڵێ: نازانم، منیش خەڵکی چیان دەوت (لە بارەیەوە) دووبارەم دەکردەوە، جا پێی دەوترێت نەتزانیوە و نەتوتوە، پاشان بەگورزێکی ئاسنین یەك گورز دەدرێت لە نێوان هەردوو گوێی، ئەوسا هاوارێکی ئەوەندە گەورە دەکات، هەرچی بە دەوریدایە دەیبیستێ جگە لە مرۆڤ و جنۆکە)).#**

## ٦٨- بابُ مَنْ أَحَبَّ الدَّفْنَ فِي الأَرْضِ المُقَدَّسَةِ أَوْ نَحْوِهَا

**١٣٣٩-** حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ قَالَ: «أُرْسِلَ مَلَكُ المَوْتِ إِلَى مُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ فَلَمَّا جَاءَهُ صَكَّهُ، فَرَجَعَ إِلَى رَبِّهِ فَقَالَ: أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لاَ يُرِيدُ المَوْتَ. فَرَدَّ اللَّهُ عَلَيْهِ عَيْنَهُ وَقَالَ: ارْجِعْ فَقُلْ لَهُ: يَضَعُ

---

[1] بڕوانە: ١٣٧٤.

يَدَهُ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ، فَلَهُ بِكُلِّ مَا غَطَّتْ بِهِ يَدُهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ. قَالَ: أَيْ رَبِّ، ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: ثُمَّ المَوْتُ. قَالَ: فَالآنَ. فَسَأَلَ اللَّهَ أَنْ يُدْنِيَهُ مِنَ الأَرْضِ المُقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلَوْ كُنْتُ ثَمَّ لَأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ عِنْدَ الكَثِيبِ الأَحْمَرِ»[1].

## ٦٨- باسی کەسێ کە پێی خۆش بێ لە زەوی پیرۆزو[2] لەو شێوەدا بنێژرێ

**١٣٣٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ((فریشتەی گیان کێشان نێردرا بۆ لای مووسا ﷺ، کاتێ هاتەی لای (مووسا) شەپازلەیەکی لێ دا[3]، فریشتەکەش گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری و وتی: منت ناردووە بۆ لای کەسێك نایەوێ بمرێ، ئینجا خوای گەورە چاوەکەی بۆ گێڕایەوەو چاك بوویەوە، وە فەرمووی: بگەڕێوەو پێی بڵێ دەستی بخاتە سەر پشتی گایەك، جا دەستی چەند تاڵەمووی پشتی گاکەی داپۆشی، ئەوە بە هەر تاڵەموویەك ساڵێك تەمەنی زیاد دەبێ، (فریشتەکە چۆیە لای و پێی وت)، مووسا ﷺ وتی: ئەی پەروەردگار پاشان چییە؟ فەرمووی پاشان مردنە، مووسا وتی: دەی با ئێستا بێت، وە داوای کرد لە خوا کە بە ئەندازەی بەرد هاوێژێك نزیکی بکاتەوە لە بەیتولموقەدەس))، ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((جا ئەگەر من لەو شوێنەدا بوومایە گۆڕەکەی مووسام نیشان دەدان، لە قەراغی ڕێگاکەدایە لای تەپۆڵکەیەکی سووردا)).**

---

[1] بڕوانە: ٣٤٠٧.

[2] مەبەست پێی (بَيْتُ الْمَقْدِس)ـە.

[3] چاوێکی کوێر کرد، وەک لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە.

## ٦٩- بابُ الدَّفْنِ بِاللَّيْلِ

وَدُفِنَ أَبُو بَكْرٍ لَيْلًا.

١٣٤٠- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَجُلٍ بَعْدَ مَا دُفِنَ بِلَيْلَةٍ، قَامَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ، وَكَانَ سَأَلَ عَنْهُ فَقَالَ: «مَنْ هَذَا؟». فَقَالُوا: فُلَانٌ، دُفِنَ البَارِحَةَ. فَصَلَّوْا عَلَيْهِ[1].

## ٦٩- باسی مردوو ناشتن لە شەودا (دروستە)

**ئەبو بەکر ﷺ بەشەو نێژرا.**

**١٣٤٠- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مردووی لەسەر پیاوێك کرد دوای ناشتنی بە شەوێك[2]، خۆی و هاوەڵانی وەستان، وە پێشتر پرسیاری کرد دەربارەی و فەرمووی: ((ئەمە کێیە؟))، هاوەڵانیش وتیان: فلانەکەس شەوی ڕابردوو نێژراوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی نوێژیان لەسەر کرد.**

## ٧٠- بابُ بِنَاءِ المَسْجِدِ عَلَى القَبْرِ

١٣٤١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: لَمَّا اشْتَكَى النَّبِيُّ ﷺ ذَكَرَتْ بَعْضُ نِسَائِهِ كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِأَرْضِ الحَبَشَةِ، يُقَالُ لَهَا مَارِيَةُ، وَكَانَتْ أُمُّ سَلَمَةَ وَأُمُّ حَبِيبَةَ ﷺ أَتَتَا أَرْضَ الحَبَشَةِ، فَذَكَرَتَا مِنْ حُسْنِهَا وَتَصَاوِيرَ فِيهَا، فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: «أُولَئِكَ إِذَا مَاتَ مِنْهُمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، ثُمَّ صَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّورَةَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ»[3].

---

[1] بروانە: ٨٥٧.

[2] ئەمە بەڵگەیە کە ناشتن لە شەودا دروستە، چونکە کە بە پێغەمبەریان ﷺ وت: شەو نێژراوە ڕەخنەی لێنەگرتن، کەواتە دروستە.

[3] بروانە: ٤٢٧.

## ٧٠- باسی دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ

١٣٤١- عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت، یەکێ لە خێزانەکانی باسی کەنیسەیەکی کرد کە لە وڵاتی حەبەشە دیویەتی، کە پێیان دەوت: مارییە، ئوممو سەلەمەو ئوممو حەبیبە ﵄ ڕۆیشتبوون بۆ وڵاتی حەبەشە، جا باسی جوانی ئەو کەنیسەو وێنەکانیان کرد کە تێیدابوو، پێغەمبەریش ﷺ سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: ((ئەوانە کاتێ پیاوێکی چاك لەنێویاندا بمردایە، لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتێکیان دروست دەکرد، پاشان ئەو وێنانەیان تێدا دروست دەکرد، ئا ئەوانە خراپترین دروست کراون لای خوا)).

## ٧١- بَابُ مَنْ يَدْخُلُ قَبْرَ المَرْأَةِ

١٣٤٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا هِلَالُ بْنُ عَلِيٍّ عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: شَهِدْنَا بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ عَلَى القَبْرِ، فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَدْمَعَانِ، فَقَالَ: «هَلْ فِيكُمْ مِنْ أَحَدٍ لَمْ يُقَارِفِ اللَّيْلَةَ؟». فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَنَا. قَالَ: «فَانْزِلْ فِي قَبْرِهَا». فَنَزَلَ فِي قَبْرِهَا فَقَبَرَهَا. قَالَ ابْنُ مُبَارَكٍ: قَالَ فُلَيْحٌ: أُرَاهُ يَعْنِي: الذَّنْبَ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: ﴿وَلِيَقْتَرِفُوا ﴿١١٣﴾﴾ الأنعام. أَيْ: لِيَكْتَسِبُوا[1].

## ٧١- باسی ئەو کەسەی دەڕواتە نێو گۆڕی ئافرەتەوە (تا بیخاتە گۆڕەوە)

١٣٤٢- ئەنەس ﵁ دەڵێ: ئامادەی ناشتنی کچەکەی پێغەمبەر ﷺ بووین، لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ لەسەر گۆڕەکە دانیشتبوو، بینیم چاوەکانی فرمێسکیان

[1] بڕوانە: ١٢٨٥.

**پێدا دەهاتە خوار، ئینجا فەرمووی: ((ئایا کەسێکتان تێدایە ئەم شەو گوناهی[1] نەکردبێ؟))، ئەبو تەڵحە وتی: من تاوانم نەکردووە، فەرمووی: ((دابەزە گۆڕەکەی))، ئەبو تەڵحەش دابەزیە گۆڕەکەی و ئافرەتەکەی خستە گۆڕەکەوە، عەبدوڵای کوڕی موبارەك دەڵێ: فولەیح وتی: مەبەستی لە وشەی (یُقارِف) گوناهە.**

**ئیمامی بوخاریش دەڵێ: مانای: ﴿ وَلِيَقْتَرِفُواْ ﴿١١٣﴾ ﴾ با گوناه ئەنجام بدەن.**

## ٧٢- بابُ الصَّلاةِ عَلَى الشَّهِيدِ

١٣٤٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ يَقُولُ: «أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ؟». فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ وَقَالَ: «أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلاَءِ يَوْمَ القِيَامَةِ». وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا وَلَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِمْ[2].

## ٧٢- باسی (حوکمی) نوێژکردن لەسەر شەهید

**١٣٤٣- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پیاوی لە شەهیدەکانی ئوحود دەخستە یەك قوماش و کفنەوە، پاشان دەیفەرموو: ((کامیان قورئانی زۆرتری لەبەر بووە؟)) جا ئەگەر ئاماژەیان بکردایە بۆ**

---

[1] هەندێ لە زانایان (لَمْ يُقَارِفِ) یان بە: سەرجێیی لەگەڵ خێزانیدا نەکردبێ مانا کردووە کە ئەو مانایەش دەگونجێ و ڕاستە، بڕوانە: إرشاد الساري: ٣/٤٣٠.

[2] بڕوانە: ١٣٤٥، ١٣٤٦، ١٣٤٧، ١٣٤٨، ١٣٥٣، ٤٠٧٩.

**یەکێکیان، لەخستنە گۆڕدا دەیخستە پێشەوە و دەیفەرموو: ((من شایەتی بۆ ئا ئەمانە دەدەم لە ڕۆژی دواییدا))، وە فەرمانی کرد بە خوێنەکانیانەوە بنێژرێن، وە نەشۆران و نوێژیان لەسەر نەکرا.**

١٣٤٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلاَتَهُ عَلَى المَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى المِنْبَرِ فَقَالَ: «إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الآنَ، وَإِنِّي أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الأَرْضِ -أَوْ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ- وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، وَلَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنَافَسُوا فِيهَا»[1].

**١٣٤٤- عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لە ماڵ دەرچوو (ڕۆیشت بۆ بەقیع)، وەك نوێژکردنی لەسەر مردوو نوێژی لەسەر شەهیدەکانی ئوحود کرد، پاشان گەڕایەوە سەر دوانگەکەی و فەرمووی: ((من پێش ئێوە دەکەوم (لەهەموو شتێکدا)، من شایەتم بۆ ئێوە، وە سوێند بەخوا من ئا ئێستا سەیری حەوزەکەم دەکەم، وە بەڕاستی کلیلی خەزێنەکانی زەوی -یان کلیلی زەوی-م پێدراوە، سوێند بەخوا من ناترسم لێتان کە دوای من هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکەن، بەڵکو ترسم هەیە لێتان لەسەر دونیا ڕکابەرایەتی یەکتر بکەن)).**

## ٧٣- بابُ دَفْنِ الرَّجُلَيْنِ وَالثَّلاَثَةِ فِي قَبْرٍ

١٣٤٥- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٥٩٦، ٤٠٤٢، ٤٠٨٥، ٦٤٢٦، ٦٥٩٠.

[2] بڕوانە: ١٣٤٣.

## ٧٣- باسی ناشتنی دوو پیاو و سێ پیاو لە گۆڕێکدا (دروستە)

**١٣٤٥- عەبدوڕەحمانی کوڕی کەعب دەڵێ: جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ بۆی گێڕایەوە وتی: کە پێغەمبەر ﷺ دوو پیاوی لە شەهیدەکانی ئوحود پێکەوە دەناشت.**

## ٧٤- بابُ مَنْ لَمْ يَرَ غَسْلَ الشُّهَدَاءِ

١٣٤٦- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ادْفِنُوهُمْ فِي دِمَائِهِمْ». - يَعْنِي: يَوْمَ أُحُدٍ. وَلَمْ يُغَسِّلْهُمْ[1].

## ٧٤- باسی ئەوەی ڕای لەگەڵ شۆردنی شەهیداندا نییە

**١٣٤٦- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((شەهیدەکان بنێژن بەخوێنەکانیانەوە))، واتە: لە ڕۆژی غەزای جەنگی ئوحود، نەشیشۆردن.**

## ٧٥- بابُ مَنْ يُقَدَّمُ فِي اللَّحْدِ

وَسُمِّيَ اللَّحْدَ؛ لأَنَّهُ فِي نَاحِيَةٍ، وَكُلُّ جَائِرٍ مُلْحِدٌ: ﴿ مُلْتَحَدًا ﴿٢٧﴾ ﴾ الكهف، مَعْدِلًا، وَلَوْ كَانَ مُسْتَقِيمًا كَانَ ضَرِيحًا.

١٣٤٧- حَدَّثَنَا ابْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا لَيْثُ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ ثُمَّ يَقُولُ: «أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ؟». فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ وَقَالَ: «أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ». وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ بِدِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يُغَسِّلْهُمْ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٣٤٣.

[2] بڕوانە: ١٣٤٣.

## ٧٥- باسی ئەو مردووەی لە دانانی نێو گۆڕەكەدا پێش دەخرێ

بۆیە پێی دەوترێ لەحد چونكە لەلاوەیە، وە هەموو لادەرێك لە ئیسلام بێ دینە، وە مانای ﴿ مُلْتَحَدًا ﴾ پەنگایەك پەنای بۆ بەریت، وە ئەگەر گۆڕینچەكە لەنێوەڕاستی گۆڕەكەدا بوو پێی دەوترێ: (ضَرِيح).

١٣٤٧- جابیری كوڕی عەبدولا ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پیاوی لە شەهیدەكانی ئوحود دەخستە یەك قوماش و كفنەوە، پاشان دەیفەرموو: ((كامیان قورئانی زۆرتری لەبەر بووە؟)) جا ئەگەر ئاماژەیان بكردبایە بۆ یەكێكیان، لە خستنەگۆڕەكەدا پێشی دەخست و دەیفەرموو: ((من شایەتی بۆ ئا ئەمانە دەدەم لە ڕۆژی دواییدا))، فەرمانی كرد بەخوێنەكانیانەوە بنێژرێن، وە نوێژی نەكرد لەسەریان و نەیشۆردن.

١٣٤٨- وَأَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ لِقَتْلَى أُحُدٍ: «أَيُّ هَؤُلاَءِ أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ؟». فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى رَجُلٍ قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ قَبْلَ صَاحِبِهِ. وَقَالَ جَابِرٌ: فَكُفِّنَ أَبِي وَعَمِّي فِي نَمِرَةٍ وَاحِدَةٍ[1]. وَقَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ كَثِيرٍ: حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، حَدَّثَنَا مَنْ سَمِعَ جَابِرًا ﷺ.

١٣٤٨- جابیری كوڕی عەبدولا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەهیدەكانی ئوحودی دەفەرموو: ((كام لە ئەمانە قورئانی زیاتری لەبەرە؟)) ئەگەر ئاماژەیان بكردبایە بۆ كەسێك لە گۆڕینچەكەدا پێشی دەخست لە هاوڕێكەی بۆ ناشتن، وە جابیر دەڵێ: باوكم و مامەم لە پارچە قوماشێكدا كفن كران، سولەیمانی كوڕی كەسیر دەڵێ: زوهری بۆی گێڕامەوە وتی: كەسێك بۆی گێڕاینەوە كە لە جابیری ﷺ بیستبوو.

---

[1] بڕوانە: ١٣٤٣.

## ٧٦- بابُ الإِذْخِرِ وَالحَشِيشِ فِي القَبْرِ

١٣٤٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حَوْشَبٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «حَرَّمَ اللَّهُ مَكَّةَ، فَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي وَلاَ لأَحَدٍ بَعْدِي، أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، لاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا، وَلاَ يُعْضَدُ شَجَرُهَا، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، وَلاَ تُلْتَقَطُ لُقَطَتُهَا إِلاَّ لِمُعَرِّفٍ».

فَقَالَ العَبَّاسُ ﷺ: إِلاَّ الإِذْخِرَ لِصَاغَتِنَا وَقُبُورِنَا. فَقَالَ: «إِلاَّ الإِذْخِرَ».

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «لِقُبُورِنَا وَبُيُوتِنَا»[1].

وَقَالَ أَبَانُ بْنُ صَالِحٍ، عَنِ الحَسَنِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ مِثْلَهُ.

وَقَالَ مُجَاهِدٌ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ ﷺ: لِقَيْنِهِمْ وَبُيُوتِهِمْ[2].

## ٧٦- باسی ئیزخیر و پووش بۆ نێوگۆڕ بەکارهێنان

**١٣٤٩- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوا مەککەی یاساغ کردوو (جەنگی تێدا بکرێ)، ئینجا حەڵاڵ نەبووە بۆ کەس لە پێش من و لە دوای منیش، تەنها کاتژمێرێك لە ڕۆژدا (جەنگ کردن) تێیدا بۆ من حەڵاڵ کرا، گیاو پووشی نابڕدرێ و هەڵناکەندرێ، درەختی نابڕدرێ، نێچیری ڕاونانرێ (ڕاوناکرێ)، شتی ونبووی هەڵناگیرێتەوە، مەگەر بۆ کەسێ جاڕی بۆ بدات))، عەباس ﷺ وتی: جگە لە ئیزخیر بۆ خانوو و گۆڕەکانمان؟ پێغەمبەریش فەرمووی: ((جگە لە ئیزخیر))، وە ئەبو هورەیرە**

---

[1] بڕوانە: ١١٢.

[2] بڕوانە: ١٥٨٧، ١٣٤٨، ١٨٣٤، ٢٠٩٠، ٢٤٣٣، ٢٧٨٣، ٢٨٢٥، ٣٠٧٧، ٣١٨٩، ٤٣١٣.

ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بۆ گۆڕ و خانووەکانمان)).

ئەبانی کوڕی صالح لە حەسەنی کوڕی موسلیمەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە صەفیەی کچی شەیبەوە دەڵێ: وێنەی فەرموودەکەی پێشووی لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە.

وە موجاهید دەگێڕێتەوە لە تاووسەوە، لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە رضي الله عنهما کە دەڵێ: ((بۆ ئاسنگەرو خانووەکانیان)).

## ٧٧- بابٌ: هَلْ يُخْرَجُ المَيِّتُ مِنَ القَبْرِ وَاللَّحْدِ لِعِلَّةٍ؟

١٣٥٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ بَعْدَ مَا أُدْخِلَ حُفْرَتَهُ فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ، فَوَضَعَهُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَنَفَثَ عَلَيْهِ مِنْ رِيقِهِ، وَأَلْبَسَهُ قَمِيصَهُ، فَاللهُ أَعْلَمُ، وَكَانَ كَسَا عَبَّاسًا قَمِيصًا.

قَالَ سُفْيَانُ: وَقَالَ أَبُو هَرِيرَةَ: وَكَانَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ قَمِيصَانِ، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عَبْدِ اللهِ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلْبِسْ أَبِي قَمِيصَكَ الذِي يَلِي جِلْدَكَ. قَالَ سُفْيَانُ: فَيُرَوْنَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَلْبَسَ عَبْدَ اللهِ قَمِيصَهُ مُكَافَأَةً لِمَا صَنَعَ[1].

## ٧٧- باسێک: ئایا مردوو لە گۆڕ و گۆڕینچە دەردەهێنرێ لەبەر هەر هۆیەك؟

١٣٥٠- جابیری کوڕی عەبدوڵا رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ (بەخاك سپاردنی) عەبدوڵای کوڕی ئوبەی، دوای ئەوەی خرابوویە گۆڕەکەیەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دەرهێنرا لە گۆڕەکەی، لەسەر هەردوو

---

[1] بڕوانە: ١٢٧٠.

ئەژنۆی خۆی داینا تفی دەمی خۆی لێدا، كراسەكەی خۆی كردەبەری، خواش دەزانێ (سودی دەبێ بۆی یان نا)، عەبدوڵای كوڕی ئوبەی كاتی خۆی كراسێكی دا بە عەباس (ی مامی پێغەمبەر ﷺ)و لە بەریكرد (لە جەنگی بەدردا).

سوفیان دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لەوكاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو كراسی لەبەردا بوو، ئینجا عەبدوڵای كوڕی عەبدوڵا (ی كوڕی ئوبەی) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو كراسەیانت كە لە ژێرەوەیەو دراوە بە لاشەتەوە بیكە بەری باوكم، سوفیان دەڵێ: هاوەڵان ڕایان وایە پێغەمبەر ﷺ كراسەكەی خۆی بۆیە كردە بەری عەبدوڵا پاداشتی ئەوەی دایەوە كە كردی (كە كراسێكی دا بە عەباسی مامی، كاتێ بەدیل گیرا لە جەنگی بەدرداو كراسی لەبەردا نەبوو).

١٣٥١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، أَخْبَرَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الْمُعَلِّمُ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا حَضَرَ أُحُدٌ دَعَانِي أَبِي مِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ: مَا أُرَانِي إِلاَّ مَقْتُولًا فِي أَوَّلِ مَنْ يُقْتَلُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَإِنِّي لاَ أَتْرُكُ بَعْدِي أَعَزَّ عَلَيَّ مِنْكَ، غَيْرَ نَفْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَإِنَّ عَلَيَّ دَيْنًا فَاقْضِ، وَاسْتَوْصِ بِأَخَوَاتِكَ خَيْرًا. فَأَصْبَحْنَا فَكَانَ أَوَّلَ قَتِيلٍ، وَدُفِنَ مَعَهُ آخَرُ فِي قَبْرٍ، ثُمَّ لَمْ تَطِبْ نَفْسِي أَنْ أَتْرُكَهُ مَعَ الآخَرِ، فَاسْتَخْرَجْتُهُ بَعْدَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ، فَإِذَا هُوَ كَيَوْمِ وَضَعْتُهُ هُنَيَّةً غَيْرَ أُذُنِهِ[1].

١٣٥١- جابیر ﷺ دەڵێ: كاتێ جەنگی ئوحود پێش هات، باوكم لە شەودا بانگی كردم و وتی: دڵنیام من یەكەم كەسم كە دەكوژرێم لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، وە من لە پاش خۆم جگە لە خودی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان لە تۆ خۆشەویستتر بەجێناهێڵم، بێگومان قەرزێكم لایە بیدەرەوە، لەگەڵ خوشكەكانیشتدا چاك بە و خەمخۆریان بە، جا كە ڕۆژمان لێ بوویەوە باوكم یەكەم كەس بوو شەهید كرا، وە لە گۆڕێكدا پیاوێكی تری لەگەڵدا نێژرا، پاشان پێم خۆش نەبوو وازی لێ بێنم لەگەڵ كەسێكی تردا لەگۆڕێكدا بێت، بۆیە دوای

[1] بڕوانە: ١٣٥٢.

**شەش مانگ لە ناشتنی لە گۆڕەکەی دەرمهێنا، هەر دەتوت ئەو ساتە وەختەیە کە ناشتبووم گوێیەکی نەبێ (کەمێکی نەمابوو).**

١٣٥٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: دُفِنَ مَعَ أَبِي رَجُلٌ، فَلَمْ تَطِبْ نَفْسِي حَتَّى أَخْرَجْتُهُ، فَجَعَلْتُهُ فِي قَبْرٍ عَلَى حِدَةٍ[1].

**١٣٥٢- جابیر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ باوکمدا پیاوێك نێژرابوو، بۆیە پێم خۆش نەبوو، هەتا دەرم هێنا و بە تەنها لە گۆڕێکدا ناشتم.**

## ٧٨- بابُ الشَّقِّ وَاللَّحْدِ فِي القَبْرِ

١٣٥٣- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ رَجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ، ثُمَّ يَقُولُ: «أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ؟». فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ فَقَالَ: «أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ يَوْمَ القِيَامَةِ». فَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ بِدِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُغَسِّلْهُمْ[2].

## ٧٨- باسی گۆڕو گۆڕینچەکەی لە پێشەوە بێ[3] یان لە نێوەڕاستی گۆڕەکەدا

**١٣٥٣- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پیاوی لە شەهیدەکانی ئوحود دەخستە یەك قوماش و کفنەوە، پاشان دەیفەرموو:**

---

[1] بڕوانە: ١٣٥١.

[2] بڕوانە: ١٣٤٣.

[3] دوای هەڵکەندنی گۆڕەکە لەڕووی قیبلەوە کەندرکرێ، یان لە نێوەڕاستی گۆڕەکەدا گۆڕینچەی بۆ بکرێ.

((کامیان قورئانی زۆرتری لەبەر بووە؟)) جا ئەگەر ئاماژەیان بکردایە بۆ یەکێکیان، لە خستنە گۆڕدا پێشی دەخست و دەیفەرموو: ((من شایەتی بۆ ئا ئەمانە دەدەم لە ڕۆژی دواییدا))، وە فەرمانی کرد بەخوێنەکانیانەوە بنێژرێن، وە نەیشۆردن (و نوێژی لەسەر نەکردن).

## ٧٩- بابٌ: إِذَا أَسْلَمَ الصَّبِيُّ فَمَاتَ هَلْ يُصَلَّى عَلَيْهِ؟ وَهَلْ يُعْرَضُ عَلَى الصَّبِيِّ الإِسْلاَمُ؟

وَقَالَ الحَسَنُ وَشُرَيْحٌ وَإِبْرَاهِيمُ وَقَتَادَةُ: إِذَا أَسْلَمَ أَحَدُهُمَا فَالوَلَدُ مَعَ المُسْلِمِ. وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ مَعَ أُمِّهِ مِنَ المُسْتَضْعَفِينَ، وَلَمْ يَكُنْ مَعَ أَبِيهِ عَلَى دِينِ قَوْمِهِ. وَقَالَ: الإِسْلاَمُ يَعْلُو وَلاَ يُعْلَى.

## ٧٩- باسێک: ئەگەر منداڵ مسوڵمان بوو ئینجا مرد ئایا نوێژی لەسەر دەکرێ؟ وە ئایا داوادەکرێ لە منداڵ مسوڵمان ببێ؟

حەسەن و شوڕەیح و ئیبڕاهیم و قەتادە دەڵێن: ئەگەر ژن و پیاو یەکێکیان مسوڵمان ببن، ئەوە منداڵەکەیان لەگەڵ مسوڵمانەکەیاندایە. عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لەگەڵ دایکیدا بوو، لەو مسوڵمانانە بوون کە بێ دەسەڵات بوون، وە لەگەڵ باوکیدا نەبوو کە (باوکی) لەسەر ئایینی گەلەکەی مابوویەوە[1]، (پێغەمبەر ﷺ) دەفەرموێ: ((ئایینی ئیسلام بەرز و زاڵە، هیچ ئایینێك زاڵ و بەرز نابێت بەسەریدا))[2].

١٣٥٤- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُمَرَ انْطَلَقَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي رَهْطٍ قِبَلَ ابْنِ صَيَّادٍ، حَتَّى وَجَدُوهُ

---

[1] دوای هەڵکەندنی گۆڕەکە لەڕووی قیبلەوە کەندرکرێ، یان لە نێوەڕاستی گۆڕەکەدا گۆڕینچەی بۆ بکرێ.

[2] ئەم وتەیە ئیبن حەجەر بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، دواتر دەڵێ: بە وتەی ئیبن عەباسیش بینیومە ئیبن حەزم لە موحەلا هێناویەتی. فتح الباري: ٢٨٢/٤.

يَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ عِنْدَ أُطُمِ بَنِي مَغَالَةَ -وَقَدْ قَارَبَ ابْنُ صَيَّادٍ الحُلُمَ- فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ لِابْنِ صَيَّادٍ «تَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟». فَنَظَرَ إِلَيْهِ ابْنُ صَيَّادٍ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الأُمِّيِّينَ. فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟ فَرَفَضَهُ وَقَالَ: «آمَنْتُ بِاللَّهِ وَبِرُسُلِهِ». فَقَالَ لَهُ: «مَاذَا تَرَى». قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: يَأْتِينِي صَادِقٌ وَكَاذِبٌ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «خُلِّطَ عَلَيْكَ الأَمْرُ. ثُمَّ قَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا». فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: هُوَ الدُّخُّ. فَقَالَ: «اخْسَأْ، فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ». فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ أَضْرِبْ عُنُقَهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنْ يَكُنْهُ فَلَنْ تُسَلَّطَ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْهُ فَلاَ خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ»[1].

**١٣٥٤- سالیمی کوڕی عەبدوڵا گێڕایەوە کە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە: کە عومەر و کۆمەڵێ لە هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشتن بەرەو ئەو شوێنەی ئیبنو صەییادی[2] لێیە، هەتا بینیان لای قەڵای بەنی مەغالە لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکرد - لەوکاتەدا ئیبنو صەییاد نزیك باڵغ بوون بوو-، هەستی نەکرد هەتا پێغەمبەر ﷺ لە دوایەوە دەستی لەپشتیدا، پاشان فەرمووی بە ئیبنو صەییاد: ((شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام؟))، ئیبنو صەییادیش تەماشای پێغەمبەری ﷺ کرد، وتی: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری نەخوێندەوارەکانی. ئینجا ئیبنو صەییاد وتی بە پێغەمبەر ﷺ: ئەی تۆ شایەتی دەدەیت کە من پێغەمبەری خوام؟ پێغەمبەریش ﷺ ئیتر پرسیاری لێ نەکردو فەرمووی: ((باوەڕم هەیە بە خواو بە پێغەمبەرانی))، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((چ جۆرە خەوێك دەبینی؟))، ئیبنو صەییاد وتی: خەوی ڕاست وخەوی درۆش دەبینم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سەرت لێ شێوێنراوە؟)) پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((بێگومان من**

---

[1] بڕوانە: ٣٠٥٥، ٦١٧٣، ٦٦١٨.

[2] ئەمە پێش مسوڵمانبوونی عەبباس بوو.

**شتێکم لە دڵمدا شاردۆتەوە بۆت چییە؟)) ئیبنو صەییاد وتی: (الدُّخُّ)ـە[1]، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێدەنگ بە، تۆ لە پلەی خۆت (کە فاڵچیەتییە) تێپەڕ ناکەیت (ئەوەی پەنهانە نایزانی) ))، ئینجا عومەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێم گەڕێ با بدەم لە گەردنی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر (دەججال) خۆی بێت ئەوە تۆ ناتوانی بیکوژی و زاڵ بیت بەسەریدا، وە ئەگەر ئەویش نەبێ کەڵکێك لە کوشتنیدا نییە)).**

١٣٥٥- وَقَالَ سَالِمٌ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: انْطَلَقَ بَعْدَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ إِلَى النَّخْلِ الَّتِي فِيهَا ابْنُ صَيَّادٍ، وَهُوَ يَخْتِلُ أَنْ يَسْمَعَ مِنِ ابْنِ صَيَّادٍ شَيْئًا قَبْلَ أَنْ يَرَاهُ ابْنُ صَيَّادٍ، فَرَآهُ النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ -يَعْنِي: فِي قَطِيفَةٍ لَهُ فِيهَا رَمْزَةٌ أَوْ زَمْرَةٌ[2]- فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ فَقَالَتْ لِابْنِ صَيَّادٍ: يَا صَافِ -وَهُوَ اسْمُ ابْنِ صَيَّادٍ- هَذَا مُحَمَّدٌ ﷺ. فَثَارَ ابْنُ صَيَّادٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ تَرَكَتْهُ بَيَّنَ». وَقَالَ شُعَيْبٌ فِي حَدِيثِهِ: فَرَفَصَهُ رَمْرَمَةٌ، أَوْ زَمْزَمَةٌ[3]. وَقَالَ إِسْحَاقُ الكَلْبِيُّ وَعُقَيْلٌ: رَمْرَمَةٌ. وَقَالَ مَعْمَرٌ: رَمْزَةٌ[4].

**١٣٥٥- وە سالیم دەڵێ: لە عەبدوڵای کوڕی عومەرم ﷺ بیست دەیوت: پاش ئەوەی پێغەمبەر و ﷺ ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەرچوون و ڕۆیشتن بۆ ئەو**

---

[1] (الدُّخُّ) ویستی بڵێ: (الدخان) دوکەڵە، بەڵام نەیتوانی تەواوی بکات، وەک چۆن فاڵچییەکان هەندێ لە وشەکان دەزانن ناتوانن تەواوی بکەن، پێغەمبەری خودا ﷺ دخانی لە دڵی خۆیدا شاردبۆوە.

[2] (رَمْزَةٌ) و (زَمْرَةٌ)و ماناکەیان لەیەکەوە نزیکە، (رَمْزَةٌ) لە (الرمز)ـەوە هاتووە کە بە مانای ئاماژەیە، وە (زَمْرَةٌ) ماناکەی لە بزمارەوە وەرگیراوە.

[3] (رَمْرَمَةٌ) لە ئەسڵدا بە مانای جوڵە دێت، وە لە فەرمودەکەدا بە مانای دەنگی هێواش و نزم دێت، هەروەها (زَمْزَمَةٌ) ماناکەی وەک (رَمْرَمَةٌ) وایە.

[4] بڕوانە: ٢٦٣٨، ٣٠٢٣، ٣٠٥٦، ٦١٧٤.

**باخه دارخورمایەی کە ئیبنوصەییادی لێ بوو، پێغەمبەر ﷺ دەیویست بەشێوەیەك ئیبنو صەییاد هەستی پێ نەكات، بۆ ئەوەی هەندێ قسەی لێ ببیستێ پێش ئەوەی ئیبنو صەییاد پێغەمبەر ﷺ ببینێ، جا كاتێ پێغەمبەر ﷺ ئیبنو صەییادی بینی ڕاكشابوو -واتە: پارچەیەك قەدیفەی دابوو بەخۆیدا، لەبەری خۆیەوە دەمی دەجوڵاندو قسەی دەكرد -جا دایكی ئیبنو صەییاد پێغەمبەری ﷺ بینی، لەكاتێكدا خۆی دەدایە پاڵ دارخورماكان (تا ئیبنو صەییاد نەیبینێ)، دایكی بە ئیبنو صەییادی وت: ئەی صاف -كە ناوی ئیبن صەییادە- ئەوە موحەممەدە ﷺ، ئیتر ئیبنو صەییادیش دەرپەڕی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر دایكی وازی لێ بهێنایە ئاشكرا دەبوو(كە دەججالە یاخود نا) ))، شوعەیب لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە بەم شێوە ئەم وشانەی گێڕاوەتەوە: ((فَرَفَصَهُ رَمْرَمَةٌ، أَوْ زَمْزَمَةٌ))، وە ئیسحاقی كەلبی و عوقەیل بە ((رَمْرَمَةٌ)) هێناویانە. وە مەعمەر بە ((رَمْزَةٌ)) هێناویەتی.**

١٣٥٦- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ -وَهْوَ: ابْنُ زَيْدٍ- عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ غُلَامٌ يَهُودِيٌّ يَخْدُمُ النَّبِيَّ ﷺ فَمَرِضَ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُهُ، فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَقَالَ لَهُ: «أَسْلِمْ». فَنَظَرَ إِلَي أَبِيهِ وَهْوَ عِنْدَهُ فَقَالَ لَهُ: أَطِعْ أَبَا القَاسِمِ ﷺ. فَأَسْلَمَ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ وَهْوَ يَقُولُ: «الحَمْدُ لله الذِي أَنْقَذَهُ مِنَ النَّارِ»[1].

**١٣٥٦- ئەنەس ﷺ دەڵێ: مێردمنداڵێكی جوولەكە خزمەتی پێغەمبەری دەكرد ﷺ، جا نەخۆش كەوت پێغەمبەریش ﷺ ڕۆیشت بۆلای و سەردانی كرد، لەلای سەریدا دانیشت و فەرمووی پێی: ((مسوڵمان ببە))، مێردمنداڵەكەش سەیری باوكی كرد كە لایدا دانیشتبوو، باوكیشی وتی:**

[1] بڕوانە: ٥٦٥٧.

**بەگوێی ئەبولقاسیم[1] بکە، ئەویش (شایەتومانی هێناو) مسوڵمان بوو، ئیتر پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەیان هاتە دەرەوەو فەرمووی: ((سوپاس بۆ ئەو خوایەی ڕزگاری کرد لە ئاگری دۆزەخ)).**

١٣٥٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَقُولُ: كُنْتُ أَنَا وَأُمِّي مِنَ الْمُسْتَضْعَفِينَ، أَنَا مِنَ الوِلْدَانِ، وَأُمِّي مِنَ النِّسَاءِ[2].

**١٣٥٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: من و دایکم لەوانە بووین کە بێ دەسەڵات و لاواز بوون[3] (لە مەککە)، من لە منداڵانداو دایکم لە ئافرەتاندا.**

١٣٥٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: يُصَلَّى عَلَى كُلِّ مَوْلُودٍ مُتَوَفًّى وَإِنْ كَانَ لِغَيَّةٍ؛ مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ وُلِدَ عَلَى فِطْرَةِ الإِسْلاَمِ، يَدَّعِي أَبَوَاهُ الإِسْلاَمَ أَوْ أَبُوهُ خَاصَّةً، وَإِنْ كَانَتْ أُمُّهُ عَلَى غَيْرِ الإِسْلاَمِ، إِذَا اسْتَهَلَّ صَارِخًا صُلِّيَ عَلَيْهِ، وَلاَ يُصَلَّى عَلَى مَنْ لاَ يَسْتَهِلُّ مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ سِقْطٌ، فَإِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رضي الله عنه كَانَ يُحَدِّثُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ البَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاء، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟». ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ ﴿٣٠﴾﴾ الروم، الآيَةَ[4].

**١٣٥٨- ئیبنو شیهاب دەڵێ: نوێژ لەسەر هەموو منداڵێك دەکرێ کە بمرێ، با منداڵی زیناش بێت، لەبەر ئەوەی بە مسوڵمانێتی لەدایك بووە، دایك و باوکی**

---

[1] نازناوی پێغەمبەرە ﷺ.

[2] بڕوانە: ٤٥٨٧، ٤٥٨٨، ٤٥٩٧.

[3] کە موسڵمان بووین توانامان نەبوو کۆچ بکەین بۆ مەدینە.

[4] بڕوانە: ١٣٥٩، ١٣٨٥، ٤٧٧٥، ٦٥٩٩.

خۆیان بە مسوڵمان دەزانن، یان باوکی بەتایبەتی با دایکیشی لەسەر ئایینی ئیسلام نەبێت، ئەگەر (لە کاتی لەدایکبوونیدا) دەنگی لێوەهات و هاوارو گریانی هەبوو، نوێژی لەسەر دەکرێ (ئەگەر مرد)، وە نوێژ ناکرێت لەسەر منداڵێك دەنگی لێوە نەیەت، لەبەر ئەوەی لەبارچووە[1]، جا بەڕاستی ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هیچ منداڵێك نییە ئیللا لەسەر سروشتی پاکی ئیسلام لەدایك دەبێ، جا دایك و باوکی دەیکەن بە جوولەکە، یان گاور، یان ئاگرپەرست، هەروەك چۆن بەچکەی ئاژەڵێك بەتەواوی و بێ کەم و کوڕی لەدایك دەبێ، ئایا هەست دەکەن بەچکەیەك لوتی یان گوێی بڕابێ؟)) پاشان ئەبو هورەیرە ﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (ئەو سروشتی دینداریيەی خوا خەڵکی لەسەر دروست کردووە).

١٣٥٩- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ البَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟». ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: ﴿ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴿٣٠﴾ ﴾ الروم[2].

١٣٥٩-زوهری دەڵێ: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان بۆی گێڕامەوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ منداڵێك نییە ئیللا لەسەر سروشتی پاکی دینداری لەدایك دەبێ، جا دایك و باوکی دەیکەن بە

[1] بە مردوویی لە دایک بووە.

[2] بڕوانە: ١٣٥٨.

جوولەکە، یان گاور یان ئاگرپەرست، هەروەك چۆن بەچکەی ئاژەڵێك بەتەواوی و بێ کەم و کوڕی لەدایك دەبێ، ئایا هەست دەکەن بەچکەیەك لوتی یان گوێی بڕابێ؟))[1] ، پاشان ئەبو هورەیرە ﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (ئەو سروشتی دیندارییەی خوا خەڵکی لەسەر دروست کردووە، ئایین و دروستکراوەکانی خوا هیچ جۆر گۆڕانی بۆ نییە، ئەو (ئایینەی باسکرا) هەر ئەوە ئایینی ڕێك و ڕاستە).

## ٨٠- بابٌ: إِذَا قَالَ الْمُشْرِكُ عِنْدَ الْمَوْتِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ

١٣٦٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ صَالِحٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ جَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لأَبِي طَالِبٍ: «يَا عَمِّ، قُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ». فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ: يَا أَبَا طَالِبٍ، أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟! فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ، وَيَعُودَانِ بِتِلْكَ الْمَقَالَةِ، حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ هُوَ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَا وَاللَّهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ، مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ». فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾ التوبة[2].

---

[1] واتە: سەرەتا ساغ و سەلیمن، دوایی خاوەنەکانیان گوێ یان لوتیان نیشانە دەکەن و دەیبڕن.

[2] بڕوانە: ٣٨٨٤، ٤٦٧٥، ٤٧٧٢، ٦٦٨١.

## ٨٠- باسێک: ئەگەر هاوبەشدانەرێک لە کاتی مردندا بڵێ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ

١٣٦٠- سەعیدی کوڕی موسەییەب لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: کاتێ ئەبو تالیب لەسەرەمەرگدا بوو پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلای و بینی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام و عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئومەییەی کوڕی موغیرەی لەلایە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو تالیبی وت: ((ئەی مامە بڵێ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، بەم وشەیە شایەتیت بۆ دەدەم لای خوا (لە ڕۆژی دواییدا) ))، جا ئەبو جەهل و عەبدوڵای کوڕی ئەبو ئومەییە وتیان: ئەی ئەبو تالیب ئایا پشت دەکەیت لە ئایینی عەبدولموتەلیب؟! پێغەمبەری خواش ﷺ بەردەوام وتنی ئەو وشەیەی بۆ پێشنیار دەکرد و ئەبو جەهل و عەبدوڵاش قسەکەی پێشوویان بۆ دووبارە دەکردەوە، هەتا ئەبو تالیب لەکۆتایی قسەی لەگەڵیاندا وتی: ئەو لەسەر ئایینی عەبدولموتەلیبە، وە خۆی گرت لەوەی بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((دەسا سوێند بەخوا هەر داوای لێبوردنت بۆ دەکەم لە خوا هەتا ڕێگریم لێ دەکرێ))، بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند لە بارەیەوە: (دروست نییە بۆ پێغەمبەر و ئەوانەی باوەڕدارن کە داوای لێخۆش بوون بکەن بۆ هاوەڵدانەران و بتپەرستان، با خزمی زۆر نزیکیشیان بن، دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بۆتەوە کە بێگومان ئەوان دۆزەخین).

## ٨١- بابُ الجَرِيدِ عَلَى القَبْرِ

وَأَوْصَى بُرَيْدَةُ الأَسْلَمِيُّ أَنْ يُجْعَلَ فِي قَبْرِهِ جَرِيدتانِ. وَرَأَى ابْنُ عُمَرَ فُسْطَاطًا عَلَى قَبْرِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ فَقَالَ: انْزِعْهُ يَا غُلَامُ، فَإِنَّمَا يُظِلُّهُ عَمَلُهُ. وَقَالَ خَارِجَةُ بْنُ زَيْدٍ: رَأَيْتُنِي وَنَحْنُ شُبَّانٌ فِي زَمَنِ عُثْمَانَ، وَإِنَّ أَشَدَّنَا وَثْبَةً الذِي يَثِبُ قَبْرَ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ حَتَّى يُجَاوِزَهُ. وَقَالَ

عُثْمَانُ بْنُ حَكِيمٍ: أَخَذَ بِيَدِي خَارِجَةُ فَأَجْلَسَنِي عَلَى قَبْرٍ، وَأَخْبَرَنِي عَنْ عَمِّهِ يَزِيدَ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: إِنَّمَا كُرِهَ ذَلِكَ لِمَنْ أَحْدَثَ عَلَيْهِ. وَقَالَ نَافِعٌ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ يَجْلِسُ عَلَى القُبُورِ.

## ٨١- باسی( ناشتنی) پەلی دارخورما لەسەر گۆڕ

**بورەیدەی ئەسلەمی ﷺ وەسیەتی کرد دوو پەلی دارخورما لەسەر گۆڕەکەی بنێژرێ. عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ چادرێکی لەسەر گۆڕی عەبدوڕەحمان بینی وتی: ئەی گەنج لایبە، چونکە بێگومان کردەوەکانی سێبەری بۆ دەکات، خاریجەی کوڕی زەید دەڵێ: بیرم دێ کاتێ گەنج بووین لە سەردەمی عوسماندا ﷺ باز درێژترینمان ئەوەمان بوو باز بدات بەسەر گۆڕەکەی عوسمانی کوڕی مەزعوندا و لێی تێپەڕێ. عوسمانی کوڕی حەکیم دەڵێ: خاریجە دەستی گرتم لەسەر گۆڕێ داینیشاندم، وە لە زەیدی کوڕی سابیتی مامیەوە بۆی گێڕامەوە کە وتوویەتی: ئەوە ناپەسەندە بۆ کەسێ قسەبکات لەسەر گۆڕەکە (نەك دانیشتن)، نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لەسەر گۆڕەکان دادەنیشت.**

١٣٦١- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ مَرَّ بِقَبْرَيْنِ يُعَذَّبَانِ فَقَالَ: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنَ البَوْلِ، وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ». ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا بِنِصْفَيْنِ، ثُمَّ غَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً. فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لِمَ صَنَعْتَ هَذَا؟ فَقَالَ: «لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا»[1].

**١٣٦١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای دوو گۆڕدا (خاوەنەکانیان لە گۆڕەکانیاندا) سزا دەدران، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:**

---

[1] بروانە: ٢١٦.

((بێگومان ئەم دووانە سزا دەدرێن، لەسەر شتێکی گەورەش سزا نادرێن، جا یەکێکیان خۆی نەدەپاراست لە پرژی میزەکەی[1]، ئەوەی تریان لە نێوان خەڵکدا دوو زمانی دەکرد))، پاشان پەلێکی دار خورمای هەڵگرت (هێنای) و کردی بە دوو لەتەوە، لەسەر هەر گۆڕێکیان لەتێکیانی دانا (ناشتی)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی ئەمەت کرد؟ فەرمووی: ((بەڵکو لە سزاکەیان سووك بکەن تا ئەو کاتەی وشك دەبن)).

## ٨٢- بَابُ مَوْعِظَةِ المُحَدِّثِ عِنْدَ القَبْرِ، وَقُعُودِ أَصْحَابِهِ حَوْلَهُ

﴿ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ ﴾ القمر. القُبُورُ. ﴿ بُعْثِرَتْ ﴾ الانفطار. أُثِيرَتْ. بَعْثَرْتُ حَوْضِي: جَعَلْتُ أَسْفَلَهُ أَعْلاَهُ، الإِيفَاضُ: الإِسْرَاعُ. وَقَرَأَ الأَعْمَشُ: (إِلَى نَصْبٍ). إِلَى شَيْءٍ مَنْصُوبٍ يَسْتَبِقُونَ إِلَيْهِ، وَالنُّصْبُ وَاحِدٌ، وَالنَّصْبُ مَصْدَرٌ ﴿ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴾ ق. مِنَ القُبُورِ. ﴿ يَنسِلُونَ ﴾ يس يَخْرُجُونَ.

## ٨٢- باسی ئامۆژگاری کردنی ئەوەی لای گۆڕدا قسەدەکات و دانیشتنی هاوەڵانی بەدەوریدا

وشەی: ﴿ ٱلْأَجْدَاثِ ﴾ لەم ئایەتەدا: ﴿ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ ﴾، واتە: گۆڕەکان، وە وشەی: ﴿ بُعْثِرَتْ ﴾ واتە: (گۆڕەکە) هەڵگێڕدرایەوە، دەوترێ: (بَعْثَرْتُ حَوْضِي) خوارەوەی حەوزەکەم هێنایە سەرەوە، وشەی (الإِيفَاضُ): پەلەکردن، ئەعمەش ئەم

[1] یان خۆی نەدەشاردەوە و پەنای نەدەدا لە کاتی میزکردندا. إرشاد الساري: ٣/٤٥٦.

بەشەی ئایەتەکەی بەم شێوە خوێندۆتەوە: (إِلَى نَصْبٍ)، واتە: پێشبڕکێ دەکەن بۆ لای شتێکی دانراو، وشەی: (النُّصْبُ) تاکە و (النَّصْبُ) چاوگە، هەروەها ﴿ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ ﴾ ، هاتنە دەرەوەیە لە گۆڕەکان ﴿ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ واتە: دێنە دەرەوە.

١٣٦٢- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي جَرِيرٌ عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الغَرْقَدِ، فَأَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ، وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ فَنَكَّسَ، فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ، مَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلَّا كُتِبَ مَكَانُهَا مِنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، وَإِلاَّ قَدْ كُتِبَ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً». فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلاَ نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ العَمَلَ، فَمَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ قَالَ: «أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ الشَّقَاوَةِ»، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ الليل، الآيَةَ[1].

١٣٦٢- عەلی ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ جەنازەیەکدا بووین لە بەقیعی غەرقەددا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان و دانیشت، ئێمەش بە دەوریدا دانیشتین، داردەستێکی بەدەستەوە بوو سەری داخستبوو، بە داردەستەکەی زەویەکەی هەڵدەکەند، پاشان فەرمووی: ((هیچ کام لە ئێوە نییە، وە هیچ گیاندارێك نییە، ئیللا شوێنی نووسراوە لە بەهەشت و دۆزەخدا، ئیللا نووسراوە بەدبەختە یان بەختەوەرە))، جا پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پشت بەوە نەبەستین بۆمان نووسراوەو واز لە کردەوەکردن بێنین، ئەوسا هەرکامێکمان لە بەختەوەران بوو، ئەوە دەڕوات بەرەو کردەوەی بەختەوەران، ئەوەشمان لە بەدبەختان بوو،

---

[1] بڕوانە: ٤١٤٥، ٤٩٤٦، ٤٩٤٧، ٤٩٤٨، ٤٩٤٩، ٦٢١٧، ٦٦٠٥، ٧٥٥٢.

ئەوە دەڕوات بەرەو کردەوەی بەدبەختتان؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جا ئەوەی بەختەوەرە کاری بەختەوەرانیان بۆ ئاسان دەکرێ، وە ئەوەش بەدبەختە ئەوە کردەوەی بەدبەختانی بۆ ئاسان دەکرێ))، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (جا ئەوکەسەی ماڵ ببەخشێ و پارێزکار بێت). تا کۆتایی ئایەتەکە.

## ٨٣- بابُ مَا جَاءَ فِي قَاتِلِ النَّفْسِ

١٣٦٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ غَيْرِ الإِسْلَامِ كَاذِبًا مُتَعَمِّدًا فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ عُذِّبَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ»[1].

## ٨٣- باسی ئەوەی لە بارەی خۆ کوژەوە هاتووە

١٣٦٣- سابیتی کوڕی زەحاک ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەسێك سوێند بخوات بە ئایینێك بێجگە لە ئیسلام بەدرۆ و بە ئەنقەست، ئەوە وەك ئەوە وایە کە خۆی وتوویەتی[2]، هەرکەسێکیش بەپارچە ئاسنێك خۆی بکوژێ، لە ئاگری دۆزەخدا بەو پارچە ئاسنە سزا دەدرێ)).

١٣٦٤- وَقَالَ حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ: حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنِ الحَسَنِ، حَدَّثَنَا جُنْدَبٌ ﷺ فِي هَذَا المَسْجِدِ فَمَا نَسِينَا، وَمَا نَخَافُ أَنْ يَكْذِبَ جُنْدَبٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَانَ بِرَجُلٍ جِرَاحٌ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَقَالَ اللَّهُ: بَدَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِهِ حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الجَنَّةَ»[3].

---

[1] بڕوانە: ٤١٧١، ٤٨٤٣، ٦٠٤٧، ٦١٠٥، ٦٦٥٢.

[2] واتە: لە ئیسلام دەرچووەو باوەڕدار نەماوە، بووەتە ئەو ئایینەی کە وتوویەتی، بۆ نموونە بڵێ: ئەوە بم ئەگەر ئەم قسە وا نەبێ.

[3] بڕوانە: ٣٤٦٣.

**١٣٦٤- حەسەن دەڵێ: ئا لەم مزگەوتەدا جوندەب ﷺ بۆی گێڕاینەوەو لەبیرمان نەچوو، ناشترسین کە جوندەب درۆ بکات (بێگومان ڕاستگۆیە)، لە پێغەمبەرەوە گێڕایەوە ﷺ کە فەرمووی: ((پیاوێك برینێکی پێوە بوو، ئینجا خۆی کوشت، خوای گەورەش فەرمووی: بەندەکەم پەلەی لە (کوشتنی) خۆی کرد، منیش بەهەشتم لێ قەدەغە کرد)).**

١٣٦٥- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الَّذِي يَخْنُقُ نَفْسَهُ يَخْنُقُهَا فِي النَّارِ، وَالَّذِي يَطْعُنُهَا يَطْعُنُهَا فِي النَّارِ»[1].

**١٣٦٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی خۆی دەخنکێنێ، لە ئاگری دۆزەخدا هەر خۆی دەخنکێنێ، ئەو کەسەی (شمشێر یان چەقۆیەك) دەکات بە شوێنێکی خۆیدا (و خۆی پێ دەکوژێ)، لە ئاگری دۆزەخیشدا هەر دەیدات لە خۆی)).**

## ٨٤- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الصَّلَاةِ عَلَى المُنَافِقِينَ وَالاِسْتِغْفَارِ لِلْمُشْرِكِينَ

رَوَاهُ ابْنُ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

١٣٦٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ# أَنَّهُ قَالَ: لَمَّا مَاتَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ دُعِيَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَثَبْتُ إِلَيْهِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتُصَلِّي عَلَى ابْنِ أُبَيٍّ وَقَدْ قَالَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا وَكَذَا؟! أُعَدِّدُ عَلَيْهِ قَوْلَهُ فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: «أَخِّرْ عَنِّي يَا عُمَرُ». فَلَمَّا أَكْثَرْتُ عَلَيْهِ قَالَ: «إِنِّي خُيِّرْتُ

---

[1] بڕوانە: ٥٧٧٨.

[2] بڕوانە: ١٢٦٩.

فَاخْتَرْتُ، لَوْ أَعْلَمُ أَنِّي إِنْ زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ فَغُفِرَ لَهُ لَزِدْتُ عَلَيْهَا». قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمْ يَمْكُثْ إِلاَّ يَسِيراً حَتَّى نَزَلَتِ الآيَتَانِ مِنْ بَرَاءَةٌ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة. قَالَ: فَعَجِبْتُ بَعْدُ مِنْ جُرْأَتِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَئِذٍ، وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ[1].

## ٨٤- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە نوێژکردن لەسەر دووڕووان، وە داوای لێخۆش بوون کردن بۆ هاوبەشدانەران

ئەم فەرموودەیە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.

١٣٦٦- عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: کاتێ عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگکرا تا نوێژی لەسەر بکات، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا (نوێژی لەسەر بکات)، من لێی چوومە پێشەوە و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ دەکەی لەسەر عەبدوڵای کوڕی ئوبەی لەکاتێکدا لەو ڕۆژەو لەو ڕۆژەدا ئاواو ئاوای وت؟ قسەکانی عەبدوڵام بۆ گێڕایەوە (کە وتبووی)، پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی: ((ئەی عومەر دوورکەوە لێم))، جا کە من زۆرم پێ وت (قسەکەم دووبارە کردەوە)، فەرمووی: ((من سەرپشك کراوم (لە نێوان کردن و نەکردنی نوێژ لەسەری)، منیش کردنم هەڵبژارد، ئەگەر بمزانیبایە لە حەفتا جار زیاتر داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم خوا لێی خۆش دەبێ، زیاترم دەکرد لە حەفتا جار))، عومەر دەڵێ: ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد، پاشان

[1] بڕوانە: ٤٦٧١.

لێ بوویەوە، جا زۆری پێ نەچوو ئەم دوو ئایەتەی سووڕەتی بەڕائەت دابەزی: (ئەی موحەممەد ﷺ بۆ هەتا هەتایە نوێژ لەسەر هیچ کام لەو دووڕووانە مەکە کە مرد، وە لەسەر گۆڕەکەی ڕامەوەستە، بێگومان ئەوانە بێباوەڕبوون بەخوا و پێغەمبەرەکەی، لە کاتێکدا هەتا مردن دەرچوو بوون لە فەرمانی خوا و سنوورشکێن بوون)، عومەر دەڵێ: جا دواتر سەرم سووڕدەما لە زات و بوێری خۆم لەو ڕۆژەدا بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە خوا و پێغەمبەرەکەی زاناتر و شارەزاترن.

## ٨٥- بابُ ثَنَاءِ النَّاسِ عَلَى المَيِّتِ

١٣٦٧- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: مَرُّوا بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَجَبَتْ». ثُمَّ مَرُّوا بِأُخْرَى فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا شَرًّا، فَقَالَ: «وَجَبَتْ». فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ ﷺ: مَا وَجَبَتْ؟ قَالَ: «هَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرًا فَوَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ، وَهَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا فَوَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ»[1].

## ٨٥- باسی باسکردنی مردوو بەچاکە لەلایەن خەڵکەوە

١٣٦٧- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺو هاوەڵان) بەلای جەنازەیەکدا تێپەڕین، بەچاکە باسیان کردو پیایاندا هەڵدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((واجب بوو))، پاشان تێپەڕین بەلای جەنازەیەکی تردا، بەخراپە باسیان کرد، فەرمووی: ((واجب بوو))، جا عومەری کوڕی خەتاب وتی: چی

---

[1] بروانە: ٢٦٤٢.

**واجب بوو؟ فەرمووی: ((ئەوەیان بەچاکە باستان کرد، بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوو، وە ئەوەی تریان بە خراپە باستان کرد، ئەویش دۆزەخی بۆ مسۆگەر بوو، ئێوە شایەتدەرانی خوان لەسەر زەویدا)).**

١٣٦٨- حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي الفُرَاتِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ قَالَ: قَدِمْتُ المَدِينَةَ وَقَدْ وَقَعَ بِهَا مَرَضٌ، فَجَلَسْتُ إِلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ، فَمَرَّتْ بِهِمْ جَنَازَةٌ فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْرًا، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَجَبَتْ. ثُمَّ مُرَّ بِأُخْرَى، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْرًا، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَجَبَتْ. ثُمَّ مُرَّ بِالثَّالِثَةِ، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا شَرًّا فَقَالَ: وَجَبَتْ. فَقَالَ أَبُو الأَسْوَدِ: فَقُلْتُ: وَمَا وَجَبَتْ يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ؟ قَالَ: قُلْتُ كَمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الجَنَّةَ». فَقُلْنَا: وَثَلاَثَةٌ؟ قَالَ: «وَثَلاَثَةٌ». فَقُلْنَا: وَاثْنَانِ؟ قَالَ: «وَاثْنَانِ». ثُمَّ لَمْ نَسْأَلْهُ عَنِ الوَاحِدِ[1].

**١٣٦٨- ئەبو ئەسوەد دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ شاری مەدینە و نەخۆشییەکی تێدا بڵاو بوو بوویەوە، منیش لەلای عومەری کوڕی خەتابدا ﷺ دانیشتم، جەنازەیەك بەلایاندا تێپەڕی بە چاکە باسی کرا، عومەر ﷺ وتی: واجب بوو، پاشان جەنازەیەکی تر بەلایاندا برا بەچاکە باسی کرا، عومەر وتی: واجب بوو، پاشان جەنازەی سێیەم بەلایاندا تێپەڕی، بەخراپە باسی خاوەنەکەی کرا، عومەر وتی: واجب بوو، ئینجا ئەبو ئەسوەد دەڵێ: وتم: ئەی گەورەی باوەڕداران یانی چی واجب بوو؟ عومەر وتی: من شتێکم وت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر مسوڵمانێك چوار کەس شایەتی چاکەی بۆ بدات، خوا دەیخاتە بەهەشتەوە))، وتمان سیانیش؟ فەرمووی: ((سیانیش))، وتمان دووانیش؟ فەرمووی: ((دووانیش))، پاشان پرسیاری یەکمان لێ نەکرد.**

---

[1] بڕوانە: ٢٦٤٣.

## ٨٦- بابُ مَا جَاءَ فِي عَذَابِ القَبْرِ

وَقَوْلُهُ ﷻ: ﴿ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ ﴿٩٣﴾ ﴾ الأنعام. والهُون هوَ الهَوَانُ. وَالْهَوْنُ: الرِّفْقُ، وَقَوْلُهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ ﴿١٠١﴾ ﴾ التوبة. وَقَوْلُهُ ﴿ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾ غافر.

## ٨٦- باسی ئەوەی دەربارەی سزای گۆڕ هاتووە

**هەروەها ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (كاتێ ستەمكاران وان لە نارەحەتی و سەختی سەرەمەرگدا، وە فریشتەكان دەستیان بۆ درێژ دەكەن (و پێیان دەڵێن:) ڕۆحەكانتان دەربێنن (لە لاشەتان)[1]، ئەمڕۆ پاداشتی ڕیسواكەر دەدرێنەوە)، وشەی (الهُون) واتە: زەلیلی و ڕیسوایی، بەلاّم وشەی: (الْهَوْنُ) واتە: لەسەرخۆیی و هێواشی، وە ئەم فەرمایشتەی خوا گەورە (بێگومان ئێمە دوو جار[2] سزایان دەدەین، پاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆ نێو سزای سەخت و گەورە (كە دۆزەخە)، هەروەها ئەم فەرمایشتەی خوا: (سزای سەخت و خراپ دووچاری دار و دەستەكەی فیرعەون بوو، كە ئاگرێكە بەیانیان و ئێواران دەبرێنە دیاری ئاگری دۆزەخ[3]، ڕۆژێكیش قیامەت هەڵدەسێت دارودەستەی فیرعەون بخەنە سەختترین سزاوە).**

---

[1] یان خۆتان دەرباز بكەن لەم سەختی دۆزەخە، وەک لەهەندێ لە تەفسیرەكاندا هاتووە.

[2] بە ئابڕووچوونیان لە دونیادا، وە سزادانیان لە گۆڕەكانیاندا، یان لێدانی فریشتەكان لە ڕووخسارو پاشیان لە كاتی گیان كێشانیاندا.

[3] لە بەرزەخدا دوای مردنیان و پێش بەرپابوونی قیامەت.

١٣٦٩- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أُقْعِدَ المُؤْمِنُ فِي قَبْرِهِ أُتِيَ، ثُمَّ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم.

١٣٦٩م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ بِهَذَا وَزَادَ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم، نَزَلَتْ فِي عَذَابِ القَبْرِ[1].

**١٣٦٩- بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کاتێ باوەڕدار لە گۆڕەکەیدا دادەنیشێنرێ، فریشتە (ی گۆڕ) دێتە لای، پاشان شایەتی دەدات کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدات کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئەوە مانای ئەم ئایەتەیە: (ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، خوا دامەزراویان دەکات بە وتنی وتەی بەڕێ و بەجێ (کە شایەتوومانە) )).**

**١٣٦٩- موحەممەدی کوڕی بەشار دەڵێ: غوندەر بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعبە ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە، ئەمەی لێ زیاد کرد، ئەم ئایەتە: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴿٢٧﴾ ﴾، دەربارەی سزای گۆڕ دابەزیوە.**

١٣٧٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ صَالِحٍ حَدَّثَنِي نَافِعٌ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ أَخْبَرَهُ قَالَ: اطَّلَعَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى أَهْلِ القَلِيبِ فَقَالَ:

---

[1] بڕوانە: ٤٦٩٩.

«وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا؟». فَقِيلَ لَهُ: تَدْعُو أَمْوَاتًا؟! فَقَالَ: «مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ مِنْهُمْ وَلَكِنْ لاَ يُجِيبُونَ»[1].

**١٣٧٠- نافيع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە و وتی: پێغەمبەر ﷺ سەیری کوژراوەکانی هاوبەشدانەرانی کرد کە لەبیرێکدا بوون (لەبەدردا)، فەرمووی: ((ئەوەی خوا بەڵێنی پێدان دەستتان کەوت و ڕاست بوو؟)) پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ مردووان بانگ دەکەیت؟ فەرمووی: ((ئێوە لەوان باشتر نابیستن، بەڵام ئەوان وەڵام نادەنەوە (توانای وەڵامدانەومیان نییە) )).**

١٣٧١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ،عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: إِنَّمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّهُمْ لَيَعْلَمُونَ الآنَ أَنَّ مَا كُنْتُ أَقُولُ حَقٌّ، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٨٠﴾ ﴾ النمل[2].

**١٣٧١- عائیشە ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەر ﷺ (لەسەر کوژراوە کافرەکانی بەدر) فەرمووی: ((بەڕاستی ئەوانە ئێستا دەزانن ئەوەی من دەیڵێم هەق و ڕاستە))، بێگومان خوای بەرزو بڵند فەرموویەتی: (بێگومان تۆ ئەی موحەممەد ﷺ ناتوانی مردووان بدوێنی).**

١٣٧٢- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، سَمِعْتُ الأَشْعَثَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ يَهُودِيَّةً دَخَلَتْ عَلَيْهَا، فَذَكَرَتْ عَذَابَ القَبْرِ، فَقَالَتْ لَهَا: أَعَاذَكِ اللَّهُ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ. فَسَأَلَتْ عَائِشَةُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ عَذَابِ القَبْرِ، فَقَالَ: «نَعَمْ عَذَابُ القَبْرِ». قَالَتْ

---

[1] بروانە: ٣٩٨٠.

[2] بروانە: ٣٩٧٨، ٣٩٧٩، ٣٩٨١.

عَائِشَةُ ﵂: فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعْدُ صَلَّى صَلاَةً إِلاَّ تَعَوَّذَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ. زَادَ غُنْدَرٌ: «عَذَابُ القَبْرِ حَقٌّ»[1].

**١٣٧٢- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: کە ئافرەتێکی جوولەکە هات بۆ لای و باسی سزای گۆڕی کرد، بە عائیشەی وت: خوا لە سزای گۆڕ بتپارێزێ، عائیشەش پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ دەربارەی سزای نێو گۆڕ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ سزای نێوگۆڕ هەیە))، عائیشە ﵂ دەڵێ: جا دوای ئەوە ئیتر پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیوە هیچ نوێژێکی کردبێ، ئیللا پەنای گرتوە بە خوا لە سزای گۆڕ. غوندەر ئەم زیادەی هێناوە: ((سزای نێوگۆڕ هەق و ڕاستە)).**

**١٣٧٣-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَمِعَ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ ﵄ تَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَطِيبًا فَذَكَرَ فِتْنَةَ القَبْرِ الَّتِي يَفْتَتِنُ فِيهَا المَرْءُ، فَلَمَّا ذَكَرَ ذَلِكَ ضَجَّ المُسْلِمُونَ ضَجَّةً[2].

**١٣٧٣- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایە سەرپێ و وتاری دا، ئینجا باسی تاقیکردنەوەی نێوگۆڕی کرد کە تووشی مرۆڤ دێت، جا کاتێ ئەوەی باسکرد، مسوڵمانەکان هاوارو دەنگە دەنگێکی گەورەیان لێهات.**

**١٣٧٤-** حَدَّثَنَا عَيَّاشُ بْنُ الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ أَنَّهُ حَدَّثَهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ العَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ، وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ، أَتَاهُ مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانِهِ فَيَقُولاَنِ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هذا الرَّجُلِ لِمُحَمَّدٍ ﷺ؟ فَأَمَّا المُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ. فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى

---

[1] بروانە: ١٠٤٩.

[2] بروانە: ٨٦.

مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ، قَدْ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الجَنَّةِ، فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا». قَالَ قَتَادَةُ: وَذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُفْسَحُ فِي قَبْرِهِ. ثُمَّ رَجَعَ إِلَى حَدِيثِ أَنَسٍ قَالَ: «وَأَمَّا المُنَافِقُ وَالكَافِرُ فَيُقَالُ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ فَيَقُولُ: لاَ أَدْرِي، كُنْتُ أَقُولُ مَا يَقُولُ النَّاسُ. فَيُقَالُ: لاَ دَرَيْتَ وَلاَ تَلَيْتَ. وَيُضْرَبُ بِمَطَارِقَ مِنْ حَدِيدٍ ضَرْبَةً، فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا مَنْ يَلِيهِ، غَيْرَ الثَّقَلَيْنِ»[1].

**١٣٧٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کاتێ مرۆڤ خرایە گۆڕەکەیەوە، ئەو کەسانەی لەگەڵیدا بوون پشتیان لێ هەڵکردو ڕۆیشتن، (مردووەکە ئاگاداریانە) هەتا گوێی لە دەنگ و خشەی پێڵاوەکانیانە، دوو فریشتە دێن بۆ لای و هەڵیدەسێننەوەو دایدەنیشێنن، پێی دەڵێن: تۆ دەربارەی ئەو پیاوە کە موحەممەدە لە دونیادا چیت دەوت؟ ئەویش دەڵێ: شایەتی دەدەم کە بەندەو پێغەمبەری خوایە، جا پێی دەوترێ: سەیری جێگاکەت بکە لە دۆزەخدا، خوا بۆی گۆڕیت بە جێگایەك لە بەهەشتدا، جا هەردوو جێگاکە دەبینێ پێکەوە))، قەتادە (یەکێك لە گێڕەرەوەکانی فەرموودەکەیە) دەڵێ: بۆمان باسکراوە کە گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ. پاشان گەڕایەوە بۆ فەرموودەکەی ئەنەس وتی: ((بەڵام دووڕوو یان کافر پێی دەوترێ: تۆ چیت دەوت دەربارەی ئەو پیاوە ئەویش دەڵێ: نازانم خەڵکی چیان دەوت، منیش هەر ئەوەم دەوت، جا پێی دەوترێ نەتزانیوە و نەتوتوە، پاشان بە گورزێکی ئاسنین یەك گورزی لێ دەدرێ، ئەوسا هاوارێکی ئەوەندە گەورە دەکات، هەرچی بەدەوریدایە دەیبیستێ جگە لە مرۆڤ و جنۆکە)).**

[1] بڕوانە: ١٣٣٨.

## ٨٧- بابُ التَّعَوُّذِ مِنْ عَذابِ القبرْ

**١٣٧٥-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَوْنُ بْنُ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ# قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ وَقَدْ وَجَبَتِ الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتًا فَقَالَ: «يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا».
وَقَالَ النَّضْرُ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَوْنٌ، سَمِعْتُ أَبِي، سَمِعْتُ البَرَاءَ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ٨٧- باسی پەناگرتن بەخوا لە سزای نێوگۆڕ

**١٣٧٥- ئەبو ئەیووب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ دەرچوو لەکاتێکدا خۆرئاوابوو بوو، جا گوێی لە دەنگێك بوو، بۆیە فەرمووی: ((ئەوە جوولەکەن لە گۆڕەکانیاندا سزا دەدرێن)).**
**(بەم ڕێگەیەش فەرموودەکە گێڕدراوەتەوە) نەزر دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕاینەوەو وتی: عەون بۆی گێڕاینەوەو، وتی: لە باوکم بیست وتی: لە بەڕائم بیست، ئەویش لە ئەبو ئەیووبی بیست: ﷺ کە لە پێغەمبەرەوە گێڕایەوە.**

**١٣٧٦-** حَدَّثَنَا مُعَلًّى، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَتْنِي ابْنَةُ خَالِدِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ العَاصِ أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ[1].

**١٣٧٦- کچی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە پەنای دەگرت بەخوا لە سزای نێوگۆڕ.**

**١٣٧٧-** حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ».

---

[1] بڕوانە: ٦٣٦٤.

**١٣٧٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: هەمیشە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم نزایەی دەکرد: ((خوایە من پەنات پێ دەگرم لە سزای گۆڕ، وە لە سزای دۆزەخ، وە لە فیتنەو ئاژاوەی ژیان و مردن، هەروەها لە ئاژاوەی دەججالە کوێرەکە)).**

## ٨٨- بابُ عَذَابِ القَبْرِ مِنَ الغِيبَةِ وَالبَوْلِ

١٣٧٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُسٍ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ :ﷺ مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى قَبْرَيْنِ فَقَالَ: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ مِنْ كَبِيرٍ -ثُمَّ قَالَ:- بَلَى أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ يَسْعَى بِالنَّمِيمَةِ، وَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ». قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ عُودًا رَطْبًا فَكَسَرَهُ بِاثْنَتَيْنِ ثُمَّ غَرَزَ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى قَبْرٍ، ثُمَّ قَالَ: «لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا»[1].

## ٨٨- باسی سزای گۆڕ بە هۆی غەیبەت کردن و میزەوە

**١٣٧٨- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای دوو گۆڕدا فەرمووی: ((بێگومان ئەم دووانە سزا دەدرێن، لەسەر شتێکی گەورەش سزا نادرێن))، پاشان فەرمووی: ((بەڵێ لەسەر شتێکی گەورەیە، جا یەکێکیان لە نێوان خەڵکدا دوو زمانی دەکرد، ئەوەی تریان خۆی نەدەپاراست لە پرژی میزەکەی))، عەبدوڵا وتی: پاشان پەلێکی دارخورمای تەڕی هەڵگرت (و هێنای)، شکاندی وکردی بە دوو لەتەوە، پاشان لەسەر هەر گۆڕێکیان لەتێکیانی ناشت، پاشان فەرمووی: ((بەڵکو لە سزاکەیان سووك بکەن تا ئەو کاتەی وشك دەبن))**

[1] بڕوانە: ٢١٦.

## ٨٩- بابُ المَيِّتِ يُعْرَضُ عَلَيْهِ بِالغَدَاةِ وَالعَشِيِّ

١٣٧٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالغَدَاةِ وَالعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَيُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ»[1].

## ٨٩- باسی مردوو لە بەیانیان و ئێواران (جێگاکەی) نیشان دەدرێ

**١٣٧٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان ئەگەر کەسێك لەئێوە مرد، شوێنەکەی لەبەیانیان و ئێواران نیشان دەدرێت، جا ئەگەر بەهەشتی بێت، ئەوە جێگاکەی لەگەڵ بەهەشتییەکاندا نیشان دەدرێ، ئەگەر لە دۆزەخیانیش بێ، ئەوە لەگەڵ دۆزەخییاندا جێگاکەی نیشان دەدرێ، پێی دەوترێ: ئا ئەوە شوێنی تۆیە هەتا خوا لە ڕۆژی دواییدا زیندووت دەکاتەوە)).**

## ٩٠- بابُ كَلَامِ المَيِّتِ عَلَى الجَنَازَةِ

١٣٨٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَتِ الجَنَازَةُ فَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَالَتْ: قَدِّمُونِي قَدِّمُونِي. وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ صَالِحَةٍ قَالَتْ: يَا وَيْلَهَا أَيْنَ يَذْهَبُونَ بِهَا؟ يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إِلاَّ الإِنْسَانَ، وَلَوْ سَمِعَهَا الإِنْسَانُ لَصَعِقَ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٣٢٤٠، ٦٥١٥.

[2] بڕوانە: ١٣١٤.

## ٩٠- باسی قسەکردنی مردوو بەسەر دارەمەیتەکەیەوە

**١٣٨٠- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کاتێ جەنازە دانراو پیاوان خستیانە سەر شانیان، جا ئەگەر چاك بێت دەڵێ: زوو بمبەن، زوو بمبەن، خۆ ئەگەر خراپ بێت دەڵێ: ئای هاوار بۆی بۆ کوێی دەبەن؟ هەموو شتێك دەنگی دەبیستێ جگە لە مرۆڤ، خۆ ئەگەر مرۆڤ دەنگی ببیستایە، دەستبەجێ (لە ترسناکی دەنگەکە) دەمرد)).**

## ٩١- بَابُ مَا قِيلَ فِي أَوْلَادِ المُسْلِمِينَ

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «مَنْ مَاتَ لَهُ ثَلاَثَةٌ مِنَ الوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الحِنْثَ كَانَ لَهُ حِجَابًا مِنَ النَّارِ، أَوْ دَخَلَ الجَنَّةَ».

١٣٨١- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنَ النَّاسِ مُسْلِمٌ يَمُوتُ لَهُ ثَلاَثَةٌ مِنَ الوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الحِنْثَ، إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ»[1].

## ٩١- باسی ئەوەی دەربارەی منداڵی مسوڵمانان وتراوە

**ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس سێ منداڵی نابالغی بمرێ، ئەوە دەبنە پەرژین بۆی لە چوونە دۆزەخ، یان دەچێتە بەهەشتەوە)).**

**١٣٨١- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ کەس نییە لە مسوڵماناندا کە سێ منداڵی نابالغی بمرێت، ئیللا خوا دەیخاتە بەهەشتەوە بەهۆی بەهرەو بەزەیی هاتنەوەی خۆی پێیاندا)).**

---

[1] بڕوانە: ١٢٤٨.

١٣٨٢- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ أَنَّهُ سَمِعَ البَرَاءَ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ إِبْرَاهِيمُ ﷺ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لَهُ مُرْضِعًا فِي الجَنَّةِ»[1].

**١٣٨٢- بەرا ﷺ دەڵێ: كاتێ ئیبراهیم (ی كوڕی پێغەمبەر ﷺ) مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئیبراهیم لە بەهەشتدا دایەنێكی هەیە (شیری دەداتێ) )).**

## ٩٢- بابُ مَا قِيلَ فِي أَوْلَادِ المُشْرِكِينَ

١٣٨٣- حَدَّثَنَا حِبَّانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ# قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَوْلَادِ المُشْرِكِينَ فَقَالَ: «اللَّهُ إِذْ خَلَقَهُمْ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»[2].

## ٩٢- باسی ئەوەی دەربارەی منداڵی هاوبەشدانەران وتراوە

**١٣٨٣- #عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا كرا ﷺ دەربارەی منداڵی بتپەرستان؟ ئەویش فەرمووی: ((خوا كە دروستی كردن، چاك دەزانێ (ئەگەر گەورە بوونایە) چییان دەكرد)).**

١٣٨٤- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ اللَّيْثِيُّ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ ذَرَارِيِّ المُشْرِكِينَ، فَقَالَ: «اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»[3].

**١٣٨٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر كرا ﷺ دەربارەی منداڵی بتپەرستان؟ ئەویش فەرمووی: ((خوا چاك دەزانێ (ئەگەر تەمەنیان بكردایە) چییان دەكرد)).**

---

[1] بڕوانە: ٣٢٥٥، ٦١٩٥.

[2] بڕوانە: ٦٥٩٧.

[3] بڕوانە: ٦٥٩٨، ٦٦٠٠.

**١٣٨٥**- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَثَلِ البَهِيمَةِ تُنْتَجُ البَهِيمَةَ، هَلْ تَرَى فِيهَا جَدْعَاءَ؟»[1].

**١٣٨٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەموو لە دایکبوویەك (منداڵێك) لەسەر سروشتی پاکی ئیسلام لە دایك دەبێ، جا دایك و باوکی دەیکەن بە جوولەکە، یان گاور، یان ئاگرپەرست، هەروەك چۆن بەچکەی ئاژەڵێك بە تەواوی و بێ کەم و کوڕی لە دایك دەبێ، ئایا دەبینی بە چکەیەك گوێی بڕابێ؟!))**

## ٩٣- بابٌ

**١٣٨٦**- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى صَلاَةً أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: «مَنْ رَأَى مِنْكُمُ اللَّيْلَةَ رُؤْيَا؟». قَالَ: فَإِنْ رَأَى أَحَدٌ قَصَّهَا، فَيَقُولُ مَا شَاءَ اللَّهُ، فَسَأَلَنَا يَوْمًا، فَقَالَ: «هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمْ رُؤْيَا؟». قُلْنَا: لاَ. قَالَ: «لَكِنِّي رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ رَجُلَيْنِ أَتَيَانِي فَأَخَذَا بِيَدِي، فَأَخْرَجَانِي إِلَى الأَرْضِ المُقَدَّسَةِ، فَإِذَا رَجُلٌ جَالِسٌ، وَرَجُلٌ قَائِمٌ بِيَدِهِ كَلُّوبٌ مِنْ حَدِيدٍ -قَالَ بَعْضُ أَصْحَابِنَا عَنْ مُوسَى: إِنَّهُ- يُدْخِلُ ذَلِكَ الكَلُّوبَ فِي شِدْقِهِ، حَتَّى يَبْلُغَ قَفَاهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ بِشِدْقِهِ الآخَرِ مِثْلَ ذَلِكَ، وَيَلْتَئِمُ شِدْقُهُ هَذَا، فَيَعُودُ فَيَصْنَعُ مِثْلَهُ. قُلْتُ مَا هَذَا؟ قَالاَ: انْطَلِقْ. فَانْطَلَقْنَا حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُضْطَجِعٍ عَلَى قَفَاهُ، وَرَجُلٌ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِهِ بِفِهْرٍ -أَوْ صَخْرَةٍ- فَيَشْدَخُ بِهِ رَأْسَهُ، فَإِذَا ضَرَبَهُ تَدَهْدَهَ الحَجَرُ، فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ لِيَأْخُذَهُ، فَلاَ يَرْجِعُ إِلَى هَذَا حَتَّى يَلْتَئِمَ رَأْسُهُ، وَعَادَ رَأْسُهُ كَمَا هُوَ، فَعَادَ إِلَيْهِ فَضَرَبَهُ، قُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالاَ: انْطَلِقْ. فَانْطَلَقْنَا إِلَى ثَقْبٍ مِثْلِ التَّنُّورِ، أَعْلاَهُ ضَيِّقٌ وَأَسْفَلُهُ وَاسِعٌ، يَتَوَقَّدُ تَحْتَهُ نَارًا، فَإِذَا اقْتَرَبَ ارْتَفَعُوا حَتَّى

---

[1] بڕوانە: ١٣٥٨.

كَادَ أَنْ يَخْرُجُوا، فَإِذَا خَمَدَتْ رَجَعُوا فِيهَا، وَفِيهَا رِجَالٌ وَنِسَاءٌ عُرَاةٌ. فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالَا: انْطَلِقْ. فَانْطَلَقْنَا حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى نَهَرٍ مِنْ دَمٍ، فِيهِ رَجُلٌ قَائِمٌ عَلَى وَسَطِ النَّهَرِ قال يزيد ووهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ: وَعَلَى شَطِّ النهر رَجُلٌ بَيْنَ يَدَيْهِ حِجَارَةٌ، فَأَقْبَلَ الرَّجُلُ الذِي فِي النَّهَرِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ رَمَى الرَّجُلُ بِحَجَرٍ فِي فِيهِ، فَرَدَّهُ حَيْثُ كَانَ، فَجَعَلَ كُلَّمَا جَاءَ لِيَخْرُجَ رَمَى فِي فِيهِ بِحَجَرٍ، فَيَرْجِعُ كَمَا كَانَ. فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ قَال: انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْنَا حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى رَوْضَةٍ خَضْرَاءَ، فِيهَا شَجَرَةٌ عَظِيمَةٌ، وَفِي أَصْلِهَا شَيْخٌ وَصِبْيَانٌ، وَإِذَا رَجُلٌ قَرِيبٌ مِنَ الشَّجَرَةِ بَيْنَ يَدَيْهِ نَارٌ يُوقِدُهَا، فَصَعِدَا بِي فِي الشَّجَرَةِ، وَأَدْخَلَانِي دَارًا لَمْ أَرَ قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهَا، فِيهَا رِجَالٌ شُيُوخٌ وَشَبَابٌ،وَنِسَاءٌ وَصِبْيَانٌ، ثُمَّ أَخْرَجَانِي مِنْهَا، فَصَعِدَا بِي الشَّجَرَةَ، فَأَدْخَلَانِي دَارًا هِيَ أَحْسَنُ وَأَفْضَلُ، فِيهَا شُيُوخٌ وَشَبَابٌ. قُلْتُ: طَوَّفْتُمَانِي اللَّيْلَةَ، فَأَخْبِرَانِي عَمَّا رَأَيْتُ. قَالَا: نَعَمْ، أَمَّا الذِي رَأَيْتَهُ يُشَقُّ شِدْقُهُ فَكَذَّابٌ يُحَدِّثُ بِالكَذْبَةِ، فَتُحْمَلُ عَنْهُ حَتَّى تَبْلُغَ الآفَاقَ، فَيُصْنَعُ بِهِ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، وَالذِي رَأَيْتَهُ يُشْدَخُ رَأْسُهُ فَرَجُلٌ عَلَّمَهُ اللَّهُ القُرْآنَ، فَنَامَ عَنْهُ بِاللَّيْلِ، وَلَمْ يَعْمَلْ فِيهِ بِالنَّهَارِ، يُفْعَلُ بِهِ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ. وَالذِي رَأَيْتَهُ فِي الثَّقْبِ فَهُمُ الزُّنَاةُ. وَالذِي رَأَيْتَهُ فِي النَّهَرِ آكِلُو الرِّبَا، وَالشَّيْخُ فِي أَصْلِ الشَّجَرَةِ إِبْرَاهِيمُ ﷺ وَالصِّبْيَانُ حَوْلَهُ فَأَوْلَادُ النَّاسِ، وَالذِي يُوقِدُ النَّارَ مَالِكٌ خَازِنُ النَّارِ. وَالدَّارُ الأُولَى التِي دَخَلْتَ دَارُ عَامَّةِ المُؤْمِنِينَ، وَأَمَّا هَذِهِ الدَّارُ فَدَارُ الشُّهَدَاءِ، وَأَنَا جِبْرِيلُ، وَهَذَا مِيكَائِيلُ، فَارْفَعْ رَأْسَكَ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا فَوْقِي مِثْلُ السَّحَابِ. قَالَا: ذَاكَ مَنْزِلُكَ. قُلْتُ دَعَانِي أَدْخُلْ مَنْزِلِي. قَالَا: إِنَّهُ بَقِيَ لَكَ عُمُرٌ لَمْ تَسْتَكْمِلْهُ، فَلَوِ اسْتَكْمَلْتَ أَتَيْتَ مَنْزِلَكَ»[1].

## ٩٣- باسێک

**١٣٨٦- سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: زۆر جار کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی (بەیانی) دەکرد، ڕووی تێدەکردین و دەیفەرموو: ((ئایا ئەمشەو کەستان خەوی**

---

[1] بڕوانە: ٨٤٥.

بینیوە؟))، دەڵێ: جا ئەگەر کەسێك بینیبای دەیگێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: (مَا شَاءَ اللَّهُ)، جا ڕۆژێکیان پرسیاری کرد لێمان و فەرمووی: ((ئایا کەستان خەوی بینیوە؟)) وتمان: نەخێر، فەرمووی: ((بەڵام من ئەمشەو لەخەومدا دوو پیاوم بینی، هاتن بۆ لام، دەستیان گرتم و بردمیان بۆ خاکی پیرۆز[1]، جا پیاوێکم بینی دانیشتبوو، پیاوێکیش وەستابوو چەند قولاپێکی ئاسنینی بەدەستەوە بوو))، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) هەندێ لە هاوڕێکانمان لە مووساوە بەم شێوە گێڕاویانەتەوە: ((ئەو قولاپانە دەخرێتە نێو ڕوومەتی تا لە پشت سەریەوە دەردەچێ، ئینجا ڕوومەتی لایەکەی تری ئاوا لێ دەکرد، ئینجا ئەو لا ڕوومەتەی چاك دەبوویەوە یەکی دەگرتەوە، جا دووبارە وەك جاری پێشووی لێدەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منیش وتم: ئەمە چییە؟ هەردووکیان وتیان: بڕۆ، جا ڕۆیشتین، هەتا ڕۆیشتینە لای پیاوێك بەپشتدا ڕاکشابوو، پیاوێکیش خڕە بەردێکی گەورەی پێبوو، یان تاوێرە بەردێکی پێبوو، لەسەر سەری کابرا (ڕاکشاوەکە) ڕاوەستابوو، دەیکێشا بە تەوقەسەریدا، جاکە پیایدا دەکێشا بەردەکە خلۆر دەبوویەوە، پیاوەکەش دەڕۆیشت بەردەکەی دەهێنایەوە، جا تا دەهاتەوە بۆ لای کابرا (ڕاکشاوەکە)، سەری چاك دەبوویەوەو یەکی دەگرتەوەو وەك خۆی لێ دەهاتەوە، جا ئەویش دەهاتەوەو دووبارە بەردەکەی پێدا دەکێشایەوە، وتم: ئەمە کێ یە؟ هەردووکیان وتیان: تۆ بڕۆ، جا ڕۆیشتین تا گەشتینە لای چاڵێك وەك تەنوور وابوو، دەمەکەی بچووك بوو، لەبنەوە پان بوو، لە ژێریەوە گڵپەی ئاگر بوو، جا کە نزیك دەبوویەوە خەڵکەکە بەرز دەبوونەوە (کە لەنێویدا بوون)، هەتا نزیك بوو بێنە دەرەوە، کە ئاگر و گڕەکە دەنیشتەوە دەگەڕانەوە بۆ بنی چاڵەکە، پیاوان و ژنانی ڕووتی

---

[1] واتە: (بَيْتُ الْمَقْدِسِ)# کە لەفەڵەستینە.

تیابوو، منیش وتم: ئەمانە کێن؟ هەردووکیان وتیان: تۆ بڕۆ، جا ڕۆیشتین هەتا چووینە لای ڕووبارێکی خوێن، پیاوێك لەنێوەڕاستی ڕووبارەکەدا وەستابوو - یەزیدو وەهبی کوڕی جەریر لە جەریری کوڕی حازیمەوە گێڕاویانەتەوە، کە جەریر بەم شێوە گێڕاویەتیەوە-: وە لە قەراغی ڕووبارەکەدا پیاوێك وەستاوەو کۆمەڵێك بەردی لەبەردەمدایە، جا ئەو پیاوەی لەنێو ڕووبارەکەدا بوو دەهات (بۆ قەراغەکە)، کە دەیویست بێتە دەرەوە، پیاوەکەی کە لە قەراغەکەدا وەستابوو بەردێکی دەکێشا بەدەمیداو دەیگێڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، جا هەر کە دەیویست بێتە دەرەوە، بەردێکی دەدا بەدەمیدا، ئەویش دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، منیش وتم: ئەمە چییە؟ وتیان: بڕۆ، جا ڕۆیشتین تا گەیشتینە باخێکی سەوز درەختێکی گەورەی تێدابوو، لە ژێریدا پیاوێکی پیرو کۆمەڵێ منداڵی تێدابوو، پیاوێکیش لە نزیك درەختەکەوە ئاگرێکی لەبەردەمدا بوو هەڵیدەگیرساند، جا هەردووکیان بەدرەختەکەدا سەریان دەخستم بردیانمە نێو خانوویەکەوە، خانووی وا جوانم هەرگیز نەدیبوو، کۆمەڵێ پیاوی پیرو گەنج و ئافرەت و منداڵی تێدابوو، پاشان لەو خانووە هێنامیانە دەرەوە، بەدرەختەکەدا سەریان خستم و بردمیانە خانوویەکەوە، لەوەی یەکەم جوانترو چاکتر بوو، کۆمەڵێ پیاوی پیر و گەنجی تێدابوو، وتم پێیان: ئەم شەو هەردووکتان منتان گەڕاند، دەی هەواڵی ئەو شتانەم پێ بدەن کە بینیم، هەردووکیان وتیان: بەڵێ باشە، ئەوەی کە بینیت لا ڕوومەتی دەقڵیشێنرا، ئەوە درۆزن بوو، قسەیەکی درۆی دەکرد، خەڵکیش لێیەوە وەریان دەگرت، هەتا بڵاو دەبوویەوە بەهەموو لایەکدا، جا هەتا ڕۆژی دوایی هەر ئاوای لێ دەکرێ، ئەوەشیان کە بینیت بەردیان دەکێشا بەسەریدا، ئەوە پیاوێکە خوا شارەزای قورئانی پێداوە، شەو دەخەوێت دەوری ناکاتەوە و شەونوێژی پێ ناکات، بەڕۆژیشدا کاری پێ ناکات تا ڕۆژی دوایی هەر ئاوای لێ دەکرێ، ئەوانەش لە کونەکەدا بینیت، ئەوە پیاو و

**ئافرەتی زیناکارن، ئەوەش لە ڕووبارە خوێنەکەدا بینیت، ئەوە سوو خۆرەکانن، ئەو پیاوە پیرەی لەژێر درەختە گەورەکەدا بوو ئیبراهیم بوو ﷺ، منداڵەکانیش کە لەگەڵیدابوون، ئەوە منداڵی خەڵکن، ئەو پیاوەش ئاگرەکەی هەڵدەگیرساند، ئەوە فریشتە مالیکە کە دەرگاوانی دۆزەخە، خانووەکەی یەکەم کە چوویتە نێوی ئەوە ماڵ و شوێنی ئیماندارانە بەگشتی، بەڵام خانووەکەی تریان ئەوە ماڵ و شوێنی شەهیدەکانە، وە من جیبریلم ئەمەش میکائیلە، جا سەرت بەرزکەرەوە، منیش سەرم بەرزکردەوە، بینیم لەسەرمەوە وەك هەور وایە، وتیان: ئەوەش شوێنی تۆیە، وتم: لێم گەڕێن با بڕۆمە ماڵ و شوێنەکەمەوە، وتیان: بەشێك لە تەمەنت ماوە تەواوت نەکردووە، هەرکات تەواوت کرد، دێیت بۆ ماڵ و جێگاکەت)).**

## ٩٤- بابُ مَوْتِ يَوْمِ الإِثْنَيْنِ

١٣٨٧- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أَبِي بَكْرٍ ﵁ فَقَالَ: فِي كَمْ كَفَّنْتُمُ النَّبِيَّ ﷺ؟ قَالَتْ: فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ. وَقَالَ لَهَا: فِي أَيِّ يَوْمٍ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: يَوْمَ الاِثْنَيْنِ. قَالَ: فَأَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟ قَالَتْ: يَوْمُ الاِثْنَيْنِ. قَالَ: أَرْجُو فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ اللَّيْلِ. فَنَظَرَ إِلَى ثَوْبٍ عَلَيْهِ كَانَ يُمَرَّضُ فِيهِ، بِهِ رَدْعٌ مِنْ زَعْفَرَانٍ فَقَالَ: اغْسِلُوا ثَوْبِي هَذَا، وَزِيدُوا عَلَيْهِ ثَوْبَيْنِ فَكَفِّنُونِي فِيهَا. قُلْتُ: إِنَّ هَذَا خَلَقٌ! قَالَ: إِنَّ الحَيَّ أَحَقُّ بِالجَدِيدِ مِنَ المَيِّتِ، إِنَّمَا هُوَ لِلْمُهْلَةِ. فَلَمْ يُتَوَفَّ حَتَّى أَمْسَى مِنْ لَيْلَةِ الثُّلاَثَاءِ وَدُفِنَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ[1].

[1] بروانە: ١٢٦٤.

## ٩٤- باسی مردن لە ڕۆژی دووشەممەدا

١٣٨٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای ئەبو بەکر ﵁ وتی: لەچەند بەرگدا پێغەمبەرتان ﷺ کفن کرد؟ عائیشەش وتی: لە سێ بەرگی سپی لۆکەدا، کراس و مێزەرەیان تێدا نەبوو، وە ئەبو بەکر بە عائیشەی وت: لە چ ڕۆژێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد؟ عائیشەش وتی: لە ڕۆژی دووشەممەدا، ئەبو بەکر وتی: ئەم ڕۆژە (ئێستا) چ ڕۆژێکە؟ عائیشە وتی: ڕۆژی دوو شەممەیە، ئەبو بەکریش وتی: ئومێد دەکەم منیش لەم ساتە تا شەو بمرم، ئینجا سەیری ئەو پۆشاکەی کرد کە لەبەریدایە، کە چارەسەر دەکرا پێوەی، هەندێ زەعفەرانی تێوەدرا بوو، بۆیە وتی: ئەم کراسەم بۆ بشۆن، دوو کراسی تریشی بۆ زیاد بکەن، هەر سیانیان بکەن بە کفن بۆم، (عائیشە دەڵێ:) وتم: ئەمە قوماشێکی کۆنە! وتی: بێگومان زیندوو شیاوترە بە پۆشاکی تازە لە مردوو، بێگومان کفن هەر بۆ کێمە، جا وەفاتی نەکرد تا شەوی سێ شەممە، پێش ئەوەی ڕۆژ ببێتەوە نێژرا و ئەسپەردە کرا.

## ٩٥- بَابُ مَوْتِ الفَجْأَةِ بَغْتَةً

١٣٨٨- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا، وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، فَهَلْ لَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ»[1].

## ٩٥- باسی مردنی کتوپڕ (لەناکاو)

١٣٨٨- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ وت: لەڕاستیدا دایکم لەپڕ گیانی دەرچوو، گومانم وابوو ئەگەر قسەی بکردایە ماڵ و سامانی

---

[1] بڕوانە: ٢٧٦٠.

دەکرد بە خێر، جا ئایا پاداشتی دەگات ئەگەر من سامانی بۆ بکەم بەخێر؟ فەرمووی: ((بەڵێ)).

## ٩٦- بابُ مَا جَاءَ فِي قَبْرِ النَّبِيِّ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما

﴿ فَأَقْبَرَهُۥ (٢١) ﴾ عبس، أَقْبَرْتُ الرَّجُلَ: إِذَا جَعَلْتَ لَهُ قَبْرًا، وَقَبَرْتُهُ دَفَنْتُهُ. ﴿ كِفَاتًا (٢٥) ﴾ المرسلات، يَكُونُونَ فِيهَا أَحْيَاءً، وَيُدْفَنُونَ فِيهَا أَمْوَاتًا.

١٣٨٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ هِشَامٍ، وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا أَبُو مَرْوَانَ يَحْيَى بْنُ أَبِي زَكَرِيَّاءَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيَتَعَذَّرُ فِي مَرَضِهِ «أَيْنَ أَنَا اليَوْمَ؟ أَيْنَ أَنَا غَدًا؟» اسْتِبْطَاءً لِيَوْمِ عَائِشَةَ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمِي قَبَضَهُ اللَّهُ بَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي، وَدُفِنَ فِي بَيْتِي[1].

## ٩٦- باسی ئەوەی دەربارەی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکرو عومەر هاتووە رضي الله عنهما

وشەی: ﴿ فَأَقْبَرَهُۥ ﴾ دەوترێ: (أَقْبَرْتُ الرَّجُلَ): ئەگەر گۆڕێکی بۆ هەڵکەنیت و بینێژیت، وشەی: (قَبَرْتُهُ) واتە: ناشتم، وشەی: ﴿ كِفَاتًا ﴾ واتە: بەزیندوویی لە زەویدا دەبن، بە مردوویش تێیدا دەنێژرێن.

١٣٨٩- عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشیەکەیدا بیانووی دەهێنایەوە و دەیفەرموو: ((ئەمڕۆ من لە کوێم؟ سبەینێ لە کوێم؟ (مەبەستی ئەوەیە لای کام خێزانییەتی) ))، بەلایەوە کاتەکەی بەهێواشی دەڕۆیشت، تا

---

[1] بروانە: ٨٩٠.

**بگاته ئەو ڕۆژەی لای عائیشەیە، جا ئەو ڕۆژەی کە لای من بوو خوای گەورە گیانی کێشا و بردیەوە بۆ لای خۆی، سەری لە نێوان سنگ و گەردنی مندا بوو، وە لە ماڵەکەی مندا نێژرا.**

١٣٩٠- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ هِلَالٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ الذِي لَمْ يَقُمْ مِنْهُ: «لَعَنَ اللَّهُ اليَهُودَ وَالنَّصَارَى، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ». لَوْلاَ ذَلِكَ أُبْرِزَ قَبْرُهُ، غَيْرَ أَنَّهُ خَشِيَ -أَوْ خُشِيَ- أَنْ يُتَّخَذَ مَسْجِدًا. وَعَنْ هِلاَلٍ قَالَ: كَنَّانِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ وَلَمْ يُولَدْ لِي[1].
حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبدُ اللَّهِ، أَخبَرَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ سُفْيَانَ التَّمَّارِ أَنَّهُ حَدثهُ أَنَّهُ رَاى قبْرَ النَّبِيِّ ﷺ مُسَنَّمًا.
حَدَّثَنَا فَرْوَةُ، حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُروَةَ، عَنْ أَبِيهِ، لَمَّا سَقَطَ عَلَيْهِمُ الحَائِطُ فِي زَمَانِ الوَلِيدِ بْنِ عَبْدِ المَلِكِ أَخَذوا فِي بِنَائِهِ، فَبَدَتْ لَهُمْ قَدَمٌ فَفَزِعوا، وَظَنُّوا أَنهَا قَدَمُ النَّبِيِّ ﷺ، فَمَا وَجَدُوا أَحَدًا يَعْلَمُ ذَلِكَ، حَتَّى قَالَ لَهُمْ عُرْوَةُ: «لَا وَاللَّهِ مَا هِيَ قَدَمُ النَّبِيِّ ﷺ، مَا هِيَ إِلَّا قَدَمُ عُمَرَ ﵁».

**١٣٩٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشیەیدا کە هەڵنەستایەوە (وەفاتی کرد) فەرمووی: «خوا نەفرینی کردووە لە جوولەکەو گاورەکان، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بە مزگەوت))، لەبەر ئەم فەرموودە نەبووایە، گۆڕەکەی پێغەمبەر ﷺ بەرز دەکرایەوەو دەردەخرا، بەڵام ئەوەندە هەیە پێغەمبەر ﷺ ترسا -یان خەڵکەکە دەترسان- گۆڕەکەی بکرێ بە مزگەوت، هیلال دەڵێ: عوروەی کوڕی زوبەیر کونیەی[2] بۆ دانام لەکاتێکدا من منداڵم نەبووە.**

---

[1] بڕوانە: ٤٣٥.

[2] کونیە واتە: (أَبُو فُلَانٍ)، وەک ئەبو عوبەیدە و ئەبو هورەیرە، بە ناوی یەکێک لە منداڵەکانی ناودەنرێ، لەم دێرەدا بۆیە ئیمامی بوخاری هێناویەتی، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە هیلال عوروەی بینیوە، کە هەردووکیان ڕاوی

وە ئەبو بەکری کوڕی عەییاش لە سوفیانی تەممارەوە دەگێڕێتەوە کە بۆی گێڕاوەتەوە: کە گۆڕەکەی پێغەمبەر ﷺ لە نێوەڕاست دا بەرزکرابوویەوە.

وە فەڕوە دەڵێ: عەلی بۆی گێڕاینەوە لە هیشامی کوڕی عوروەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە وتی: کاتێ لە سەردەمی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیکدا دیواری مزگەوت ڕووخا بەسەریاندا، دەستیان کرد بەدروست کردنەوەی، جا پێیەکی مرۆڤیان بۆ دەرکەوت و ترسیان لێ نیشت و وایان زانی پێی پێغەمبەرە ﷺ جا کەسیان دەست نەکەوت ئەوە بزانێ، هەتا عوروە پێی وتن: نا سوێند بەخوا ئەوە پێی پێغەمبەر نیە ﷺ، ئەوە بێگومان پێی عومەرە ﷺ.

١٣٩١- وَعَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا أَوْصَتْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ لاَ تَدْفِنِّي مَعَهُمْ، وَادْفِنِّي مَعَ صَوَاحِبِي بِالبَقِيعِ، لاَ أُزَكَّى بِهِ أَبَدًا[١].

١٣٩١- عائیشە ﷺ وەسیەتی کرد بۆ عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ﷺ و وتی: من لەگەڵ پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانیدا مەنێژە، بەڵکو لەگەڵ خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کە هاوڕێمن لە بەقیع بمنێژە، تا هەتا هەتا (بەهۆی ناشتنمەوە لە نزیک پێغەمبەر ﷺو دوو هاوەڵەکەیدا) بەچاك باس نەکرێم و وەسف و ستایش نەکرێم.

١٣٩٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ الحَمِيدِ، حَدَّثَنَا حُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ الأَوْدِيِّ قَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ،

---

فەرموودەکەن، دەڵێ: عوروە کونیەی بۆ داناوم، واتە: بەیەک گەیشتووین، کەواتە ئەم فەرموودەیە ڕاستە لە هیلالەوە، چونکە عوروەی بینیوە.

[١] بڕوانە: ٧٣٢٧.

اذْهَبْ إِلَي أُمِّ المُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ ﵂ فَقُلْ: يَقْرَأُ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ عَلَيْكِ السَّلاَمَ، ثُمَّ سَلْهَا أَنْ أُدْفَنَ مَعَ صَاحِبَيَّ. قَالَتْ: كُنْتُ أُرِيدُهُ لِنَفْسِي، فَلأُوثِرَنَّهُ اليَوْمَ عَلَى نَفْسِي. فَلَمَّا أَقْبَلَ قَالَ لَهُ: مَا لَدَيْكَ؟ قَالَ: أَذِنَتْ لَكَ يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ. قَالَ: مَا كَانَ شَيْءٌ أَهَمَّ إِلَيَّ مِنْ ذَلِكَ المَضْجَعِ، فَإِذَا قُبِضْتُ فَاحْمِلُونِي، ثُمَّ سَلِّمُوا ثُمَّ قُلْ: يَسْتَأْذِنُ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ. فَإِنْ أَذِنَتْ لِي فَادْفِنُونِي، وَإِلاَّ فَرُدُّونِي إِلَي مَقَابِرِ المُسْلِمِينَ، إِنِّي لاَ أَعْلَمُ أَحَدًا أَحَقَّ بِهَذَا الأَمْرِ مِنْ هَؤُلاَءِ النَّفَرِ الَّذِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَنْهُمْ رَاضٍ، فَمَنِ اسْتَخْلَفُوا بَعْدِي فَهُوَ الخَلِيفَةُ، فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا. فَسَمَّى عُثْمَانَ وَعَلِيًّا وَطَلْحَةَ وَالزُّبَيْرَ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ وَسَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ، وَوَلَجَ عَلَيْهِ شَابٌّ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: أَبْشِرْ يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ بِبُشْرَى اللَّهِ، كَانَ لَكَ مِنَ القَدَمِ فِي الإِسْلاَمِ مَا قَدْ عَلِمْتَ، ثُمَّ اسْتُخْلِفْتَ فَعَدَلْتَ، ثُمَّ الشَّهَادَةُ بَعْدَ هَذَا كُلِّهِ. فَقَالَ: لَيْتَنِي يَا ابْنَ أَخِي، وَذَلِكَ كَفَافًا لاَ عَلَيَّ وَلاَ لِي، أُوصِي الخَلِيفَةَ مِنْ بَعْدِي بِالمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ خَيْرًا، أَنْ يَعْرِفَ لَهُمْ حَقَّهُمْ، وَأَنْ يَحْفَظَ لَهُمْ حُرْمَتَهُمْ، وَأُوصِيهِ بِالأَنْصَارِ خَيْرًا الذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالإِيمَانَ أَنْ يُقْبَلَ مِنْ مُحْسِنِهِمْ، وَيُعْفَى عَنْ مُسِيئِهِمْ، وَأُوصِيهِ بِذِمَّةِ اللَّهِ وَذِمَّةِ رَسُولِهِ ﷺ أَنْ يُوفَى لَهُمْ بِعَهْدِهِمْ، وَأَنْ يُقَاتَلَ مِنْ وَرَائِهِمْ، وَأَنْ لاَ يُكَلَّفُوا فَوْقَ طَاقَتِهِمْ[1].

**١٣٩٢- عەمری کوڕی مەیمونی ئەودی دەڵێ: عومەری کوڕی خەتابم ﷺ بینی وتی: ئەی عەبدوڵای کوڕی عومەر برۆ بۆ لای دایکی باوەڕداران عائیشە ﷺ و پێی بڵێ: عومەر سەلامت لێ دەکات، پاشان داوای لێ بکە کە با من لەگەڵ دوو هاوڕێکەمدا (پێغەمبەر ﷺو ئەبو بەکر) بنێژرێم، عائیشەش وتی: من ئەو شوێنەم بۆ خۆم دەویست، بەڵام ئەمڕۆ ئەو پێش دەخەم بەسەر خۆمدا (دەیدەم بەو)، جا کە هاتەوە پێی وت: چ وەڵامێکت پێیە؟ عەبدوڵاش وتی: ئەی گەورەی ئیمانداران مۆڵەتی دا (لە پاڵیاندا بنێژرێیت)، عومەر وتی: هیچ شتێك بەلامەوە**

---

[1] بڕوانە: ٣٠٥٢، ٣١٦٢، ٣٧٠٠، ٤٨٨٨، ٧٢٠٧.

لەو شوێنە گرنگتر نەبوو، جا کاتێ گیانم کێشرا، ئینجا هەڵمگرن، پاشان سەلام بکەن، پاشان بڵێن: عومەری کوڕی خەتاب داوات لێ دەکات لێرەدا بنێژرێ، جا ئەگەر عائیشە مۆڵەتی دا لەوێدا بمنێژن، ئەگەر مۆڵەتی نەدا ئەوە بمگێڕنەوە بۆ گۆڕستانی مسوڵمانان (کە بەقیعە لەوێدا بمنێژن)، من کەس ناناسم بەم کاری (جێنشینییە) شیاوتر بێت، لەم چەند کەسەی کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ وەفاتی کرد لێیان ڕازی بوو، جا ئەوان هەرکەسیان کردە جێنشین لەپاش من، ئەوە ئەو کەسە خەلیفەیە و گوێی لێ بگرن و گوێڕایەڵی بکەن، ئینجا ناوی عوسمان و عەلی و تەڵحەو زوبەیر و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی برد، گەنجێکی ئەنصاری هاتە ژوورەوە بۆ لای عومەر و وتی: ئەی گەورەی ئیمانداران مژدەت لێ بێ بە مژدەی خوای گەورە: تۆ خاوەن ئەو ڕابردووەی لە ئیسلامدا کەخۆت دەزانی، پاشان کرایتە جێنشین و دادگەر بوویت، پاشان دوای هەموو ئەمانە شەهیدیت پێ بەخشرا، عومەر وتی: ئەی برازای خۆم خۆزگە سەر بەسەر دەربچوومایە، نەگوناهبار ببم، نە پاداشتم بکرێم، ئامۆژگاری جێنشینی پاش خۆم دەکەم کە چاك بێ لەگەڵ کۆچەرانی سەرەتای ئیسلامدا، مافێك کە هەیانە بزانێ مافی خۆیانە، وە پارێزگاری لە ڕێز و حورمەتیان بکات، وە ئامۆژگاری دەکەم کە لەگەڵ ئەنصارییەکاندا چاك بێت، ئەوانەی بوونە لانکەی باوەڕداران و ئیمان و ئایین، چاکەی چاکانیان وەرگرێ، وە چاوپۆشی بکات لە خراپەی خراپانیان، وە ئامۆژگاری دەکەم ئاگای لە پەیمان و عەهدی خواو پەیمان و عەهدی پێغەمبەرەکەی بێت (بەرانبەر ئەهلی کیتاب)، وە پەیمانەکەیان لەگەڵدا بباتە سەر و نەیشکێنێ، وە جەنگ بکات لەگەڵ ئەوانەی لە پشتیانەوەن (پێشیانەوەن)، وە زیاد لە توانای خۆیان داوایان لێ نەکات.

## ٩٧- بابُ مَا يُنْهَى مِنْ سَبِّ الأَمْوَاتِ

١٣٩٣- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا». وَرَوَاهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ القُدُّوسِ، عَنِ الأَعْمَشِ، وَمُحَمَّدُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ الأَعْمَشِ. تَابَعَهُ عَلِيُّ بْنُ الجَعْدِ، وَابْنُ عَرْعَرَةَ، وَابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ[1].

## ٩٧- باسی ئەوەی ڕێگری لێکراوە لە جنێودان بە مردووان

**١٣٩٣- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جنێو مەدەن بەمردووان، چونکە بێگومان ئەوان گەیشتوونەتە ئەو جێگایەی کە کارو کردەوەکانیان پێش خۆیان خستووە))، ئەم فەرموودەیە عەبدوڵای کوڕی عەبدولقوددوس لە ئەعمەشەوە گێڕاویەتیەوە، وە موحەممەدی کوڕی ئەنەس لە ئەعمەشەوە گێڕاویەتیەوە، هەریەك لە عەلی کوڕی جەعدو ئیبنو عەرعەرو ئیبنو ئەبی عەدی لە شوعبەوە گێڕاویانەتەوەو پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئادەم دەکەن.**

## ٩٨- بابُ ذِكْرِ شِرَارِ المَوْتَى

١٣٩٤- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ أَبُو لَهَبٍ -عَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ- لِلنَّبِيِّ ﷺ: تَبًّا لَكَ سَائِرَ اليَوْمِ. فَنَزَلَتْ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ١﴾ المسد[2].

---

[1] بڕوانە: ٦٥١٦.

[2] بڕوانە: ٣٥٢٥، ٣٥٢٦، ٤٧٧٠، ٤٨٠١، ٤٩٧١، ٤٩٧٢، ٤٩٧٣.

## ٩٨- باسی باسکردنی خراپترینی مردووان

**١٣٩٤- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: ئەبو لەهەب -نەفرینی خوای لێ بێ- بە پێغەمبەری ﷺ وت: مردن بۆ تۆ بە درێژایی ئەمڕۆ، بەوهۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (هەردوو دەستی ئەبو لەهەب تیابچن[1]، بێگومان لەناوچوون[2]).**

---

[1] واتە: تیدا بچێت، دەستی بەکارهێناوە مەبەستی خودی کەسەکەیە، وەک ﴿وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۝١٩٥﴾ البقرة.

[2] مەبەست پێی تیداچوونی ئەبو لەهەبە.

## ١- باب وُجُوبِ الزَّكَاةِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى ﷻ: ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴿٤٣﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما حَدَّثَنِي أَبُو سُفْيَانَ رضي الله عنه فَذَكَرَ حَدِيثَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ يَأْمُرُنَا بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَالصِّلَةِ وَالْعَفَافِ[١].

## ١- باسی واجبیەتی زەکات

**وە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (بە نوێژەکانتان هەستن و زەکات بدەن)، وە عەبدوڵای کوڕی عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: ئەبو سوفیان رضي الله عنه بۆی گێڕامەوە، ئینجا فەرموودەکەی پێغەمبەری ﷺ باس کرد و وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانمان پێدەکات بە نوێژ و زەکات و گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی و داوێن پاکی.**

١٣٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ الضَّحَّاكُ بْنُ مَخْلَدٍ، عَنْ زَكَرِيَّاءَ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَيْفِيٍّ، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مُعَاذًا رضي الله عنه إِلَى الْيَمَنِ

---

[١] بڕوانە: ٧.

فَقَالَ: «ادْعُهُمْ إِلَي شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدِ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ»[1].

**١٣٩٥- عه‌بدولاَی كوڕی عه‌باس ﷺ ده‌گێڕێته‌وه‌: كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ موعازی ﷺ نارد بۆ یه‌مه‌ن و پێی فه‌رموو: ((بانگیان بكه‌ بۆ ئه‌وه‌ی شایه‌تی بده‌ن كه‌ هیچ په‌رستراوێكی ڕاست نیه‌ جگه‌ له‌ خوا، وه‌ شایه‌تی بده‌ كه‌ بێگومان من پێغه‌مبه‌ری خوام، ئینجا ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌یان به‌ گوێ كردی، ئه‌وسا ئاگاداریان بكه‌ كه‌ بێگومان خوا له‌ هه‌موو شه‌و و ڕۆژێكدا پێنج نوێژی له‌سه‌ر فه‌رزكردوون، ئینجا ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌شیان به‌گوێ كردی، ئه‌وسا ئاگاداریان بكه‌ كه‌ بێگومان خوا له‌ ماڵ و سامانه‌كانیاندا زه‌كات و به‌خشینێكی له‌سه‌ر فه‌رز كردوون، له‌ ده‌وڵه‌مه‌نده‌كانیان وه‌رده‌گیرێ و ده‌درێت به‌ هه‌ژار و نه‌داره‌كانیان)).**

١٣٩٦- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ ابْنِ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَوْهَبٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الجَنَّةَ. قَالَ: مَا لَهُ؟ مَا لَهُ؟ وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَرَبٌ مَالَهُ، تَعْبُدُ اللَّهَ، وَلاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ».

وَقَالَ بَهْزٌ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُثْمَانَ، وَأَبُوهُ عُثْمَانُ بْن عَبْدِ اللهِ أَنَّهُمَا سَمِعَا مُوسَى بْنَ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ بِهَذَا. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: أَخْشَى أَنْ يَكُونَ مُحَمَّدٌ غَيْرَ مَحْفُوظٍ إِنَّمَا هُوَ عَمْرٌو[2].

**١٣٩٦- ئه‌بو ئه‌یووب ﷺ ده‌گێڕێته‌وه‌: كه‌ پیاوێك به‌ پێغه‌مبه‌ری ﷺ وت: كرده‌وه‌یه‌كم پێ بڵێ بمباته‌ به‌هه‌شته‌وه‌، (یه‌كێك له‌هاوه‌ڵان) وتی: ئه‌و كابرایه‌**

---

[1] بڕوانه: ١٤٥٨، ١٤٩٦، ٢٤٤٨، ٤٣٤٧، ٧٣٧١، ٧٣٧٢.

[2] بڕوانه: ٥٩٨٢، ٥٩٨٣.

**چی دەوێ؟! ئەو كابرایە چی دەوێ؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پێویستییەكی گرنگی هەیە، خوا بپەرستە و هیچ شتێك مەكە بەهاوەڵی، بەجوانی نوێژەكانت بكە، زەكات بدە، هەروەها پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنە)). بەهز دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕاینەوە وتی: موحەممەدی كوڕی عوسمان و عوسمانی كوڕی عەبدوڵای باوكی بۆیان گێڕامەوە كە هەردووكیان لە مووسای كوڕی تەڵحەیان بیستووە، ئەویش ئەم فەرموودەی لە ئەبو ئەیووب بیستووە، ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: دەترسم ئەو فەرموودەیە لە موحەممەدی كوڕی عوسمان ڕاست نەبێ، بەڵكو عەمری كوڕی عوسمان بێت[1].**

١٣٩٧- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، حَدَّثَنَا عَفَّانُ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدِ بْنِ حَيَّانَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺأَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَمِلْتُهُ دَخَلْتُ الجَنَّةَ. قَالَ: «تَعْبُدُ اللَّهَ لَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ المَكْتُوبَةَ، وَتُؤَدِّي الزَّكَاةَ المَفْرُوضَةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ». قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا. فَلَمَّا وَلَّى قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا».

حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي حَيَّانَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو زُرْعَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذَا.

**١٣٩٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: كە عەرەبێكی دەشتەكی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: كردەوەیەكم نیشان بدە ئەگەر بیكەم بڕۆمە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: ((خوا بپەرستە و هیچ شتێك مەكە بەهاوەڵی، وە نوێژە فەرزەكان بكەو زەكاتی فەرز بدە و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرە))، پیاوەكە وتی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە لەوە زیاتر ناكەم، جا كاتێ پشتی هەڵكرد و ڕۆیشت،**

---

[1] واتە: شوعبە لێی تێک چووە، لە جیاتی عەمری کوڕی عوسمان کردوویەتی بە موحەممەدی کوڕی عوسمان. بڕوانە: إرشاد الساري: ٥٠٨/٣.

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس پێی خۆشە سەیری کەسێکی بەهەشتی بکات، ئەوە با سەیری ئەم پیاوە بکات)).**

**(ئیمامی بوخاری ئەم فەرموودەی بەم ڕێگەیەش گێڕاوەتەوە): موسەدەد بۆی گێڕامەوە لە یەحیاوە، ئەویش لە ئەبو حەییانەوە دەڵێ: ئەبو زورعە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

١٣٩٨- حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو جَمْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَقُولُ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ القَيْسِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا الحَيَّ مِنْ رَبِيعَةَ، قَدْ حَالَتْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ كُفَّارُ مُضَرَ، وَلَسْنَا نَخْلُصُ إِلَيْكَ إِلَّا فِي الشَّهْرِ الحَرَامِ، فَمُرْنَا بِشَيْءٍ نَأْخُذُهُ عَنْكَ، وَنَدْعُو إِلَيْهِ مَنْ وَرَاءَنَا. قَالَ: «آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: الإِيمَانِ بِاللَّهِ وَشَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ -وَعَقَدَ بِيَدِهِ هَكَذَا - وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَأَنْ تُؤَدُّوا خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ، وَأَنْهَاكُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالحَنْتَمِ، وَالنَّقِيرِ، وَالمُزَفَّتِ». وَقَالَ سُلَيْمَانُ وَأَبُو النُّعْمَانِ، عَنْ حَمَّادٍ: «الإِيمَانِ بِاللَّهِ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ»[1].

**١٣٩٨- عەبدوڵای کوڕی عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: نوێنەری خێڵی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ئەم خێڵە لە هۆزی ڕەبیعەین، (چونکە خێڵی عەبدولقەیس بەشێکن لە هۆزی ڕەبیعە)، ئینجا عەرزیان کرد بێگومان کافرانی هۆزی موزەڕ لە نێوان ئێمەو جەنابتدان، وە ئێمە ناتوانین بێینە خزمەتت لەو مانگانەدا نەبێ کە (جەنگ تێیاندا) حەرامە، کەواتە فەرمانمان پێ بفەرموو بە شتانێك لە جەنابتەوە وەری بگرین، تا هۆزەکەشمان بانگ بکەین بۆ لای، فەرموی: ((فەرمانتان پێ دەکەم بە چوار**

[1] بڕوانە: ٥٣.

**شت و قەدەغەی چوار شتیشتان لێ دەکەم، (چوار فەرمانەکان ئەمانەن): باوەڕ بوون بەخواو شایەتیدان کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا - وە ئاوەها پەنجەکانی دەستی قوچاند وەك ئاماژەی یەك خوایی-، وە نوێژ کردن و زەکات دان، پێنج یەکی ئەوەی لە جەنگدا دەستتان دەکەوێ بیدەن (بە دەوڵەتی ئیسلامیی)، وە قەدەغەی چوار شتیشتان[١] لێ دەکەم (کە ئەم شتانەن): کولەکەی هەڵکۆڵراو، کوپە (کە لە قوڕو موو درووست دەکرا)، دەفری هەڵکوڵراو لەبنکی دار خورما، کوپەی قیڕو زەفت تێهەڵسواو))[٢]، وە سولەیمان و ئەبو نوعمان لە حەممادەوە فەرموودەکەیان بەم جۆرە گێڕاوەتەوە: ((باوەڕبوون بە خوا شایەتیدانە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نیە جگە لە خوا)).**

١٣٩٩- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ الحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﵁، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ العَرَبِ فَقَالَ عُمَرُ - ﵁، كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَمَنْ قَالَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ؟»[٣].

**١٣٩٩- ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، ئەبو بەکر ﵁ بوویە جێنشین، ئەوەی ویستی پاشگەزبێتەوە لە عەرەبەکان پاشگەز بوویەوە،**

---

[١] کە خواردنەوەیان تێدەکردن چ ئاو بێ، یان سرکە یان دۆشاو.

[٢] هۆی قەدەغە کردنی ئەو چوارە کە شلەمەنییان تێ دەکرێ، لەبەر ئەوەیە سرکەو دۆشاو تیاندا زوو دەبێتە عارەق.

[٣] بڕوانە: ٦٩٢٤، ٧٢٨٤.

**عومەریش ﷺ وتی بە ئەبو بەكر: چۆن لەگەڵ خەڵكیدا دەجەنگی لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((فەرمانم پێ كراوە لە دژی خەڵك بجەنگم هەتا دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، جا هەركەس بیڵێ، ئەوە بێگومان بە هەق و مافی خۆی نەبێت ماڵ و خوێنیان لەلایەن منەوە پارێزراوە، لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە)).**

١٤٠٠- فَقَالَ: وَاللَّهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ المَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا. قَالَ عُمَرُ ﷺ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ قَدْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الحَقُّ[1].

**١٤٠٠- ئەبو بەكریش ﷺ وتی: سوێند بەخوا دەجەنگم لە دژی ئەو كەسەی جیاوازی بكات لە نێوان نوێژ و زەكاتدا، چونكە زەكات مافی ماڵ وسامانە، وە سوێند بەخوا ئەگەر گیسكێكم نەدەنێ كە كاتی خۆی دەیاندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر نەدانی لە دژیان دەجەنگم، عومەر ﷺ وتی: سوێند بە خوا كاتێك كە خوا سینەی (دڵی) ئەبو بەكری گوشاد كرد بۆ ئەم كارە منیش بۆم دەركەوت كە ئەو بڕیارە هەق و راستە.**

## ٢- بابُ البَيْعَةِ عَلَى إِيتَاءِ الزَّكَاةِ

﴿ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ ﴾ التوبة.

١٤٠١- حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ قَيْسٍ قَالَ: قَالَ جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: بَايَعْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ[2].

---

[1] بڕوانە: ١٤٥٦، ١٤٥٧، ٦٩٢٥، ٧٢٨٥.

[2] بڕوانە: ٥٨.

## ٢- باسی پەیمان دان لەسەر زەکات دان

**(خوا دەفەرموێ): (جا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان کرد و زەکاتیان دا، ئەوە برای ئایینیتانن).**

**١٤٠١- جەریری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پەیمانم دا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر نوێژکردن و زەکات دان و ئامۆژگاری کردنی هەموو مسوڵمانێك.**

## ٣- بابُ إِثْمِ مَانِعِ الزَّكَاةِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ۖ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ التوبة.

## ٣- باسی تاوانی زەکات نەدەر

**هەروەها باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەو کەسانەی ئاڵتون و زیو کۆدەکەنەوە و لەڕێی خوادا نایبەخشن، ئەوە مژدەیان پێ بدە بەسزایەکی بەئازار، لەڕۆژێکدا (ئەو ئاڵتون و زیوە) لەئاگری دۆزەخدا سوور دەکرێتەوە، ئینجا نێوچاوان و تەنیشت و پشتیانی پێ داخ دەکرێ، (پێیان دەوترێ:) ئەمە ئەو (سامانەیە) کۆتان دەکردەوە بۆ خۆتان، دەی بچێژن (تۆڵەی) ئەوەی کۆتان دەکردەوە).**

١٤٠٢- حَدَّثَنَا الحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ هُرْمُزَ الأَعْرَجَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَأْتِي الإِبِلُ عَلَى صَاحِبِهَا عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ، إِذَا هُوَ لَمْ يُعْطِ فِيهَا حَقَّهَا، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَأْتِي الغَنَمُ عَلَى صَاحِبِهَا

عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ، إِذَا لَمْ يُعْطِ فِيهَا حَقَّهَا، تَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا». وَقَالَ: «وَمِنْ حَقِّهَا أَنْ تُحْلَبَ عَلَى الْمَاءِ». قَالَ: «وَلاَ يَأْتِي أَحَدُكُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ بِشَاةٍ يَحْمِلُهَا عَلَى رَقَبَتِهِ لَهَا يُعَارٌ، فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ. فَأَقُول: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ بَلَّغْتُ. وَلاَ يَأْتِي بِبَعِيرٍ يَحْمِلُهُ عَلَى رَقَبَتِهِ لَهُ رُغَاءٌ، فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ. فَأَقُول: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ بَلَّغْتُ»[1].

**١٤٠٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((وشتر (لە ڕۆژی دواییدا) لەسەر چاکترین شێوەی (لە قەڵەوی و گەورەیی)دا دێت بەسەر خاوەنەکەیدا، ئەگەر زەکات و مافەکەیانی نەدابێت، بەقاچی و سمەکانی پێی پێدادەنێ (دەیشێلێ)، مەڕیش بەچاکترین شێوەی دێت بەسەر خاوەنەکەیدا، ئەگەر زەکات و مافەکەیانی نەدابێت بەسمەکانی پێیدادەنێت، بە شاخەکانی قۆچی لێ دەدات))، هەروەها فەرمووی: ((وە لە مافەکانییەتی لەکاتی ئاودانیاندا (لەلایەن هەژارانەوە) بدۆشرێن))، وە فەرمووی: ((با لە ڕۆژی دواییدا هیچ کامتان نەیەت مەڕێکی بەسەر ملیەوە هەڵگرتبێت بباڕێنێ، جا بڵێ ئەی موحەممەد (فریام بکەوە)، منیش دەڵێم هیچم بۆ ناکرێ بۆت، لە دونیا پێم ڕاگەیاندن. وە با کەسێکتان نەیەت و وشترێك بەسەر ملیەوە بێت بباعێنێ، جا ئەوکەسە بڵێ ئەی موحەممەد (فریام بکەوە)، منیش دەڵێم: هیچ شتێکم لەدەست نایەت بۆت، چونکە لە دونیادا (ئەوەی پێویست بوو) ڕامگەیاند)).**

١٤٠٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا هَاشِمُ بْنُ القَاسِمِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَنْ

---

[1] بروانە: ٢٣٧١، ٢٣٧٨، ٣٠٧٣، ٦٩٥٨.

آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ، مُثِّلَ لَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَانِ، يُطَوَّقُهُ يَوْمَ القِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَيْهِ -يَعْنِي: شِدْقَيْهِ- ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، ثُمَّ تَلاَ: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ آل عمران، الآيَةَ[1].

**١٤٠٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەس خوا ماڵ و سامانی پێ ببەخشێ و زەكاتەكەی نەدات، لە ڕۆژی دواییدا دەكرێتە مارێكی (گەورەی) سەركەچەڵ، دوو شاخی هەیە[2]، لە ڕۆژی دواییدا ئەو مارە لە ملی دەئاڵێ، قەپ دەكا بە هەردوو شەویلەیدا -(لِهْزِمَيْهِ) واتە: هەردوو شەویلەی-، پاشان دەڵێ: من سامانەكەتم، من ماڵەكەتم كۆت دەكردەوە)) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وە با ئەو كەسانەی چروكی و ڕەزیلی دەكەن، وا نەزانن بە هۆی ئەو ماڵ و سامانەی خوا لە بەهرەی خۆی پێی بەخشیون ئەو(چروكی)ە چاكترە بۆیان، (نەخێر وانییە)، بەڵكو ئەوە خراپە بۆیان، وە بێگومان ئەوەی چروكیان پێ دەكرد، لە ڕۆژی دواییدا وەك تەوق دەكرێتە ملیان، وە كەلەپور و میراتی ئاسمانەكان و زەوی تەنها بۆ خوایە، وە خوا ئاگادارە بە هەرچی كە ئێوە دەیكەن).**

## ٤- بابٌ: مَا أُدِّيَ زَكَاتُهُ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ

لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوَاقٍ[3] صَدَقَةٌ».

---

[1] بڕوانە: ٢٣٧١، ٤٥٦٥، ٤٦٥٩، ٦٩٥٧.

[2] لَهُ زَبِيبَتَانِ بە چەند مانای تر مانا كراوە وەك: ١- كەف كەوتۆتە هەردوو كەلاوەی. ٢- دوو خاڵی ڕەش لەسەرووی چاوەكانیەوەیە. ٣- دوو كەڵبەی هەیە لە دەمیەوە هاتوونەتە دەرەوە.

[3] خَمْسَةِ أَوَاقٍ: واتە: پێنج ئۆقیە، هەر ئۆقیەیەك چل درهەمی زیو دەكات، كەواتە پێنج ئۆقیەكە دەكاتە دوو سەد درهەم، بە كێشانەی ئێستا لێكدراوەتەوە دەكاتە: (٥٩٥ گرام) زیو.

١٤٠٤- وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ شَبِيبِ بْنِ سَعِيدٍ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: أَخْبِرْنِي قَوْلَ اللَّهِ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ﴿٣٤﴾﴾ التوبة، قَالَ ابْنُ عُمَرَ ﵄: مَنْ كَنَزَهَا فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهَا فَوَيْلٌ لَهُ، إِنَّمَا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تُنْزَلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا أُنْزِلَتْ جَعَلَهَا اللَّهُ طُهْرًا لِلأَمْوَالِ[1].

## ٤- باسێک: ئەو سامانەی زەکاتی لێ بدرێ بە کەنز[2] دانانرێ

**بەبەڵگەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ئەوەی لە پێنج ئۆقیە کەمتر بێت زەکاتی تێدا نییە)).**

**١٤٠٤- خالیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەردا ﵄ ڕۆیشتین بۆ سەفەرێك، (لەڕێگادا) عەرەبێکی دەشتەکی بە عەبدوڵای وت: مانای ئەم ئایەتەم پێ بڵێ: (ئەوانەی ئاڵتون و زیو کۆدەکەنەوە و لە ڕێی خوادا نایبەخشن)، عەبدوڵاش وتی: هەرکەس کۆی کاتەوەو زەکاتەکەی نەدات سزای توند بۆ ئەو کەسەیە، بێگومان ئەو ئایەتە پێش ئەوە بوو ئایەتی زەکاتدان دابەزێ، جا کە ئایەتی زەکات دابەزی، خوا ئەو ماڵ بەخشینەی کرد بە مایەی پاککردنەوە بۆ ماڵ و سامان.**

١٤٠٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يَزِيدَ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبُ بْنُ إِسْحَاقَ قَالَ الأَوْزَاعِيُّ: أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ يَحْيَى بْنِ عُمَارَةَ أَخْبَرَهُ، عَنْ أَبِيهِ يَحْيَى بْنِ عُمَارَةَ بْنِ أَبِي الحَسَنِ

---

[1] بڕوانە: ٤٦٦١.

[2] کە هەڕەشە لە خاوەنەکەی کراوە لە قورئان و سوننەتدا.

أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ[1] أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ»[2].

**١٤٠٥- ئەبو سەعيد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: (( (پارە) لە پێنج ئۆقيە كەمتر زەكاتى تێدا واجب نييە، وە لە پێنج وشتر كەمتر زەكاتى تێدا واجب نييە، وە لە پێنج ويسق[3] كەمتر زەكاتى تێدا واجب نييە)).**

١٤٠٦- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، سَمِعَ هُشَيْمًا، أَخْبَرَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: مَرَرْتُ بِالرَّبَذَةِ فَإِذَا أَنَا بِأَبِي ذَرٍّ ﷺ فَقُلْتُ لَهُ: مَا أَنْزَلَكَ مَنْزِلَكَ هَذَا؟ قَالَ: كُنْتُ بِالشَّأْمِ، فَاخْتَلَفْتُ أَنَا وَمُعَاوِيَةُ فِي الذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالفِضَّةَ وَلاَ يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ. قَالَ مُعَاوِيَةُ: نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الكِتَابِ. فَقُلْتُ: نَزَلَتْ فِينَا وَفِيهِمْ. فَكَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ فِي ذَاكَ، وَكَتَبَ إِلَي عُثْمَانَ ﷺ يَشْكُونِي، فَكَتَبَ إِلَيَّ عُثْمَانُ أَنِ اقْدَمِ المَدِينَةَ. فَقَدِمْتُهَا فَكَثُرَ عَلَيَّ النَّاسُ حَتَّى كَأَنَّهُمْ لَمْ يَرَوْنِي قَبْلَ ذَلِكَ، فَذَكَرْتُ ذَاكَ لِعُثْمَانَ، فَقَالَ لِي: إِنْ شِئْتَ تَنَحَّيْتَ فَكُنْتَ قَرِيبًا. فَذَاكَ الذِي أَنْزَلَنِي هَذَا المَنْزِلَ، وَلَوْ أَمَّرُوا عَلَيَّ حَبَشِيًّا لَسَمِعْتُ وَأَطَعْتُ[4].

**١٤٠٦- زەيدى كوڕى وەهب دەڵێ: بەڕەبزەدا تێپەڕيم (شوێنێكە لە نێوان مەككە و مەدينە)، لەپڕ ئەبو زەڕم بينى ﷺ و پێم وت: چ شتێك ئا لەم شوێنەدا نيشتەجێى كردوويت؟ وتى: من لە شام بووم، حا من و موعاوييە لەسەر ئەم**

---

[1] خَمْسُ أَوْسُقٍ واتە: پێنج وسق هەر وسقێكى سەردەمى پێغەمبەر ﷺ دەكاتە (٦٠) صاع، بە كێشانەى ئێستا لێك دراوەتەوە دەكاتە نزيكەى: (٦٥٢ كغم)، هەندێكيش دەڵێن: دەكاتە (٦٧٢ كغم)، ئەمە بۆ گەنم و جۆ حساب كراوە، بەڵام هەندێ دانەوێڵەى تر قورسترە و حسابەكەى دەگۆڕێ.

[2] بڕوانە: ١٤٤٧، ١٤٥٩، ١٤٨٤.

[3] دانەوێڵە و مێوژ و خورما.

[4] بڕوانە: ٤٦٦٠.

**ئایەتە: (ئەوانەی ئاڵتون و زیو کۆدەکەنەوە و نایبەخشن لەڕێی خوادا) ڕامان جیاواز بوو، موعاوییە وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی خاوەن کتێبەکان دابەزیوە، منیش وتم: دەربارەی ئێمەو ئەوانیش دابەزیوە، بۆیە لە نێوان من و موعاوییەدا کێشە دروست بوو لەسەر ئەوە، موعاوییە نامەیەکی نووسی بۆ عوسمان و شکاتی منی لا کرد، ئەوسا عوسمانیش نامەیەکی بۆ من نووسی کە بڕۆم بۆ مەدینە. منیش ڕۆیشتم بۆ مەدینە، جا خەڵکێکی زۆرم لێ کۆبوویەوە[1]، بە جۆرێك وەك لەوەو پێش منیان نەدیبێ، منیش ئەمەم بۆ عوسمان باسکرد، عوسمانیش پێی وتم: ئەگەر حەز دەکەیت و دەتەوێ بڕۆ بۆ (جێگایەك لە)کەناری مەدینە و نزیك بیت، ئەوەبوو منی ئا لەم شوێنەدا نیشتەجێ کردووە، ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی بکەنە ئەمیر و لێپرسراوم، من گوێی لێ دەگرم و گوێڕایەڵی دەکەم.**

١٤٠٧- حَدَّثَنَا عَيَّاشٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا الجُرَيْرِيُّ، عَنْ أَبِي العَلاَءِ، عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: جَلَسْتُ. وَحَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الصَّمَدِقَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، حَدَّثَنَا الجُرَيْرِيُّ، حَدَّثَنَا أَبُو العَلاَءِ بْنُ الشِّخِّيرِ، أَنَّ الأَحْنَفَ بْنَ قَيْسٍ حَدَّثَهُمْ قَالَ: جَلَسْتُ إِلَى مَلإٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَجَاءَ رَجُلٌ خَشِنُ الشَّعَرِ وَالثِّيَابِ وَالهَيْئَةِ، حَتَّى قَامَ عَلَيْهِمْ فَسَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: بَشِّرِ الكَانِزِينَ بِرَضْفٍ يُحْمَى عَلَيْهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، ثُمَّ يُوضَعُ عَلَى حَلَمَةِ ثَدْيِ أَحَدِهِمْ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ نُغْضِ كَتِفِهِ، وَيُوضَعُ عَلَى نُغْضِ كَتِفِهِ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ حَلَمَةِ ثَدْيِهِ يَتَزَلْزَلُ، ثُمَّ وَلَّى فَجَلَسَ إِلَى سَارِيَةٍ، وَتَبِعْتُهُ وَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، وَأَنَا لاَ أَدْرِي مَنْ هُوَ فَقُلْتُ لَهُ: لاَ أُرَى القَوْمَ إِلاَّ قَدْ كَرِهُوا الذِي قُلْتَ. قَالَ: إِنَّهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئًا.

---

[1] پرسیاریان لێ دەکردم بۆچی لە شام دەرچووم و هاتم بۆ مەدینە.

**١٤٠٧- جەریر گێڕایەوە لە ئەبولعەلاوە، ئەویش لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە گێڕایەوە و وتی: دانیشتبووم.**

**جەریر وتی: ئەبولعەلای کوڕی شیخخیر بۆی گێڕاینەوە کە ئەحنەفی کوڕی قەیس بۆی گێڕانەوەو وتی: لەنێو کۆمەڵێ پیاوی قوڕەیشیدا دانیشتبووم، ئینجا پیاوێکی قژ و پۆشاك و شێوە زبر[1] هات، نزیك بوویەوە هەتا لە لای سەریان وەستا و سەلامی کرد، پاشان وتی: مژدە بدە بەوانەی ئاڵتوون و زیو کۆدەکەنەوە (و زەکاتی نادەن) بەبەردی سوورەوەکراو لەنێو ئاگری دۆزەخدا، پاشان ئەو بەردە دەخرێتە سەر گۆی مەمکی کەسێك لەوانە، تا لە ئێسقانی شانییەوە دەردەچێت، وە ئەو بەردە سوورەوەکراوە دەخرێتە سەر ئێسقانی شانی، تا لە گۆی مەمکییەوە دێتە دەرەوە، ئەو کەسە دەست و هەموو لەشی دەلەرزێ، پاشان ئەو پیاوە (کە قسەکەی کرد) ڕۆیشت و لای پایەیەکدا دانیشت، منیش شوێنی کەوتم و چووم لەلای دانیشتم، وە من نەمدەزانی کێیە بۆیە پێم وت: وا نازانم ئەوەی وتت ئەو خەڵکە پێیان خۆش بووبێ؟ وتی: بێگومان ئەوانە هیچ تێناگەن (هەر خەریکی کۆکردنەوەی دونیان).**

١٤٠٨- قَالَ لِي خَلِيلِي -قَالَ: قُلْتُ: مَنْ خَلِيلُكَ؟ قَالَ: النَّبِيُّ ﷺ-: «يَا أَبَا ذَرٍّ أَتُبْصِرُ أُحُدًا؟». قَالَ: فَنَظَرْتُ إِلَى الشَّمْسِ مَا بَقِيَ مِنَ النَّهَارِ، وَأَنَا أُرَى أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُرْسِلُنِي فِي حَاجَةٍ لَهُ، قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا أُنْفِقُهُ كُلَّهُ إِلاَّ ثَلاَثَةَ دَنَانِيرَ». وَإِنَّ هَؤُلاَءِ لاَ يَعْقِلُونَ، إِنَّمَا يَجْمَعُونَ الدُّنْيَا. لَا وَاللَّهِ لَا أَسْأَلُهُمْ دُنْيَا، وَلاَ أَسْتَفْتِيهِمْ عَنْ دِينٍ حَتَّى أَلْقَى اللَّهَ[2].

---

[1] ئەو پیاوە ئەبو زەڕ بوو، بڕوانە: فتح الباري: ٣٥١/٤.

[2] بڕوانە: ١٢٣٧.

**١٤٠٨- ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم فەرمووی پێم -(ئەحنەف) دەڵێ: وتم: خۆشەویستت کێیە؟ ئەبو زەڕ وتی: پێغەمبەرە ﷺ : ((ئەی ئەبو زەڕ ئایا کێوی ئوحود دەبینی؟))، منیش سەیری خۆرم کرد ڕۆژ ئەوەندەی نەمابوو، وە من گومانم وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەمنێرێ بۆ کارو پێویستییەکی خۆی، وتم: بەڵێ ئوحود دەبینم، فەرمووی: ((پێمخۆشە بە ئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتووونم هەبێت، هەمووی ببەخشم (لە پێناو خوادا) جگە لە سێ دینار نەبێت))[1]، ئەبو زەڕ وتی: بەڵام بەڕاستی ئا ئەمانە تێناگەن، هەر دونیا کۆدەکەنەوە، نە سوێند بەخوا داوای دونیایان لێ ناکەم، وە پرسیاری ئایینیان لێ ناکەم هەتا دەگەمەوە خزمەتی خوا.**

## ٥- بابُ إِنْفَاقِ المَالِ فِي حَقِّهِ

١٤٠٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسٌ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ حِكْمَةً فَهْوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا»[2].

## ٥- باسی بەخشینی سامان لە هەق و شوێنی خۆیدا

**١٤٠٩- عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئیرەیی و خۆزگە پێ خواستنی گەورە تەنها لە دوو شتدا دروستە: بە پیاوێك خوا سەروەت و سامانی پێ بەخشیبێ، توانای پێ دابێ لە پێناوی هەق و ڕاستیدا**

---

[1] پێدەچێ پێغەمبەری خودا ﷺ لەو ڕۆژەدا پێویستی بە سێ دینار بوو بێت بۆ هەندێک لە پێویستی ماڵەکانی.

[2] بڕوانە: ٧٣.

تەفرو توناى بكات (بيبەخشێ)، وە بەپياوێك كە خوا دانايى و شارەزايى پێدابێ، (كە لە نێوان خەڵكيدا) حوكمى پێ بكات و فێرى خەڵكانى ديكەشى بكات)).

## ٦- بابُ الرِّيَاءِ فِي الصَّدَقَةِ

لِقَوْلِهِ تعالى: ﴿ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ۖ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾ ﴾ البقرة، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: «صَلْدًا لَيْسَ عَلَيْهِ شَيْءٌ». وَقَالَ عِكْرِمَةُ: ﴿ وَابِلٌ ﴾ مَطَرٌ شَدِيدٌ، وَالطَّلُّ: النَّدَى.

## ٦- باسی ڕووپامایی لە زەكات و ماڵ بەخشيندا

بە بەڵگەی ئەم فەرمايشتەی خوای بەرزو بڵند: (ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە خێرو بەخشينەكانتان بە منەت كردن و ئازاردان پوچەڵ مەكەنەوە، وەك ئەو كەسەی ماڵ و سامانی خۆی بەخت دەكات لەبەر ڕووپامايی خەڵك، وە باوەڕی نييە بەخوا و بەڕۆژی دوايی، جا وێنەی ئەو ناپاكە وەك بەردێكی لووس وايە كە خۆڵێكی كەمی بەسەرەوە بێت، ئينجا بارانێكی لێزمە لێی بدات و بەردەكە بەڕووتی بهێڵێتەوە، ئيتر ناتوانن هيچێك لەوەی كردوويانەی دەستيان كەوێت و دەستيان پێی ناگات، وە خوا ڕێنموونی گەلی بێباوەڕ و خوانەناس ناكات)، وە عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ وشەی: ﴿ صَلْدًا ﴾ لە ئايەتەكەدا واتە: بەردێك هيچی بەسەرەوە نەبێت، وە عيكريمە دەڵێ: وشەی: ﴿ وَابِلٌ ﴾، يانی: بارانی لێزمە، وە وشەی: (الطَّلُّ) يانی: نەرمەباران.

## ٧- بابٌ: لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ، وَلاَ يَقْبَلُ إِلاَّ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ

لِقَوْلِهِ: ﴿ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ۗ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾ ﴾ البقرة.

## ٧- باسێک: خودا هیچ خێرێک له ماڵی دزراو وەر ناگرێ، جگه له ماڵێک که به کەسابەتێکی حەڵاڵ پەیداکرابێ

بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وتەیەکی چاك و داوای لێخۆش بوون بۆ کردن له خوا له ماڵ بەخشینێك چاکترە که ئازار و دڵ ئێشانی بەدوادا بێت، وه خوا دەوڵەمەندی لەسەرخۆیه).

## ٨- بابُ الصَّدَقَةِ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ

لِقَوْلِهِ: ﴿ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ ﴾ البقرة.

## ٨- باسی خێر و ماڵ بەخشین له ماڵی کەسابەتی حەڵاڵ

بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ( (وه خوا) برەو به خێرو بەخشینەکان دەدات، وه خوا هیچ سپڵەیەکی تاوانباری خۆش ناوێ، بێگومان ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوه و کردەوه چاکەکانیان کردووه و نوێژیان کردووه و زەکاتیان داوه، ئەوه پاداشتیان لای پەروەردگاریانه، ئەوه ترسیان لەبەر نییەو خەفەت ڕوویان تێناکات).

١٤١٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُنِيرٍ، سَمِعَ أَبَا النَّضْرِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ -هُوَ: ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ- عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ -وَلاَ يَقْبَلُ اللَّهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ- وَإِنَّ اللَّهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يُرَبِّيهَا لِصَاحِبِهِ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ[1] حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الجَبَلِ». تَابَعَهُ سُلَيْمَانُ عَنِ ابْنِ دِينَارٍ. وَقَالَ وَرْقَاءُ، عَنِ ابْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَرَوَاهُ مُسْلِمُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ وَزَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، وَسُهَيْلٌ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

**١٤١٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس بە ئەندازەی یەك دەنکە خورما لە ماڵێك کە بەحەلاڵ پەیداکراوە ببەخشێت - خواش ماڵی حەلاڵ نەبێ گیرای ناکات-، جا بێگومان خوای گەورە بەدەستی ڕاستی وەری دەگرێ، پاشان خوا گەشەی پێدەدات بۆ خاوەنەکەی، وەك ئەوەی کەسێکتان جوانووەکەی بە خێو دەکات، هەتا بەقەدەر کێوێکی لێ دێت (ئەوەندە گەورەی دەکات بۆ خاوەنەکەی))).**

**سولەیمان لە ئیبنو دینارەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە بەڕێگەیەکی تر پاڵپشتە بۆ ڕێگەکەی پێشوو. وە وەرقاو دەڵێ و دەگێڕێتەوە لە ئیبنو دینارەوە، ئەویش لە سەعیدی کوڕی یەسارەوە، لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە. وە موسلیمی کوڕی ئەبو مەریەم و زەیدی کوڕی ئەسلەم و سوهەیل لە ئەبو سالحەوە گێڕاویانەتەوە ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە.**

---

[1] فَلُوَّ: جاشولکە یان جوانووە، کە لەشیر بڕابێتەوە، یان یەک ساڵە بێت. بڕوانە: ئەلموندجید بە کوردی: ٧٠٣/٣.

[2] بڕوانە: ٧٤٣٠.

## ٩- بابُ الصَّدَقَةِ قَبْلَ الرَّدِّ

**١٤١١-** حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مَعْبَدُ بْنُ خَالِدٍ قَالَ: سَمِعْتُ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «تَصَدَّقُوا فَإِنَّهُ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ يَمْشِي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ، فَلاَ يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا، يَقُولُ الرَّجُلُ: لَوْ جِئْتَ بِهَا بِالأَمْسِ لَقَبِلْتُهَا، فَأَمَّا اليَوْمَ فَلاَ حَاجَةَ لِي بِهَا»[1].

## ٩- باسی ماڵ بەخشین پێش هاتنی ئەو ڕۆژەی کەس نییە وەری بگرێ

**١٤١١- حاریسەی کوڕی وەهب ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ماڵ ببەخشن، چونکە دڵنیابن ڕۆژگارێکتان بەسەردا دێت کەسێك زەکات و خێرەکەی دەبات، کەسی دەست ناکەوێ زەکاتەکەی لێ وەربگرێ، کەسەکە بەبەخشەرەکە دەڵێ: ئەگەر دوێنێ هێنابات وەرم دەگرت، بەڵام ئەمڕۆ هیچ پێویستیم پێی نییە)).**

**١٤١٢-** حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ المَالُ فَيَفِيضَ، حَتَّى يُهِمَّ[2] رَبَّ المَالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ، وَحَتَّى يَعْرِضَهُ فَيَقُولَ الذِي يَعْرِضُهُ عَلَيْهِ: لَا أَرَبَ لِي»[3].

---

[1] بڕوانە: ١٤٢٤، ٧١٢٠.

[2] يُهِمَّ واتە: خاوەن سامانەکە زۆر بەلایەوە گرنگە، وە لە هەندێک گێڕەرەوەکانی بوخاری بە (يَهُمُّ) هێناویانە، واتە خەفەتبار دەبێت کەس نیە ماڵەکەی وەربگرێ. بڕوانە: إرشاد الساري: ٥٢٨/٣.

[3] بڕوانە: ٨٥.

**١٤١٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت و هەڵناستێ، هەتا ماڵ و سامان لەنێوتاندا زۆر نەبێ و زیاتر دەبێ لە پێویستی خەڵك، هەتا وای لێ دێ خاوەن ماڵ و سامان زۆر بەلایەوە گرنگە کەسێك هەبێ زەکات و خێرەکەی وەربگرێ، وە هەتا بەکەسێك دەڵێ زەکاتی بداتێ، ئەو کەسەی پێی وتوە زەکاتەکەی بداتێ دەڵێ: پێویستیم پێی نییە)).**

١٤١٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ النَّبِيلُ، أَخْبَرَنَا سَعْدَانُ بْنُ بِشْرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو مُجَاهِدٍ، حَدَّثَنَا مُحِلُّ بْنُ خَلِيفَةَ الطَّائِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ عَدِيَّ بْنَ حَاتِمٍ ﷺ يَقُولُ: كُنْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَجَاءَهُ رَجُلاَنِ أَحَدُهُمَا يَشْكُو العَيْلَةَ، وَالآخَرُ يَشْكُو قَطْعَ السَّبِيلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمَّا قَطْعُ السَّبِيلِ فَإِنَّهُ لاَ يَأْتِي عَلَيْكَ إِلاَّ قَلِيلٌ حَتَّى تَخْرُجَ العِيرُ إِلَى مَكَّةَ بِغَيْرِ خَفِيرٍ، وَأَمَّا العَيْلَةُ فَإِنَّ السَّاعَةَ لاَ تَقُومُ حَتَّى يَطُوفَ أَحَدُكُمْ بِصَدَقَتِهِ لاَ يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا مِنْهُ، ثُمَّ لَيَقِفَنَّ أَحَدُكُمْ بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ حِجَابٌ وَلاَ تُرْجُمَانٌ يُتَرْجِمُ لَهُ، ثُمَّ لَيَقُولَنَّ لَهُ: أَلَمْ أُوتِكَ مَالًا؟ فَلَيَقُولَنَّ: بَلَى. ثُمَّ لَيَقُولَنَّ: أَلَمْ أُرْسِلْ إِلَيْكَ رَسُولًا؟ فَلَيَقُولَنَّ: بَلَى. فَيَنْظُرُ عَنْ يَمِينِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ النَّارَ، ثُمَّ يَنْظُرُ عَنْ شِمَالِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ النَّارَ، فَلْيَتَّقِيَنَّ أَحَدُكُمُ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ[1].

**١٤١٣- عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم ﷺ، دوو پیاو هاتنە خزمەتی: یەکێکیان سکاڵای هەژاری کرد و ئەویتریان سکاڵای بوو لەدەست ڕێگر و جەردە، پێغەمەری خواش ﷺ فەرمووی: ((جا سەبارەت بە ڕێگری و جەردەیی ئەوە بێگومان کاتێکی زۆرت بەسەردا تێناپەڕێ، هەتا وای لێ دێ کاروان دێت بۆ مەککە بەبێ پاسەوان، دەربارەی هەژاریش ئەوە بێگومان ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت، هەتا وای لێ دێ کەسێکتان زەکاتەکەی**

---

[1] بڕوانە: ١٤١٧، ٣٥٩٥، ٦٠٢٣، ٦٥٣٩، ٦٥٤٠، ٦٥٦٣، ٧٤٤٣، ٧٥١٢.

**دەگێڕێ، کەسی دەست ناکەوێ لێی وەربگرێ، پاشان هەریەك لە ئێوە لەبەردەم خوای گەورەدا ڕادەوەستێ، لە نێوان ئەو و خوادا پەردەو وەرگێڕ نییە کاری وەرگێڕی بۆ بکات، پاشان خوا پێی دەفەرموێ: ئایاماڵ و سامانم پێ نەدایت؟ ئەویش بەدڵنیاییەوە دەڵێ: بەڵێ: پێت دام، پاشان دەڵێ: ئایا پێغەمبەرم بۆ نەناردی؟ لەوەڵامدا بەبێگومان دەڵێ: بەڵێ ناردت، جا سەیری لای ڕاستی دەکات جگە لە ئاگر هیچی تر نابینێت، پاشان سەیری لای چەپی دەکات، دیسان جگە لە ئاگر هیچی تر نابینێت، دەی هەریەك لەئێوە با خۆی بپارێزێ لە ئاگری دۆزەخ، با بەلەتە خورمایەکیش بێت، خۆ ئەگەر ئەوەشی نەبوو، ئەوە با بەوشەیەکی جوان (کە لەگەڵ خەڵکیدا بیکات) خۆی بپارێزێ)).**

١٤١٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَطُوفُ الرَّجُلُ فِيهِ بِالصَّدَقَةِ مِنَ الذَّهَبِ، ثُمَّ لاَ يَجِدُ أَحَدًا يَأْخُذُهَا مِنْهُ، وَيُرَى الرَّجُلُ الوَاحِدُ يَتْبَعُهُأَرْبَعُونَ امْرَأَةً، يَلُذْنَ بِهِ مِنْ قِلَّةِ الرِّجَالِ وَكَثْرَةِ النِّسَاءِ».

**١٤١٤- ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان ڕۆژێك دێت بەسەر خەڵکیدا پیاو زەکاتی ئاڵتوونەکەی دەگێڕێ، پاشان کەسێکی دەست ناکەوێ لێی وەربگرێت، وە یەك پیاو دەبینرێ چل ئافرەت شوێنی دەکەون و پەنای پێ دەگرن، لەبەر کەمی پیاو و زۆری ئافرەت)).**

## ١٠- بابٌ: اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ وَالقَلِيلِ مِنَ الصَّدَقَةِ

﴿ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴿٢٦٦﴾ ﴾ البقرة.

## ١٠- باسێک: خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن با بەلەتە خورمایەک و کەمێک لەخێریش بێت

**خوای گەورە دەفەرموێ: (نموونەی ئەو کەسانەی ماڵ و دارایی خۆیان دەبەخشن لە پێناو ڕەزامەندی خوا، وە بۆ دامەزراندنی دڵ و دەروونیان (لەسەر چاکە)، وەك باخێك وایە كە بەشوێنێکی بەرزەوە بێت بارانی بەخوڕ و لێزمە لێی بدات، ئینجا دوو بەرانبەر میوە بگرێت، جا ئەگەر بارانی بەخوڕ و لێزمە لێی نەدات و نەرمە باران لێی بدات (هەر بەرهەمی دەبێت)، وە خوا بینایە بەوەی کە دەیکەن، ئایا کەس لە ئێوە ئاواتەخوازە کە باخێکی هەبێ لە دار خورماو جۆرەها درەختی مێو و ڕەز ڕووباری زۆر بەژێریاندا بڕوات، جۆرەها میوەو بەر لەو باخەدا هەبێ بۆ خاوەنەکەی).**

١٤١٥- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ الحَكَمُ -هُوَ: ابْنُ عَبْدِ اللهِ البَصْرِيُّ- حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ آيَةُ الصَّدَقَةِ كُنَّا نُحَامِلُ، فَجَاءَ رَجُلٌ فَتَصَدَّقَ بِشَيْءٍ كَثِيرٍ فَقَالُوا: مُرَائِي. وَجَاءَ رَجُلٌ فَتَصَدَّقَ بِصَاعٍ،

فَقَالُوا: إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَاعِ هَذَا. فَنَزَلَتِ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ ﴿٧٩﴾ ﴾ التوبة. الآيَةَ[1].

**١٤١٥- ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: کاتێ ئایەتی ماڵ بەخشین دابەزی، ئێمە حەماڵیمان دەکرد (تا ماڵ ببەخشین)، جا پیاوێك هات و شتێکی زۆری کرد بەخێر، (دووڕووەکان) وتیان ئەوە ڕیابازە، پیاوێکی تر هات مەنێك دانەوێڵەی کرد بەخێر، وتیان خوا پێویستی بەم مەنە دانەوێڵەی ئەو کابرایە نییە، ئیتر بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئەو (دووڕووانەی) کە تانەو تەشەر دەدەن لەو باوەڕدارانەی جگە لە زەکات ماڵ و سامانیان دەبەخشن، هەروەها تانە و تەشەر دەدەن لەو کەسانەی کە تەنها کەمێکیان هەیە بەزەحمەت پەیدایان کردووە (و دەیبەخشن)، ئینجا گاڵتەشیان پێ دەکەن، خواش گاڵتە بەوان دەکات، وە سزای سەختیشیان بۆ هەیە (لە ڕۆژی دواییدا) ).**

**١٤١٦-** حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَمَرَنَا بِالصَّدَقَةِ انْطَلَقَ أَحَدُنَا إِلَى السُّوقِ فَتَحَامَلَ، فَيُصِيبُ الْمُدَّ، وَإِنَّ لِبَعْضِهِمُ الْيَوْمَ لَمِائَةَ أَلْفٍ[2].

**١٤١٦- ئەبو مەسعودی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ دەکردین بەماڵ بەخشین، کەسێك لە ئێمە دەڕۆشت بۆ بازاڕ حەماڵی دەکرد و مشتێ گەنم یان جۆی پەیدا دەکرد (و دەیکرد بەخێر)، کەچی هەندێکیان ئەمڕۆ سەد هەزار (درهەمی) هەیە و(نایبەخشێت).**

---

[1] بڕوانە: ١٤١٦، ٢٢٧٣، ٤٦٦٨، ٤٦٦٩.

[2] بڕوانە: ١٤١٥.

١٤١٧- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَعْقِلٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَدِيَّ بْنَ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ»[1].

**١٤١٧- عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((خۆتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ با بەلەتە خورمایەکیش بێت)).**

١٤١٨- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: دَخَلَتِ امْرَأَةٌ مَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا تَسْأَلُ، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئًا غَيْرَ تَمْرَةٍ فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا، فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْنَا، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: «مَنِ ابْتُلِيَ مِنْ هَذِهِ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ»[2].

**١٤١٨- عائیشە ﷺ دەڵێ: ئافرەتێك لەگەڵ دوو کچی بچکۆلەیدا هات بۆماڵیان سواڵی دەکرد، جا هیچی دەست نەکەوت لای من یەك دەنکە خورما نەبێت، بۆیە پێمدا، ئافرەتەکە بەشی کرد لە نێوان دوو کچەکەیدا (یەکی لەتێکی دانێ)و خۆی لێی نەخوارد، پاشان هەستا و ڕۆیشت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ماڵەوەمان، منیش هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەرکەسێك خوا تاقی بکاتەوە بەم جۆرە ئافرەت و هەتیوانە (و خزمەتیان بکات)، ئەوە دەبنە پەرژین بۆی لە ئاگری دۆزەخ)).**

---

[1] بڕوانە: ١٤١٣.

[2] بڕوانە: ٥٩٩٥.

## ١١- بابٌ: أيُّ الصَّدَقَةِ أفضَلُ؟ وَصَدَقَةُ الشَّحِيحِ الصَّحِيحِ

لِقَوْلِهِ: ﴿ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ ﴿١٠﴾ ﴾ المنافقون. الآية. وَقَوْلِهِ: الآية.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ ﴿٢٥٤﴾ ﴾ البقرة.

## ١١- باسێک: کام ماڵ بەخشینە گەورەیە؟ وە ماڵ بەخشینی ڕژدەی لەشساغ

**بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (لەو ماڵ و سامانە ببەخشن کە پێمان داون، پێش ئەوەی مردن یەخە بە هەریەك لە ئێوە بگرێ) تا کۆتایی ئایەتەکە، وە لەبەر ئەم فەرمایشتەشی: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لەو ماڵ و سامانە ببەخشن کە پێمان داون، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کڕین و فرۆشتن و دۆستایەتی تێدانییە) تا کۆتایی ئایەتەکە.**

١٤١٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حدَّثَنَا عُمَارَةُ بْنُ القَعْقَاعِ، حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ أَجْرًا؟ قَالَ: «أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَخْشَى الفَقْرَ وَتَأْمُلُ الغِنَى، وَلاَ تُمْهِلُ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الحُلْقُومَ، قُلْتَ: لِفُلاَنٍ كَذَا، وَلِفُلاَنٍ كَذَا، وَقَدْ كَانَ لِفُلاَنٍ»[1].

**١٤١٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام ماڵ بەخشینە پاداشتی گەورەترە؟ فەرمووی: ((ئەوە کە تۆ ماڵێ ببەخشی لە کاتێکدا لەشت ساغەو دڵت نایە و ڕژدە بیت، لە هەژاری**

[1] بڕوانە: ٢٧٤٨.

**بترسی و هیوای دەوڵەمەندبوونت هەبێت، (ماڵ بەخشین) دوا مەخە تا ئەو کاتەی گیان دەگاتە گەرووت، ئینجا دەڵێت: ئەوە بۆ فلانە کەس و ئەوە و فیسارە کەس، ئەوەش کاتی خۆی داومە بە فلانە کەس)).**

## بابٌ

١٤٢٠- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ فِرَاسٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ بَعْضَ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ قُلْنَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَيُّنَا أَسْرَعُ بِكَ لُحُوقًا؟ قَالَ: «أَطْوَلُكُنَّ يَدًا». فَأَخَذُوا قَصَبَةً يَذْرَعُونَهَا، فَكَانَتْ سَوْدَةُ أَطْوَلَهُنَّ يَدًا، فَعَلِمْنَا بَعْدُ أَنَّمَا كَانَتْ طُولَ يَدِهَا الصَّدَقَةُ، وَكَانَتْ أَسْرَعَنَا لُحُوقًا بِهِ، وَكَانَتْ تُحِبُّ الصَّدَقَةَ.

## باسێک

**١٤٢٠- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ وتی: کاممان زووتر (لە قیامەتدا) بە خزمەتت دەگەین؟ فەرمووی: ((ئەوەتان دەستی درێژتر بێت))، ئەوانیش قامیشێکیان هێنا باڵیان دەپێوا، جا سەودە باڵی لە هەموویان درێژتر بوو، ئینجا دواتر زانیمان مەبەست لە دەستدرێژی سەودە ماڵ بەخشین بوو، سەودە[1] پێش هەموویان مردو گەیشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، چونکە ئەو زۆر حەزی لە ماڵ بەخشین بوو.**

---

[1] سەرنج: لەڕاستیدا زەینەبی کچی جەحش ﵂ لە پێش هەموویان مرد، هاتنی ناوی سەودە لەم فەرموودەیەدا یان هەڵەیە، یاخود عائیشە ﵂ لەبیری چۆتەوە کە زەینەب لە پێشدا مردووە، یاخود عائیشە مەبەستی ئەوە نییە کە ڕاستەوخۆ دوای پێغەمبەر سەودە مردووە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە زەینەب لە پێشدا مردووەو، بە هەڵە لەم فەرموودەیەدا ناوی سەودە هاتووە. بڕوانە: فتح الباري: ٦٦٣/٤.

## ١٢- بابُ صَدَقَةِ العَلَانِيَةِ

وَقَوْلِهِ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾ ﴾ البقرة: ٢٧٤.

## ١٢- باسی ماڵ بەخشینی ئاشکرا

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەو کەسانەی بە شەو و بەڕۆژ بە پەنهانی و بەئاشکرا ماڵ و سامانیان دەبەخشن، ئەوە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، هیچ ترسێکیان لەبەر نیە (لە داهاتوودا)، وە ئەوان خەفەتبار نابن (بۆ ڕابردوو) ).**

## ١٣- بابٌ: صَدَقَةِ السِّرِّ

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: .وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا صَنَعَتْ يَمِينُهُ.. وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ ﴿٢٧١﴾ ﴾ البقرة.

## ١٣- باسێک: ماڵ بەخشینی پەنهان

**ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە فەرموویەتی: ((وە پیاوێك ماڵێکی بەخشیوەو شاردوویەتیەوە هەتا لای چەپی نەزانێ لای ڕاستی چی کردووە و بەخشیوە، وە خوای گەورە فەرموویەتی: (ئەگەر ماڵ و بەخشینەکانتان ئاشکرا بکەن، ئەوە کارێکی باشە، وە ئەگەر بیشارنەوە بیدەن بە هەژاران ئەوە چاکترە بۆ خۆتان)).**

## ١٤- بابٌ: إِذَا تَصَدَّقَ عَلَى غَنِيٍّ وَهُوَ لَا يَعْلَمُ

١٤٢١- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ رَجُلٌ: لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِقٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ عَلَى سَارِقٍ. فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ زَانِيَةٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ. فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ، لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ غَنِيٍّ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ عَلَى غَنِيٍّ فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، عَلَى سَارِقٍ، وَعَلَى زَانِيَةٍ، وَعَلَى غَنِيٍّ. فَأُتِيَ، فَقِيلَ لَهُ: أَمَّا صَدَقَتُكَ عَلَى سَارِقٍ فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعِفَّ عَنْ سَرِقَتِهِ، وَأَمَّا الزَّانِيَةُ فَلَعَلَّهَا أَنْ تَسْتَعِفَّ عَنْ زِنَاهَا، وَأَمَّا الغَنِيُّ فَلَعَلَّهُ يَعْتَبِرُ فَيُنْفِقُ مِمَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ».

## ١٤- باسێک: ئەگەر ماڵی بەخشی بەدەوڵەمەند و نەیزانی دەوڵەمەندە

**١٤٢١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پیاوێك وتی: سوێند بەخوا خێرێك دەکەم، جا بەخێرەکەیەوە لە ماڵ دەرچوو کردیە دەستی دزێك، جا کە ڕۆژ بوویەوە خەڵك قسەیان دەکردو دەیانووت: پارەیەکی خێر دراوە بە دزێك، ئینجا پیاوەکە وتی: خوایە سوپاس تەنها بۆ تۆیە، سوێند بەخوا خێرێك دەکەم، جا لە ماڵ دەرچوو خێرەکەی بکات، خێرەکەی کردە دەستی ئافرەتێکی زیناکاری داوێنپیس، جا کە ڕۆژ بوویەوە خەڵك قسەیان دەکرد و دەیانوت: ئەمشەو ماڵێکی خێر دراوە بە ئافرەتێکی داوێنپیس، ئینجا کابرا وتی: خوایە سوپاس تەنها بۆ تۆیە، (کە ویستت وابوو ئەم خێرە) بۆ ئەو ئافرەتە زیناکارە بێت، سوێند بە خوا خێرێك دەکەم، جا ماڵەکەی لەگەڵ خۆی برد لە ماڵ دەرچوو، ئینجا نایە دەستی پیاوێکی دەوڵەمەند، جا کە ڕۆژ بوویەوە خەڵك قسەیان دەکرد و دەیانوت: ماڵێکی خێر**

دراوه به دەوڵەمەندێك، ئینجا کابرا وتی: خوایه سوپاس تەنها بۆ تۆیه (که ویستت وابوو ئەم خێره) بۆ دز و بۆ ئافرەتی زیناکەر و دەوڵەمەند بێت[1]، جا هاتنه خەوی و پێیان ووت: سەبارەت بەو ماڵەی بەخشیوته بەدزێك ئەوه بەڵکو وازبێنێ له دزیکردنەکەی، ئەوەشی داوته بەئافرەته داوێنپیسەکە، ئەویش بەڵکو وازبێنێ له زیناکردن، دەوڵەمەندەکەش بەڵکو پەند وەرگرێ و لەو ماڵەی خوا پێیداوه ببەخشێت و خێر بکات)).

## ١٥- بابٌ: إِذَا تَصَدَّقَ عَلَى ابْنِهِ وَهُوَ لاَ يَشْعُرُ

١٤٢٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، حَدَّثَنَا أَبُو الجُوَيْرِيَةِ، أَنَّ مَعْنَ بْنَ يَزِيدَ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَا وَأَبِي وَجَدِّي، وَخَطَبَ عَلَيَّ فَأَنْكَحَنِي، وَخَاصَمْتُ إِلَيْهِ، وَكَانَ أَبِي يَزِيدُ أَخْرَجَ دَنَانِيرَ يَتَصَدَّقُ بِهَا، فَوَضَعَهَا عِنْدَ رَجُلٍ فِي المَسْجِدِ، فَجِئْتُ فَأَخَذْتُهَا فَأَتَيْتُهُ بِهَا، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا إِيَّاكَ أَرَدْتُ. فَخَاصَمْتُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «لَكَ مَا نَوَيْتَ يَا يَزِيدُ، وَلَكَ مَا أَخَذْتَ يَا مَعْنُ».

## ١٥- باسێک: ئەگەر کەسێک ماڵێکی بەخشی بە کوڕی خۆی بێ ئەوەی هەست بکات

١٤٢٢- ئەبو جوەیرییه دەگێڕێتەوه که مەعنی کوڕی یەزید ﷺ بۆی گێڕایەوه و وتی: من لەگەڵ باوکم و باپیرم پەیمانمان دا به پێغەمبەری خوا ﷺ، وه خوازبێنی ئافرەتێکی بۆ کردم، (پێم دراو) مارەی کرد بۆم، کێشەیەکیشم هەبوو بردمه خزمەتی، یەزیدی باوکم چەند دینارێکی برد بیکات بەخێر، جا لای پیاوێك که

[1] (ئەمەی پێ ناخۆش بوو)، ئەم بەشه له فەرموودەکه له ڕیوایەتی تەبەرانیدا هاتووه. بڕوانه: إرشاد الساري: ٣/ ٥٤٠.

له مزگەوت بوو داینا (بیکات بەخێر بۆی)، منیش ڕۆیشتم وەرم گرت و هێنامەوە بۆ لای باوکم، باوکیشم وتی: سوێند بە خوا من مەبەستم نەبووە بە تۆ بدرێ، ئیتر بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ((یەزید تۆ نیەتەکەی خۆتت بۆ نووسراوە، مەعن تۆش ئەوەی کە وەرت گرتووە هی خۆتە)).

## ١٦- بابُ الصَّدَقَةِ بِاليَمِينِ

١٤٢٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي خُبَيْبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ تَعَالَى فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: إِمَامٌ عَدْلٌ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللَّهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي المَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ»[١].

## ١٦- باسی (ڕەوایەتی) ماڵ بەخشین بەدەستی ڕاست

١٤٢٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((حەوت جۆر کەس خوای بەرز و بڵند دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، لە ڕۆژێکدا هیچ سێبەرێك نییە جگە لەسێبەری ئەو (کە ئەمانەن): پێشەوایەکی دادگەر، گەنج و لاوێك لەنێو بەندایەتی خوادا گەورە بوو بێت (و لاوێتی بەسەر بردبێت)، وە پیاوێك دڵی پەیوەست بێت بەمزگەوتەکانەوە و هۆگریان بێت، وە دوو کەس لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێ، لەسەری (لەژیاندا) پێکەوەبن، وە لەسەر ئەو خۆشەویستییە لەیەکتری جیاببنەوە (بەمردنی

[١] بڕوانە: ٦٦٠.

یەكێكیان)، وە پیاوێك ئافرەتێكی خاوەن دەسەڵات و جوانی داوای كاری خراپی لێ بكات، پیاوەكەش بڵێ: من لە خوا دەترسم، وە پیاوێك ماڵێكی بەخشیبێت و شاردبێتەوە، هەتا لای چەپی نەزانێ لای ڕاستی چی دەبەخشێت، وە پیاوێك بەتەنیا بیر و یادی خوا بكات، چاوەكانی فرمێسكیان پێدا بێتە خوارەوە)).

١٤٢٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الجَعْدِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَعْبَدُ بْنُ خَالِدٍ قَالَ: سَمِعْتُ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ الخُزَاعِيَّ ﷺ يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «تَصَدَّقُوا، فَسَيَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ يَمْشِي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ، فَيَقُولُ الرَّجُلُ: لَوْ جِئْتَ بِهَا بِالأَمْسِ لَقَبِلْتُهَا مِنْكَ، فَأَمَّا اليَوْمَ فَلاَ حَاجَةَ لِي فِيهَا»[1].

١٤٢٤- حاریسەی كوڕی وەهبی خوزاعی ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ماڵ ببەخشن، چونكە دڵنیابن ڕۆژگارێكتان بەسەردا دێت كەسێك زەكات و خێرەكەی دەبات، ئینجا كابرا[2] دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بتهێنایە لێتم وەردەگرت، بەڵام ئەمڕۆ هیچ پێویستیم پێی نییە)).

## ١٧- بَابُ مَنْ أَمَرَ خَادِمَهُ بِالصَّدَقَةِ وَلَمْ يُنَاوِلْ بِنَفْسِهِ

وَقَالَ أَبُو مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «هُوَ أَحَدُ المُتَصَدِّقِينَ»[3].

١٤٢٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَنْفَقَتِ المَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، كَانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتْ، وَلِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا كَسَبَ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ، لاَ يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرَ بَعْضٍ شَيْئًا»[1].

---

[1] بڕوانە: ١٤١١.

[2] كابرای كە بەخشەرەكە دەیەوێ ماڵ و خێرەكەی پێ بدات دەڵێ ... .

[3] بڕوانە: ١٤٣٨.

## ١٧- باسی ئەو کەسەی فەرمان بدات بە خزمەتکارەکەی ماڵ ببەخشێ و بەخۆی پێی هەڵنەستێ

**ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: (((ئەو کەسەی خەزنەدارە و فەرمانی پێ دەکرێ ماڵێك ببەخشێ)، یەکێکە لەو دوو کەسەی ماڵیان بەخشیوە)).**

**١٤٢٥- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئافرەت لە خۆراکی ماڵەوەی ببەخشێت بەبێ دەست بڵاوی، ئەوە پاداشتی ئەوەی هەیە کە بەخشیویەتی، وە مێردەکەشی پاداشتی هەیە بەهۆی ئەوەی پەیدای کردووە، هەروەها وێنەی ئەو پاداشتە بۆ دەرگاوانی[٢] پارە هەیە، هیچ کام لەمانە هیچێك لە پاداشتی یەکتری کەم ناکەنەوە)).**

## ١٨- بابٌ: لاَ صَدَقَةَ إلاَّ عَنْ ظَهْرِ غِنًى

وَمَنْ تَصَدَّقَ وَهْوَ مُحْتَاجٌ، أَوْ أَهْلُهُ مُحْتَاجون، أَوْ عَلَيْهِ دَيْنٌ، فَالدَّيْنُ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى مِنَ الصَّدَقَةِ وَالعِتْقِ وَالهِبَةِ، وَهْوَ رَدٌّ عَلَيْهِ، لَيْسَ لَهُ أَنْ يُتْلِفَ أَمْوَالَ النَّاسِ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ إِتْلاَفَهَا أَتْلَفَهُ اللَّهُ»[٣]. إلاَّ أَنْ يَكُونَ مَعْرُوفًا بِالصَّبْرِ فَيُؤْثِرَ عَلَى نَفْسِهِ وَلَوْ كَانَ بِهِ خَصَاصَة، كَفِعْلِ أَبِي بَكْرٍ حِينَ تَصَدَّقَ بِمَالِهِ، وَكَذَلِكَ آثَرَ الأَنْصَارُ المُهَاجِرِينَ، وَنَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ إِضَاعَةِ المَالِ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُضَيِّعَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِعِلَّةِ الصَّدَقَةِ[٤].

---

[١] بڕوانە: ١٤٣٧، ١٤٣٩، ١٤٤٠، ١٤٤١، ٢٠٦٥.

[٢] ئەو کەسەیە کە بەرپرسە لە دارایی و سەرپەرشتی دەکات، کاتێ فەرمانی پێ بکرێت ماڵێک بدات بە هەژارێک، ئەویش بەشدارە لە خێرەکەدا کە ئەو فەرمانە جێ بەجێ دەکات.

[٣] بڕوانە: ٢٣٨٧.

[٤] بڕوانە: ٨٤٤.

وَقَالَ كَعْبُ بنُ مالك: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ ﷺ. قَالَ: «أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ، فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ». قُلْتُ فَإِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِي الذِي بِخَيْبَرَ[1].

## ١٨- باسێک: خێرکردن دەبێ لەسەر تێری بێت

**كەسێك ماڵ ببەخشێت خۆی یان ماڵ و منداڵی پێویستییان بەو ماڵەبێت، یان قەرزدار بێت، ئەوە قەرزدانەوەكە هەقتر و لەپێشترە لە ماڵ بەخشین و كۆیلە ئازادكردن، بەخشش (ئەگەر ئەم كارانە بكات) ئەوە پارەكەی دەدرێتەوە، چونكە ڕەوا نییە بۆی ماڵ و سامانی خەڵك بفەوتێنێ. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەركەس ماڵی خەڵك ببات (بەقەرز)و بیەوێ لە ناوی ببات و بیفەوتێنێ، خوا لە ناوی دەبات))، مەگەر كەسێك بێت ناسراو بێت بە ئارامگری و باوی خەڵك بدات بەسەرخۆیدا، با خۆشی زۆر پێویستی بەو پارە هەبێ، وەك ئەوەی ئەبو بەكر كردی كاتێ هەموو ماڵەكەی كرد بەخێرو بەخشی، هەروەها ئەنصارییەكان كۆچەرییەكانیان لە خۆیان پێشخست و باویان دان بەسەر خۆیاندا، وە پێغەمبەر ﷺ ماڵ بەفیڕۆدانی قەدەغەكردووە، كەواتە: نابێ ماڵ و سامانی خەڵكی بە بیانووی ماڵ بەخشین لەنێو ببات.**

**كەعبی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی بەشێ لە تەوبەو پەشیمانییەكەم ئەوەیە واز لەهەموو ماڵ و سامانەكەم بێنم، بیكەمە خێر بۆ خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ فەرمووی: ((هەندێ لە سامانەكەت بۆ خۆت بهێڵەرەو، ئەوە چاكترە بۆ خۆت))، منیش وتم: دەباشە ئەو بەشەی لەخەیبەر بەرم كەوت دەیهێڵمەوە.**

---

[1] بڕوانە: ٢٧٥٧.

١٤٢٦- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»[1].

**١٤٢٦- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمووی: ((چاكترین ماڵ بەخشین ئەوەیە لەسەر تێری بێ[2]، وە لەو كەسانەوە دەست پێبكە (بەخەرجكردنی ماڵ بۆیان) كە بژێویان لەسەر تۆیە)).**

١٤٢٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ».

**١٤٢٧- حەكیمی كوڕی حیزام ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((دەستی سەرەوە چاكترە لە دەستی ژێرەوە، وە بەو كەسانە دەست پێبكە كە خەرجییان لەسەر تۆیە، وە چاكترین ماڵ بەخشین ئەوەیە لەسەر تێری بێت، وە ئەو كەسەی كەخۆی لە داواكردن بپارێزێ، خواش دەیپارێزێ، هەر كەسیش بێ نیاز بێ (لە خەڵك)، خواش بێ نیازی دەكات)).**

١٤٢٨- وَعَنْ وُهَيبٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هريرَةَ ﷺ بهذا[3].

**١٤٢٨-(ئەم فەرموودەیە بەم ڕێگەش هاتووە): وهەیب دەڵێ: هیشام لە باوكیەوە بۆی گێڕاینەوە، ئەویش لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە.**

---

[1] بڕوانە: ١٤٢٨، ٥٣٥٥، ٥٣٥٦.

[2] واتە: خاوەنی خێرەكە پێویستی بەو ماڵە نەبێت دەیبەخشێت لە پێویستییەكانی زیاد بێت.

[3] بڕوانە: ١٤٢٦.

١٤٢٩- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ ح[1].

وَحَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ وَهُوَ عَلَى المِنْبَرِ، وَذَكَرَ الصَّدَقَةَ وَالتَّعَفُّفَ وَالمَسْأَلَةَ: «اليَدُ العُلْيَا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى، فَاليَدُ العُلْيَا هِيَ المُنْفِقَةُ، وَالسُّفْلَى هِيَ السَّائِلَةُ».

**١٤٢٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا لەسەر دوانگە بوو، باسی ماڵ بەخشین و خۆپاراستن لە داواکردن و سواڵکردنی کردو فەرمووی: ((دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی ژێرەوە، دەستی سەرەوە ئەو دەستەیە دەبەخشێت، دەستی ژێرەوەش ئەو دەستەیە سواڵ دەکات)).**

## ١٩- بابُ المَنَّانِ بِمَا أَعْطَى

لِقَوْلِهِ تعالى: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنًّا وَلَآ أَذًى ﴿٢٦٢﴾ ﴾ البقرة. الآيَةَ.

## ١٩- باسی ئەوەی زۆر منەت دەکات بەسەر خەڵکدا بەهۆی بەخشینەکەیەوە

**بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەو کەسانەی لەڕێی خوادا ماڵ دەبەخشن، پاشان بە شوێن ئەوەدا کە بەخشیویانە منەت ناکەن و ئازاری دڵی هەژاران نادەن، ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، کە نەترسیان لەسەرە و نەخەفەتبار دەبن).**

---

[1] ئەم فەرموودەیە بە دوو ڕشتە و سەنەد ڕیوایەت کراوە.

## ٢٠- بابُ مَنْ أَحَبَّ تَعْجِيلَ الصَّدَقَةِ مِنْ يَوْمِهَا

١٤٣٠- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، أَنَّ عُقْبَةَ بْنَ الحَارِثِ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ العَصْرَ، فَأَسْرَعَ ثُمَّ دَخَلَ البَيْتَ، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ خَرَجَ، فَقُلْتُ -أَوْ قِيلَ- لَهُ، فَقَالَ: «كُنْتُ خَلَّفْتُ فِي البَيْتِ تِبْرًا[١] مِنَ الصَّدَقَةِ، فَكَرِهْتُ أَنْ أُبَيِّتَهُ فَقَسَمْتُهُ»[٢].

## ٢٠- باسی ئەوەی بیەوێ و حەز بکات لەپێش کاتی خۆی خێر و ماڵ بەخشینەکە ئەنجام بدات

**١٤٣٠- عوقبەی کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی نوێژی عەسری بۆ کردین، جا پەلەی کرد، پاشان چۆیەوە ماڵەوە[٣]، ئینجا زۆری پێ نەچوو هاتە دەرەوە، من پێم وت -یان پێی وترا-[٤]: پێغەمبەریش فەرمووی: ((پارچە ئاڵتوونێکی زەکاتم لە ماڵەوە بەجێ هێشتبوو، حەزم نەکرد شەوی بەسەردا بێت لەلام، بۆیە دابەشم کرد)).**

## ٢١- بابُ التَّحْرِيضِ عَلَى الصَّدَقَةِ وَالشَّفَاعَةِ فِيهَا

١٤٣١- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَدِيٌّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ عِيدٍ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ، ثُمَّ مَالَ عَلَى النِّسَاءِ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ أَنْ يَتَصَدَّقْنَ، فَجَعَلَتِ المَرْأَةُ تُلْقِي القُلْبَ وَالخُرْصَ[٥].

---

[١] تِبر واتە: خۆڵی ئاڵتوون، لە فەرموودەکەدا مەبەستی پارچە ئاڵتوون و زیوە پێش کردنی بەخشڵ یان سکە و پارە.

[٢] بڕوانە: ٨٥١.

[٣] پێشتر ئەم فەرموودەیە بەمجۆرە هاتووە: (فَسَلَّمَ ثَمَّ قَامَ مُسرعاً)، واتە: جا سەلامی نوێژەکەی دایەوە پاشان هەستا و بەپەلە ڕۆیشت (بۆ ماڵەوە) فەرموودە ژمارە (٨٥١)ی صەحیحی بوخاری. إرشاد الساري: ٥٥٥/٣.

[٤] بۆچی وا بەپەلە ڕۆیشت و گەڕایەوە.

[٥] بڕوانە: ٩٨.

# ٢١- باسی هاندان لەسەر ماڵ بەخشین، (پاداشتی) تکاکردن لە ماڵ بەخشیندا

**١٤٣١- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی جەژندا پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە ڕۆیشتە دەرەوە (بۆ نوێژگە)، جا دوو ڕکات نوێژی جەژنی کرد، نە لەپێش و نە لەپاشیەوە نوێژی نەکرد، پاشان ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتان، بیلالیشی لەگەڵدا بوو، ئینجا ئامۆژگاری ئافرەتانی کرد و فەرمانی پێکردن کە ماڵ ببەخشن، ئافرەتانیش دەستیان کرد بە هەڵدانی بازن و گوارەکانیان (بۆ بیلال).**

١٤٣٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، حَدَّثَنَا أَبُو بُرْدَةَ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو بُرْدَةَ بْنُ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا جَاءَهُ السَّائِلُ، أَوْ طُلِبَتْ إِلَيْهِ حَاجَةٌ قَالَ: «اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا، وَيَقْضِي اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ ﷺ مَا شَاءَ»[1].

**١٤٣٢- ئەبو بوردە لە ئەبو مووسای باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سوالکەرێ هاتبایە بۆ خزمەتی، یان داوای پێویستییەکی لێ بکرایە دەیفەرموو: ((تکای بۆ بکەن پاداشت دەدرێنەوە، خواش هەر بڕیارێکی بوێ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی دەیدات)).**

١٤٣٣- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الفَضْلِ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تُوكِي فَيُوكَى عَلَيْكِ».

حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، عَنْ عَبْدَةَ، وَقَالَ: «لاَ تُحْصِي فَيُحْصِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٦٠٢٧، ٦٠٢٨.

[2] بڕوانە: ١٤٣٤، ٢٥٩٠.

**١٤٣٣- ئەسما ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: (( (ماڵ ببەخشە و دەست مەگرەوە و دەمی کیسەکەت مەبەستە، ئەگینا خواش لەتۆی دەبەستێت و دەیگرێتەوە)) [1].**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ): عوسمانی کوڕی ئەبی شەیبە لە عەبدەوە بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( (ئەو ماڵەی دەیبەخشی) مەیژمێرەو بەزۆری مەزانە، ئەگەرنا خواش لەسەرت هەڵدەژمێرێ لێت دەگرێتەوە)).**

## ٢٢- بابُ الصَّدَقَةِ فِيمَا اسْتَطَاعَ

١٤٣٤- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ. وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، عَنْ حَجَّاجِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ أَنَّهَا جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «لاَ تُوعِي فَيُوعِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ، ارْضَخِي مَا اسْتَطَعْتِ» [2].

## ٢٢- باسی ماڵ بەخشین ئەوەندەی لەتوانادایە

**١٤٣٤- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەگێڕێتەوە کە هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی پێی: (( (ماڵ ببەخشە) لە پیاسکە و کیسەدا هەڵیمەگرە، ئەگەرنا خواش لەتۆی دەگرێتەوە، چەند دەتوانی کەم کەم لێی ببەخشە)).**

---

[1] واتە: گەر وا بکەیت خواش ڕزق و ڕۆزی تۆ دەبڕێت.

[2] بڕوانە: ١٤٣٣.

## ٢٣- بابٌ: الصَّدَقَةُ تُكَفِّرُ الخَطِيئَةَ

١٤٣٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: أَيُّكُمْ يَحْفَظُ حَدِيثَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَنِ الفِتْنَةِ؟ قَالَ: قُلْتُ: أَنَا أَحْفَظُهُ كَمَا قَالَ. قَالَ: إِنَّكَ عَلَيْهِ لَجَرِيءٌ، فَكَيْفَ قَالَ؟ قُلْتُ: فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصَّدَقَةُ وَالمَعْرُوفُ. قَالَ سُلَيْمَانُ: قَدْ كَانَ يَقُولُ: «الصَّلاَةُ وَالصَّدَقَةُ، وَالأَمْرُ بِالمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ المُنْكَرِ». قَالَ: لَيْسَ هَذِهِ أُرِيدُ، وَلَكِنِّي أُرِيدُ الَّتِي تَمُوجُ كَمَوْجِ البَحْرِ. قَالَ: قُلْتُ: لَيْسَ عَلَيْكَ بِهَا يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ بَأْسٌ، بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابٌ مُغْلَقٌ. قَالَ: فَيُكْسَرُ البَابُ أَوْ يُفْتَحُ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ. بَلْ يُكْسَرُ. قَالَ: فَإِنَّهُ إِذَا كُسِرَ لَمْ يُغْلَقْ أَبَدًا. قَالَ: قُلْتُ: أَجَلْ.

فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَهُ مَنِ البَابُ، فَقُلْنَا لِمَسْرُوقٍ: سَلْهُ. قَالَ: فَسَأَلَهُ. فَقَالَ: عُمَرُ ﷺ. قَالَ: قُلْنَا: فَعَلِمَ عُمَرُ مَنْ تَعْنِي؟ قَالَ: نَعَمْ، كَمَا أَنَّ دُونَ غَدٍ لَيْلَةً، وَذَلِكَ أَنِّي حَدَّثْتُهُ حَدِيثًا لَيْسَ بِالأَغَالِيطِ[1].

## ٢٣- باسێک: ماڵ بەخشین تاوان دەسڕێتەوە

**١٤٣٥- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: لەلای عومەردا ﷺ دانیشتبووین وتی: کامتان دەربارەی ئاژاوەو بەلا فەرموودەی پێغەمبەری خوای ﷺ لەبەرە؟ وتم: من لەبەرمە، عومەر وتی: بێگومان تۆ چاونەترسی[2]، وتم: بەلاو ئاشووب و تاوان کە تووشی مرۆڤ دەبن بەهۆی کەس و کار و ماڵ و منداڵ و دراوسێیەوە، نوێژ و ڕۆژوو ماڵ بەخشین و فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەیسڕێتەوە، عومەر وتی: ئەم جۆرەم ناوێ، بەڵکو ئەو ئاژاوەم دەوێ کە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدات، حوزەیفە وتی: ئەو ئاژاوەیە هیچ زیانێکی بۆ تۆ نابێ ئەی پێشەوای ئیمانداران، چونکە بەڕاستی لە نێوان تۆ و ئەو ئاژاوەدا دەرگایەکی داخراو**

---

[1] بڕوانە: ٥٢٥.

[2] سەبارەت بە گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ یان سەبارەت بەو فەرموودەیەی عومەر پرسیاری کرد لەبارەیەوە.

هەیە، عومەر وتی: ئایا ئەو دەرگایە دەشكێنرێ یان دەكرێتەوە؟ حوزەیفە وتی: دەشكێنرێ، عومەر وتی: كەواتە هەتا هەتایە داناخرێتەوە؟ حوزەیفە دەڵێ: وتم: ڕاستە وایە.

(شەقیق) دەڵێ: ترساین پرسیار لە حوزەیفە بكەین دەرگاكە كێیە؟ بۆیە بە مەسروقمان وت: پرسیاری لێ بكە (دەرگاكە كێیە؟)، وتی: مەسروقیش پرسیاری لێ كرد، (حوزەیفە) وتی: دەرگاكە عومەرە ﷺ، شەقیق دەڵێ: وتمان (بە حوزەیفە): ئایا عومەر دەیزانی ئەو دەرگایە چییە؟ حوزەیفە وتی: بەڵێ دەیزانی وەك چۆن دەیزانی ئەم شەو پێش سبەینێیە، چونكە بێگومان من فەرموودەیەكم بۆ گێڕایەوە، هیچ هەڵەو تێكەڵ و پێكەڵییەكی تێدانییە.

## ٢٤- بابُ مَنْ تَصَدَّقَ فِي الشِّرْكِ ثُمَّ أَسْلَمَ

١٤٣٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ أَشْيَاءَ كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الجَاهِلِيَّةِ مِنْ صَدَقَةٍ أَوْ عَتَاقَةٍ وَصِلَةِ رَحِمٍ، فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَجْرٍ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ مِنْ خَيْرٍ»[1].

## ٢٤- باسی كەسێک لە كاتی بتپەرستیدا ماڵی بەخشی بێ، پاشان مسوڵمان بێ

١٤٣٦- حەكیمی كوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ دەربارەی شتانێك كە من لە سەردەمی نەفامیدا لەبەر خوا دەمكرد لە

[1] بڕوانە: ٢٢٢٠، ٢٥٣٨، ٥٩٩٢.

**ماڵ بەخشین و کۆیلە ئازادکردن و بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی، ئایا هیچ پاداشتێکیان هەیە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تۆ لەسەر (گیرابوونی) ئەو چاکانە مسوڵمان بوویت کە پێشتر کردووتە)).**

## ٢٥- بابُ أَجْرِ الخَادِمِ إِذَا تَصَدَّقَ بِأَمْرِ صَاحِبِهِ غَيْرَ مُفْسِدٍ

١٤٣٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَصَدَّقَتِ المَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ زَوْجِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ كَانَ لَهَا أَجْرُهَا، وَلِزَوْجِهَا بِمَا كَسَبَ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ»[1].

## ٢٥- باسی پاداشتی خزمەتکار ئەگەر بە فەرمانی خاوەنەکەی ماڵ ببەخشێ بێ دەست بڵاوی

**١٤٣٧- عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئافرەت لە خۆراکی ماڵی مێردەکەی ببەخشێت بەبێ دەست بڵاوی، ئەوە پاداشتی ئەوەی هەیە (کە بەخشیوویەتی)، وە مێردەکەشی پاداشتی هەیە بەهۆی ئەوەی پەیدای کردەوە، هەروەها بە وێنەی ئەو پاداشتە بۆ دەرگاوانی[2] پارە هەیە)).**

١٤٣٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ العَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الخَازِنُ المُسْلِمُ الأَمِينُ الذِي يُنْفِذُ -وَرُبَّمَا قَالَ: يُعْطِي- مَا أُمِرَ بِهِ كَامِلًا مُوَفَّرًا طَيِّبٌ بِهِ نَفْسُهُ، فَيَدْفَعُهُ إِلَى الذِي أُمِرَ لَهُ بِهِ أَحَدُ المُتَصَدِّقَيْنِ»[3].

---

[1] بڕوانە: ١٤٢٥.

[2] ئەو کەسەیە کە بەرپرسە لە دارایی و سەرپەرشتی دەکات، کاتێ فەرمانی پێ بکرێت ماڵێک بدات بە هەژارێک، ئەویش بەشدارە لەخێرەکەدا کە ئەو فەرمانە جێ بەجێ دەکات.

[3] بڕوانە: ٢٢٦٠، ٢٣١٩.

**١٤٣٨- ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خەزنەداری مسوڵمانی دەست پاك ئەوەی فەرمانی پێی کراوە جێ بەجێی دەکات- هەندێ جار دەیوت: دەیدات- بەتەواوی و خۆشحاڵییەوە دەیدات، بەو کەسەی فەرمانی پێکراوە بیدرێتێ، ئەو خەزنەدارە یەکێکە لە دوو بەخشەرەکە)).**

## ٢٦- بابُ أَجْرِ المَرْأَةِ إِذَا تَصَدَّقَتْ أَوْ أَطْعَمَتْ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ

١٤٣٩- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ وَالأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ تَعْنِي: «إِذَا تَصَدَّقَتِ المَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا[1]»[2].

## ٢٦- باسی پاداشتی ئافرەت ئەگەر پارە، یان خۆراکی بەخشی لە ماڵی مێردەکەی بێ زیادەڕۆیی

**١٤٣٩- عائیشە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە مەبەستی ئەوەیە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر ئافرەت لە ماڵی مێردەکەی ماڵ و سامانی بەخشی)).**

١٤٤٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا أَطْعَمَتِ المَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، لَهَا أَجْرُهَا، وَلَهُ مِثْلُهُ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ، لَهُ بِمَا اكْتَسَبَ، وَلَهَا بِمَا أَنْفَقَتْ»[3].

---

[1] ئیمامی بوخاری لێرەدا بەشێکی فەرموودەکەی هێناوە لە ڕیوایەتەکانی تردا بە تەواوی فەرموودەکە دێنێت، لێرە دەیەوێ ئاماژە بکات بە ڕیوایەتەکان لە عائیشەوە ﷺ والله اعلم.

[2] بڕوانە: ١٤٢٥.

[3] بڕوانە: ١٤٢٥.

**١٤٤٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئافرەت لە ماڵی مێردەكەی خۆراك ببەخشێت بێ زیادەڕۆیی، ئەوە پاداشتی ئەو بەخشینەی بۆ هەیە، مێردەكەشی بەوێنەی ئەو پاداشتی بۆ هەیە، وە خەزنەداریش بەوێنەی ئەو پاداشتەی بۆ هەیە، پاداشتی مێردەكەی بەهۆی ئەوەوەیە كەپەیدای كردووە، وە پاداشتی ئافرەتەكەش بەهۆی ئەوەوەیە كە بەخشیویەتی)).**

١٤٤١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ يَحْيَى، أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَنْفَقَتِ المَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، فَلَهَا أَجْرُهَا، وَلِلزَّوْجِ بِمَا اكْتَسَبَ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ»[1].

**١٤٤١- عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ئەگەر ئافرەت لە خۆراكی ماڵەكەی ببەخشێت و زیادەڕۆیی نەكات، ئەوە پاداشتی ئەو بەخشینەی بۆ هەیە، مێردەكەشی پاداشتی پەیداكردنەكەی بۆ هەیە، خەزنەداریش بە هەمان شێوە پاداشتی هەیە)).**

## ٢٧- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى:

﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ (٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ (٧) وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ (٩) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ (١٠) ﴾ الليل. «اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقَ مَالٍ خَلَفًا».

١٤٤٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي مُزَرِّدٍ، عَنْ أَبِي الحُبَابِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ العِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ، فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، وَيَقُولُ الآخَرُ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا».

---

[1] بروانە: ١٤٢٥.

## ٢٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند:

**(ئینجا ئەو کەسەی ماڵ ببەخشێ و لە خوا بترسێ و پارێزکار بێت و باوەڕی بێ بەوەی کە زۆر چاکە (لا إله إلا الله یان بەهەشت)، ئەوە بێگومان یارمەتی دەدەین بۆ ڕێگای ئاسان، بەڵام ئەوکەسەی ڕژدەیی بکات و خۆی بێ نیاز بزانێ و باوەڕی نەبێ بەوەی کە زۆر چاکە، ئەوە بێگومان ڕێگای سەختی بۆ ئاسان دەکەین)، (پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ): ((خوایە ئەوەی ماڵ دەبەخشێت لە جیاتی ئەوە ماڵی تری بدەرێ و شوێنەکەی بۆ پڕ بکەرەوە)).**

**١٤٤٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هیچ ڕۆژێك نییە بەندەکان بەیانی بکەنەوە مەگەر دوو فریشتە دێن، جا یەکێکیان دەڵێ: خوایە ئەوەی ماڵ دەبەخشێ شوێنەکەی بۆ پڕکەرەوە، ئەوی تریان دەڵێ: خوایە ئەوەی دەست قوچاوەو نابەخشێت (سامانەکەی) لەناو ببە)).**

## ٢٨- بابُ مَثَلِ المُتَصَدِّقِ وَالبَخِيلِ

١٤٤٣- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَثَلُ البَخِيلِ وَالمُتَصَدِّقِ كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ، عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ». وَحَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَثَلُ البَخِيلِ وَالمُنْفِقِ كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ، عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ، مِنْ ثُدِيِّهِمَا إِلَى تَرَاقِيهِمَا، فَأَمَّا المُنْفِقُ فَلاَ يُنْفِقُ إِلاَّ سَبَغَتْ -أَوْ وَفَرَتْ- عَلَى جِلْدِهِ حَتَّى تُخْفِيَ بَنَانَهُ وَتَعْفُوَ أَثَرَهُ، وَأَمَّا البَخِيلُ فَلاَ يُرِيدُ أَنْ يُنْفِقَ شَيْئًا إِلاَّ لَزِقَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ مَكَانَهَا، فَهُوَ يُوَسِّعُهَا وَلاَ تَتَّسِعُ». تَابَعَهُ الحَسَنُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ طَاوُسٍ: فِي الجُبَّتَيْنِ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٤٤٤، ٢٩١٧، ٥٢٩٩، ٥٧٩٧.

# ٢٨-نموونەی بەخشەر و ڕەزیل

١٤٤٣- ئیبنو تاووس لە باوكیەوە، ئەویش گێڕایەوە لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نموونەی ڕەزیل و بەخشەر وەك دوو پیاو وان، دوو زرێی جەنگییان لەبەردابێت))، هەروەها ئەبولیەمان بۆی گێڕاینەوە، وتی: شوعەیب بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەبو زیناد بۆی گێڕاینەوە كە عەبدوڕەحمان بۆی گێڕاوەتەوە، كە لە ئەبو هوڕەیرەی بیستووە، ئەبو هوڕەیرەش ﷺ دەگێڕێتەوە كە خۆی لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست دەیفەرموو: ((نموونەی ڕەزیل و بەخشەر وەك دووپیاو وان، دوو زرێی جەنگییان لەبەردابێت، لە هەردوو مەمكیانەوە تا شان و ملیان دایپۆشیبێ، جا ئەوەیان ماڵ دەبەخشێت، هەر كە ماڵێك دەبەخشێت زرێیكە زیاتر لە لاشەی دادەپۆشێت -یان دایدەپۆشێت - بەسەر پێستیدا، هەتا دەگاتە سەر پەنجەكانی و شوێن پێیەكانی دەسڕێتەوە[١]، بەلام ئەوەی ڕەزیلە هەر كە دەیەوێت شتێك ببەخشێت، هەموو ئەلقەكانی لە شوێنی خۆیاندا دێنەوە یەك، جا هەوڵ دەدات فراوانی بكات، بەلام زرێكە فراوان نابێت))، حەسەنی كوڕی موسلیم لە تاووسەوە فەرموودەكەی گێڕاوەتەوە كە پاڵپشتی فەرموودەی تاووس دەكات لە بەشی (دوو زرێی جەنگیدا).

١٤٤٤- وَقَالَ حَنْظَلَةُ عَنْ طَاوُسٍ: «جُنَّتَانِ». وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرٌ، عَنِ ابْنِ هُرْمُزٍ، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «جُنَّتَانِ»[٢].

---

[١] واتە: دەخشێ بە زەویدا، ئەوەندە درێژەو شوێن پێیەكانی دەسڕێتەوە.

[٢] بڕوانە: ١٤٤٣.

١٤٤٤- حەنزەڵە لە تاووسەوە بە (جُنَّتَانِ) (دوو زرێی جەنگی) گێڕاویەتیەوە، لەیس دەڵێ: جەعفەر لە ئیبنو هورموزەوە بۆی گێڕامەوە دەڵێ: لە ئەبو هوڕەیڕەم بیست ﷺ لە پێغەمبەرەوە بە (جُنَّتَانِ) گێڕایەوە.

## ٢٩- بابُ صَدَقَةِ الكَسْبِ وَالتِّجَارَةِ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ﴾ البقرة.

## ٢٩- باسی بەخشین لە ماڵی کەسابەت و بازرگانی

بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند: (ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە لەو سامانە حەڵاڵ و پاکەی پەیداتان کردووە وە لەوەی کە لە زەویدا بۆمان ڕواندوون ببەخشن، مەڕۆن لەوەی کە خراپە ببەخشن لەکاتێکدا کە خۆتان ئەو ماڵە خراپە وەرناگرن (ئەگەر پێتان بدرێ)، مەگەر چاوی لێ بپۆشن، وە چاك بزانن کە خوا بێ نیازی شایستەی ستایشە).

## ٣٠- بابٌ: عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ، فَمَن لم يَجِدْ فَلْيَعمَلْ بالمعروف

١٤٤٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ». فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ قَالَ:

«يَعْمَلُ بِيَدِهِ فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ وَيَتَصَدَّقُ». قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: «يُعِينُ ذَا الحَاجَةِ الْمَلْهُوفَ». قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: «فَلْيَعْمَلْ بِالْمَعْرُوفِ، وَلْيُمْسِكْ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ»[1].

## ٣٠- باسێک: هەموو مسوڵمانێک پێویستە خێرێك بكات، جا هەرکەس نەیبوو، با چاکەیەک لەگەڵ خەڵكدا بكات

**١٤٤٥- سەعیدی كوڕی ئەبی بوردە دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە و لە باپیریەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((هەموو مسوڵمانێك لەسەریەتی خێرێك بكات))، پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەگەر كەسێك نەیبوو؟ فەرمووی: ((بەدەست و بازووی كاربكات سوود بەخۆی بگەیەنێ بیشیكات بەخێر))، پێیان وت: ئەی ئەگەر نەیتوانی و نەیبوو؟ فەرمووی: ((یارمەتی كەسێك بدات كە هانای بۆ هێنا بۆ پێویستییەكی))، پێیان وت: ئەی ئەگەر نەیبوو نەیتوانی؟ فەرمووی: ((با ئەوەی چاكە بیكات و ئەوەی خراپە نەیكات و خۆی بەدوور بگرێ لێی، ئەوە بێگومان بەخێركردن بۆی دەنووسرێ)).**

## ٣١- بابٌ: قَدْرُ كَمْ يُعْطَى مِنَ الزَّكَاةِ وَالصَّدَقَةِ؟ وَمَنْ أَعْطَى شَاةً

١٤٤٦- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا أَبُو شِهَابٍ، عَنْ خَالِدٍ الحَذَّاءِ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها قَالَتْ: بُعِثَ إِلَى نُسَيْبَةَ الأَنْصَارِيَّةِ بِشَاةٍ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى عَائِشَةَ رضي الله عنها، مِنْهَا فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟». فَقُلْتُ: لاَ، إِلاَّ مَا أَرْسَلَتْ بِهِ نُسَيْبَةُ مِنْ تِلْكَ الشَّاةِ فَقَالَ: «هَاتِ فَقَدْ بَلَغَتْ مَحِلَّهَا»[2].

---

[1] بڕوانە: ٦٦٠٢.

[2] بڕوانە: ١٤٩٤، ٢٥٧٩.

## ٣١- باسێک: له زەکاتدان و خێرکردندا چەندێک ببەخشێ؟ وە (حوکمی) ئەو کەسەی مەڕێک ببەخشێ

**١٤٤٦- ئوممو عەتییە ﷺ دەڵێ: مەڕێکیان نارد بۆ نوسەیبەی ئەنصاری ﷺ ) ئەویش (سەری بڕی و) بەشێکی لێ نارد بۆ عائیشە ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((شتێکت لایە؟))، منیش وتم: نەخێر مەگەر ئەو بەشە گۆشتەی نوسەیبە لە مەڕەکە ناردوویەتی بۆمان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیهێنە بەڕاستی گەیشتۆتە جێگای خۆی))[١].**

## ٣٢- بابُ زَكَاةِ الوَرِق

١٤٤٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى المَازِنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ مِنَ الإِبِلِ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ».

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبدُ الوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنِي يحيى بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو سَمِعَ أَبَاهُ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ بهذا[٢].

## ٣٢- باسی زەکاتی زیو

**١٤٤٧- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لە پێنج مێگەل وشتر کەمتر زەکاتی تێدا واجب نییە، وە (پارە) لە پێنج**

---

[١] واتە: بووەتە هی عائیشە و دروستە پێغەمبەر ﷺ لێی بخوات، چونکە ئەو مەڕە زەکات بوو، پێغەمبەریش ﷺ دروست نییە لە زەکات بخوات.

[٢] بڕوانە: ١٤٠٥.

ئۆقیه[١] کەمتر زەکاتی تێدا واجب نییه، وە له پێنج ویسق (دانەوێڵە) کەمتر زەکاتی تێدا واجب نییه)).

(ئیمامی بوخاری دەڵێ): موحەممەدی کوڕی موسەننا بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدولوەهاب بۆی گێڕاینەوە وتی: یەحیای کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە وتی: عەمرٍ بۆی گێڕاینەوە کە له باوکی بیستوە، ئەویش له ئەبو سەعیدی ﵁ بیستوە دەڵێ: ئەم فەرموودەم له پێغەمبەر ﷺ بیست.

## ٣٣- بابُ العَرْضِ فِي الزَّكَاةِ

وَقَالَ طَاوُسٌ: قَالَ مُعَاذٌ لأَهْلِ اليَمَنِ: ائْتُونِي بِعَرْضٍ ثِيَابٍ خَمِيصٍ أَوْ لَبِيسٍ فِي الصَّدَقَةِ، مَكَانَ الشَّعِيرِ وَالذُّرَةِ، أَهْوَنُ عَلَيْكُمْ، وَخَيْرٌ لأَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ بِالمَدِينَةِ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَأَمَّا خَالِدٌ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْتُدَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ». وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَصَدَّقْنَ وَلَوْ مِنْ حُلِيِّكُنَّ». فَلَمْ يَسْتَثْنِ صَدَقَةَ الفَرْضِ مِنْ غَيْرِهَا، فَجَعَلَتِ المَرْأَةُ تُلْقِي خُرْصَهَا وَسِخَابَهَا، وَلَمْ يَخُصَّ الذَّهَبَ وَالفِضَّةَ مِنَ العُرُوضِ.

## ٣٣- باسی کەلوپەل له زەکاتدا بدرێ (دروستە)

تاووس دەڵێ: موعاز ﵁ به خەڵکی یەمەنی وت: له جیاتی زەکات جۆو زەڕات (گەنمەشامی) و قوماش و جلوبەرگ و پۆشاکم بۆ بێنن، بۆ ئێوە ئاسانترە و چاکتریشە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ له مەدینە، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵام خالید زرێ پۆشەکانی و شمشێر و چەکەکانی بۆ غەزاکردن له ڕێی

---

[١] ئۆقیه: به چل درهەم دەڵێن، پێنج ئۆقیه زیو دەکاتە (٢٠٠) درهەم زیو، ئەوەش ڕاددەی گەشتنە زەکاتی زیوە، بۆ زەکاتی پارەی زێڕو ئاڵتوون له فەرموودەی تردا باس کراوە.

خوادا دایناوه))[1]، وه پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( (بەئافرەتان) ماڵ ببەخشن با لە خشڵ و خاڵەکانیشتان بێت))، جا پێغەمبەر ﷺ ماڵ بەخشینی فەرز کە زەکاتە جیانەکردەوە لە بەخشینی تر، بۆیە ئافرەتان دەستیان کرد بە توڕدانی گوارە و ملوانکەکانیان بۆ (بیلال)، وە پێغەمبەر ﷺ ئاڵتوون و زیوی جیانەکردەوە لە شتی تر (بەڵکو بەگشتی داوای ماڵ بەخشینی کرد).

١٤٤٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ أَنَّ أَنَسًا ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ كَتَبَ لَهُ التِي أَمَرَ اللَّهُ رَسُولَهُ ﷺ: «وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ مَخَاضٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ، وَعِنْدَهُ بِنْتُ لَبُونٍ فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ، وَيُعْطِيهِ المُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ عَلَى وَجْهِهَا، وَعِنْدَهُ ابْنُ لَبُونٍ، فَإِنَّهُ يُقْبَلُ مِنْهُ وَلَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ»[2].

١٤٤٨- سومامە دەڵێ: ئەنەس ﷺ بۆی گێڕایەوە: ئەوەی خوا فەرمانی کردبوو بە پێغەمبەر ﷺ لە زەکاتدا ئەبو بەکر ﷺ بۆ ئەنەسی نووسی: ((هەرکەس زەکاتدانەکەی گەیشت بەبەچکە وشترێکی مێینەی یەك ساڵی بەلاّم نەیبوو، بەڵکو بەچکە وشترێکی مێینەی دوو ساڵی هەبوو، ئەوە بێگومان لێی وەردەگیرێ، کۆکەرەوەی زەکات بیست درهەم یان دوو مەڕی دەداتێ، وە ئەگەر بەچکە وشترێکی مێینەی یەك ساڵی دەکەوت، بەلاّم نەیبوو، بەڵکو بەچکە وشترێکی نێری دوو ساڵی هەبوو، ئەوە بێگومان لێی وەردەگیرێ هیچ شتێکی ناکەوێ لەگەڵیدا (وەك باقی بیدرێتەوە) )).

---

[1] واتە: زەکاتی تێدا نییە و پێویست نییە لەسەری زەکات بدات.

[2] بڕوانە: ١٤٥٠، ١٤٥١، ١٤٥٣، ١٤٥٤، ١٤٥٥، ٢٤٨٧، ٥٨٧٨، ٦٩٥٥.

١٤٤٩- حَدَّثَنَا مُؤَمَّلٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَصَلَّى قَبْلَ الخُطْبَةِ، فَرَأَى أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعِ النِّسَاءَ، فَأَتَاهُنَّ وَمَعَهُ بِلاَلٌ نَاشِرَ ثَوْبِهِ، فَوَعَظَهُنَّ، وَأَمَرَهُنَّ أَنْ يَتَصَدَّقْنَ، فَجَعَلَتِ المَرْأَةُ تُلْقِي، وَأَشَارَ أَيُّوبُ إِلَى أُذُنِهِ وَإِلَى حَلْقِهِ[1].

**١٤٤٩- عەتای کوڕی ئەبو ڕەباح دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ وتی: شایەتی دەدەم لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ کە (سوێند بەخوا) پێغەمبەر ﷺ پێش وتاردان نوێژی (جەژنی) کرد، ئینجا گومانی وابوو کە ئافرەتان گوێیان لە وتارەکەی نەبوو، بۆیە ڕۆیشت بۆ لایان و بیلالیشی لەگەڵدا بوو، (بیلال) کراسەکەی بڵاو کردبوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێکردن بەماڵ بەخشین، جا هەر ئافرەت بوو (گوارەو ملوانەکەی) فڕێ دەدایە (کۆشی بیلالەوە). ئەیوبیش ئاماژەی دەکرد بۆ گوێ و بۆ گەردنی.[2]**

## ٣٤- بابٌ: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ

وَيُذْكَرُ عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلُهُ.

١٤٥٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ أَنَّ أَنَسًا ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ كَتَبَ لَهُ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ»[3].

---

[1] بڕوانە: ٩٨.

[2] مەبەستی ئەیوب کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی فەرموودەکە ئەوەیە کە ئافرەتان گوارەی گوێیان و ملوانکەی مل و گەردنیان فڕێ دەدایە کۆشی بیلالەوە.

[3] بڕوانە: ١٤٤٨.

## ٣٤- باسێک: نابێ ماڵی جیا کۆبکرێتەوە، وە نابێ ماڵی کۆ جیابکرێتەوە (لە ترسی زەکات لێ کەوتن)

وێنەی ئەم وتەیە لە سالیمەوە، لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﭭ لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەهەمان شێوە گێڕدراوەتەوە.

١٤٥٠- سومامە دەڵێ: ئەنەس ﭬ بۆی گێڕایەوە کە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایناب‌وو (لە زەکاتدا بدرێ) ئەبو بەکر ﭬ بۆی نووسی: ((وە ماڵی جیا کۆناکرێتەوە، وە ماڵی کۆ جیاناکرێتەوە لە ترسی زەکاتدان))[1].

## ٣٥- بابٌ: مَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ

وَقَالَ طَاوُسٌ وَعَطَاءٌ: إِذَا عَلِمَ الخَلِيطَانِ أَمْوَالَهُمَا فَلاَ يُجْمَعُ مَالُهُمَا. وَقَالَ سُفْيَانُ: لاَ يَجِبُ حَتَّى يَتِمَّ لِهَذَا أَرْبَعُونَ شَاةً، وَلِهَذَا أَرْبَعُونَ شَاةً.

## ٣٥- باسێك: ئەو ماڵەی هاوبەش و تێکەڵاوە (کە زەکاتی لێ درا)، ئەوە هەریەکەیان بەئەندازەی ماڵەکەی بەشە زەکاتی لێ وەردەگیرێ[2]

وە تاووس و عەتا دەڵێن: ئەگەر ئەو دوو هاوبەشەی ماڵەکەیان تێکەڵاوە، هەریەکەیان دەیزانی ماڵەکەی کامەیە و چەندە، ئەوە بەیەکەوە کۆناکرێنەوە و

---

[1] سەرنج: ئەم فەرموودەیە مەبەستی ئەوەیە نابێت فێڵ بکرێت لە زەکات داندا، بۆ نموونە ئەگەر کەسێک (٤٠) چل سەر مەڕی هەبێت بیەوێ زەکاتی مەڕێکی تەواو نەدات، دەتوانێ لەگەڵ دوو کەسی تر بێت بە شەریک کە ئەوانیش (٤٠) چل سەر مەڕیان هەیە یان کەمتر، ئەو کاتە بە هەرسێکیان یەک مەڕ زەکات دەدەن، جا بۆیە نابێت ماڵی جیا کۆبکرێتەوە (لا یجمع بین مفترق)، یان کەسێک (١٢١) سەرمەڕی هەبێت، لەکاتی زەکاتدا بڵێ کاکە تەنها (٤٩) سەریان هی خۆمە، ئەوانی تر هەر (٢٠) بیست دانەیان هی برایەکمە یان هی کوڕمە، ئەمەش نابێ (لا یفرق بین مجتمع).

[2] بۆ نموونە ئەگەر بەهەردووکیانەوە سێ مەڕیان کەوت بیدەن، ئەگەر ژمارەی ئاژەڵەکانیان وەک یەک بوو، ئەوە هەریەکەیان مەڕ و نیوێکی دەکەوێ، وە ئەگەر ڕێژەی ئاژەڵەکانیان جیاواز بوو، ئەوە ڕێژەی زەکات دانەکەش جیاواز دەبێ.

بەیەك ماڵ دانانرێ. وە سوفیان دەڵێ: زەكات لە ماڵی دوو شەریكدا واجب نابێ، هەتا ئەمەیان چل سەر ئاژەڵی نەبێت و ئەوی تریان چلی نەبێ.

١٤٥١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ كَتَبَ لَهُ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ»[1].

**١٤٥١- سومامە دەگێڕێتەوە كە ئەنەس ﷺ بۆی گێڕایەوە كە ئەو زەكاتەی دیاریكراو بوو لەلایەن پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەكر ﷺ بۆی نووسی: ((ئەو ماڵەی كە تێكەڵاوە (لە نیوان دوو شەریكدا)، ئەوە بێگومان (كە زەكاتیان دا)، هەردووكیان بە یەكسانی لە نێوانیاندا زەكاتیان لێ وەردەگیرێ)).**

## ٣٦- بابُ زَكَاةِ الإِبِلِ

ذَكَرَهُ أَبُو بَكْرٍ وَأَبُو ذَرٍّ وَأَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

١٤٥٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا الوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الهِجْرَةِ، فَقَالَ: «وَيْحَكَ، إِنَّ شَأْنَهَا شَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ تُؤَدِّي صَدَقَتَهَا؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ البِحَارِ، فَإِنَّ اللَّهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئًا»[3].

---

[1] بروانە: ١٤٤٨.

[2] بروانە: ١٤٤٨، ١٤٦٠.

[3] بروانە: ٢٦٣٣، ٣٩٢٣، ٦١٦٥.

## ٣٦- باسی (حوکمی) زەکاتی وشتر

ئەبو بەکر و ئەبو زەڕ و ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ (فەرموودەی زەکاتی وشتریان) گێڕاوەتەوە.

١٤٥٢- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پیاوێکی دەشتەکی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی کۆچکردن لە ڕێگەی خوادا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هاوار بۆ تۆ بەڕاستی هیجرەت کارێکی سەخت و گرانە، ئایا وشترت هەیە زەکاتەکەی بدەیت؟))، وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دەی تۆ چاکە بکە، ئەگەر لە دوورترین شوێنیش بیت، لەوپەڕی دەریاو ئۆقیانووسەکانیشەوە بیت، ئەوە دڵنیابە خوا هیچێك لە کردەوەکانت زایە ناکات)) (و پاداشتت دەداتەوە لەسەری).

## ٣٧- بابُ مَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ بِنْتِ مَخَاضٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ

١٤٥٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ أَنَّ أَنَسًا ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ كَتَبَ لَهُ فَرِيضَةَ الصَّدَقَةِ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ رَسُولَهُ ﷺ: .مَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ مِنَ الإِبِلِ صَدَقَةُ الجَذَعَةِ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ جَذَعَةٌ وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الحِقَّةُ، وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِنِ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ الحِقَّةُ وَعِنْدَهُ الجَذَعَةُ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الجَذَعَةُ، وَيُعْطِيهِ المُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ إِلاَّ بِنْتُ لَبُونٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ بِنْتُ لَبُونٍ، وَيُعْطِي شَاتَيْنِ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ لَبُونٍ وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الحِقَّةُ، وَيُعْطِيهِ المُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ لَبُونٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ وَعِنْدَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ بِنْتُ مَخَاضٍ، وَيُعْطِي مَعَهَا عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ،[1] .

---

[1] بڕوانە: ١٤٤٨.

# ٣٧- باسی كەسێک زەكاتەكەی بەچكە وشترێكی مێینەی یەک ساڵی بكەوێ و نەیبێت

١٤٥٣- سومامە دەڵێ: ئەنەس ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە و دەڵێ: ئەو ڕێژە زەكاتە فەرزەی كە خوا فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ كردبوو، ئەبو بەكر بەنامەیەك بۆ ئەنەسی نووسی (كە ئەمەیە): ((هەركەس زەكاتی وشترەكانی گەیشتە وشترێكی چوار ساڵی مێینە، بەڵام ئەو جۆرە وشترەی نەبوو، بەڵكو وشترێكی سێ ساڵی مێینەی هەبوو، ئەوە ئەو وشترە سێ ساڵەی لێ وەردەگیرێ و لەگەڵ دوو مەڕدا، ئەگەر هەیبوو یان لەگەڵ بیست درهەمدا (ئەگەر مەڕی نەبوو)، وە هەر كەس زەكاتی وشترەكانی گەیشتە وشترێكی سێ ساڵی مێینە، بەڵام ئەو جۆرە وشترەی نەبوو بەڵكو وشترێكی چوار ساڵی مێینەی هەبوو، ئەوە ئەو وشترە چوار ساڵەی لێ وەردەگیرێ و زەكات وەرگرەكە بیست درهەم یان دوو مەڕی دەداتێ، وە هەر كەس زەكاتی وشترەكانی گەشتە وشترێكی سێ ساڵی مێینە و نەیبوو، تەنها بەچكە وشترێكی دوو ساڵی هەبوو، ئەوە ئەو بەچكە دوو ساڵەی لێ وەردەگیرێ و دوو مەڕ یان بیست درهەمی دەداتێ[1]، وە هەركەس زەكاتی وشترەكانی گەیشتە بەچكە وشترێكی دوو ساڵی مێینە (و نەیبوو)، بەڵكو وشترێكی سێ ساڵەی مێینەی هەبوو، ئەوە وشترە سێ ساڵەكەی لێ وەردەگیرێ و زەكات وەرگرەكە بیست درهەم، یان دوو مەڕی دەداتێ، وە هەركەس زەكاتی وشترەكانی گەیشتە بەچكە وشترێكی دوو ساڵی مێینە بەڵام نەیبوو، بەڵكو بەچكە وشترێكی یەك ساڵی مێینەی هەبوو، ئەوە ئەو بەچكە یەك ساڵەی لێ وەردەگیرێ لەگەڵیدا، بیست درهەم یان دوو مەڕی دەدات)).

---

[1] واتە: زەكاتدەرەكە دوو مەڕ یان بیست درهەم دەدات بە زەكاتوەرگرەكە.

## ٣٨- بابُ زَكَاةِ الغَنَمِ

١٤٥٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ المُثَنَّى الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسٍ، أَنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ كَتَبَ لَهُ هَذَا الكِتَابَ، لَمَّا وَجَّهَهُ إِلَى البَحْرَيْنِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ التِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى المُسْلِمِينَ، وَالتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ، فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ المُسْلِمِينَ عَلَى وَجْهِهَا فَلْيُعْطِهَا، وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَهَا فَلاَ يُعْطِ: فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ فَمَا دُونَهَا مِنَ الغَنَمِ مِنْ كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ، إِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ إِلَى خَمْسٍ وَثَلاَثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ أُنْثَى، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَثَلاَثِينَ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ أُنْثَى، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَأَرْبَعِينَ إِلَى سِتِّينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الجَمَلِ، فَإِذَا بَلَغَتْ وَاحِدَةً وَسِتِّينَ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ -يَعْنِي:- سِتًّا وَسَبْعِينَ إِلَى تِسْعِينَ فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الجَمَلِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ إِلاَّ أَرْبَعٌ مِنَ الإِبِلِ فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا مِنَ الإِبِلِ فَفِيهَا شَاةٌ، وَفِي صَدَقَةِ الغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ إِلَى مِائَتَيْنِ شَاتَانِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى مِائَتَيْنِ إِلَى ثَلاَثِمِائَةٍ فَفِيهَا ثَلاَثٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلاَثِمِائَةٍ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً وَاحِدَةً فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، وَفِي الرِّقَةِ رُبْعُ العُشْرِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ إِلاَّ تِسْعِينَ وَمِائَةً فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا»[1].

## ٣٨- باسی زەکاتی مەڕ و بزن

**١٤٥٤- سومامەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەنەس دەگێڕێتەوە کە ئەنەس بۆی گێڕاوەتەوە: کە ئەبو بەکر ﷺ کاتێ ناردی بۆ بەحرەین ئەم نامەی بۆ نووسی:**

---

[1] بڕوانە: ١٤٤٨.

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، ئەمە یاسای زەکاتدانی فەڕزە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوە لەسەر مسوڵمانان، کە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە، جا هەرکەس لە مسوڵمانان بەم شێوە داوای لێ کرا با بیدات، وە هەر کەس لەوە زیاتری لێ داواکرا ئەوە با (زیادەکەی) نەدات. ((لە بیست و چوار وشتر و کەمتر لە بیست و چوار لە مەڕ و بزن (زەکاتەکەی دەدرێ)، لە هەر پێنج وشترێکدا مەڕێك دەدرێ، ئەگەر ژمارەیان گەیشتە بیست و پێنج تا سی و پێنج، ئەوە بەچکە وشترێکی یەك ساڵی مێینەی دەکەوێ، جا کە گەیشتە سی و شەش تا چل و پێنج، ئەوە بەچکە وشترێکی دوو ساڵی مێینەی دەکەوێ، ئینجا کە گەشتە چل و شەش تا شەست، ئەوە وشترێکی سێ ساڵی مێینەی بەرکەڵی دەکەوێ، ئینجا کە گەیشتە شەست و یەك تا حەفتا و پێنج، ئەوە وشترێکی چوار ساڵی مێینەی دەکەوێ، ئینجا کە گەیشتە -واتە: حەفتا و شەش- تا نەوەد، ئەوە دوو بەچکە وشتری دوو ساڵی مێینەی دەکەوێ، ئینجا کە گەیشتە نەوەد و یەك تا سەد و بیست، ئەوە دوو بەچکە وشتری سێ ساڵی بەرکەڵی دەکەوێ، ئینجا ئەگەر لە سەد و بیست وشتر زیادی کرد، ئەوە لە هەموو چل وشترێکدا بەچکە وشترێکی دوو ساڵی مێینەی دەکەوێ، وە لە هەموو پەنجا وشترێکدا، وشترێکی سێ ساڵی مێینەی دەکەوێ، وە ئەگەر کەسێك تەنها چوار وشتری هەبوو، ئەوە زەکاتی تێدا واجب نییە، مەگەر خاوەن وشترەکە خۆی حەز بکات بیدات، ئینجا کە گەیشتە پێنج وشتر، ئەوە مەڕێکی دەکەوێ، وە لە زەکاتی مەڕو بزندا لەوەی کە لە دەرودەشت دەلەوەڕێ، ئەگەر چل تا سەد و بیست سەر بێ، یەك مەڕ زەکاتی دەکەوێ، جا ئەگەر لە سەد و بیست زیادی کرد تا دوو سەد سەر، ئەوە دوو مەڕی دەکەوێ، جا ئەگەر لە دوو سەد سەر زیادی کرد تا سێ سەد سەر، ئەوە سێ مەڕی دەکەوێ بیدات، ئینجا ئەگەر لە

سێ سەد زیادی کرد، ئەوە لە هەموو سەد مەڕێکدا یەك مەڕی دەکەوێ، ئینجا ئەگەر ئەو مەڕ و بزنانەی کابرا کە بۆ خۆیان دەلەوەڕێن، یەك مەڕی کەم بوو لە چل سەر، ئەوە زەکاتی تێدانییە، مەگەر خاوەنەکەی خۆی بیەوێ بیدات، وە لە زیو لە چل درهەم درهەمێك دەکەوێ، جا ئەگەر درهەمە زیوەکان سەدو نەوەد درهەم بوون، ئەوە زەکاتی تێدانییە مەگەر خاوەنەکەی خۆی بیەوێ بیدات)).

## ٣٩- بابٌ: لاَ تُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ وَلاَ تَيْسٌ إِلاَّ مَا شَاءَ المُصَدِّقُ

١٤٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ، أَنَّ أَنَسًا ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ كَتَبَ لَهُ الصَّدَقَةَ التِي أَمَرَ اللَّهُ رَسُولَهُ ﷺ: «وَلاَ يُخْرَجُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ، وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ[1]، وَلاَ تَيْسٌ، إِلاَّ مَا شَاءَ المُصَدِّقُ»[2].

## ٣٩- باسێک: ئاژەڵی پیر و کوێر و نێر لە زەکاتدا وەرناگیرێ، مەگەر زەکات وەرگرەکە لەسەری ڕازی بێ

١٤٥٥- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو بەکر ﷺ ئەو نامەیەی بۆ نووسی کە خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردبوو: ((لە زەکاتدا نابێت ئاژەڵی پیر و عەیبدارو نێر بدرێ، مەگەر زەکات وەرگرەکە بیەوێ و ڕازی بێت پێی)).

---

[1] ذاتُ عَوَار واتە: ئاژەڵێک عەیبێکی وای هەبێ لە کڕین و فرۆشتندا بدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، کە نەخۆشی و غەیری نەخۆشیش دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر وشەکە (ذاتُ عُوَار) بوو، ئەوە مەبەست پێی ئاژەڵی کوێرە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٣/٥٨٠.

[2] بڕوانە: ١٤٤٨.

## ٤٠- بابُ أَخْذِ العَنَاقِ فِي الصَّدَقَةِ

١٤٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ح. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا[1].

## ٤٠- وەرگرتنی گیسک لە زەکاتدا

**١٤٥٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ وتی: سوێند بە خوا ئەگەر گیسکێك کە لە کاتی خۆیدا دەیاندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ پێم نەدەن، جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر نەدانی.**

١٤٥٧- قَالَ عُمَرُ ﷺ: فَمَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَأَيْتُ أَنَّ اللَّهَ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ بِالقِتَالِ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الحَقُّ[2].

**١٤٥٧- عومەر ﷺ وتی: ئەوە بوو کاتێك بینیم خوا دڵی ئەبو بەکری گوشاد کرد بۆ جەنگ، ئەوسا منیش زانیم کە ئەم بڕیارە هەق و ڕاستە.**

## ٤١- بابٌ: لاَ تُؤْخَذُ كَرَائِمُ أَمْوَالِ النَّاسِ فِي الصَّدَقَةِ

١٤٥٨- حَدَّثَنَا أُمَيَّةُ بْنُ بِسْطَامٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ القَاسِمِ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَيْفِيٍّ، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذًا ﷺ عَلَى اليَمَنِ قَالَ: .إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ أَهْلِ كِتَابٍ،

---

[1] بڕوانە: ١٤٠٠.

[2] بڕوانە: ١٤٠٠.

فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ عِبَادَةُ اللَّهِ، فَإِذَا عَرَفُوا اللَّهَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فَإِذَا فَعَلُوا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكَاةً تُؤْخَذُ مِنْ أَمْوَالِهِمْ وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِذَا أَطَاعُوا بِهَا فَخُذْ مِنْهُمْ، وَتَوَقَّ كَرَائِمَ أَمْوَالِ النَّاسِ»[١].

## ٤١- باسێک: له زەکاتدا چاکترینی ماڵی خەڵک وەرناگیرێ

**١٤٥٨- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ موعازی ﷺ نارد بۆ یەمەن فەرمووی: ((بێگومان تۆ دەڕۆیت بۆ نێو گەلێك کە خاوەنی کتێبی ئاسمانین، جا با یەکەم شتێك کە بانگیان دەکەیت بۆی بەندایەتی خوا بێت، جا ئەگەر خوایان ناسی (باوەڕیان پێ هێنا)، ئەوسا پێیان بڵێ کە بێگومان خوا لەشەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرزکردوون، ئینجا کە ئەوەشیان کرد، ئەوە پێیان بڵێ بێگومان خوا زەکاتی لە ماڵ (ی دەوڵەمەند)ەکانیاندا فەرزکردووە و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، ئینجا کە ئەوەشیان کرد، ئەوسا لێیان وەربگرە، بەڵام خۆت بپارێزە لە وەرگرتنی ماڵە هەرە چاکەکانی خەڵك)).**

## ٤٢- بابٌ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ

**١٤٥٩-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ المَازِنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الوَرِقِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الإِبِلِ صَدَقَةٌ»[٢].

---

[١] بڕوانە: ١٣٩٥.

[٢] بڕوانە: ١٤٠٥.

## ٤٢- باسێک: لە پێنج وشتر کەمتر زەکاتی ناکەوێ

١٤٥٩- ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( لە پێنج ویسق کەمتر لە خورما زەکاتی تێدا واجب نییە، وە لە زیودا لە پێنج ئۆقیە کەمتر زەکاتی تێدا واجب نییە، وە لە پێنج سەر وشتر کەمتر زەکاتی تێدا واجب نییە)).

## ٤٣- بابُ زَكَاةِ البَقَرِ

وَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لأَعْرِفَنَّ مَا جَاءَ اللَّهَ رَجُلٌ بِبَقَرَةٍ لَهَا خُوَارٌ». وَيُقَالُ: جُؤَارٌ ﴿ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ النحل. تَرْفَعُونَ أَصْوَاتَكُمْ كَمَا تَجْأَرُ البَقَرَةُ.

## ٤٣- باسی زەکاتی مانگا و ڕەشەوڵاخ

ئەبو حومەید دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان دەزانم سبەی (لە ڕۆژی دواییدا) کابرایەك بە مانگاکەیەوە کە بۆڕەی دێ دێت بۆ بەردەم خوای گەورە))[١]، (ئیمامی بوخاری دەڵێ): لە جیاتی (خُوَارٌ) دەوترێ: (جُؤَارٌ)، بەهەمان مانایە وەك لە قورئان دەفەرموێ: ﴿ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ واتە: دەنگتان لێ بەرزدەبێتەوە، وەك چۆن مانگا دەبۆڕێنێ.

١٤٦٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنِ المَعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ -أَوْ وَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ، أَوْ كَمَا حَلَفَ- مَا مِنْ رَجُلٍ تَكُونُ لَهُ إِبِلٌ أَوْ بَقَرٌ أَوْ غَنَمٌ لاَ يُؤَدِّي حَقَّهَا، إِلاَّ أُتِيَ

---

[١] لەبەر ئەوەی زەکاتەکەی نەداوە.

بِهَا يَوْمَ القِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا تَكُونُ وَأَسْمَنَهُ، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، كُلَّمَا جَازَتْ أُخْرَاهَا رُدَّتْ عَلَيْهِ أُولاَهَا، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ». رَوَاهُ بُكَيْرٌ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**١٤٦٠- ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: گەیشتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺو فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە -یان ئەو زاتەی هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە جگە لە ئەو، یان وەك ئەو سوێندەی خواردی- هەر پیاوێك وشتر یان ڕەشەوڵاخ یان مەڕ و بزنی هەبێ و زەکاتەکەی نەدات، لە ڕۆژی دواییدا (کەسەکە) دەهێنرێ (و ئاژەڵەکە) بەگەورەترین و قەڵەوترین شێوە بەسمەکانی پێی پیا دەنێت، بە شاخەکانی قۆچی لێ دەدات، کە کۆتاهەمینیان لێی تێپەڕی، یەکەمەکەیان دەگەڕێتەوە سەری، هەتا لە نێوان خەڵکیدا قەزاوەت و بڕیار تەواو دەبێت))، ئەم فەرموودەیە بوکەیر لە ئەبو صالحەوە ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

## ٤٤- بابُ الزَّكَاةِ عَلَى الأَقَارِبِ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَهُ أَجْرَانِ أَجْرُ القَرَابَةِ، وَالصَّدَقَةِ»[2].

١٤٦١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ الأَنْصَارِ بِالْمَدِينَةِ مَالًا مِنْ نَخْلٍ، وَكَانَ أَحَبَّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرُحَاءَ، وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ المَسْجِدِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْخُلُهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ، قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا

---

[1] بروانە: ٦٦٣٨.

[2] بروانە: ١٤٦٦.

تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ آل عمران. قَامَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ. إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ: ﴿ لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ آل عمران، وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرُحَاءَ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لله أَرْجُو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللَّهِ، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ حَيْثُ أَرَاكَ اللَّهُ. قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَخْ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، وَقَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ». فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَبَنِي عَمِّهِ.

تَابَعَهُ رَوْحٌ. وَقَالَ يَحْيَى بْنُ يَحْيَى وَإِسْمَاعِيلُ عَنْ مَالِكٍ: «رَايِحٌ»[1].

## ٤٤- باسی زەکاتدان بەخزم و نزیکەکان

**وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (( (زەکاتدان بەخزم) دوو پاداشتی هەیە: پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی زەکاتدان)).**

**١٤٦١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەبو تەڵحە لەنێو ئەنصارییەکاندا لە مەدینە لە هەمووان زیاتر باخی دار خورمای هەبوو، باخی بەیروحا لە هەموو ماڵەکانی دیکەی لای خۆشەویستتر بوو کە بەرانبەر مزگەوت بوو، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە دەڕۆیشتە نێوییەوە و لەو ئاوە شیرین و سازگارەی تێیدا بوو دەیخواردەوە، ئەنەس دەڵێ: جا کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: (ئێوە ناگەن بە خێر و چاکەی تەواو و دەستگیرتان نابێ تا هەندێ لەو ماڵ وسامانەی کە خۆشتان دەوێ بەختی نەکەن)، ئەبو تەڵحە هەستاو ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان خوای گەورەو بڵند دەفەرموێ: (بە چاکە ناگەن تا هەندێ لەو ماڵەی خۆشتان دەوێ نەیبەخشن)، وە بەڕاستی**

---

[1] بڕوانە: ٢٣١٨، ٢٧٥٢، ٢٧٥٨، ٢٧٦٩، ٤٥٥٤، ٤٥٥٥، ٥٦١١.

**خۆشەویستترین ماڵی من بەلامەوە بەیروحایە، ئەوە خێربێ لە ڕێی خوادا، هیوای چاکە و پاداشتی لای خوای لێ دەکەم، جا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ خۆت خوا چۆنت پێ دەڵێ ئاوای لێ بکە، ئەنەس: دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەخ ئەوە ماڵێکی پڕ قازانج و خێرە، ئەوە ماڵێکی پڕ قازانج و خێرە، بێگومان ئەوەی وتت بیستم و بەڕاستی من ڕام وایە بیکەیتە خێر و چاکە بۆ خزمەکانت))، ئەبو تەڵحەش وتی: دەی وای لێ دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئەبو تەڵحە لە نێوان خزمەکان و ئامۆزاکانیدا بەشی کرد.**

**ڕەوحیش بەڕێگەیەکی تر ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدولای کوڕی یوسفی کردووە، وە یەحیای کوڕی یەحیا و ئیسماعیل لە مالیکەوە بە ((رَايِحٌ)) گێڕاویانەتەوە لە جیاتی ((رَابِحٌ)).**

١٤٦٢- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي زَيْدٌ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي أَضْحًى -أَوْ فِطْرٍ- إِلَى المُصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ فَوَعَظَ النَّاسَ وَأَمَرَهُمْ بِالصَّدَقَةِ فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، تَصَدَّقُوا». فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، تَصَدَّقْنَ، فَإِنِّي رَأَيْتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ». فَقُلْنَ: وَبِمَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: «تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ العَشِيرَ، مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ». ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمَّا صَارَ إِلَى مَنْزِلِهِ جَاءَتْ زَيْنَبُ امْرَأَةُ ابْنِ مَسْعُودٍ تَسْتَأْذِنُ عَلَيْهِ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذِهِ زَيْنَبُ، فَقَالَ: «أَيُّ الزَّيَانِبِ؟». فَقِيلَ: امْرَأَةُ ابْنِ مَسْعُودٍ. قَالَ: «نَعَمِ ائْذَنُوا لَهَا». فَأُذِنَ لَهَا، قَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ، إِنَّكَ أَمَرْتَ اليَوْمَ بِالصَّدَقَةِ، وَكَانَ عِنْدِي حُلِيٌّ لِي، فَأَرَدْتُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهِ، فَزَعَمَ ابْنُ مَسْعُودٍ

أَنَّهُ وَوَلَدَهُ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَلَيْهِمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَدَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ، زَوْجُكِ وَوَلَدُكِ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتِ بِهِ عَلَيْهِمْ»[1].

**١٤٦٢- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژنی قوربان -یان ڕەمەزاندا- لە شار ڕۆیشتە دەرەوە بۆ نوێژگە (و نوێژی کرد)، پاشان لێ بوویەوە و ئامۆژگاری خەڵکی کرد، فەرمانی پێ کردن بە ماڵ بەخشین و فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە ماڵ ببەخشن))، ئینجا ڕۆیشت بۆ لای ئافرەتانیش و فەرمووی: ((ئەی کۆمەڵی ئافرەتان خێر بکەن و ماڵ ببەخشن، چونکە بەڕاستی من ئێوەم دی زۆربەی دۆزەخییان ئێوە بوون))، ئافرەتانیش وتیان: ئەوە هۆکارەکەی چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((نەفرین زۆر دەکەن، سپڵەن بەرانبەر مێردەکانتان، ئەی کۆمەڵی ئافرەتان عەقڵ و ئایین ناتەواوی وەك هەرکام لە ئێوەم نەدیوە، کە دڵ و عەقڵی پیاوی بەتوانا نەهێڵن))، پاشان گەڕایەوە، جا کاتێ گەیشتەوە ماڵ زەینەبی خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ هات بۆ خزمەتی و مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست، بە پێغەمبەری خوا ﷺ وترا: ئەوە زەینەبە، فەرمووی: ((کام زەینەبەیانە؟))، وترا: زەینەبی خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود، فەرمووی: ((بەڵێ مۆڵەتی بدەن با بێتە ژوورەوە))، جا مۆڵەتی دراو هاتە ژوورەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، تۆ ئەمڕۆ فەرمانت کرد بە ماڵ بەخشین، منیش هەندێ خشڵ و ئاڵتوونم هەبوو ویستم خێری لێ بکەم، عەبدوڵای (مێردیشم) وتی: بەڕاستی ئەوو کوڕەکانی شیاوترن ئەو خێرەیان پێ بدەم! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((عەبدوڵای کوڕی مەسعود ڕاستی وتوە، مێردەکەت و منداڵەکانت شیاوترن خێرەکەتیان پێ بدەیت)).**

---

[1] بڕوانە: ٣٠٤.

## ٤٥- بابٌ: لَيْسَ عَلَى المُسْلِمِ فِي فَرَسِهِ صَدَقَةٌ

١٤٦٣- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ عَنْ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَ عَلَى المُسْلِمِ فِي فَرَسِهِ وَغُلَامِهِ صَدَقَةٌ»[1].

## ٤٥- باسێک: مسوڵمان ئەسپ و وڵاخەکەی زەکاتی لێ ناکەوێ

**١٤٦٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مسوڵمان لە عەبد (بەندە)و ئەسپەکەیدا زەکاتی لەسەر نییە و نایکەوێ)).**

## ٤٦- بابٌ: لَيْسَ عَلَى المُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ صَدَقَةٌ

١٤٦٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ خُثَيْمِ بْنِ عِرَاكٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا خُثَيْمُ بْنُ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ عَلَى المُسْلِمِ صَدَقَةٌ فِي عَبْدِهِ وَلاَ فَرَسِهِ»[2].

## ٤٦- باسێک: مسوڵمان لە کۆیلەو بەندەیدا زەکات ناکەوێ

**١٤٦٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مسوڵمان لە بەندە و ئەسپیدا زەکاتی لەسەر نییە و نایکەوێ)).**

---

[1] بڕوانە: ١٤٦٤.

[2] بڕوانە: ١٤٦٣.

## ٤٧- بابُ الصَّدَقَةِ عَلَى اليَتَامَى

١٤٦٥- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ هِلاَلِ بْنِ أَبِي مَيْمُونَةَ، حَدَّثَنَا عَطَاءُ بْنُ يَسَارٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ ﷺ يُحَدِّثُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَلَسَ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى المِنْبَرِ وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ فَقَالَ: «إِنِّي مِمَّا أَخَافُ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِي مَا يُفْتَحُ عَلَيْكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا وَزِينَتِهَا». فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوَ يَأْتِي الخَيْرُ بِالشَّرِّ فَسَكَتَ النَّبِيُّ ﷺ فَقِيلَ لَهُ: مَا شَأْنُكَ تُكَلِّمُ النَّبِيَّ ﷺ وَلاَ يُكَلِّمُكَ؟ فَرَأَيْنَا أَنَّهُ يُنْزَلُ عَلَيْهِ. قَالَ: فَمَسَحَ عَنْهُ الرُّحَضَاءَ، فَقَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ؟» وَكَأَنَّهُ حَمِدَهُ. فَقَالَ: «إِنَّهُ لاَ يَأْتِي الخَيْرُ بِالشَّرِّ، وَإِنَّ مِمَّا يُنْبِتُ الرَّبِيعُ يَقْتُلُ أَوْ يُلِمُّ، إِلاَّ آكِلَةَ الخَضْرَاءِ، أَكَلَتْ حَتَّى إِذَا امْتَدَّتْ خَاصِرَتَاهَا اسْتَقْبَلَتْ عَيْنَ الشَّمْسِ، فَثَلَطَتْ وَبَالَتْ وَرَتَعَتْ، وَإِنَّ هَذَا المَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَنِعْمَ صَاحِبُ المُسْلِمِ مَا أَعْطَى مِنْهُ المِسْكِينَ وَاليَتِيمَ وَابْنَ السَّبِيلِ -أَوْ كَمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ- وَإِنَّهُ مَنْ يَأْخُذُهُ بِغَيْرِ حَقِّهِ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، وَيَكُونُ شَهِيدًا عَلَيْهِ يَوْمَ القِيَامَةِ»[1].

## ٤٧- باسی زەکاتدان بە هەتیو

**١٤٦٥- عەتای کوڕی یەسار دەڵێ ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕایەوە: کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لەسەر دوانگە دانیشت و ئێمە بە چواردەوریدا دانیشتین و فەرمووی: ((بەڕاستی ئەوەی کە من دەترسم توشتان بێت پاش مردنم، ئەو جوانی و ڕازاوەیی دونیایە کە خوا پێتان دەدات))، جا پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا خێر و چاکە خراپە بەشوێن خۆیدا دێنێ؟ پێغەمبەریش ﷺ بێدەنگ بوو، جا بە پیاوەکە وترا: ئەوە چیتە تۆ قسە لەگەڵ پێغەمبەردا دەکەیت، کە ئەو قسەت لەگەڵ ناکات؟ ئیتر زانیمان کە نیگای بۆ**

---

[1] بروانە: ٩٢١.

دێ، ئەبو سەعید دەڵێ: جا ئەو عەرەقە زۆرەی خۆی سڕی (کە بەهۆی قورسی نیگاکەوە کردبووی)، ئینجا فەرمووی: ((بێگومان چاکە خراپە ناهێنێ، بێگومان هەندێ لەو سەوزی و جوانییەی بەهار دەیڕوێنێ، ئاژەڵ دەکوژێ یان نزیکە بیکوژێ (کاتێ زۆری لێ بخوات)، بەڵام ئاژەڵی گیاخۆر دەلەوەڕێ هەتا هەردوو کەلەکەی پڕ دەبێ (تێر دەخوات)، ئینجا خۆی دەدات بەخۆر و دەتورێنێ و میز دەکات، هەر بەم جۆرە دەلەوەڕێ، وە بێگومان ئەم ماڵ و سامانە سەوز و شیرینە، جا ئای چەند چاکە ئەو مسوڵمانە دەوڵەمەندەی کە بەشی هەژار و هەتیو و ڕێبوار دەدات -یان وەك ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی-، وە بێگومان ئەو کەسەی ئەو ماڵە بەناڕەوا وەربگرێت، وەك ئەو کەسەیە هەر بخوات و تێر نەبێ، وە لە ڕۆژی دواییشدا ببێتە شایەت لەسەری)).

## ٤٨- بابُ الزَّكَاةِ عَلَى الزَّوْجِ وَالأَيْتَامِ فِي الحَجْرِ

قَالَهُ أَبُو سَعِيدٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

١٤٦٦- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي شَقِيقٌ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما. قَالَ: فَذَكَرْتُهُ لِإِبْرَاهِيمَ، فَحَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ، عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ بِمِثْلِهِ سَوَاءً، قَالَتْ: كُنْتُ فِي المَسْجِدِ فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «تَصَدَّقْنَ وَلَوْ مِنْ حُلِيِّكُنَّ». وَكَانَتْ زَيْنَبُ تُنْفِقُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ وَأَيْتَامٍ فِي حَجْرِهَا، قَالَ: فَقَالَتْ لِعَبْدِ اللَّهِ: سَلْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيَجْزِي عَنِّي أَنْ أُنْفِقَ عَلَيْكَ وَعَلَى أَيْتَامِي فِي حَجْرِي مِنَ الصَّدَقَةِ؟ فَقَالَ: سَلِي أَنْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ. فَانْطَلَقْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ. فَوَجَدْتُ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ عَلَى البَابِ، حَاجَتُهَا مِثْلُ حَاجَتِي، فَمَرَّ عَلَيْنَا بِلَالٌ

---

[١] بڕوانە: ٣٠٤.

فَقُلْنَا: سَلِ النَّبِيَّ ﷺ: أَيَجْزِي عَنِّي أَنْ أُنْفِقَ عَلَى زَوْجِي وَأَيْتَامٍ لِي فِي حَجْرِي؟ وَقُلْنَا: لاَ تُخْبِرْ بِنَا. فَدَخَلَ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: «مَنْ هُمَا». قَالَ: زَيْنَبُ قَالَ: «أَيُّ الزَّيَانِبِ؟». قَالَ: امْرَأَةُ عَبْدِ اللَّهِ. قَالَ: «نَعَمْ لَهَا أَجْرَانِ: أَجْرُ القَرَابَةِ، وَأَجْرُ الصَّدَقَةِ».

## ٤٨- باسی زەکاتی ئافرەت بە مێردەکەی و منداڵانی هەتیو کە لە ماڵەکەیدا بن

**ئەبو سەعید ﷺ ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.**

**١٤٦٦- عەمرِی کوڕی حاریس لە زەینەبی خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: (ئەعمەش) دەڵێ: ئەم فەرموودەم گێڕایەوە بۆ ئیبڕاهیم، ئیبڕاهیمیش بۆی گێڕامەوە لە ئەبو عوبەیدەوە لە عەمرِی کوڕی حاریسەوە لەزەینەبەوە کە خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعودە هەمان فەرموودەی وەك خۆی بۆگێڕامەوە، زەینەب دەڵێ: من لە مزگەوتدا بووم و پێغەمبەرم ﷺ بینی فەرمووی: ((ماڵ ببەخشن با لە خشڵ و ئاڵتوونەکانیشتان بێت))، (عەمر دەڵێ:) زەینەب خەرجی عەبدوڵای مێردی و چەند هەتیوێکی دەکێشا کە لەلای بوون، دەڵێ: جا زەینەب بە عەبدوڵای وت: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکە، ئایا دروستە بۆم کە خەرجی تۆ و ئەو هەتیوانەی کە لەلا من لە زەکات بکێشم؟ عەبدوڵا وتی: تۆ خۆت پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکە، ئیتر منیش ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئافرەتێکی ئەنصارییم بینی لەبەر دەرگای ماڵی پێغەمبەردا ﷺ بوو، پێویستییەکەی وەك پێویستییەکەی من وابوو، جا بیلال تێپەڕی بەلاماندا، ئێمەش پێمان وت: پرسیار بکە لە پێغەمبەر ﷺ ئایا دروستە من (لەپارەی زەکات) خەرجی مێرد و چەند هەتیوێك بکێشم کە لەلای خۆمن؟ وە وتمان: ناومان مەبە، جا بیلال ڕۆیشتە ژوورەوە و پرسیاری لێ کرد،**

**پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو دوو ئافرەتە کێن؟))، بیلال وتی: زەینەب، فەرمووی: ((کام زەینەبەیان؟))، وتی: خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود، فەرمووی: ((بەڵێ دوو پاداشتی بۆ هەیە: پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی ماڵ بەخشین)).**

١٤٦٧- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ [أُمِّ سَلَمَةَ]، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلِيَ أَجْرٌ أَنْ أُنْفِقَ عَلَى بَنِي أَبِي سَلَمَةَ؟ إِنَّمَا هُمْ بَنِيَّ. فَقَالَ: «أَنْفِقِي عَلَيْهِمْ، فَلَكِ أَجْرُ مَا أَنْفَقْتِ عَلَيْهِمْ»[1].

**١٤٦٧- زەینەبی کچی ئوممو سەلەمە گێڕایەوە لە ئوممو سەلەمەوە ﵂ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پاداشتم دەبێ ئەگەر خەرجی مناڵەکانی ئەبو سەلەمە بکێشم، لەکاتێکدا منداڵی خۆمن؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خەرجییان بکێشە، بێگومان پاداشتی ئەو خەرجی و بەخێوکردنەت بۆ هەیە (دەنووسرێ) )).**

## ٤٩- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَـٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۝٦٠﴾ التوبة.

وَيُذْكَرُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: يُعْتِقُ مِنْ زَكَاةِ مَالِهِ، وَيُعْطِي فِي الحَجِّ. وَقَالَ الحَسَنُ: إِنِ اشْتَرَى أَبَاهُ مِنَ الزَّكَاةِ جَازَ، وَيُعْطِي فِي المُجَاهِدِينَ وَالَّذِي لَمْ يَحُجَّ. ثُمَّ تَلَا: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَـٰتُ لِلْفُقَرَآءِ ۝٦٠﴾ التوبة، الآيَةَ، فِي أَيِّهَا أَعْطَيْتَ أَجْزَأَتْ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ خَالِدًا احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ». وَيُذْكَرُ عَنْ أَبِي لَاسٍ: حَمَلَنَا النَّبِيُّ ﷺ عَلَى إِبِلِ الصَّدَقَةِ لِلْحَجِّ.

---

[1] بڕوانە: ٥٣٦٩.

## ٤٩- ئەم فەرمایيشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە لە پێناو ئازادکردنی کۆیلەو بۆ قەرزداران و لە ڕێی خوادا)

وە لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ﷻ گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: (مسوڵمان) لە ماڵی زەکاتەکەی دەتوانێ کۆیلە ئازاد بکات، وە پارەی حەجکردنی لە زەکات دەدرێ. وە حەسەن دەڵێ: ئەگەر (باوکی کۆیلە بێت) لە ماڵی زەکاتەکە کە دەری دەکات بیکڕێ دروستە، وە ماڵی زەکات دەدرێ بە موجاهیدین و ئەو کەسەی کە حەجی نەکردووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (بێگومان زەکات بۆ هەژاران و نەداران) تا کۆتایی ئایەتەکە، لە هەرکام لەم بەشانەدا بیدەیت دروستە و زەکاتەکەت لەکۆڵ دەکەوێ.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان خالید پۆشاکی جەنگ و چەکەکانی بۆ جیهاد و غەزا تەرخان کردووە))[1]، وە لە ئەبولاسەوە گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ بۆ حەجکردن سواری وشتری زەکاتی کردین (پێی ڕۆیشتین بۆ حەج).

١٤٦٨- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالصَّدَقَةِ فَقِيلَ: مَنَعَ ابْنُ جَمِيلٍ، وَخَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، وَعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ المُطَّلِبِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا يَنْقِمُ ابْنُ جَمِيلٍ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ فَقِيرًا فَأَغْنَاهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، وَأَمَّا خَالِدٌ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِدًا، قَدِ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْتُدَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَأَمَّا العَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ المُطَّلِبِ فَعَمُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَهْيَ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ وَمِثْلُهَا مَعَهَا».

تَابَعَهُ ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ عَنْ أَبِيهِ. وَقَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ: «هِيَ عَلَيْهِ وَمِثْلُهَا مَعَهَا». وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: حُدِّثْتُ عَنِ الأَعْرَجِ بِمِثْلِهِ.

---

[1] واتە: زەکاتی تێدا نییە، واجب نییە لەسەری زەکات بدات.

١٤٦٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە زەکاتدان، جا وترا: ئیبنو جەمیل و خالیدی کوڕی وەلید و عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ زەکاتەکەیان نادەن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئیبنو جەمیل هیچ شتێك نییە ڕێگری لێ بکات زەکات نەدات، ئەوە نەبێت کە کاتی خۆی هەژار بوو، خوداو پێغەمبەرەکەی دەوڵەمەندیان کرد، بەڵام خالید بێگومان ئێوە (کەوا دەڵێن) ستەم لە خالید دەکەن، چونکە پۆشاکی جەنگ و کەلوپەلەکانی جەنگی تەرخان کردووە بۆ جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا (بۆیە زەکاتی تێدا نییە)، عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ئەوە مامەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەوە زەکاتی لەسەرە و ئەوەندەی زەکاتەکەشی لەگەڵدا بێت))(لەسەریەتی).

ئیبنو ئەبی زیناد لە باوکیەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، کە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی شوعەیب دەکات، ئیبنو ئیسحاق لە ئەبو زینادەوە تا کۆتایی سەنەدەکە کە فەرموویەتی: ((عەباس زەکاتەکەی لەسەرە و ئەوەندەی زەکاتەکەش (دەبێ بدات) لەگەڵیدا))، وە ئیبنو جورەیج دەڵێ: وێنەی هەمان فەرموودەم بۆ گێڕدراوەتەوە لە ئەعرەجەوە.

## ٥٠- بابُ الاِسْتِعْفَافِ عَنِ المَسْأَلَةِ

١٤٦٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ نَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى نَفِدَ مَا عِنْدَهُ فَقَالَ: «مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً خَيْرًا وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٦٤٧٠.

# ٥٠- باسی بێ نیازی لە سواڵ و داواكردن

**١٤٦٩- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە كە خەڵكانێكی ئەنصارى داوای ماڵیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، ئەویش پێیدان، پاشان جارێكی تر داوایان كرد هەر پێیدان، هەتا هەموو ئەو ماڵەی لای بوو تەواو بوو، ئەوسا فەرمووی: ((هەر ماڵێكم لەلا بێت هەڵی ناگرم و دەتاندەمێ، هەركەس خۆی بەدوور بگرێ لە سواڵ و داواكردن خواش دەیپارێزێ، هەركەسیش خۆی بێ نیاز بكات، خواش دەوڵەمەند و بێ نیازی دەكات، هەركەسیش خۆگربێ، خواش ئارامی پێ دەبەخشێ، هیچ كەسێك نییە بەخششێكی پێ درابێ چاكتر و فراوانتر بێت لە ئارامگرتن و دان بەخۆداگرتن)).**

١٤٧٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيَحْتَطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْتِيَ رَجُلًا، فَيَسْأَلَهُ، أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ»[١].

**١٤٧٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر كەسێكتان گوریسەكەی هەڵبگرێ (و بڕوات لە شاخ) دار بكات و بە كۆڵی بیهێنێ (و بیفرۆشێ)، چاكترە لەوەی بێت بۆ لای كەسێك و داوای لێ بكات، ئەویش پێی بدات یان پێی نەدات)).**

١٤٧١- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ العَوَّامِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ، فَيَأْتِيَ بِحُزْمَةِ الحَطَبِ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَبِيعَهَا، فَيَكُفَّ اللهُ بِهَا وَجْهَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ، أَعْطَوْهُ أَوْ مَنَعُوهُ»[٢].

---

[١] بڕوانە: ١٤٨٠، ٢٠٧٤، ٢٣٧٤.

[٢] بڕوانە: ٢٠٥٧، ٢٣٧٣.

**١٤٧١- زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((سوێند بەخوا ئەگەر کەسێکتان گوریسەکەی هەڵبگرێ و کۆڵێ دار بەکۆڵی بێنێت و بیفرۆشێت، خوا چاو و ڕووی پێ بپارێزێ، چاکترە لەوەی کە داوا لە خەڵك بکات، پێی بدەن یان پێی نەدەن)).**

١٤٧٢- وَحَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي ثُمَّ قَالَ: «يَا حَكِيمُ، إِنَّ هَذَا المَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، اليَدُ العُلْيَا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى»، قَالَ حَكِيمٌ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ، لاَ أَرْزَأُ أَحَدًا بَعْدَكَ شَيْئًا حَتَّى أُفَارِقَ الدُّنْيَا، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ يَدْعُو حَكِيمًا إِلَى العَطَاءِ فَيَأْبَى أَنْ يَقْبَلَهُ مِنْهُ، ثُمَّ إِنَّ عُمَرَ ﷺ دَعَاهُ لِيُعْطِيَهُ فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَ مِنْهُ شَيْئًا. فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي أُشْهِدُكُمْ يَا مَعْشَرَ المُسْلِمِينَ عَلَى حَكِيمٍ، أَنِّي أَعْرِضُ عَلَيْهِ حَقَّهُ مِنْ هَذَا الفَيْءِ فَيَأْبَى أَنْ يَأْخُذَهُ. فَلَمْ يَرْزَأْ حَكِيمٌ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى تُوُفِّيَ[1].

**١٤٧٢- عوروەی کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی موسەییەب گێڕاویانەتەوە کە حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: داوای (ماڵ و سامانم) لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش پێی دام، پاشان جارێکی تر داوام کرد، ئەویش پێی دام، پاشان داوام کرد هەر پێی دام، پاشان فەرمووی: ((ئەی حەکیم بێگومان ئەم ماڵ و سامانە (وەك میوەیەکی) سەوز و شیرینە، جا هەرکەس بەبێ داواکردن و پێداگری و چاو تێبڕین وەری بگرێ، ئەوە فەڕ و بەرەکەتی تێدەکەوێ بۆی،**

[1] بروانە: ٢٧٥٠، ٣١٤٣، ٦٤٤١.

هەرکەسیش بەتەمابوون و چاوتێبڕین وەری بگرێ، بەرەکەت و فەڕی تێ ناکەوێ بۆی، وەك کەسێ وایە هەر بخوات و تێر نەبێ، دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی ژێرەوە))، حەکیم دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی ڕەوانەکردووە، دوای تۆ داوای هیچ شتێك لەکەس ناکەم هەتا لە دونیا دەردەچم و دەمرم، جا ئەبو بەکر ﷺ (لە سەردەمی خیلافەتیدا) حەکیمی بانگ دەکرد بەشەکەی خۆی پێ بدات، بەڵام حەکیم وەری نەدەگرت لێی، پاشان عومەر ﷺ (لە سەردەمی خیلافەتیدا) بانگی کرد تا ماڵ و سامانی بداتێ بەڵام ڕازی نەبوو، هیچی لێ وەربگرێ، بۆیە عومەر وتی: مسوڵمانینە من ئێوە دەکەم بەشایەت لەسەر حەکیم، من بەشەکەی خۆی لەم دەستکەوتە پێ دەدەم، کەچی ئەو وەری ناگرێت، حەکیم شتی لە هیچ کەس وەرنەدەگرت دوای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەتا مرد و لەدونیا دەرچوو.

## ٥١- بابُ مَنْ أعْطَاهُ اللَّهُ شَيْئًا مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ وَلاَ إِشْرَافِ نَفْسٍ:

﴿ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾ الذاريات.

١٤٧٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعْطِينِي العَطَاءَ، فَأَقُولُ: أَعْطِهِ مَنْ هُوَ أَفْقَرُ إِلَيْهِ مِنِّي فَقَالَ: «خُذْهُ، إِذَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا المَالِ شَيْءٌ -وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلاَ سَائِلٍ- فَخُذْهُ، وَمَا لاَ فَلاَ تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ»[1].

---

[1] بڕوانە: ٧١٦٣، ٧١٦٤.

## ٥١- باسی کەسێک خوا شتێکی پێداوە بەبێ داواکردن و لە دڵەوە بەتەمابوون (وە لە ماڵەکانیاندا مافی سواڵکەرو بێ بەشان هەیە)

١٤٧٣- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە عومەرم بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵێكی پێ دەدام[1]، منیش دەموت: بیدە بە كەسێ لەمن هەژارتر بێت و پێویستی زیاتری پێی بێت، ئەویش دەیفەرموو: ((وەری بگرە، ئەگەر شتێ لەم ماڵ و سامانەت بۆ هات- تۆ چاوت لێی نەبوو و داوات نەكردبوو-، ئەوە وەری بگرە، ئەگەرنا ئەوە وازی لێ بێنە و نەفست لە دوای نەبێت)).

## ٥٢- بَابُ مَنْ سَأَلَ النَّاسَ تَكَثُّرًا

١٤٧٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي جَعْفَرٍ قَالَ: سَمِعْتُ حَمْزَةَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ النَّاسَ حَتَّى يَأْتِيَ يَوْمَ القِيَامَةِ لَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ»[2].

## ٥٢- باسی ئەو کەسەی داوا لە خەڵکی بکات بۆ زۆر کردنی ماڵ

١٤٧٤- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەردەوام مرۆڤ (ی سواڵكەر) داوا لە خەڵكی دەكات، هەتا كە ڕۆژی دوایی دێت، پارچەیەك گۆشت بە ڕوخساریەوە نییە)).

---

[1] بە هۆی ئەوەی كارێكم پێ سپێردرابوو ئەنجاممدا، لە بەرانبەردا ئەو ماڵەم پێدرا.

[2] بڕوانە: ١٤٧٥.

١٤٧٥- وَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ تَدْنُو يَوْمَ القِيَامَةِ حَتَّى يَبْلُغَ العَرَقُ نِصْفَ الأُذُنِ، فَبَيْنَا هُمْ كَذَلِكَ اسْتَغَاثُوا بِآدَمَ، ثُمَّ بِمُوسَى، ثُمَّ بِمُحَمَّدٍ ﷺ». وَزَادَ عَبْدُ اللهِ حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي جَعْفَرٍ: «فَيَشْفَعُ لِيُقْضَى بَيْنَ الخَلْقِ، فَيَمْشِي حَتَّى يَأْخُذَ بِحَلْقَةِ البَابِ، فَيَوْمَئِذٍ يَبْعَثُهُ اللهُ مَقَامًا مَحْمُودًا، يَحْمَدُهُ أَهْلُ الجَمْعِ كُلُّهُمْ»[1].

**١٤٧٥- وە دەفەرموێ[2]: ((بێگومان لە ڕۆژی دواییدا خۆر نزیك دەبێتەوە (لە خەڵك)، هەتا وای لێ دێ عەرەق (ی مرۆڤەكان) دەگاتە نێوەڕاستی گوێچكە، جا كاتێ خەڵكەكە ئا لەو حاڵەتدان، هانا بۆ ئادەم ﷺ دەبەن، پاشان بۆ مووسا ﷺ، پاشان بۆ موحەممەد ﷺ دەبەن))، عەبدوڵا ئەم زیادەشی گێڕاوەتەوە: لەیس بۆی گێڕامەوە وتی: ئیبنو ئەبی جەعفەر بۆی گێڕامەوە: ((جا پێغەمبەر ﷺ تكا دەكات تا دادگایی خەڵك دەست پێ بكرێ، ئیتر دەڕوات تا دەست دەگرێ بە قوڵپی دەرگای بەهەشتەوە، جا لەو ڕۆژەدا خوا پلەی ڕێزداری پێ دەدات (كە شەفاعەتكردنی گەورەیە)، هەموو خەڵكی كۆكراوەی مەحشەر سوپاس و ستایشی دەكەن)).**

## ٥٣- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ ﴿٢٧٣﴾﴾ البقرة.

وَكَمِ الغِنَى؟ وَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «وَلاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ». لقول الله تعالى: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾﴾ البقرة.

---

[1] بروانە: ٤٧١٨.

[2] ئەم فەرموودەیە لەگەڵ فەرموودەكەی تردا پێكەوە پەیوەستن و تەواوكەری یەكترین.

## ٥٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بە زۆر داوای هیچ شتێک لە خەڵک ناکەن)

وه مرۆڤ چەندی هەبێ دەوڵەمەندە؟ وه ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ئەوەندەی نییه بێ نیازی بكات))، بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی بەرز و بڵند: ((خێر) بۆ ئەو هەژارانەیە كە دەست و پێ بەستراون لەڕێی خوادا ناتوانن (بۆ ڕۆزی پەیداكردن) بگەڕێن بە زەویدا، نەفام و نەزان وادەزانێ دەوڵەمەندن بەهۆی بێ نیازییانەوە، تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) بە شێوەیاندا دەیانناسیتەوە بە زۆر داوای هیچ لە كەس ناكەن، جا هەر ماڵێك بەختی دەكەن، ئەوە بێگومان خوا زانا و ئاگادارە پێی).

١٤٧٦- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ المِسْكِينُ الذِي تَرُدُّهُ الأُكْلَةُ وَالأُكْلَتَانِ، وَلَكِنِ المِسْكِينُ الذِي لَيْسَ لَهُ غِنًى وَيَسْتَحْيِي أَوْ لاَ يَسْأَلُ النَّاسَ إِلْحَافًا»[1].

١٤٧٦- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: كە فەرموویەتی: ((هەژار ئەو كەسە نییە بەپارووییەك و دووان وازبێنێ و كۆڵ بدات، بەڵكو هەژار كەسێكە دەوڵەمەند نییە و شەرم دەكات (سواڵ بكات)، یان بۆ سواڵ بەزۆر بەرۆكی خەڵكی ناگرێ)).

١٤٧٧- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ الحَذَّاءُ، عَنِ ابْنِ أَشْوَعَ عَنِ الشَّعْبِيِّ، حَدَّثَنِي كَاتِبُ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: كَتَبَ مُعَاوِيَةُ إِلَى المُغِيرَةِ بْنِ

[1] بڕوانە: ١٤٧٩، ٤٥٣٩.

شُعْبَةَ أَنِ اكْتُبْ إِلَيَّ بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ. فَكَتَبَ إِلَيْهِ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلاَثًا: قِيلَ وَقَالَ، وَإِضَاعَةَ المَالِ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ»[1].

**١٤٧٧- شەعبی دەڵێ: نووسەرەکەی موغیرەی کوڕی شوعبە بۆی گێڕامەوە وتی: موعاوییە نامەیەکی نووسی بۆ موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ کە شتێکم بۆ بنووسە کە لە پێغەمبەرت ﷺ بیستبێ، موغیرەش بۆی نووسی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((بێگومان خوا سێ شتی بەناپەسەند بۆ ئێوە داناوە: وتی و وتی (قسەو قسەڵۆك)، ماڵ و سامان بەفیڕۆدان، زۆر داوا و پرسیارکردن)).**

١٤٧٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ غُرَيْرٍ الزُّهْرِيُّ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَهْطًا وَأَنَا جَالِسٌ فِيهِمْ، قَالَ: فَتَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْهُمْ رَجُلًا لَمْ يُعْطِهِ، وَهُوَ أَعْجَبُهُمْ إِلَى، فَقُمْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَسَارَرْتُهُ فَقُلْتُ: مَا لَكَ عَنْ فُلَانٍ؟ وَاللَّهِ إِنِّي لأُرَاهُ مُؤْمِنًا. أو قَالَ: مُسْلِمًا. قَالَ: فَسَكَتُّ قَلِيلًا، ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ فِيهِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ. مَا لَكَ عَنْ فُلَانٍ؟ وَاللَّهِ إِنِّي لأُرَاهُ مُؤْمِنًا. أَوْ قَالَ: مُسْلِمًا. قَالَ: فَسَكَتُّ قَلِيلًا، ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ فِيهِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا لَكَ عَنْ فُلَانٍ؟ وَاللَّهِ إِنِّي لأُرَاهُ مُؤْمِنًا. أَوْ قَالَ: مُسْلِمًا. يَعْنِي: فَقَالَ: «إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ، خَشْيَةَ أَنْ يُكَبَّ فِي النَّارِ عَلَى وَجْهِهِ». وَعَنْ أَبِيهِ عَنْ صَالِحٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ ابْنِ مُحَمَّدٍ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ هَذَا، فَقَالَ فِي حَدِيثِهِ: فَضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ فَجَمَعَ بَيْنَ عُنُقِي وَكَتِفِي، ثُمَّ قَالَ: «أَقْبِلْ أَيْ سَعْدُ، إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ»[2].

---

[1] بڕوانە: ٨٤٤.

[2] بڕوانە: ٢٧.

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: ﴿ فَكُبْكِبُوا ﴿٩٤﴾ ﴾ الشعراء. قُلِبُوا. ﴿ مُكِبًّا ﴿٢٢﴾ ﴾ الملك. أَكَبَّ الرَّجُلُ إِذَا كَانَ فِعْلُهُ غَيْرَ وَاقِعٍ عَلَى أَحَدٍ، فَإِذَا وَقَعَ الفِعْلُ قُلْتَ: كَبَّهُ اللَّهُ لِوَجْهِهِ، وَكَبَبْتُهُ أَنَا.

**١٤٧٨- عامیری کوڕی سەعد لە باوکیەوە (کە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصە) ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵی دا بە چەند کەسێك، منیش لە نێویاندا دانیشتبوم، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە پیاوێکیان هێنا و هیچی پێنەدا، کە بەلای منەوە چاکترینیان بوو، بۆیە منیش هەستام و ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا، سرتەو چپەم کرد لەگەڵی و وتم: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) بۆچی بەشی فلان کەست نەدا؟ سوێند بەخوا من دەزانم ئیمانداره، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((یان مسوڵمانە))، سەعد دەڵێ: منیش کەمێك بێدەنگ بووم، پاشان زانیاریم دەربارەی ئەو پیاوە وای لێکردم کە بگەڕێمەوە (بۆ قسەکەی پێشووم)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی بەشی فلان کەست نەدا؟ سوێند بە خوا من دەزانم ئیمانداره، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((یان مسوڵمانە))، (عامیر) دەڵێ: سەعد وتی: منیش کەمێك بێدەنگ بووم، پاشان زانیاریم دەربارەی ئەو پیاوە وای لێکردم کە بگەڕێمەوە (بۆ قسەکەی پێشووم) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی بەشی فلان کەست نەدا؟ سوێند بەخوا من دەزانم ئیمانداره، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((یان مسوڵمانە))، مەبەستی (مسوڵمانە) ئەمە بوو فەرمووی: ((بێگومان من بەشی کەسێك دەدەم لە کاتێکدا کەسێکی دیکە لەو خۆشەویستترە لام، لە ترسی ئەوەی بەسەر ڕوودا بخرێتە دۆزەخەوە))، هەروەها (یەعقوبی کوڕی ئیبراهیم ) لە باوکیەوە[1] ، ئەویش لە سالحەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی موحەمەدەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: لە باوکم بیستووە ئەم**

---

[1] کەواتە فەرموودەکە مورسەلە، موحەمەدی کوڕی سەعد بەبێ ناوهێنانی سەعد لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە.

**فەرموودەی دەگێڕایەوە، وە لە گێڕانەوەكەیدا وتی: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی كێشای بە نێوانی ملم و هەردوو شانمدا، پاشان فەرمووی: ((ئەی سەعد وەرە (با بۆت ڕوون بكەمەوە[1]، بێگومان من بەشی كەسێك دەدەم ...)).**

**ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ﴿ فَكُبْكِبُوا ﴿٩٤﴾ ﴾، واتە: سەربەرەو خوار كران، سەرەونخون كران، ﴿ مُكِبًّا ﴿٢٢﴾ ﴾، دەوترێ: (أَكَبَّ الرَّجُلُ)، ئەگەر كارەكەی نەكەوێتە سەر كەسێكی تر (واتە: كردارێكی تێنەپەڕەو بۆ خۆی قلب بێتەوە بەملدا و بەدەم و ڕووخساردا)، بەڵام ئەگەر كارەكەی كەوتە سەر كەسێكی تر، ئەو كاتە دەڵێت: (كَبَّهُ اللهُ لِوَجْهِهِ) خودا بەدەم و ڕوودا خستی، وە: (كَبَبْتُهُ أَنَا)، من بەدەم و ڕوودا خستم.**

١٤٧٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ المِسْكِينُ الذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلَكِنِ المِسْكِينُ الذِي لاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ بِهِ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، وَلاَ يَقُومُ فَيَسْأَلُ النَّاسَ»[2].

**١٤٧٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نەدار و هەژار ئەو كەسە نییە كە دەگەڕێ بەسەر خەڵكیدا پارووویەك یان دووان، خورمایەك یان دووان دەیگێڕێتەوە و واز دێنێ، بەڵكو هەژار ئەو كەسەیە كە ئەوەندەی نییە بێ نیازی بكات، خەڵكیش پێی نازانن تا خێری پێ بكەن، خۆشی هەڵناستێ داوا لە خەڵك بكات)).**

---

[1] یان پێی ڕازیبە و قبوڵی بكە.

[2] بڕوانە: ١٤٧٦.

١٤٨٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ، ثُمَّ يَغْدُوَ -أَحْسِبُهُ قَالَ: إِلَى الجَبَلِ- فَيَحْتَطِبَ، فَيَبِيعَ فَيَأْكُلَ وَيَتَصَدَّقَ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ أَكْبَرُ مِنَ الزُّهْرِيِّ، وَهُوَ قَدْ أَدْرَكَ ابْنَ عُمَرَ[1].

**١٤٨٠- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان گوریسەکەی هەلگرێ، پاشان بڕوات -وابزانم فەرمووی: بۆ شاخ- و دار بکات (و بەکۆڵی بیهێنێ)، بیفرۆشێ و بیخوات و بیبەخشێت، چاکترە بۆی لەوەی کە داوا لە خەڵك بکات))، ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: صاڵحی کوڕی کەیسان لە زوهری گەورەترە (لەتەمەندا)، وە بێگومان ئەو (صاڵح)ـە بە ئیبنو عومەر گەیشتووە.**

## ٥٤- بابُ خَرْصِ[2] التَّمْرِ

١٤٨١- حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ بَكَّارٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَبَّاسٍ السَّاعِدِيِّ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ غَزْوَةَ تَبُوكَ، فَلَمَّا جَاءَ وَادِيَ القُرَى، إِذَا امْرَأَةٌ فِي حَدِيقَةٍ لَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لأَصْحَابِهِ: «اخْرُصُوا». وَخَرَصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَشَرَةَ أَوْسُقٍ، فَقَالَ لَهَا: «أَحْصِي مَا يَخْرُجُ مِنْهَا». فَلَمَّا أَتَيْنَا تَبُوكَ قَالَ: «أَمَا إِنَّهَا سَتَهُبُّ اللَّيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدَةٌ فَلاَ يَقُومَنَّ أَحَدٌ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُ بَعِيرٌ فَلْيَعْقِلْهُ». فَعَقَلْنَاهَا، وَهَبَّتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ،

---

[1] بڕوانە: ١٤٧٠.

[2] خَرْص: قەبڵاندن یان خەمڵاندنی خورمای تەڕە بەخورمای وشک پێش لێکردنەوەی، چونکە بە خەمڵاندنی وشکەکە دەردەکرێ، بۆ ئەوە دەخەمڵێنرێ پێش لێکردنەوەی و وشک کردنەوەی، تا ئەگەر لێی خورا، خاوەن ماڵەکە یان میوان گوناهبار نەبن.

فَقَامَ رَجُلٌ فَأَلْقَتْهُ بِجَبَلِ طَيِّئٍ، وَأَهْدَى مَلِكُ أَيْلَةَ لِلنَّبِيِّ ﷺ بَغْلَةً بَيْضَاءَ، وَكَسَاهُ بُرْدًا وَكَتَبَ لَهُ بِبَحْرِهِمْ، فَلَمَّا أَتَى وَادِيَ القُرَى قَالَ لِلْمَرْأَةِ: «كَمْ جَاءَ حَدِيقَتُكِ؟». قَالَتْ: عَشَرَةَ أَوْسُقٍ خَرْصَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي مُتَعَجِّلٌ إِلَى المَدِينَةِ، فَمَنْ أَرَادَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَعَجَّلَ مَعِي فَلْيَتَعَجَّلْ». فَلَمَّا -قَالَ ابْنُ بَكَّارٍ كَلِمَةً مَعْنَاهَا- أَشْرَفَ عَلَى المَدِينَةِ قَالَ: «هَذِهِ طَابَةُ». فَلَمَّا رَأَى أُحُدًا قَالَ: «هَذَا جُبَيْلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ، أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ دُورِ الأَنْصَارِ؟». قَالُوا: بَلَى. قَالَ: «دُورُ بَنِي النَّجَّارِ، ثُمَّ دُورُ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ دُورُ بَنِي سَاعِدَةَ، أَوْ دُورُ بَنِي الحَارِثِ بْنِ الخَزْرَجِ، وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ، يَعْنِي: خَيْرًا»[١].

## ٥٤- باسی خەملاندنی خورما[٢]

**١٤٨١- ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ غەزای تەبووكمان كرد، جا كاتێ گەیشتە شاری (واد القری)[٣]، بینی ئافرەتێك لەنێو باخەكەی خۆیدایە، پێغەمبەریش ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: (( (خورمای ئەو باخە) بخەملێنن))، پێغەمبەر ﷺ بە دە ویسق خەملاندی، بە ئافرەتەكەی فەرموو: ((ئەندازەكەیت بیر بێت[٤]، بزانە چەندێ خورمای بەرهەم هێناوە))، جا كاتێ گەیشتینە تەبووك فەرمووی: ((ئاگادار بن ئەمشەو بایەكی زۆر توندو بەهێز هەڵدەكات، كەوابوو كەس هەڵنەسێتەوە، هەركەسیش وشتری پێیە، با بیبەسێتەوە))، ئێمەش وشترەكانمان بەستەوە، ئینجا بایەكی زۆر توند هەڵی**

---

[١] بڕوانە: ١٨٧٢، ٣١٦١، ٣٧٩١، ٤٤٢٢.

[٢] مەبەست ئەوەیە كاتێ دارخورما خورمای تەڕی گرتووە بخەملێنرێ بە خورمای وشك، ئەو خورمایە چەندی بۆ دیاری بكرێ بۆ ڕێژەی زەكات لێدانی و تا گوناهبار نەبن كە لێی دەخۆن، چونكە لە پێشدا زەكاتەكەی دیاری كراوە.

[٣] شارێكی كۆنە لە نێوان مەدینە و شامدا بووە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٦١٥/٣.

[٤] بزانە چەند زەكاتی تێدایە لەو خورمایەی بەرهەم هاتووە.

کرد، پیاوێك هەستایەوە و بایەکە بردی و لە کێوی تەییی فڕێی دا، پاشای ئەیله[1] ئێسترێکی ماچەکی سپی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەریش ﷺ) پۆشاکێکی خەتخەتی بەدیاری بۆ نارد و نامەیەکی بۆ نووسی، بەگەورەی وڵاتی خۆی هێشتییەوە (لەبەرانبەر دانی سەرانە)، ئینجا کە هاتەوە بۆ شاری (وادی القری) بە ئافرەتەکەی (جاری پێشووی) فەرموو: ((باخەکەت چەند خورمای هەبوو؟))، وتی: دە ویسق، وەك ئەوەی پێغەمبەر ﷺ خەملاندبووی، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان من پەلەمە و دەگەڕێمەوە بۆ مەدینە، جا هەرکەس لە ئێوە دەیەوێ بەپەلە لەگەڵم بێت، با پەلە بکات و بڕۆین))، جا کاتێ -ئیبنو بەککار وشەیەکی وت بەو مانایە بوو- شاری مەدینەی لێ وەدەرکەوت و چاوی کەوت پێی، فەرمووی: ((ئەمە تابەیە))، ئینجا کە ئوحودیشی بینی فەرمووی: ((ئەم کێوە بچووکە ئێمەی خۆش دەوێ، ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ، ئایا پێتان بڵێم چاکترینی بنەماڵەی ئەنصار کامانەن؟))، وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((بنەماڵەی نەججار، پاشان بنەماڵەی عەبدولئەشهەل، پاشان بنەماڵەی بەنی ساعیدە -یان بنەماڵەی حاریسی کوڕی خەزرەج -، وە لە هەموو بنەماڵەکانی ئەنصاردا)) واتە: خێر و چاکە هەیە.

١٤٨٢- وَقَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ بِلَالٍ حَدَّثَنِي عَمْرٌو: «ثُمَّ دَارُ بَنِي الحَارِثِ، ثُمَّ بَنِي سَاعِدَةَ». وَقَالَ سُلَيْمَانُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ غَزِيَّةَ، عَنْ عَبَّاسٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أُحُدٌ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: كُلُّ بُسْتَانٍ عَلَيْهِ حَائِطٌ فَهْوَ حَدِيقَةٌ، وَمَا لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ حَائِطٌ لَمْ يَقُلْ: حَدِيقَةٌ.

١٤٨٢- سولەیمانی کوڕی بیلال دەڵێ: عەمر بۆی گێڕامەوە (بەم شێوەیە): ((پاشان ماڵی بەنی حاریس، پاشان بەنی ساعیدە))، وە سولەیمان دەڵێ: لە

[1] ئەیله: شارێکی دیار بووە، پاشان وێران بووە، لە قەراغی دەریا لە نێوان حیجاز و میصردا بووە، هدي الساري مقدمة فتح الباري: ١١٢.

سەعدی كوڕی سەعیدەوە، لە عومارەی كوڕی غەزییەوە، لە عەباسەوە، لە باوكیەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ئوحود كێوێكە ئێمەی خۆش دەوێ، ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ))، ئەبو عەبدولا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: هەر باخێك دیوار و پەرژینی هەبێ، ئەوە (حَدِيقَةٌ)، ئەوەشی دیوار و پەرژینی نەبوو، پێی ناوترێ: (حَدِيقَةٌ).

## ٥٥- بابُ العُشْرِ فِيمَا يُسْقَى مِنْ مَاءِ السَّمَاءِ وَبِالمَاءِ الجَارِي

وَلَمْ يَرَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ فِي العَسَلِ شَيْئًا.

١٤٨٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا العُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ العُشْرِ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: هَذَا تَفْسِيرُ الأَوَّلِ، لأَنَّهُ لَمْ يُوَقِّتْ فِي الأَوَّلِ، يَعْنِي: حَدِيثَ ابْنِ عُمَرَ .وَفِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ العُشْرُ» وَبَيَّنَ فِي هَذَا وَوَقَّتَ، وَالزِّيَادَةُ مَقْبُولَةٌ، وَالمُفَسَّرُ يَقْضِي عَلَى المُبْهَمِ إِذَا رَوَاهُ أَهْلُ الثَّبَتِ، كَمَا رَوَى الفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُصَلِّ فِي الكَعْبَةِ. وَقَالَ بِلاَلٌ: قَدْ صَلَّى [١٥٩٩] فَأُخِذَ بِقَوْلِ بِلاَلٍ، وَتُرِكَ قَوْلُ الفَضْلِ. **(ئەم بڕگەیە وەرنەگێڕدراوە)**

## ٥٥- باسی دەیەک زەکات دەدرێت لەوەی بەئاوی باران و ئاسمان و ئاوی ڕووبارەکان ئاو بدرێت

**عومەری كوڕی عەبدولعەزیز پێی وابوو كە هەنگوین زەكاتی لێ ناكەوێ.**

**١٤٨٣- سالیمی كوڕی عەبدولا لە باوكیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((لەوەی ئاوی ئاسمان و كانیاو**

**ئاوی دابێت، یان بەڕەگ و ڕیشکەکەی ئاو بخوات، (زەکاتەکەی) دە یەکە، وە ئەوەی بە وڵاخی ئاو هەڵگوز ئاو بدرێ بیست یەکە)).**

## ٥٦- بابٌ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ

١٤٨٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا مَالِكٌ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ فِيمَا أَقَلُّ مِنْ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَلاَ فِي أَقَلَّ مِنْ خَمْسَةٍ مِنَ الإِبِلِ الذَّوْدِ صَدَقَةٌ، وَلاَ فِي أَقَلَّ مِنْ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الوَرِقِ صَدَقَةٌ»[1].

قالَ أبوعبدالله: هذا تفسيرُ الأولِ إذا قالَ: ((لَيْسَ فِيمَا دونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ)). ويُؤخذُ أبداً في العِلمِ بما زادَ لأهلُ الثَّبَتِ أو بَيَّنوا.

## ٥٦- باسێک: لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێ

**١٤٨٤- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێ، وە لە پێنج وشتر کەمتر زەکاتی ناکەوێ، وە لە پێنج ئۆقیە کەمتر لە زیو زەکاتی ناکەوێ)).**

**ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەم فەرموودەی ئەبو سەعید فەرموودەکەی پێشتری عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ ڕوون دەکاتەوە، چونکە لێرەدا دەفەرموێ: ((لە پێنج ویسق کەمتر (دانەوێڵە) زەکاتی ناکەوێ))، بەڵام لە فەرموودەکەی پێش ئەم فەرموودەیە نادیار بوو کە لە چەندێکدا زەکاتی دەکەوێ، لەم زانیاری فەرموودەیە ئەوەی ڕوونکردنەوەی زیاتری لابێت، یان وشەی زیاتری گێڕابێتەوە، ئەگەر ئەو کەسانە جێگای متمانە بن هەمیشە قسەکەیان وەردەگیرێ.**

---

[1] بڕوانە: ١٤٠٥.

## ٥٧- بابُ أَخْذِ صَدَقَةِ التَّمْرِ عِنْدَ صِرَامِ النَّخْلِ وَهَلْ يُتْرَكُ الصَّبِيُّ فَيَمَسُّ تَمْرَ الصَّدَقَةِ؟

١٤٨٥- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ الحَسَنِ الأَسَدِيُّ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُؤْتَى بِالتَّمْرِ عِنْدَ صِرَامِ النَّخْلِ، فَيَجِيءُ هَذَا بِتَمْرِهِ، وَهَذَا مِنْ تَمْرِهِ، حَتَّى يَصِيرَ عِنْدَهُ كَوْمًا مِنْ تَمْرٍ، فَجَعَلَ الحَسَنُ وَالحُسَيْنُ ﷺ يَلْعَبَانِ بِذَلِكَ التَّمْرِ، فَأَخَذَ أَحَدُهُمَا تَمْرَةً، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَخْرَجَهَا مِنْ فِيهِ فَقَالَ: «أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ آلَ مُحَمَّدٍ ﷺ لاَ يَأْكُلُونَ الصَّدَقَةَ»[1].

## ٥٧- باسی وەرگرتنی زەكاتی خورما لەكاتی لێكردنەوەی بەرەكەی، وە ئایا واز لە منداڵ دەهێنرێ دەست بدات لە خورمای زەكات؟

**١٤٨٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لەكاتی ڕنینی خورمادا خورما دەهێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئەم (زەكاتی) خورماكەی دەهێنا، ئەوی تر (زەكاتی) خورماكەی دەهێنا، هەتا كومایەكی خورما لای پێغەمبەر ﷺ كۆدەبوویەوە، ئینجا حەسەن و حوسەین ﷺ یارییان دەكرد بەو خورمای زەكاتە، جا یەكێكیان خورمایەكی هەڵگرت خستیە دەمییەوە، پێغەمبەریش ﷺ سەیری كرد و لە دەمی دەرهێناو فەرمووی: ((ئایا نازانی كە بنەماڵەی موحەممەد زەكات ناخۆن!)).**

---

[1] بڕوانە: ١٤٩١، ٣٠٧٢.

## ٥٨- بابُ مَنْ بَاعَ ثِمَارَهُ أَوْ نَخْلَهُ أَوْ أَرْضَهُ أَوْ زَرْعَهُ، وَقَدْ وَجَبَ فِيهِ العُشْرُ أَوِ الصَّدَقَةُ فَأَدَّى الزَّكَاةَ مِنْ غَيْرِهِ، أَوْ بَاعَ ثِمَارَهُ وَلَمْ تَجِبْ فِيهِ الصَّدَقَةُ

وَقَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ: «لاَ تَبِيعُوا الثَّمَرَةَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا». فَلَمْ يَحْظُرِ البَيْعَ بَعْدَ الصَّلاَحِ عَلَى أَحَدٍ، وَلَمْ يَخُصَّ مَنْ وَجَبَ عَلَيْهِ الزَّكَاةُ مِمَّنْ لَمْ تَجِبْ.

## ٥٨- باسی ئەگەر کەسێک بەروبوومەکەی یان دارخورماکەی یان زەوییەکەی یان کشتوکاڵەکەی فرۆشت، لەکاتێکدا دەیەک یان زەکاتی لێ کەوتبوو، وە زەکاتەکەی لە غەیری ئەمانەوە دابوو، یان بەروبوومەکەی فرۆشتبوو، لەکاتێکدا زەکاتی لێ نەکەوتبوو

**وە ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((بەروبوومی درەختەکانتان مەفرۆشن، هەتا سەرەتای پێگەیشتنیان دەردەکەوێ))، کەواتە فرۆشتنی بەروبوومی قەدەغە نەکردووە لە کەس دوای پێگەیشتنی، وە ئەوەی زەکاتی دەکەوێ جیای نەکردۆتەوە لەوەی زەکاتی ناکەوێ.**

١٤٨٦- حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ - ؓ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ الثَّمَرَةِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا. وَكَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ صَلاَحِهَا قَالَ: حَتَّى تَذْهَبَ عَاهَتُهُ[1].

**١٤٨٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ؓ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی بەروبوومی قەدەغەکردووە هەتا پێگەیشتنی دەست پێدەکات، وە ئیبنو عومەر کە پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی (کاتی) چاکبوون و پێگەیشتنی دەیوت: تا لەخەم دەرەخسێ و لەدەردو نەخۆشی تێدەپەڕێ.**

[1] بڕوانە: ٢١٨٣، ٢١٩٤، ٢١٩٩، ٢٢٤٧، ٢٢٤٩.

١٤٨٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي خَالِدُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا[1].

**١٤٨٧- جابیری کوڕی عەبدولا ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی بەروبوومی قەدەغەکردووە، هەتا سەرەتای پێگەیشتنی دەست پێدەکات.**

١٤٨٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى تُزْهِيَ، قَالَ: حَتَّى تَحْمَارَّ[2].

**١٤٨٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی بەروبوومی قەدەغەکردووە هەتا پێدەگات، وتی: واتە: هەتا سوور دەبێ.**

## ٥٩- بابٌ: هَلْ يَشْتَرِي صَدَقَتَهُ؟

وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَشْتَرِيَ صَدَقَتَهُ غَيْرُهُ؛ لأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا نَهَى الْمُتَصَدِّقَ خَاصَّةً عَنِ الشِّرَاءِ وَلَمْ يَنْهَ غَيْرَهُ.

١٤٨٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ تَصَدَّقَ بِفَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَوَجَدَهُ يُبَاعُ، فَأَرَادَ أَنْ يَشْتَرِيَهُ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَاسْتَأْمَرَهُ، فَقَالَ: «لاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ». فَبِذَلِكَ كَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ لاَ يَتْرُكُ أَنْ يَبْتَاعَ شَيْئًا تَصَدَّقَ بِهِ إِلاَّ جَعَلَهُ صَدَقَةً[3].

---

[1] بڕوانە: ٢١٨٩، ٢١٩٦، ٢٣٨١، ٢٣٤٠، ٢٦٣٢.

[2] بڕوانە: ٢١٩٥، ٢١٩٧، ٢١٩٨، ٢٢٠٨.

[3] بڕوانە: ٢٧٧٥، ٢٩٧١، ٣٠٠٢.

## ٥٩- باسێک: ئایا (دروستە) زەکاتەکەی بکڕێتەوە؟

قەیناكات كەسێكی تر ماڵی زەكاتەكەی ئەم بكڕێتەوە، چونكە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كردووە لەوەی زەكاتدەرەكە ماڵی زەكاتەكەی خۆی بكڕێتەوە، بەڵام ڕێگری نەكرد لە غەیری زەكاتدەرەكە بیكڕێتەوە.

١٤٨٩- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە عومەر ئەسپێكی كرد بەخێر بۆ تێكۆشان لەڕێی خوادا، ئینجا بینی دەفرۆشرێ، بۆیە ویستی بیكڕێتەوە، پاشان هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ (بۆ ئەو مەبەستە) ڕاوێژی پێكرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((زەكاتەكەت مەگێڕەوە))، جا بەوهۆیەوە عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ هەر شتێكی بكڕیبایە كە لە زەكاتدا دابووی، نەیدەهێشتەوە ڕاستەوخۆ دەیكردەوە بەخێر.

١٤٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَأَضَاعَهُ الذِي كَانَ عِنْدَهُ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِيَهُ، وَظَنَنْتُ أَنَّهُ يَبِيعُهُ بِرُخْصٍ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «لاَ تَشْتَرِ وَلاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ، وَإِنْ أَعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ، فَإِنَّ العَائِدَ فِي صَدَقَتِهِ كَالعَائِدِ فِي قَيْئِهِ»[1].

١٤٩٠- زەیدی كوڕی ئەسلەم لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە عومەرم بیست ﷺ دەیوت: ئەسپێكم دا بەپیاوێك بۆ جیهاد لە ڕێی خوادا (سواری بێ)، بەڵام ئەو كەسەی ئەسپەكەی لابوو خزمەتی نەكرد و گوێی پێ نەدا، بۆیە ویستم بیكڕمەوە و گومانم وابوو بە هەرزان دەیفرۆشێ، جا پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد (لەوبارەوە)، ئەویش فەرمووی: ((مەیكڕە و خێرەكەت مەگێڕەوە، ئەگەر

---

[1] بروانە: ٢٦٢٣، ٢٦٣٦، ٢٩٧٠، ٣٠٠٣.

بەیەك درهەمیش بتداتێ، چونكە بێگومان ئەو كەسەی زەكاتەكەی بكڕێتەوەو بیگێڕێتەوە، وەك ئەو (سەگە) وایە ڕشانەوەی خۆی بخواتەوە)).

## ٦٠- بابُ مَا يُذْكَرُ فِي الصَّدَقَةِ لِلنَّبِيِّ ﷺ

١٤٩١- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَخَذَ الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ ﷺ تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كِخٍ كِخٍ». لِيَطْرَحَهَا، ثُمَّ قَالَ: «أَمَا شَعَرْتَ أَنَّا لاَ نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ»[1].

## ٦٠- باسی ئەوەی دەربارەی زەكات بۆ پێغەمبەر ﷺ وتراوە

**١٤٩١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: حەسەنی كوڕی عەلی ﷺ دەنكێ خورمای لە خورمای زەكات هەڵگرت و خستییە دەمیەوە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((كەخ كەخ)) بۆ ئەوەی فڕێی بدا، پاشان فەرمووی: ((ئایا نەتزانیوە ئێمە زەكات ناخۆین!)).**

## ٦١- بابُ الصَّدَقَةِ عَلَى مَوَالِي أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ

١٤٩٢- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: وَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ شَاةً مَيِّتَةً أُعْطِيَتْهَا مَوْلاَةٌ لِمَيْمُونَةَ مِنَ الصَّدَقَةِ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَلاَّ انْتَفَعْتُمْ بِجِلْدِهَا؟». قَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ. قَالَ: «إِنَّمَا حَرُمَ أَكْلُهَا»[2].

---

[1] بروانە: ١٤٨٥.

[2] بروانە: ٢٢٢١، ٥٥٣١، ٥٥٣٢.

## ٦١- باسی زەكاتدان بە ئازادكراوانی خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ

**١٤٩٢- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مەڕێكی مرداربووی بینی، كە لە زەكاتدا درابوو بەكەنیزەكێكی ئازادكراوی مەیموونەی (خێزانی پێغەمبەر ﷺ)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوە بۆچی سوودتان لە پێستەكەی وەرنەگرتووە؟))، پێیان وت: چونكە ئەوە مرداربۆتەوە، فەرمووی: ((بێگومان خواردنی گۆشتەكەی حەڕام كراوە (نەك پێستەكەی) )).**

١٤٩٣- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا الحَكَمُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ لِلْعِتْقِ، وَأَرَادَ مَوَالِيهَا أَنْ يَشْتَرِطُوا وَلاَءَهَا، فَذَكَرَتْ عَائِشَةُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: «اشْتَرِيهَا، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ». قَالَتْ: وَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِلَحْمٍ، فَقُلْتُ: هَذَا مَا تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ. فَقَالَ: «هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ»[1].

**١٤٩٣- ئەسوەد دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﷺ كە ویستی بەریرە بكڕێ تا ئازادی بكات، بەڵام خاوەنەكانی ویستیان مەرج دابنێن كە وەلای[2] بۆ ئەوان بێت، عائیشەش ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باسكرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((بیكڕە، چونكە بێگومان وەلای ئازادكراو بۆ ئەو كەسەیە كە ئازادی دەكات))، عائیشە وتی: گۆشتێكیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، منیش ووتم: ئەم گۆشتە ئەو زەكاتەیە دراوە بە بەریرە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو گۆشتە بۆ ئەو زەكاتە، بەڵام بۆ ئێمە دیارییە)).**

---

[1] بڕوانە: ٤٥٦.

[2] وَلاَءَ: واتە: نزیكایەتی، بەڵام لەم فەرموودەیەدا مەبەست پێی مافی میرات بردنە لە خاوەن كۆیلە و كەنیزەک، دوای مردنی كۆیلە و كەنیزەكەكە هەموو ماڵەكەیان بۆ خاوەنەكەیان دەبێ، ئەگەر میراتگری نەبوو میراتی لێ ببات، هەروەها (وَلاَءَ) بەو خوێن بۆ دانەش دەوترێ كە بۆ كۆیلە و كەنیزەک دەدرێ، ئەگەر تاوانێكیان كرد و خوێنیان كەوتە سەر. بڕوانە: إرشاد الساري: ٦٢٩/٣.

## ٦٢- بابٌ: إِذَا تَحَوَّلَتِ الصَّدَقَةُ

١٤٩٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأَنْصَارِيَّةِ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى عَائِشَةَ ﵂ فَقَالَ: «هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟». فَقَالَتْ: لاَ، إِلَّا شَيْءٌ بَعَثَتْ بِهِ إِلَيْنَا نُسَيْبَةُ مِنَ الشَّاةِ الَّتِي بَعَثْتَ بِهَا مِنَ الصَّدَقَةِ. فَقَالَ: «إِنَّهَا قَدْ بَلَغَتْ مَحِلَّهَا»[1].

## ٦٢- باسێک: ئەگەر زەکاتەکە گۆڕا

**١٤٩٤- ئوممو عەتییەی ئەنصاری ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ ماڵی عائیشە ﵂و فەرمووی: ((شتێکتان هەیە (بۆ خواردن)؟)) عائیشە وتی: نەخێر، مەگەر ئەو بەشە گۆشتەی نوسەیبە بۆی ناردووین لەو مەڕەی کە بەزەکات بۆت ناردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی گەیشتۆتە جێگای خۆی)).**

١٤٩٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِلَحْمٍ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: «هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ لَنَا هَدِيَّةٌ».
وَقَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَنْبَأَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، سَمِعَ أَنَسًا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

**١٤٩٥- ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە کە گۆشتێ هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە زەکات بوو درابوو بە بەریرە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوە بۆ بەریرە زەکاتە، بەڵام بۆ ئێمە دیارییە)).**
**ئەبو داود دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕاینەوە لەقەتادەوە کە لە ئەنەسی بیستووە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە.**

---

[1] بڕوانە: ١٤٤٦.
[2] بڕوانە: ٢٥٧٧

## ٦٣- بابُ أَخْذِ الصَّدَقَةِ مِنَ الأَغْنِيَاءِ وَتُرَدَّ فِي الفُقَرَاءِ حَيْثُ كَانُوا

١٤٩٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَيْفِيٍّ، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ حِينَ بَعَثَهُ إِلَى اليَمَنِ: «إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ، فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ»[1].

## ٦٣- باسی وەرگرتنی زەکات لە دەوڵەمەندان و دانەوەی بە هەژاران لە هەر کوێ بوون

**١٤٩٦- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە موعازی کوڕی جەبەلی ﷺ فەرموو کاتێ ناردی بۆ یەمەن: ((بێگومان تۆ دەڕۆیت بۆ لای گەلێك کە خاوەن پەڕاوی ئاسمانین، جا کە ڕۆیشتیتە لایان بانگیان بکە بۆ ئەوەی شایەتی بدەن کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا، وە شایەتی بدەن کە بێگومان من پێغەمبەری خوام، ئینجا ئەگەر ئەوەیان بەگوێ کردی، ئەوسا ئاگاداریان بکە کە بێگومان خوا لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرزکردوون، ئینجا ئەگەر ئەوەشیان بەگوێ کردی، ئەوسا ئاگاداریان بکە کە بێگومان خوا بەخشینێکی لەسەر فەرزکردوون، لە دەوڵەمەندەکانیان**

---

[1] بروانە: ١٣٩٥.

وەردەگیرێ و دەدرێ بە هەژارو نەدارەكانیان، جا ئەگەر ئەوەشیان بەگوێ كردی، ئەوە ئاگاداربە چاكترین ماڵیان وەرمەگرە (لە زەكاتدا)، وە خۆت لە دوعای ستەم لێكراو بپارێزە، چونكە بەڕاستی لە نێوان ئەو و خوادا پەردە نییە)).

## ٦٤- بابُ صَلَاةِ الإِمَامِ وَدُعَائِهِ لِصَاحِبِ الصَّدَقَةِ

وَقَوْلِهِ تعالى: ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ﴿١٠٣﴾ ﴾ التوبة.

١٤٩٧- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ قَالَ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ فُلَانٍ». فَأَتَاهُ أَبِي بِصَدَقَتِهِ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى»[١].

## ٦٤- باسی نزا و دوعای پێشەوا بۆ زەكاتدەر

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ( (ئەی موحەممەد ﷺ) لە ماڵ و سامانەكانیان زەكات وەربگرە، پاك و پوختیان بكەرەوە پێی، وە دوعایان بۆ بكە، بێگومان دوعاكانت بۆیان مایەی دڵ ئارامییە).

١٤٩٧- عەبدوڵای كوڕی ئەبی ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خەڵكانێك زەكاتەكەیان بۆ بهێنایە دەیفەرموو: ((خوایە لە بنەماڵەی فلان كەس خۆشبە و بەزەیی خۆت بڕێژە بەسەریاندا))، جا باوكم زەكاتەكەی برد بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوایە لە بنەماڵەی ئەبی ئەوفا خۆشبە و بەزەیی خۆت بڕێژە بەسەریاندا)).

---

[١] بروانە: ٤١٦٦، ٦٣٣٢، ٦٣٥٩.

## ٦٥- بَابُ مَا يُسْتَخْرَجُ مِنَ البَحْرِ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَيْسَ العَنْبَرُ بِرِكَازٍ إِنما هُوَ شَيْءٌ دَسَرَهُ البَحْرُ. وَقَالَ الحَسَنُ فِي العَنْبَرِ وَاللُّؤْلُؤِ: الخُمُسُ، فَإِنَّمَا جَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الرِّكَازِ الخُمُسَ، لَيْسَ فِي الَّذِي يُصَابُ فِي المَاءِ.

## ٦٥- باسی (حوکمی) ئەوەی لە دەریادا دەردەهێنرێ

**عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: عەنبەر ریکاز (کانزا) نییە، بەڵکو عەنبەر شتێکە دەریا لایدەدا لە کەناری دەریادا. حەسەن دەڵێ: لە عەنبەرو مرواریدا پێنج یەکی زەکاتیان لێ دەکەوێ، (ئیمامی بوخاری دەڵێ): بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەگەنجینەدا زەکاتی پێنج یەکی داناوە، ئەوەی لە ئاودا بەدەست دەهێنرێ پێی ناوترێ: گەنجینە.**

١٤٩٨- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَنَّ رَجُلًا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إِسْرَائِيلَ، بِأَنْ يُسْلِفَهُ أَلْفَ دِينَارٍ، فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ، فَخَرَجَ فِي البَحْرِ، فَلَمْ يَجِدْ مَرْكَبًا، فَأَخَذَ خَشَبَةً فَنَقَرَهَا، فَأَدْخَلَ فِيهَا أَلْفَ دِينَارٍ، فَرَمَى بِهَا فِي البَحْرِ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ الذِي كَانَ أَسْلَفَهُ، فَإِذَا بِالخَشَبَةِ فَأَخَذَهَا لِأَهْلِهِ حَطَبًا -فَذَكَرَ الحَدِيثَ- فَلَمَّا نَشَرَهَا وَجَدَ المَالَ»[1].

**١٤٩٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((پیاوێکی جوولەکە داوای لە پیاوێکی تری جوولەکە کرد کە هەزار دیناری بەقەرز بداتێ، پیاوەکەش هەزار دینارەکەی پێدا (کاتی دانەوەی هات)، کابرای قەرزدار ڕۆیشت بۆ کەناری دەریا کەشتی دەست نەکەوت، جا دارێکی هێناو هەڵیکۆڵی، هەزار دینارەکەی خستە نێویەوە، پاشان دارەکەی فڕێ دایە**

[1] بروانە: ٢٠٦٣، ٢٢٩١، ٢٤٠٤، ٢٤٣٠، ٢٧٣٤، ٦٢٦١.

دەریاكەوە، ئینجا ئەو پیاوەی قەرزەكەی پێ دابوو لە ماڵ هاتە دەرەوە، (بۆ كەناری دەریاكە) دارێكی بینی هەڵیگرت و بردیەوە بۆ ماڵەوە بۆ سووتاندن -جا بەدرێژی فەرموودەكەی گێڕایەوە-، جا كاتێك دارەكەی شكاند، پارەكەی خۆی بینی تێیدا)).

## ٦٦- بابٌ: فِي الرِّكَازِ الخُمُسُ

وَقَالَ مَالِكٌ وَابْنُ إِدْرِيسَ: الرِّكَازُ دِفْنُ الجَاهِلِيَّةِ، فِي قَلِيلِهِ وَكَثِيرِهِ الخُمُسُ. وَلَيْسَ المَعْدِنُ بِرِكَازٍ، وَقَدْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «فِي المَعْدِنِ: جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الخُمُسُ». وَأَخَذَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ مِنَ المَعَادِنِ مِنْ كُلِّ مِائَتَيْنِ خَمْسَةً. وَقَالَ الحَسَنُ: مَا كَانَ مِنْ رِكَازٍ فِي أَرْضِ الحَرْبِ فَفِيهِ الخُمُسُ، وَمَا كَانَ مِنْ أَرْضِ السِّلْمِ فَفِيهِ الزَّكَاةُ، وَإِنْ وَجَدْتَ اللُّقَطَةَ فِي أَرْضِ العَدُوِّ فَعَرِّفْهَا، وَإِنْ كَانَتْ مِنَ العَدُوِّ فَفِيهَا الخُمُسُ. وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: المَعْدِنُ رِكَازٌ مِثْلُ دِفْنِ الجَاهِلِيَّةِ؛ لأَنَّهُ يُقَالُ: أَرْكَزَ المَعْدِنُ. إِذَا خَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ. قِيلَ لَهُ: قَدْ يُقَالُ لِمَنْ وُهِبَ لَهُ شَيْءٌ، أَوْ رَبِحَ رِبْحًا كَثِيرًا، أَوْ كَثُرَ ثَمَرُهُ: أَرْكَزْتَ. ثُمَّ نَاقَضَ وَقَالَ: لاَ بَأْسَ أَنْ يَكْتُمَهُ فَلاَ يُؤَدِّيَ الخُمُسَ.

## ٦٦- باسێک: لە گەنجینەی کۆنی دۆزراوەدا پێنج یەک دەدرێ

ماليك و ئیبنو ئیدریس دەڵێن: ریكاز گەنجینەی شاراوەی سەردەمی نەفامییە، لە كەم و زۆریدا پێنج یەكی زەكاتە. بەڵام كانزا گەنجینە نییە، وە بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لە كانزا (دەرهێناندا بمرێ) خوێنەكەی نابژێردرێ، وە لەگەنجینەی دۆزراوەدا پێنج یەكی زەكاتە))، وە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز لە كانزاكاندا لە هەردوو سەد (درهەم)ێكدا پێنجی وەردەگرت، وە حەسەن دەڵێ: هەر گەنجینەیەك لە زەوی جەنگدا[1] بدۆزرێتەوە، ئەوە پێنج

---

[1] زەوی جەنگ: ئەو خاک و وڵاتەیە گۆڕەپانی جەنگی نێوان مسوڵمانان و کافرانە، کافران تێیدا باڵادەستن.

**یەکی زەکاتە، ئەو گەنجینەش لە زەوی ئیسلامدا بدۆزرێتەوە، ئەوە وەك ماڵی زەکات زەکاتی لێ دەدرێ[١]، وە ئەگەر لە خاکی دوژمندا ماڵێکت دۆزییەوە، ئەوە بانگەوازی بۆ بکە، وە ئەگەر گەنجینەکە لە دوژمنانی ئیسلام دەستی کەوت، ئەوە هەر پێنج یەکی دەدرێ، وە کەسانێك لە زانایان دەڵێن: کانزاش وەك گەنجینەی کۆنی دۆزراوەی سەردەمی نەفامی وایە، چونکە لە زمانی عەرەبیدا دەوترێت: (أَرْكَزَ المَعْدِنُ)، ئەگەر بەشێکی کانزاکە بێتە دەرەوە. پێی وترا دەوترێت: ئەگەر کەسێك شتێکی پێ ببەخشرێ، یان قازانجێکی زۆر بکات، یان بەروبوومی باخەکەی زۆر بێ (أَرْكَزْتَ)، جا ئەو زانایە پێچەوانەی قسەکەی خۆی کردووە، وتوویەتی: قەیناکات ئاشکرای نەکات و پێنج یەکی لە زەکاتەدا نەدات.**

١٤٩٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، وَعَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «العَجْمَاءُ جُبَارٌ، وَالبِئْرُ جُبَارٌ، وَالمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الخُمُسُ»[٢].

**١٤٩٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئاژەڵ (هەر زیانێك بدات) بژاردنی نییە، بیریش (هەر شتێك بکەوێتە ناوی) بژاردنی نییە، کانیش[٣] (هەر شتێکی تێکەوێ) بژاردنی نییە، گەنجینەش پێنج یەکی زەکاتە)).**

---

[١] واتە: چل یەکی دەدرێ.

[٢] بڕوانە: ٢٣٥٥، ٦٩١٢، ٦٩١٣.

[٣] واتە: کانی خەڵوز و شتی وا، ئەگەر کەسێکی تێکەوێ.

## ٦٧- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالى: ﴿وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا ۝٦٠﴾ التوبة. وَمُحَاسَبَةِ الْمُصَدِّقِينَ مَعَ الإِمَامِ

١٥٠٠- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: اسْتَعْمَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا مِنَ الأَسْدِ عَلَى صَدَقَاتِ بَنِي سُلَيْمٍ يُدْعَى: ابْنَ اللُّتْبِيَّةِ، فَلَمَّا جَاءَ حَاسَبَهُ[1].

## ٦٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (کرێکارو کۆکەرەوانی زەکات (بەشێکی زەکاتیان پێ دەدرێ))و لێپرسینەوەی پێشەوا لەگەڵ کۆکەرەوانی زەکاتدا

**١٥٠٠- ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی لە هۆزی ئەسەد نارد بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی تیرەی سولەیم، پێی دەوترا: ئیبنو لوتبییە، جا کاتێ هاتەوە لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرد.**

## ٦٨- بابُ اسْتِعْمَالِ إِبِلِ الصَّدَقَةِ وَأَلْبَانِهَا لأَبْنَاءِ السَّبِيلِ

١٥٠١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ نَاسًا مِنْ عُرَيْنَةَ اجْتَوَوُا المَدِينَةَ، فَرَخَّصَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَأْتُوا إِبِلَ الصَّدَقَةِ فَيَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَقَتَلُوا الرَّاعِيَ وَاسْتَاقُوا الذَّوْدَ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ، وَتَرَكَهُمْ بِالحَرَّةِ يَعَضُّونَ الحِجَارَةَ. تَابَعَهُ أَبُو قِلاَبَةَ وَحُمَيْدٌ وَثَابِتٌ عَنْ أَنَسٍ[2].

---

[1] بروانە: ٩٢٥.

[2] بروانە: ٢٣٣.

# ٦٨- باسی (دروستە) بەكارهێنانی وشتری زەكات و (خواردنەوەی) شیرەكەی بۆ ڕێبواری پەككەوتوو

**١٥٠١- شوعبە دەڵێ: قەتادە بۆی گێڕاینەوە لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: چەندكەسێك لە هۆزی عورەینە هاتن (بۆ مەدینە و مسوڵمان بوون)، خواردن و ئاو هەوای مەدینەیان پێنەكەوت، پێغەمبەری خواش ﷺ مۆڵەتی پێدان بڕۆنە (دەرەوەی مەدینە) بۆ نێو وشترەكانی زەكات، لە شیر و میزیان بخۆنەوە، (ئەوانیش ڕۆیشتن، جا كە چاك بوونەوە)، شوانەكەیان كوشت و وشترەكانیان فڕاند و بردیانن، پێغەمبەری خواش ﷺ ناردی بە شوێنیاندا و هێنرانەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد دەست و قاچیان بڕین و بە بزماری سوورەوەكراو چاویان ڕشتن (یان چاویان هەڵكۆڵین)، وە توڕی دانە[1] بەردەڵانە ڕەشەكەی دەرەوەی مەدینە (لەبەر ئازارو تینویەتی) قەپیان دەكرد بەبەردەكاندا، ئەبو قیلابە و حومەیدو سابیت ئەم فەرموودەیان لە ئەنەسەوە گێڕاوەتەوەو پاڵپشتی گێڕانەوەكەی قەتادە دەكەن.**

## ٦٩- بابُ وَسْمِ الإِمَامِ إِبِلَ الصَّدَقَةِ بِيَدِهِ

١٥٠٢- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ، حَدَّثَنَا الوَلِيدُ، حَدَّثَنَا أَبُو عَمْرٍو الأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: غَدَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ لِيُحَنِّكَهُ، فَوَافَيْتُهُ فِي يَدِهِ المِيسَمُ يَسِمُ إِبِلَ الصَّدَقَةِ[2].

---

[1] توڕیان دان: فڕێیان دان.

[2] بڕوانە: ٥٤٧٠، ٥٥٤٢، ٥٨٢٤.

## ٦٩- باسی پێشەوا بەدەستی خۆی وشتری زەکات داخ بکات([1])

**١٥٠٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: سەر لە بەیانییەك عەبدوڵای کوڕی ئەبوتەڵحەم برد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، تا ملاشووی شیرین بکات، جا لەوکاتەدا کە ڕۆیشتم پێغەمبەری خوا ﷺ ئاسنی داخکردنەکەی بەدەستەوەبوو، وشتری زەکاتی پێ نیشانە دەکرد (بۆ ئەوەی بناسرێتەوە).**

## ٧٠- بابُ فَرْضِ صَدَقَةِ الفِطْرِ

وَرَأَى أَبُو العَالِيَةِ وَعَطَاءٌ وَابْنُ سِيرِينَ صَدَقَةَ الفِطْرِ فَرِيضَةً.

١٥٠٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ السَّكَنِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَهْضَمٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ نَافِعٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ الفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى العَبْدِ وَالحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالكَبِيرِ مِنَ المُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ[2].

## ٧٠- باسی بەفەڕزدانانی زەکاتی سەرفیترە

**١٥٠٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مەنێ (صاع) خورما یان مەنێ جۆ سەرفیترەی دانا لەسەر هەموو مسوڵمانێك، بەندە بێت یان ئازاد، پیاو بێت یان ئافرەت، بچووك بێت یان گەورە، وە فەرمانی کرد پێش ڕۆیشتنی خەڵك بۆ نوێژی جەژن سەرفیترەکە بدرێت.**

---

[1] بۆ ئەوەی دیار بێت و نەگۆڕێ.

[2] بڕوانە: ١٥٠٤، ١٥٠٧، ١٥٠٩، ١٥١١، ١٥١٢.

## ٧١- بابُ صَدَقَةِ الفِطْرِ عَلَى العَبْدِ وَغَيْرِهِ مِنَ المُسْلِمِينَ

١٥٠٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَضَ زَكَاةَ الفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى، مِنَ المُسْلِمِينَ[1].

## ٧١- باسی زەکاتی سەرفیترە لەسەر بەندە و کەسانی تر لە مسوڵمانان (پێویستە)

**١٥٠٤- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مەنێ خورما یان مەنێ جۆ سەرفیترەی دانا لەسەر هەموو کەسێکی ئازاد یان بەندە، پیاو یان ئافرەت لە مسوڵمانان.**

## ٧٢- بابُ صدقة الفطر صَاعٍ مِنْ شَعِيرٍ

١٥٠٥- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: كُنَّا نُطْعِمُ الصَّدَقَةَ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ[2].

## ٧٢- باسی زەکاتی سەرفیترە مەنێ جۆیە

**١٥٠٥- ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: ئێمە کاتی خۆی خۆراکمان دەدا لە سەرفیترەدا، کە مەنێک جۆ بوو.**

---

[1] بڕوانە: ١٥٠٣.

[2] بڕوانە: ١٥٠٦، ١٥٠٨، ١٥١٠.

## ٧٣- بابُ صَدَقَةِ الفِطْرِ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ

١٥٠٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ العَامِرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ ﷺ يَقُولُ كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الفِطْرِ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ[1].

## ٧٣- باسی زەکاتی سەرفیترە مەنێک خۆراکە

**١٥٠٦- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ئێمە لە (سەردەمی) ڕابردوودا زەکاتی سەرفیترەمان دەدا کە مەنێك بوو لە خۆراك، یان مەنێك لە جۆ، یان مەنێك لە خورما، یان مەنێك لە کەشك، یان مەنێك لە مێوژ.**

## ٧٤- بابُ صَدَقَةِ الفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ

١٥٠٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ قَالَ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِزَكَاةِ الفِطْرِ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: فَجَعَلَ النَّاسُ عِدْلَهُ مُدَّيْنِ مِنْ حِنْطَةٍ[2].

## ٧٤- باسی زەکاتی سەرفیترە مەنێک خورمایە

**١٥٠٧- نافیع دەگێڕێتەوە کە عەبدولا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەدانی زەکاتی سەرفیترە کە مەنێك بوو لە خورما، یان مەنێك بوو لە جۆ. نافیع دەڵێ: عەبدولا وتی: دوایی خەڵك لە جیاتی ئەوە دوو مشت گەنمیان دیاریکردووە.**

---

[1] بڕوانە: ١٥٠٥.

[2] بڕوانە: ١٥٠٣.

## ٧٥- بابُ صَاعٍ مِنْ زَبِيبٍ

١٥٠٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُنِيرٍ، سَمِعَ يَزِيدَ العَدَنِيَّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ: حَدَّثَنِي عِيَاضُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُعْطِيهَا فِي زَمَانِ النَّبِيِّ ﷺ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، فَلَمَّا جَاءَ مُعَاوِيَةُ وَجَاءَتِ السَّمْرَاءُ قَالَ: أُرَى مُدًّا مِنْ هَذَا يَعْدِلُ مُدَّيْنِ[1].

## ٧٥- باسی زەکاتی سەرفیترە مەنێک مێوژە

**١٥٠٨- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: کاتی خۆی ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مەنێك لە خۆراك، یان مەنێك لە خورما، یان مەنێك لە جۆ، یان مەنێك لە مێوژمان دەدا، جا کاتێ موعاوییە هات (بوو بەخەلیفە) گەنم پەیدابوو، موعاوییە ﷺ وتی: ڕام وایە مشتێ لەم گەنمە بەرانبەر دوو مشتە (لە جۆ و خورما، ... هتد).**

## ٧٦- بابُ الصَّدَقَةِ قَبْلَ العِيدِ

١٥٠٩- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ مَيْسَرَةَ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ - رضى الله عنهما - أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِزَكَاةِ الفِطْرِ قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ[2].

## ٧٦- باسی سەرفیترە پێش نوێژی جەژن دەدرێ

**١٥٠٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەدانی زەکاتی سەرفیترە پێش ڕۆیشتنی خەڵك بۆ نوێژی جەژن.**

---

[1] بڕوانە: ١٥٠٥.

[2] بڕوانە: ١٥٠٣.

١٥١٠- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو عُمَرَ، عَنْ زَيْدٍ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الفِطْرِ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ. وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: وَكَانَ طَعَامَنَا الشَّعِيرُ وَالزَّبِيبُ وَالأَقِطُ وَالتَّمْرُ[1].

**١٥١٠- عیازی کوڕی عەبدوڵای کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە کە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا مەنێك لە خۆراکمان دەدا (بۆ سەرفیترە)، ئەبو سەعید وتی: وە لەوکاتەدا خواردنی ئێمە جۆ و مێوژ و کەشك و خورما بوو.**

## ٧٧- بابُ صَدَقَةِ الفِطْرِ عَلَى الحُرِّ وَالمَمْلُوكِ

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ فِي المَمْلُوكِينَ لِلتِّجَارَةِ: يُزَكَّى فِي التِّجَارَةِ، وَيُزَكَّى فِي الفِطْرِ.

١٥١١- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: فَرَضَ النَّبِيُّ ﷺ صَدَقَةَ الفِطْرِ -أَوْ قَالَ: رَمَضَانَ- عَلَى الذَّكَرِ وَالأُنْثَى، وَالحُرِّ وَالمَمْلُوكِ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، فَعَدَلَ النَّاسُ بِهِ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ. فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ يُعْطِي التَّمْرَ، فَأَعْوَزَ أَهْلُ المَدِينَةِ مِنَ التَّمْرِ، فَأَعْطَى شَعِيرًا، فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُعْطِي عَنِ الصَّغِيرِ وَالكَبِيرِ، حَتَّى إِنْ كَانَ يُعْطِي عَنْ بَنِيَّ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ يُعْطِيهَا الذِينَ يَقْبَلُونَهَا، وَكَانُوا يُعْطُونَ قَبْلَ الفِطْرِ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ[2].

## ٧٧- باسی زەکاتی سەرفیترە لەسەر مرۆڤی ئازادو بەندە پێویستە

**زوهری دەڵێ: دەربارەی ئەو کۆیلانەی کە بۆ بازرگانی بن: ئەوە لەکاتی زەکاتی بازرگانیدا زەکاتیان لێ دەدرێ و لەجەژنی ڕەمەزانیشدا زەکاتی سەرفیترەیان بۆ دەدرێ.**

---

[1] بڕوانە: ١٥٠٥.

[2] بڕوانە: ١٥٠٣.

**١٥١١- نافيع دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زەكاتی سەرفیترەی فەرز كرد -یان وتی: (سەرفیترەی) ڕەمەزان- لەسەر نێر ومێ، ئازاد و كۆیلە، بە مەنێك لە خورما یان مەنێك لە جۆ، بەڵام خەڵك گۆڕیان بۆ نیو مەن لە گەنم، بەڵام عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ خورمای دەدا، جا ساڵێك خەڵكی مەدینە پێویستییان بەخورما بوو دەستییان نەكەوت، بۆیە عەبدوڵا جۆی دا، (نافیع دەڵێ:) عەبدوڵا سەرفیترەی بچووك و گەورەی دەدا، هەتا سەرفیترەی كوڕەكانی منیشی دەدا، وە عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ سەرفیترەكەی دەدا بەو كەسانەی (دانرابوون) سەرفیترەیان وەردەگرت، وە هاوەڵان بەڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش جەژنی ڕەمەزان سەرفیترەكەیان دەدا.**

## ٧٨- باب صَدَقَةِ الفِطْرِ عَلَى الصَّغِيرِ وَالكَبِيرِ

١٥١٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدَقَةَ الفِطْرِ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ عَلَى الصَّغِيرِ وَالكَبِيرِ وَالحُرِّ وَالمَمْلُوكِ[1].

## ٧٨- باسی سەرفیترەدان لەسەر منداڵ و گەورە پێویستە

**١٥١٢- عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زەكاتی سەرفیترەی پێویست كرد، مەنێك لە جۆ یان مەنێك لە خورما لەسەر منداڵ و گەورە و ئازاد و كۆیلە.**

[1] بڕوانە: ١٥٠٣.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٢٥- كِتابُ الحَجِّ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٢٥- پەڕاوی حەج

## ١- بابُ وُجُوبِ الحَجِّ وَفَضلِهِ

وقَولِ اللَّهِ تعالى: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ آل عمران.

## ١- باسی پێویست بوونی حەج و گەورەییەتی

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (خوای گەورە حەجی لەسەر خەڵکی پێویست کردووە، بۆ کەسێك توانای ڕێگای هەبێت، وە هەرکەس باوەڕی (بە حەج) نەبێ، ئەوە بەڕاستی خوا بێ نیازە لە هەموو جیهانیان).**

١٥١٣- حَدَّثَنَا عبد اللَّهِ بْن يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ الفَضْل رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ، فَجَعَلَ الفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظرُ إِلَيْهِ، وَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَصْرِفُ وَجْهَ الفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا، لَا يَثبُتُ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفأَحجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ». وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ[1].

---

[1] بڕوانە: ١٨٥٤، ١٨٥٥، ٤٣٩٩، ٦٢٢٨.

١٥١٣- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: فەزڵ (کە برای عەبدوڵایە) لە پاشکۆی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو، لەوکاتەدا ئافرەتێك لە هۆزی خەسعەم هات (پرسیار بکات)، فەزڵ سەیری ئافرەتەکەی دەکرد و ئافرەتەکەش سەیری فەزڵی دەکرد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕووی فەزڵی وەرگێڕا بۆ لایەکەی تر (تاسەیری یەکتر نەکەن)، ئافرەتەکەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان حەج فەڕزی خوایە لەسەر بەندەکانی کەوتۆتە سەر باوکم و فەڕز بووە لەسەری کە پیرێکی بەتەمەنە، خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، دەی ئایا دروستە من لە جیاتی ئەو حەجی بۆ بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ دروستە))، ئەم ڕووداوەش لەکاتی حەجی ماڵئاواییدا بوو.

## ٢- باب قَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى:

﴿ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِّيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾

﴿ فِجَاجًا ﴿٣١﴾ ﴾ الأنبياء، الطُّرُقُ الوَاسِعَةُ.

١٥١٤- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنَا ابن وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابن شِهَابٍ، أَنَّ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ ابن عُمَرَ ﵄ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَرْكَبُ رَاحِلَتَهُ بِذِي الْحلَيْفَةِ، ثُمَّ يُهِلُّ حَتَّى تَسْتَوِيَ بِهِ قَائِمَةً[1].

## ٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند:

(خەڵکی دێن بۆ لات (بۆ حەج) بە پیادە و بەسواری هەموو وشترێکی لاواز، (لەبەر ئەوەی) کە لە هەموو ڕێگایەکی دوورەوە دێن بۆ ئەوەی سوودو کەڵکی دینی و دونیایی بەدەست بێنن). ﴿ فِجَاجًا ﴿٣١﴾ ﴾ واتە: ڕێگا فراوانەکان.

[1] بڕوانە: ١٦٦.

**١٥١٤- عەبدوڵای کوڕی عومەر** ﷺ **دەڵێ: پێغەمبەرم** ﷺ **دی لە** (ذِي الْحلَيْفَةِ) **سواری وشترەکەی دەبوو، پاشان** (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ)**ی دەوت، هەتا وشترەکە بە پێغەمبەرەوە** ﷺ **ڕێك هەستایەوە.**

١٥١٥- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيم، أَخْبَرَنَا الوَلِيدُ، حَدَّثَنَا الأوزَاعِيُّ، سَمِعَ عَطَاءً يُحَدِّثُ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ إِهْلَالَ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنْ ذِي الحلَيْفَةِ حِينَ اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتهُ. رَوَاهُ أَنَسٌ وَابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ.

**١٥١٥- جابیری کوڕی عەبدوڵا** ﷺ **دەگێڕێتەوە کە وتنی:** (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ)**ی پێغەمبەری خوا** ﷺ **لە** (ذِي الحلَيْفَةِ) **وە دەستی پێکرد، کاتێ وشترەکەی پێیەوە هەستایەوە. ئەنەس و ئیبنو عەباسیش ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.**

## ٣- بابُ الحَجِّ عَلَى الرَّحْلِ

١٥١٦- وَقَالَ أَبَانُ: حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ دِينَارٍ، عَنِ القَاسِمِ عنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مَعَهَا أَخَاهَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ، فَأَعْمَرَهَا مِنَ التَّنْعِيمِ، وَحَمَلَهَا عَلَى قَتَبٍ. وَقَالَ عُمَرُ ﷺ: شُدُّوا الرِّحَالَ فِي الحَجِّ، فَإِنَّهُ أَحَدُ الجِهَادَيْنِ[1].

## ٣- باسی حەجکردن بە سواری وشترێک کە تەنها کورتانێکی پێوە بێت (بێ کەژاوە)

**١٥١٦- عائیشە** ﷺ **دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر** ﷺ **عەبدوڕەحمانی برای لەگەڵدا نارد لە تەنعیم[2] ئیحرامی پێبەست بە عومرە، سواری وشترێکی کرد کۆپانێکی**

---

[1] بروانە: ٢٩٤.

[2] تەنعیم: جێگای ئیحرام بەستنە لە نێوان شام و مەککەدا.

**سادەی بچووکی پێوە بوو، وە عومەر ﷺ دەڵێ: کۆپان و کورتانەکان قایم ببەستنەوە بە وڵاخەکانتانەوە لەکاتی ڕۆیشتن بۆ حەج، چونکە بێگومان حەج یەکێکە لە دوو جیهادەکە[١].**

١٥١٧- وَقَالَ مُحَمَّدُ بن أَبِي بَكْرٍ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا عَزْرَةُ بْنُ ثَابِتٍ، عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَنَسٍ قَالَ: حَجَّ أَنَسٌ عَلَى رَحْلٍ، وَلَمْ يَكُنْ شَحِيحًا، وَحَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ حَجَّ عَلَى رحْلٍ وَكَانَتْ زَامِلَتَهُ.

**١٥١٧- سومامەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەنەس دەڵێ: ئەنەس بەسواری وشترێکی بێ کەژاوە حەجی کرد کە کورتانێکی سادەی پێوە بوو، ڕژدو ڕەزیلیش نەبوو، وە (ئەنەس) گێڕایەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەسوار وشترێکی بێ کەژاوە حەجی کرد، کورتانێکی سادەی پێوەبوو، باروبنەکەش لە هەمان وشتر نرابوو.**

١٥١٨- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا أَيْمَنُ بْنُ نَابِلٍ، حَدَّثَنَا القَاسِمُ بن مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، اعْتَمَرْتُمْ وَلَمْ أَعْتَمِرْ. فَقَالَ: «يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ، اذْهَبْ بِأُخْتِكَ فَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ». فَأَحْقَبَهَا عَلَى نَاقَةٍ، فَاعْتَمَرَتْ[٢].

**١٥١٨- قاسیمی کوڕی موحەممەد لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کەوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێوە عومرەتان کرد، بەڵام من عومرەم نەکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی عەبدوڕەحمان خوشکەکەت (عائیشە) ببە ئیحرامی عومرەی پێ ببەستە لە تەنعیم))[٣]، ئەویش سوار وشترێکی مێینەی کرد[٤] لە پاشکۆی خۆیدا، (هێنایەوە بۆ مەککە) ئینجا عومرەی کرد.**

---

[١] بروانە: جیهادی دوژمنان و جیهادی نەفس، یان جیهادی گەورە و جیهادی بچووک.

[٢] بروانە: ٢٩٤.

[٣] تەنعیم: جێگای ئیحرام بەستنە لە نێوان شام و مەککەدا.

[٤] لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا هاتووە (ناقتە) واتە: وشترەکەی عەبدوڕەحمان خۆی.

## ٤- بابُ فَضْلِ الحَجِّ المَبْرُورِ

١٥١٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ العَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رسول الله ﷺ: أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ باللَّهِ وَرَسُولِهِ». قِيلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: «جِهَادٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ». قِيلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: «حَجٌّ مَبْرُورٌ».

## ٤- باسی حەجی چاک و وەرگیراو

**١٥١٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ چ کردەوەیەك لەنێو کردەوەکاندا گەورەترە و پاداشتی زۆرترە؟ فەرمووی: ((باوەڕبوون بەخوا و پێغەمبەرەکەی))، وترا: دوای ئەو چی تر گەورەیە؟ فەرمووی: ((خەبات و تێکۆشان لەپێناو ئاین و ڕێبازی خوادا))، وترا: دوای ئەو چی تر؟ فەرمووی: ((حەجی چاك و وەرگیراو)).**

١٥٢٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْمبَارَكِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، أَخْبَرَنَا حَبِيبُ بْن أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أمِّ الْمؤْمِنِينَ ﷺ أنَهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَرى الجِهَادَ أَفْضَلَ العَمَلِ، أفَلَا نُجَاهِدُ؟ قَالَ: «لَا، لكن أَفْضَلَ الجِهَادِ حَجٌّ مَبْرُورٌ»[1].

**١٥٢٠- عائیشەی دایکی ئیمانداران ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە خەبات و تێکۆشان بە چاکترین و گەورەترین کردەوە دەزانین، دەی ئێمەی ئافرەتانیش بەشداری خەبات و تێکۆشان نەکەین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نەخێر، بەڵکو چاکترین خەبات و تێکۆشان (بۆ ئێوەی ژنان) حەجی چاك و وەرگیراوە)).**

---

[1] بڕوانە: ١٨٦١، ٢٧٨٤، ٢٨٧٥، ٢٨٧٦.

١٥٢١- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا سَيَّارٌ أَبُو الحَكَمِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ حَجَّ لله، فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أمّهُ»[1].

**١٥٢١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەرکەس بەدڵسۆزی حەج بکات لەبەر خوا، جیماع و دەستبازی نەکات لەگەڵ ئافرەتاندا و سەرپێچی فەرمانی خوا نەکات، دەگەڕێتەوە (پاکدەبێتەوە لە تاوان) وەك ئەو ڕۆژەی لەدایك بووە)).**

## ٥- بابُ فَرْضِ مَوَاقِيتِ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ

١٥٢٢- حَدَّثَنَا مَالِكُ بنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ قَالَ: حَدَّثَنِي زَيْدُ بْنُ جُبَيْرٍ: أَنَهُ أَتَى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ فِي مَنْزِلِهِ -وَلَهُ فُسْطَاطٌ وَسُرَادِقٌ- فَسَأَلْتُهُ: مِنْ أَيْنَ يَجُوزُ أَنْ أَعْتَمِرَ؟ قَالَ: فَرَضَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لأهلِ نَجْدٍ قَرْنًا، وَلأهلِ الَمدِينَةِ ذَا الُحلَيفَةِ، وَلأهْلِ الشأْمِ الجُحْفَةَ.

## ٥- باسی دیاریکردنی جێگای ئیحرام بەستنی حەج و عومرە

**١٥٢٢- زەیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە کە ڕۆیشت بۆ لای عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لەو جێگایەی لێی دانیشتبوو -چادر و دەواری هەڵدابوو-، پرسیارم لێ کرد لەکوێوە دروستە ئیحرام ببەستم بۆ عومرە؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەرنی دیاریکرد بۆ خەڵکی نەجد، وە زولحولەیفی دیاریکرد بۆ خەڵکی مەدینە، وە جوحفەی دیاریکرد بۆ خەڵکی شام.**

---

[1] بروانە: ١٨١٩، ١٨٢٠.

## ٦- بابُ قَوْلِ الله تَعَالَى: ﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ ﴿١٩٧﴾﴾ البقرة.

١٥٢٣- حَدَّثَنَا يحيى بْنُ بِشْرٍ، حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، عَنْ وَرْقَاءَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أَهْلُ اليَمَنِ يَحُجُونَ وَلَا يَتَزَوَّدُونَ وَيقُولُونَ: نَحْنُ الْمتَوَكِّلُونَ. فَإِذَا قَدِمُوا مَكَّةَ سَأَلُوا النَّاسَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ ﴿١٩٧﴾﴾ البقرة. رواهُ ابنُ عُيَينَةَ عن عَمرٍ عن عِكرِمةَ مُرسَلاً.

## ٦- باسى ئەم فەرمايشتەى خواى بەرز و بڵند: (توێشوو هەڵبگرن (ئەى باوەڕداران) كە باشترين توێشوو لەخواترسان و خۆپارێزييە)

**١٥٢٣- عەبدوڵاى كوڕى عەباس ﷺ دەڵێ: خەڵكى يەمەن دەهاتن بۆ حەج و توێشوويان لەگەڵ خۆيان نەدەهێنا و دەيانوت: ئێمە پشتمان بەخوا بەستووە، جا كە دەگەيشتنە مەككە داوايان لە خەڵك دەكرد و سواڵيان دەكرد، ئيتر بەوهۆيەوە خواى بەرز و بڵند ئەم ئايەتەى دابەزاند: ﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ ﴿١٩٧﴾﴾ البقرة. واتە: (توێشوو هەڵبگرن (ئەى باوەڕداران) كە باشترين توێشوو لەخواترسانە و خۆپارێزييە)، ئەم فەرموودەيە (بەڕێگەيەكى تر) ئيبنو عوەينە لە عەمرەوە لە عيكريمەوە گێڕاويەتيەوە كە مورسەلە[1].**

---

[1] فەرموودەى مورسەل: بەو فەرموودەيە دەوترێ كە تابعيين بيگێڕێتەوە و ناوى هاوەڵەكەى تێدا نەبێ و فەرموودەكەش هى پێغەمبەر يان ڕووداوێكى سەردەمى پێغەمبەر ﷺ بێت، ڕاستەوخۆ تابيعيەكە بيگێڕێتەوە بێ ناوهێنانى صەحابە، كەواتە سەنەدەكە كەسێكى نوقسانە كە صەحابەيە.

## ٧- بابُ مُهَلِّ أهْلِ مَكَّةَ لِلْحَجِّ وَالعُمْرَةِ

١٥٢٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْن إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابن طَاوُسٍ، عن أَبِيهِ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ وقَّتَ لأهلِ المَدِينَةِ ذَا الحلَيْفَةِ، وَلأهلِ الشَّأْمِ الجُحْفَةَ، وَلأهلِ نَجْدٍ قَرْنَ المَنَازِلِ، وَلأهلِ اليَمَنِ يَلَمْلَمَ، هُنَّ لَهنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ مِمَّنْ أَرَادَ الحجَّ وَالعُمْرَةَ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، حَتى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ.

## ٧- باسی جێگای (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ ...)ی خەڵکی مەککە بۆ حەج و عومرە

**١٥٢٤- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەر ﷺ زوحولەیفەی دیاری کرد بەجێگای ئیحرام بەستن بۆ خەڵکی مەدینە، جوحفەشی دیاریکرد بۆ خەڵکی شام، قەرنولمەنازیلیشی دیاریکرد بۆ خەڵکی نەجد، یەلەملەمیشی دیاریکرد بۆ خەڵکی یەمەن، ئەم شوێنانەی دیاریکرد بۆ خەڵکی ئەم وڵاتانە و بۆ هەموو ئەو کەسانەشی دوورترن، بەڵام بەسەر یەکێك لەو شوێنانەدا دێن بۆ هەر کەس کە بیەوێ حەج و عومرە بکات، وە هەر کەسیش نزیك تر بوو لە مەککەوە لەو شوێنانەی باسکران، ئەوە لە ماڵ و جێگای خۆیەوە (ئیحرام ببەستێ)، تەنانەت خەڵکی مەککە لە مەککەدا ئیحرام دەبەستن.**

## ٨- بابُ مِيقَاتِ أهْلِ المَدِينَةِ، وَلَا يُهِلُّوا قبلَ ذِي الحُلَيْفَةِ

١٥٢٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِك، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُهِلُّ أَهْلُ المَدِينَةِ مِنْ ذِي الحُلَيْفَةِ، وَأَهْلُ الشَّامِ مِنَ الجُحْفَةِ، وَأَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَيُهِلُّ أَهْلُ اليَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ»[1].

---

[1] بڕوانە: ١٣٣.

## ٨- باسی جێگای ئیحرام بەستنی خەڵکی مەدینە کە نابێ پێش گەشتنە زولحولەیفە ئیحرام ببەستن

**١٥٢٥- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خەڵکی مەدینە لە زولحولەیفەوە ئیحرام دەبەستن، خەڵکی شامیش لە جوحفەوە، خەڵکی نەجدیش لە قەڕنولمەنازیلەوە))، وە عەبدوڵا ﭬ وتی: پێم گەشتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((وە خەڵکی یەمەن لە یەلەملەمەوە ئیحرام ببەستن)).**

## ٩- بَابُ مُهَلِّ أَهْلِ الشَّأْمِ

١٥٢٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ ﭬ قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لأهلِ المَدِينَةِ ذَا الحُلَيْفَةِ، وَلأهلِ الشَّأْمِ الجُحْفَةَ، وَلأهلِ نَجْدٍ قَرْنَ المَنَازِلِ، وَلأهلِ اليَمَنِ يَلَمْلَمَ، فَهُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِن، لِمَنْ كَانَ يُرِيدُ الحجَّ وَالعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمُهَلُّهُ مِنْ أَهْلِهِ، وَكَذَاكَ حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا.

## ٩- باسی جێگای ئیحرام بەستنی خەڵکی شام

**١٥٢٦- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زولحولەیفەی دیاری کرد بە جێگای ئیحرام بەستنی خەڵکی مەدینە، جوحفەشی دیاریکرد بۆ خەڵکی شام، قەڕنولمەنازیلیشی دیاریکرد بۆ خەڵکی نەجد، یەلەملەمیشی دیاریکرد بۆ خەڵکی یەمەن، ئەم شوێنانە دیاریکراون بۆ خەڵکی ئەو وڵاتانە و بۆ ئەو کەسانەشی دوورترن بەسەر یەکێك لەو شوێنانەدا دێن، بۆ کەسێك کە بیەوێ حەج و عومرە بکات، هەر کەسێکیش لەو شوێنانەی باسکران نزیکتر بوو**

**لە مەككەوە، ئەوە شوێنی ئیحرام بەستنی لە ماڵ و جێگای خۆیەوە دەبێت، هەروەها تەنانەت خەڵكی مەككەش لە مەككەوە ئیحرام دەبەستن.**

## ١٠- بابُ مُهَلِّ أَهْلِ نَجْدٍ

١٥٢٧- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَفِظْنَاهُ مِنَ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ: وَقَّتَ النَّبِيُّ ﷺ.

## ١٠- باسی شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵكی نەجد

**١٥٢٧- (ئەم فەرموودەیە دوو ڕێگا و سەنەدی هەیە، یەكێكیان ئیمامی بوخاری دەڵێ): عەلی بۆی گێڕاینەوە وتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: لە زوهرییەوە لەبەرمان كردووە لە سالیمەوە لە باوكیەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ دیاری كرد.**
**(ڕێگای دووەمیان ئەمەیە):**

١٥٢٨- وَحَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ وَهْبٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «مُهَلُّ أَهْلِ المَدِينَةِ ذُو الحُلَيْفَةِ، وَمُهَلُّ أَهْلِ الشَّأْمِ مَهْيَعَةُ - وَهِيَ الجُحْفَةُ - وَأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنٌ». قَالَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ: زَعَمُوا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ - وَلَمْ أَسْمَعْهُ -: «وَمُهَلُّ أَهْلِ اليَمَنِ يَلَمْلَمُ».

**١٥٢٨- سالیمی كوڕی عەبدوڵا لە باوكیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((زولحولەیفە شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵكی مەدینەیە، مەهیەعەش كە جوحفەیە شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵكی شامە، وە خەڵكی نەجدیش قەڕن شوێنی ئیحرام بەستنیانە، عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ وتی: -بەڵام من لە پێغەمبەرم ﷺ نەبیستووە- خەڵكی دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((یەلەملەم شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵكی یەمەنە)).**

## ١١- بابُ مُهَلِّ مَنْ كَانَ دُونَ المَوَاقِيتِ

١٥٢٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَّتَ لأهلِ المَدِينَةِ ذَا الحُلَيْفَةِ، وَلأهلِ الشَّامِ الجُحْفَةَ، وَلأهلِ اليَمَنِ يَلَمْلَمَ، وَلأهلِ نَجْدٍ قَرْنًا، فَهُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ مِمَّنْ كَانَ يُرِيدُ الحجَّ وَالعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمِنْ أَهْلِهِ، حَتَّى إِنَّ أَهْلَ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا[1].

## ١١- باسی شوێنی ئیحرام بەستنی ئەو کەسانەی نزیکترن لە مەککەوە لە شوێنە دیاریکراوەکانی ئیحرام بەستن

**١٥٢٩- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زوحولەیفەی دیاری کرد بەجێگای ئیحرام بەستن بۆ خەڵکی شاری مەدینە، جوحفەشی دیاریکرد بۆ خەڵکی شام، یەلەملەمیشی دیاریکرد بۆ خەڵکی یەمەن، قەرنیشی دیاریکرد بۆ خەڵکی نەجد، ئەم شوێنانەی دیاریکرد بۆ خەڵکی ئەم وڵاتانە و بۆ ئەو کەسانەشی دوورترن، بەڵام بەسەر یەکێك لەو شوێنانەدا دێن بۆ هەر کەس کە بیەوێ حەج و عومرە بکات، وە هەر کەسیش نزیک تر بوو لە مەککەوە لەو شوێنانەی باسکران، ئەوە لە ماڵ و جێگای خۆیەوە (ئیحرام ببەستێ)، تەنانەت خەڵکی مەککە لە مەککەدا ئیحرام دەبەستن.**

---

[1] بڕوانە: ١٥٢٤.

## ١٢- بابُ مُهَلِّ أهْلِ اليَمَنِ

١٥٣٠- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَّتَ لأهلِ المَدِينَةِ ذَا الحلَيْفَةِ، وَلأهلِ الشَّامِ الجُحْفَةَ، وَلأهلِ نَجْدٍ قَرْنَ المَنَازِلِ، وَلأهلِ اليَمَنِ يَلَمْلَمَ، هُنَّ لأهلِهِنَّ وَلكُلِّ آتٍ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِم مِمَّنْ أَرَادَ الحجَّ وَالعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، حَتَّى أَهْلُ مَكةَ مِنْ مَكةَ[1].

## ١٢- باسی شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی یەمەن

**١٥٣٠- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ زولحولەیفەی دیاری کرد بەجێگای ئیحرام بەستن بۆ خەڵکی مەدینە، جوحفەشی دیاریکرد بۆ خەڵکی شام، قەرنولەنازیلیشی دیاریکرد بۆ خەڵکی نەجد، یەلەملەمیشی دیاریکرد بۆ خەڵکی یەمەن، ئەم شوێنانەی دیاریکرد بۆ خەڵکی ئەم وڵاتانە و بۆ ئەوکەسانەشی دوورترن بەڵام بەسەر یەکێك لەو شوێنانەدا دێن، بۆ هەر کەس کە بیەوێ حەج و عومرە بکات، وە هەر کەسیش نزیك تر بوو لە مەککەوە لەو شوێنانەی باسکران، ئەوە لەو جێگایەوە دەستپێدەکات (ئیحرام ببەستێ)، تەنانەت خەڵکی مەککە لە مەککەدا (ئیحرام دەبەستن).**

## ١٣- بابٌ: ذَاتُ عِرْقٍ لأهْلِ العِرَاقِ

١٥٣١- حَدَّثَنِي عَلِيُّ بْنُ مُسْلِمٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نُمَيْرٍ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لَمَّا فُتِحَ هَذَانِ المِصْرَانِ أَتَوْا عُمَرَ فَقَالُوا: يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ

---

[1] بڕوانە: ١٥٢٤.

ﷺ حَدَّ لأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنًا، وَهُوَ جَوْرٌ عَنْ طَرِيقِنَا، وَإِنَّا إِنْ أَرَدْنَا قَرْنًا شَقَّ عَلَيْنَا. قَالَ فَانْظُرُوا حَذْوَهَا مِنْ طَرِيقِكُمْ. فَحَدَّ لَهُمْ ذَاتَ عِرْقٍ.

## ١٣-باسێک: (ذَاتُ عِرْقٍ) شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی عێراقە

**١٥٣١- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەم دوو شارە (کوفە و بەصرە) نازادکران، خەڵکەکەی هاتنە خزمەت عومەر وتیان: ئەی پێشەوای ئیمانداران، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ قەرنی دیاری کردووە بۆ خەڵکی نەجد (بۆ ئیحرام بەستن)، ئەم شوێنە چەپ و لاڕێیەو لەسەر ڕێگاکەماندا نییە، وە ئەگەر بمانەوێ بڕۆینە قەرن نارەحەتە بۆمان، عومەر وتی: دەی سەرنج بدەن بزانن کام جێگای لە ڕێگاتاندا لە ڕێکی قەرن دایە، (وترا: ذَاتَ عِرْقٍ) عومەریش (ذَاتَ عِرْقٍ)ی بۆ دیاریکردن (لەوێوە ئیحرام ببەستن).**

## ١٤- بابٌ

١٥٣٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَاخَ بِالبَطْحَاءِ بِذِي الحُلَيْفَةِ فَصَلَّى بِهَا. وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ يَفْعَلُ ذَلِكَ[1].

## ١٤- باسێک

**١٥٣٢- نافیع لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەتحا کە لە زولحولەیفەدایە وشترەکەی خوس داو لەوێدا نوێژی کرد، عەبدوڵای کوڕی عومەریش لەو جێگایەدا وشترەکەی خوس دەدا و نوێژی دەکرد.**

---

[1] بڕوانە: ٤٨٤.

## ١٥- بابُ خُرُوجِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى طَرِيقِ الشَّجَرَةِ

١٥٣٣- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ المُنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْرُجُ مِنْ طَرِيقِ الشَّجَرَةِ، وَيَدْخُلُ مِنْ طَرِيقِ المُعَرَّسِ، وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ إِلَى مَكَّةَ يُصَلِّي فِي مَسْجِدِ الشَّجَرَةِ، وَإِذَا رَجَعَ صَلَّى بِذِي الحُلَيْفَةِ بِبَطْنِ الوَادِي، وَبَاتَ حَتَّى يُصْبِحَ[١].

## ١٥- باسی دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە لە ڕێگای (الشَّجَرَة) وە

**١٥٣٣- عەبدوڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە لە ڕێگای ناسراو بە شەجەرەوە لە مەدینە دەردەچوو، وە کە دەگەڕایەوە لە ڕێگای موعەڕەسەوە دەهاتەوە بۆ مەدینە، وە پێغەمبەر ﷺ کە دەڕۆیشت بۆ مەککە لە مزگەوتی شەجەرە نوێژی دەکرد، کاتێکیش دەگەڕایەوە لە مەککە بۆ مەدینە لە زولحولەیفە نوێژی دەکرد، لەنێو شیوەکەدا (شیوی عەقیق) نوێژی دەکرد، وە لەو شیوەدا دەمایەوە تا ڕۆژ دەبوویەوە.**

## ١٦- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «العَقِيقُ وَادٍ مُبَارَكٌ»

١٥٣٤- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا الوَلِيدُ وَبِشْرُ بْنُ بَكْرٍ التِّنِّيسِيُّ قَالَا: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنِي عِكْرِمَةُ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَقُولُ: إِنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ رضي الله عنه يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِوَادِي العَقِيقِ يَقُولُ: «أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِنْ رَبِّي فَقَالَ: صَلِّ فِي هَذَا الوَادِي المُبَارَكِ وَقُلْ: عُمْرَةً فِي حَجَّةٍ»[٢].

---

[١] بڕوانە: ٤٨٤.

[٢] بڕوانە: ٢٣٣٧ , ٧٣٤٣

## ١٦- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ:
## ((عەقیق شیوێکی پیرۆزە))

**١٥٣٤- عومەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست لە شیوی عەقیقدا دەیفەرموو: ((ئەمشەو لەلایەن پەروەردگارمەوە نێردراوێك هاتە لام و فەرمووی: لەم شیوە پیرۆزەدا نوێژ بکە، وە بڵێ: ئیحرامی عومرە لەگەڵ حەجدا پێکەوە ببەستن)).**

١٥٣٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ رُئِيَ وَهُوَ فِي مُعَرَّسٍ بِذِي الحُلَيْفَةِ بِبَطْنِ الوَادِي، قِيلَ لَهُ: إِنَّكَ بِبَطْحَاءَ مُبَارَكَةٍ. وَقَدْ أَنَاخَ بِنَا سَالِمٌ، يَتَوَخَّى بِالمُنَاخِ الذِي كَانَ عَبْدُ اللهِ يُنِيخُ، يَتَحَرَّى مُعَرَّسَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَهُوَ أَسْفَلُ مِنَ المَسْجِدِ الذِي بِبَطْنِ الوَادِي، بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الطَّرِيقِ وَسَطٌ مِنْ ذَلِكَ[1].

**١٥٣٥- مووسای کوڕی عوقبە دەڵێ: سالیمی کوڕی عەبدوڵا لە باوکیەوە بۆی گێڕامەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە: ((لە کاتێکدا لەشیوی عەقیقەدا شەو مایەوە، لە شوێنی خەوتنەکەی لە زولحولەیفە خەوتبوو، لە خەویدا پێی وترا: تۆ ئەوەتای لەنێو شیوێکی زیخەڵاناوی پیرۆزدا))، (مووسا وتی:) لە ڕاستیدا سالیم وشترەکانی پێ خوسداین لەو شوێنەدا کە عەبدوڵا وشترەکەی خوس دەدا، دەیویست لەو شوێنەدا خوسیدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەو تێیدا خەوتووە (لە شیوی عەقیقدا)، کە دەکەوێتە خوارەوەی ئەو مزگەوتەی کە لەنێو شیوی عەقیقدایە، کە لە نێوان ئەوان و ڕێگاکەدا لەو نێوانەدایە.**

---

[1] بڕوانە: ٤٨٣.

## ١٧- بابُ غَسْلِ الخَلُوقِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ مِنَ الثِّيَابِ

١٥٣٦- قَالَ أَبُو عَاصِمٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، أَنَّ صَفْوَانَ بْنَ يَعْلَى أَخْبَرَهُ، أَنَّ يَعْلَى قَالَ لِعُمَرَ ﷺ: أَرِنِي النَّبِيَّ ﷺ حِينَ يُوحَى إِلَيْهِ. قَالَ فَبَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ بِالجِعْرَانَةِ وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تَرَى فِي رَجُلٍ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ وَهْوَ مُتَضَمِّخٌ بِطِيبٍ؟ فَسَكَتَ النَّبِيُّ ﷺ سَاعَةً، فَجَاءَهُ الوَحْيُ، فَأَشَارَ عُمَرُ ﷺ إِلَى يَعْلَى، فَجَاءَ يَعْلَى، وَعَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَوْبٌ قَدْ أُظِلَّ بِهِ فَأَدْخَلَ رَأْسَهُ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُحْمَرُّ الوَجْهِ وَهُوَ يَغِطُّ، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَقَالَ: «أَيْنَ الذِي سَأَلَ عَنِ العُمْرَةِ؟» فَأُتِيَ بِرَجُلٍ، فَقَالَ: «اغْسِلِ الطِّيبَ الذِي بِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَانْزِعْ عَنْكَ الجُبَّةَ، وَاصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ كَمَا تَصْنَعُ فِي حَجَّتِكَ». قُلْتُ لِعَطَاءٍ: أَرَادَ الإِنْقَاءَ حِينَ أَمَرَهُ أَنْ يَغْسِلَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ؟ قَالَ: نَعَمْ[1].

## ١٧- باسی سێ جار خۆ شۆردنی تێکەڵاو بەزەعفەران بەپۆشاکی کەسێک ئیحرامی پۆشیوە

**١٥٣٦- یەعلا بە عومەری ﷺ ووت پێغەمبەرم پیشان بدە کاتێ نیگای بۆ دێ، وتی: جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە جیعرانە بوو چەند کەسێکی لە هاوەڵانی لەگەڵدابوو، پیاوێك هاتە خزمەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی دەفەرمووی دەربارەی کەسێك ئیحرامی بە عومرە بەستووە، لە هەمان کاتدا سەر و قژی خۆی بەبۆنی خۆش زەرد کردبێ؟ پێغەمبەر ﷺ ماوەیەك بێدەنگ بوو، جا نیگای بۆ هات، عومەریش ئاماژەی بۆ یەعلا کرد، یەعلاش هات (سەیری کرد) پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێکی بەسەرەوەیە بۆی کراوە بە سێبەر، یەعلا سەری بردە ژێر ئەو پۆشاکەوە، پێغەمبەری خوای بینی ڕوومەتی سوور هەڵگەڕاوە و**

---

[1] بروانە: ١٧٨٩، ١٨٤٧، ٤٣٢٩، ٤٩٨٥.

پرخە پرخی دێ، پاشان وردە وردە باری لەشی سووك بوو (نیگا کۆتایی هات)، جا فەرمووی: ((کوا ئەو کەسەی دەربارەی عومرە پرسیاری کرد؟)) جا پیاوەکە هێنرا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((ئەو بۆن و ڕەنگە لە خۆت داوە سێ جار بیشۆرە، وە جوبەکەت لەبەرت دابکەنە، ئەوەی لە حەجەکەتدا دەیکەیت لە عومرەکەشتدا بیکە))، (جورەیج دەڵێ:) بە عەتام وت: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ جوان لابردن و نەهێشتنی بۆن خۆشییەکە بووە، کاتێ فەرمانی پێکرد سێ جار بیشۆرێت؟ عەتا وتی: بەڵێ مەبەستی ئەوە بووە.

## ١٨- بابُ الطِّيبِ عِنْدَ الإِحْرَامِ وَمَا يَلْبَسُ إِذَا أَرَادَ أَن يُحْرِمَ وَيَتَرَجَّلَ وَيَدَّهِنَ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: يَشَمُّ المُحْرِمُ الرَّيْحَانَ وَيَنْظُرُ فِي المِرْآةِ، وَيَتَدَاوى بِمَا يَأْكُلُ الزَّيْتَ وَالسَّمْنَ. وَقَالَ عَطَاءٌ: يَتَخَتَّمُ وَيَلْبَسُ الهِمْيَانَ. وَطَافَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ، وَقَدْ حَزَمَ عَلَى بَطْنِهِ بِثَوْبٍ. وَلَمْ تَرَ عَائِشَةُ ﷺ بِالتُّبَّانِ بَأْسًا لِلَّذِينَ يَرْحَلُونَ هَوْدَجَهَا.

## ١٨- باسی بەکارهێنانی بۆنی خۆش لەکاتی ئیحڕام بەستن، وە (ئیحڕامدار) چ پۆشاکێک لەبەر بکات کاتێ ویستی ئیحڕام بپۆشێ و قژی دابهێنێ و ڕۆنی لێ بدات

عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: کەسێك لەئیحڕامدا بوو دەتوانێ بۆنی ڕێحانە بکات و سەیری ئاوێنە بکات، وە دەتوانێ چارەسەری تەواوی خۆی بکات بەو شتانەی دەخورێن وەك زەیت و ڕۆن، عەتا دەڵێ: ئەو کەسەی لە ئیحڕامدایە دروستە ئەنگوستیلە لە پەنجە بکات، توشەبەرە ببەستێتە نێوقەدی، وە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ بەئیحڕامەوە تەواف دەکرد و قوماشێکی بەستبوو

**بەورگیەوە، هەروەها عائیشە ﵂ بۆ ئەو کەسانەی کەژاوەکەی دەبەستنەوە بەسەر وشترەکەیەوە، ژێردەرپێ کورتیان لە پێدابێ بەلایەوە ئاسایی بوو.**

١٥٣٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَان، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ يَدَّهِنُ بِالزَّيْتِ. فَذَكَرْتُهُ لِإِبْرَاهِيمَ، قَالَ: مَا تَصْنَعُ بِقَوْلِهِ:

**١٥٣٧- مەنصور دەیگێڕێتەوە لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ سەر و ڕیشی بەزەیت چەور دەکرد، مەنصور دەڵێ: ئەمەی عەبدوڵام بۆ ئیبڕاهیم گێڕایەوە، وتی: چی دەکەیت لەم وتەی ئەسوەد (کە لەم فەرموودەی دواتر دێ):**

١٥٣٨- حَدَّثَنِي الأَسْوَدُ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي مَفَارِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ[١].

**١٥٣٨- ئەسوەد لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: دەڵێی ئێستا بە پێش چاومەوەیە بریسکەی ئەو بۆنخۆشییەی بە قژی پێغەمبەرەوە ﷺ بوو لە خەتی نێوەڕاستی قژیدا، لەو کاتەی کە لەئیحرامدا بوو.**

١٥٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ القَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِإِحْرَامِهِ حِينَ يُحْرِمُ، وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالبَيْتِ[٢].

**١٥٣٩- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: بۆ خۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی ئیحرام بەستنیدا (پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ)**

---

[١] بڕوانە: ٢٧١.

[٢] بڕوانە: ١٧٥٤، ٥٩٢٢، ٥٩٢٨، ٥٩٣٠.

هەروەها بۆئیحرام شکاندنیشی (لە پاش ڕەجمی شەیتان و سەرتاشین) لە پێش ئەوەی تەوافی بەیت بکات بۆنی خۆشم لێ دەدا.

## ١٩- بابُ مَنْ أهَلَّ مُلَبِّدًا

١٥٤٠- حَدَّثَنَا اصْبَغُ، أَخْبَرَنَا ابن وَهْبٍ، عَنْ يونُسَ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أبِيهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُهِلُّ مُلَبِّدًا[1].

## ١٩- باسی بەستنەوەی قژو لۆک کردنی لە کاتی ئیحرام بەستندا

١٥٤٠- سالیم لە باوکیەوە ﷺ گێڕایەوە و دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەنگی بەرز (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی دەوت و ئیحرامی بەست، قژی سەری بەستبوویەوە و لۆکی[2] کردبوو.

## ٢٠- بابُ الإهْلالِ عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الحُلَيْفَةِ

١٥٤١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، سَمِعْتُ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ.
وَحَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ يَقُولُ: مَا أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَّا مِنْ عِنْدِ المَسْجِدِ. يَعْنِي: مَسْجِدَ ذِي الحُلَيْفَةِ.

---

[1] بڕوانە: ١٥٤٩، ٥٩١٤، ٥٩١٥.

[2] واتە: قژی بە هەنگوین، یان سرێژ پێکەوە نووساند تا مووی لێ هەڵنەوەرێ و ڕشک و ئەسپێ هەڵنەهێنێ.

## ٢٠- باسی دەنگ بەرزکردنەوە بە (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ ...) لە مزگەوتی زولحولەیفەوە[١]

**١٥٤١- سالیمی کوڕی عەبدوڵا دەڵێ لە عەبدوڵای کوڕی عومەرم بیست ﷺ. سالیمی کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە کە لە باوکی ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەلای مزگەوتەکەوە دەستی بە وتنی: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ ...) دەکرد، واتە: مزگەوتی زولحولەیفە.**

## ٢١- بابُ مَا لاَ يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ

**١٥٤٢**- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَلْبَسُ الْقُمُصَ وَلاَ الْعَمَائِمَ وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ وَلاَ الْبَرَانِسَ وَلاَ الْخِفَافَ، إِلاَّ أَحَدٌ لاَ يَجِدُ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ أَوْ وَرْسٌ»[٢].

## ٢١- باسی ئەو پۆشاک و جل و بەرگەی کە نابێ کەسێک لە ئیحرامدا بێت لەبەری بکات

**١٥٤٢- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێك لە ئیحرامدا بێت چ پۆشاکێك لەبەر بکات؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نابێ کراس و مێزەرەو شەڕواڵ و کڵاو و خوف لەبەربکات و بیپۆشێ، مەگەر کەسێك جووتێ نەعلی نەبێت، با جووتێ خوف**

---

[١] ئەم جێگایە شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی مەدینەیە کە دەچن بۆ حەج کردن لە مەککە.

[٢] بڕوانە: ١٣٤.

لەپێ بكات لە خوارووی قاپارەكانیەوە خووفەكان ببڕێت (و لەپێیان بكات)، وە هیچ پۆشاكێك لەبەر مەكەن كە بۆنی زەعفەران و وەرسی بەركەوتبێت)).

## ٢٢- بَابُ الرُّكُوبِ وَالاِرْتِدَافِ فِي الحَجِّ

١٥٤٣- ١٥٤٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ يُونُسَ الأَيْلِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ أُسَامَةَ ﷺ كَانَ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ عَرَفَةَ إِلَى المُزْدَلِفَةِ، ثُمَّ أَرْدَفَ الفَضْلَ مِنَ المُزْدَلِفَةِ إِلَى مِنًى، قَالَ: فَكِلاَهُمَا قَالَ: لَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ ﷺ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ العَقَبَةِ.

## ٢٢- باسی سواربوونی وڵاخ وە سواربوون لە پاشكۆدا

**١٥٤٣- ١٥٤٤- عەبدوڵای كوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە ئوسامە ﷺ لە پاشكۆی پێغەمبەردا ﷺ بوو لە عەرەفەوە هەتا موزدەلیفە، پاشان لە موزدەلیفە هەتا مینا فەزڵی خستە پاشكۆی خۆی، عەبدوڵا دەڵێ: ئوسامە و فەزڵ دەیانوت: پێغەمبەر ﷺ لەو ماوەیەدا بەردەوام (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی دەوت، هەتا ڕەجمی جەمەرەتولعەقەبەی كرد))[1].**

## ٢٣- بَابُ مَا يَلْبَسُ المُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ وَالأَرْدِيَةِ وَالأُزُرِ

وَلَبِسَتْ عَائِشَةُ ﷺ الثِّيَابَ المُعَصْفَرَةَ وَهْيَ مُحْرِمَةٌ وَقَالَتْ: لاَ تَلَثَّمْ وَلاَ تَتَبَرْقَعْ وَلاَ تَلْبَسْ ثَوْبًا بِوَرْسٍ[2] وَلاَ زَعْفَرَانٍ[1]. وَقَالَ جَابِرٌ: لاَ أَرَى المُعَصْفَرَ[2] طِيبًا. وَلَمْ تَرَ عَائِشَةُ بَأْسًا بِالحُلِيِّ وَالثَّوْبِ الأَسْوَدِ وَالمُوَرَّدِ وَالخُفِّ لِلْمَرْأَةِ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: لاَ بَأْسَ أَنْ يُبْدِلَ ثِيَابَهُ.

---

[1] لە كوردەواریدا پێی دەڵێن شەیتانی گەورە.

[2] وَرْس: ڕووەكێكە لەوڵاتی عەرەب و حەبەشەو هیند دەڕوێ، بۆ ڕەنگكردنی ئاوریشم و پۆشاك بەكاردێ. بڕوانە: المعجم الوسيط: ٦٩٥.

## ٢٣- باسی ئەو پۆشاك و ڕیدا و ئیزارانەی دروستە ئیحڕامدار بیانپۆشێت

**عائیشە ﵂ پۆشاكێكی ڕەنگكراو بە گیاگەزەنەی لەبەردابوو كاتێ لەئیحڕامدا بوو، وە عائیشە دەڵێ: ئافرەت لە ئیحڕامدابێت نابێ دەمی داپۆشێ و پەچە و نیقاب بكات، وە نابێ پۆشاكێك لەبەر بكات بۆنخۆش كرابێت بەوەرس و زەعفەران. جابیر ﵁ دەڵێ: من عەسفەر بە بۆنخۆش دانانێم، وە عائیشە: خشڵی ئاڵتون و پۆشاكی ڕەش و پۆشاكێكی گوڵ ڕەنگی و خووف هەموو ئەمانەی بەڕەوا داناوە بۆ ئافرەت (ی ئیحڕامدار بەكاریان بێنێ و بیانپۆشێ)، ئیبڕاهیم دەڵێ: هیچی تێدا نییە (كەسێك لە ئیحڕامدا بێت) جل و پۆشاكەكانی بگۆڕێ.**

١٥٤٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ المُقَدَّمِيُّ، حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي كُرَيْبٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ المَدِينَةِ بَعْدَ مَا تَرَجَّلَ وَادَّهَنَ وَلَبِسَ إِزَارَهُ وَرِدَاءَهُ، هُوَ وَأَصْحَابُهُ، فَلَمْ يَنْهَ عَنْ شَيْءٍ مِنَ الأَرْدِيَةِ وَالأُزْرِ تُلْبَسُ إِلاَّ المُزَعْفَرَةَ التِي تَرْدَعُ عَلَى الجِلْدِ، فَأَصْبَحَ بِذِي الحُلَيْفَةِ، رَكِبَ رَاحِلَتَهُ حَتَّى اسْتَوَى عَلَى البَيْدَاءِ، أَهَلَّ هُوَ وَأَصْحَابُهُ وَقَلَّدَ بَدَنَتَهُ، وَذَلِكَ لِخَمْسٍ بَقِينَ مِنْ ذِي القَعْدَةِ، فَقَدِمَ مَكَّةَ لأَرْبَعِ لَيَالٍ خَلَوْنَ مِنْ ذِي الحَجَّةِ، فَطَافَ بِالبَيْتِ وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ، وَلَمْ يَحِلَّ مِنْ أَجْلِ بُدْنِهِ لأَنَّهُ قَلَّدَهَا، ثُمَّ نَزَلَ بِأَعْلَى مَكَّةَ عِنْدَ الحَجُونِ، وَهُوَ مُهِلٌّ بِالحَجِّ، وَلَمْ يَقْرَبِ الكَعْبَةَ بَعْدَ طَوَافِهِ بِهَا حَتَّى رَجَعَ مِنْ عَرَفَةَ، وَأَمَرَ أَصْحَابَهُ أَنْ يَطَّوَّفُوا بِالبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ، ثُمَّ يُقَصِّرُوا مِنْ رُءُوسِهِمْ ثُمَّ يَحِلُّوا، وَذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ بَدَنَةٌ قَلَّدَهَا، وَمَنْ كَانَتْ مَعَهُ امْرَأَتُهُ فَهِيَ لَهُ حَلاَلٌ، وَالطِّيبُ وَالثِّيَابُ[٣].

---

[١] زَعْفَرَان: ڕووەكێكە پۆشاكی پێ ڕەنگ دەكەن و ڕەنگەكەی زەرد یان پرتەقاڵییە.

[٢] المُعَصْفَر: واتە: گیاگەزەنە.

[٣] بڕوانە: ١٦٢٥، ١٧٣١.

**١٥٤٥- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەشاری مەدینە دەرچوو (بەرەو مەککە)، دوای ئەوەی سەر و ڕیشی بەبۆنی خۆش چەورکرد و شانەیکرد و دایهێنا، وە خۆی و هاوەڵانی ئیزار و ڕیدایان[١] پۆشی، وە ڕێگەی بەلەبەرکردنی هەموو جۆرە ئیزارو ڕیدایەك دا، جگە لەوانەی ئەوەندە زەعفەرانی لێدرابێ کە ڕەنگ بداتەوەو پێست زەرد بکات، جا بەیانی بوویەوە و ڕۆیشتە زولحولیفە (شەو لەوێ مایەوە، وە بەیانی) سواری وڵاخەکەی بوو ڕۆیشت تا ڕۆیشتە سەر بەیدا[٢]، جا خۆی و هاوەڵانی ئیحرامیان بەست، جا ئەو وشترانەی هێنابووی بۆ قوربانی یەکی جووتێ نەعلی کردە ملیان و دیاریکردن، ئەو کاتەی (ئەمانەی کرد) هێشتا مانگی زولقەعدە پێنج ڕۆژی مابوو، لە ڕۆژی چوارەمی مانگی قورباندا گەیشتە مەککە، ئینجا تەواف بەیتی کرد و سەعی نێوان صەفا و مەڕوەی کرد، خۆی ئیحرامی شکاند لەبەر ئەوەی وشتری دیاری (هەدی) هێنابوو و نیشانەشی کردبوون، ئینجا لەسەرووی مەککەوە لای حەجوون دابەزی و بارگەی خست، پێغەمبەر ﷺ تەنها ئیحرامی بە حەج بەستبوو، دوای ئەوەی تەواف بەیتی کرد، ئیتر نزیك کەعبە نەکەوتەوە تا لە عەرەفە گەڕایەوە، بەڵام فەرمانی کرد بەهاوەڵانی تەواف بەیت و سەعی نێوان صەفا و مەڕوە بکەن، پاشان سەریان کورت بکەنەوە، پاشان ئیحرام بشکێنن، ئەمە بۆ ئەو هاوەڵانە بوو کە وشتری نیشانەکراویان لەگەڵ خۆیان نەهێنابوو (تا بیکەن بە فیدیەی شکاندنی ئیحرامەکە)، ئەوەشیان خێزانی لەگەڵ بێت (دوای ئیحرام شکاندنەکە) بۆی حەڵاڵە سەرجێیی لەگەڵدا بکات، هەروەها بۆنی خۆش لەخۆدان و جلوبەرگ لەبەرکردنیان بۆ حەڵاڵە.**

---

[١] ئیزار: پارچە قوماشێکە بۆ نێوان نێوک و ئەژنۆیە، ڕیدا: پارچە قوماشێکە دەدرێت بەسەر شاندا. إرشاد الساري: ٦٣/٤.

[٢] بەیدا: زەوییەکی دەشت و تەختاییە، پێش ئەوەی بگەیت بە زولحولەیفە.

## ٢٤- بابُ مَنْ بَاتَ بِذِي الحُلَيْفَةِ حَتَّى أَصْبَحَ

قَالَهُ ابن عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٥٤٦- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُنْكَدِرِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ بِالمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَبِذِي الحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ بَاتَ حَتَّى أَصْبَحَ بِذِي الحُلَيْفَةِ، فَلَمَّا رَكِبَ رَاحِلَتَهُ وَاسْتَوَتْ بِهِ أَهَلَّ[1].

## ٢٤- باسی کەسێک کە شەو لە زولحولیفە بمێنێتەوە تا ڕۆژ دەبێتەوە

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە (کەوای کردووە)[2].**

**١٥٤٦- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (کاتێ ویستی بڕوات بۆ حەج) لە مەدینە نوێژی بەچوار ڕکات کرد (واتە: کورتی نەکردەوە)، بەڵام لە زولحولەیفە دوو ڕکاتی کرد، پاشان لە زولحولەیفە شەو مایەوە تا ڕۆژ بوویەوە، ئینجا کاتێ سواری وشترەکەی بوو، وشترەکە هەڵسایەوە و بەدەنگی بەرز (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ بِالحَجِّ)ی[3] کرد.**

---

[1] بڕوانە: ١٠٨٩.

[2] پێشتر عەبدوڵا لە فەرموودەی: (١٥٣٣) ئەو فەرموودەی گێڕایەوە.

[3] (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ بِالحَجِّ)، واتە: نییەتم هێنا بۆ تۆ خوایە بە حەج.

١٥٤٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّاب، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ بِالمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَصَلَّى العَصْرَ بِذِي الحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، قَالَ: وَأَحْسِبُهُ بَاتَ بِهَا حَتَّى أَصْبَحَ[1].

**١٥٤٧- ئەبوقیلابە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەویش دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد لە مەدینە، وە دوو ڕکات نوێژی عەسری کرد لە زولحولیفە، ئەبوقیلابە دەڵێ: وا گومان دەبەم شەو لە زولحولەیفە ماوەتەوە تا ڕۆژ بووەتەوە.**

## ٢٥- بابُ رَفْعِ الصَّوْتِ بِالإِهْلَالِ

١٥٤٨- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ بِالمَدِينَةِ الظُّهْرَ أَرْبَعًا، وَالعَصْرَ بِذِي الحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، وَسَمِعْتُهُمْ يَصْرُخُونَ بِهِمَا جَمِيعًا[2].

## ٢٥- باسی دەنگ بەرزکردنەوە بە تەلبییەکردن

**١٥٤٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد لە مەدینە، وە دوو ڕکات نوێژی عەسری کرد لە زولحولەیفە، وە گوێم لێ بوو بەدەنگی بەرز پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان دەنگیان بەرز کردەوە** (بەوتنی: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ حَجًّا وَعُمْرَةً) **یان دەکرد، وە نیەتیان بە حەج و عومرە دەهێنا.**

---

[1] بڕوانە: ١٠٨٩.

[2] بڕوانە: ١٠٨٩.

## ٢٦- بابُ التَّلْبِيَةِ

١٥٤٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ تَلْبِيَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ»[1].

## ٢٦- باسی تەلبییەکردن

**١٥٤٩- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: تەلبییەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بەم جۆرە بوو: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ)، واتە: خوایە وەڵامی دوای وەڵام دەدەمەوە لە گوێڕایەڵیتدا، فەرمانبەردار و گوێڕایەڵتم هیچ هاوبەشێکت نییە، ستایش نیعمەت و موڵك هەر بۆ تۆیە، هیچ هاوبەشێکت نییە.**

١٥٥٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: إِنِّي لأَعْلَمُ كَيْفَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُلَبِّي: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ». تَابَعَهُ أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ.

**١٥٥٠- عائیشە ﷺ دەڵێ: من چاك دەزانم پێغەمبەر ﷺ چۆن تەلبییەی دەکرد، بەم جۆرە: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ). ئەبو موعاویە ئەم فەرموودەی لە ئەعمەشەوە گێڕاویەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی سوفیان دەکات.**

---

[1] بڕوانە: ١٥٤٠.

## ٢٧- بابُ التَّسبِيحِ وَالتَّحْمِيدِ وَالتَّكبِيرِ قبْلَ الإهْلَالِ عِنْدَ الرُّكُوبِ عَلَى الدَّابَّةِ

١٥٥١- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ مَعَهُ بِالْمَدِينَةِ الظُّهْرَ أَرْبَعًا، وَالعَصْرَ بِذِي الحلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ بَاتَ بِهَا حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى البَيْدَاءِ، حَمِدَ اللَّهَ وَسَبَّحَ وَكَبَّر، ثمَّ أَهَلَّ بِحَجٍّ وعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهِمَا، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَ النَّاسَ فَحَلُّوا، حَتَّى كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ أَهَلُّوا بِالحَجِّ، قَالَ: وَنَحَرَ النَّبِيُّ ﷺ بَدَنَاتٍ بِيَدِهِ قِيَامًا، وَذَبَحَ رَسُول اللَّهِ ﷺ بِالمَدِينَةِ كَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ. قَالَ أبو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ بَعْضُهُمْ: هذا عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ أَنَسٍ[1].

## ٢٧- باسی (الحمدلله) و (سبحان الله) و (الله أكبر) كردن پێش نییەتهێنان[2] لەكاتی سواربوونی وڵاخدا

**١٥٥١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆی بە چوار ڕكات كرد، وە نوێژی عەسری لە زولحولەیفە بەدوو ڕكات كرد، ئینجا شەو لە زولحولەیفە مایەوە تا ڕۆژ بوویەوە، پاشان سواری وڵاخەكەی بوو لەسەر بەرزایی بەیدا كە هەستایەوە، پێغەمبەر ﷺ (الحمدلله وسبحان الله والله أكبر)ی كرد، پاشان بەدەنگی بەرز نیەتی حەج و عومرەی پێكەوە هێنا، هاوەڵانیش بەدەنگی بەرز نیەتی حەج و عومرەیان هێنا (بە: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ حَجًّا وَعُمْرَةً)، جا كە گەیشتینە مەككە فەرمانی كرد بە هاوەڵان (پاش ئەوەی عومرەیان ئەنجامدا) ئیحرامیان شكاند، هەتاكوو ڕۆژی هەشتەمی**

---

[1] بڕوانە: ١٠٨٩.

[2] بە وتنی: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ حَجًّا وَعُمْرَةً)، واتە: نییەتم هێنا بۆ تۆ خوایە بە حەج و عومرە.

**مانگی قوربانا (کە پێی دەڵێن: يَوْمُ التَّرْوِيَةِ) جارێکی تر ئیحرامیان بە حەج بەستەوە، (ئەنەس) وتی: پێغەمبەریش ﷺ بەدەستی خۆی چەند وشترێکی سەربڕی کەبەپێوە ڕاوەستابوون[1]، وە لە مەدینەش (کاتێ گەڕایەوە) دوو بەرانی سەربڕی کە ڕەنگیان ڕەش وسپی بوو. ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: هەندێ لە ڕاوییەکان دەڵێ: ئەم فەرموودەیە گێڕدراوەتەوە لە ئەیوبەوە لە پیاوێکەوە لە ئەنەسەوە.**

## ٢٨- بابُ مَنْ أَهَلَّ حِينَ اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةً

١٥٥٢- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، أَخْبَرَنَا ابن جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي صَالِحُ بْنُ يسَانَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: أَهَلَّ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةً[2].

## ٢٨- باسی نییەتهێنان (بە حەج و عومرە) کاتێ وشترەکەی هەڵسایەوە ڕاست وەستا

**١٥٥٢- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ وشترەکە هەڵسایەوەو ڕاوەستا بە دەنگی بەرز نییەتی (حەج و عومرەی) هێنا.**

## ٢٩- بابُ الإِهْلَالِ مُسْتَقْبِلَ القِبْلَةِ

١٥٥٣- وَقَالَ أَبُو مَعْمَرٍ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ إِذَا صَلَّى بِالغَدَاةِ بِذِي الحُلَيْفَةِ أَمَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَرُحِلَتْ ثُمَّ رَكِبَ، فَإِذَا اسْتَوَتْ بِهِ اسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ قَائِمًا، ثُمَّ يُلَبِّي حَتَّى يَبْلُغَ المَحْرَمَ، ثُمَّ يُمْسِكُ حَتَّى إِذَا جَاءَ ذَا طُوًى بَاتَ بِهِ

---

[1] وشتر بە ڕاوەستاوی و بە پێوە سەردەبڕدرێ، بە جیاواز لە هەموو ئاژەڵەکانی تر کە بە پاڵەوە سەردەبڕدرێن.

[2] بڕوانە: ١٦٦.

حَتَّى يُصْبِحَ، فَإِذَا صَلَّى الغَدَاةَ اغْتَسَلَ، وَزَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَعَلَ ذَلِكَ. تَابَعَهُ إِسْمَاعِيلُ، عَنْ أَيُّوبَ فِي الغَسْلِ.

## ٢٩- باسی نییەتهێنان (بە حەج و عومرە) بەدەنگی بەرز ڕوو بە قیبلە

**١٥٥٣- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ کە نوێژی بەیانی لە زوحولەیفە دەکرد فەرمانی دەکرد وشترەکەیان بۆ کۆپان دەکرد، پاشان سوار دەبوو، جا کە وشترەکە هەڵدەسایەوە و ڕاست دەبوویەوە، عەبدوڵا بەسەر وشترەکەوە قنج و قیت ڕووی دەکردە قیبلە (نییەتی حەجی دەهێنا)[1]، پاشان دەستی دەکرد بەتەلبییەکردن، تا دەگەیشتە خاکی حەرەم، پاشان لە تەلبییەکردن دەوەستا هەتا دەڕۆیشتە (ذَو طُوًى)[2]، لەوێدا شەو دەمایەوە تا ڕۆژ دەبوویەوە، جا کە نوێژی بەیانی دەکرد خۆی دەشۆرد، عەبدوڵا پێی وایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای کردووە، ئیسماعیل لە ئەیووبەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوەو پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبولواریسی کردووە لەبەشی خۆشۆردنەکەدا.**

١٥٥٤- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ أَبُو الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ إِذَا أَرَادَ الخُرُوجَ إِلَى مَكَّةَ ادَّهَنَ بِدُهْنٍ لَيْسَ لَهُ رَائِحَةٌ طَيِّبَةٌ، ثُمَّ يَأْتِي مَسْجِدَ الحُلَيْفَةِ فَيُصَلِّي ثُمَّ يَرْكَبُ، وَإِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةً أَحْرَمَ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَفْعَلُ.

**١٥٥٤- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ بیویستایە بڕوات بۆ مەککە (بۆ حەجکردن)، سەر و ڕیشی چەور دەکرد بەچەورییەك بۆنی خۆش**

---

[1] ئەم زیادەیە لە گێڕانەوەی ئیبنو ماجە و ئەبو عوانە لە صەحیحەکەیدا هاتووە. إرشاد الساري: ٤٧/٤.

[2] کە ئێستا پێی دەڵێن: آبار الزاهد.

نەبێت، پاشان دەچووە مزگەوتی زولحولەیفە و نوێژی دەکرد، پاشان سوار وشترەکەی دەبوو، کە وشترەکە ڕاست دەبوویەوە، عەبدوڵا نییەتی حەجی دەهێنا، پاشان دەیوت: پێغەمبەرم ﷺ دی ئاوەهای دەکرد.

## ٣٠- بَابُ التَّلْبِيَةِ إِذَا انْحَدَرَ فِي الوَادِي

١٥٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ فَذَكَرُوا الدَّجَّالَ، أَنَّهُ قَالَ: «مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ». فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَمْ أَسْمَعْهُ وَلَكِنَّهُ قَالَ: «أَمَّا مُوسَى كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ إِذِ انْحَدَرَ فِي الوَادِي يُلَبِّي»[1].

## ٣٠- باسی تەلبییەکردن کاتی دابەزین بۆ نێو شیوەکە[2]

١٥٥٥- موجاهید دەڵێ: ئێمە لە خزمەت عەبدوڵای کوڕی عەباس دا بووین ﷺ، جا باسی دەججالیان کرد، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لە نێوچاوانی نووسراوە کافر))، عەبدوڵای کوڕی عەباسیش وتی: من ئەم وتەیەم نەبیستووە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بەڵام مووسا ﷺ دەڵێی بەپێش چاومەوەیە سەیری دەکەم، کاتێ دادەبەزێ بۆ نێو شیوەکە و تەلبییەی دەکرد بەدەنگی بەرز)).

## ٣١- بَابٌ: كَيْفَ تُهِلُّ الحَائِضُ وَالنُّفَسَاءُ؟

أَهَلَّ: تَكَلَّمَ بِهِ، وَاسْتَهْلَلْنَا وَأَهْلَلْنَا الهِلاَلَ كُلُّهُ مِنَ الظُّهُورِ، وَاسْتَهَلَّ المَطَرُ خَرَجَ مِنَ السَّحَابِ. ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ﴿٣﴾﴾ المائدة. وَهُوَ مِنِ اسْتِهْلاَلِ الصَّبِيِّ.

---

[1] بڕوانە: ٣٣٥٥، ٥٩١٣.

[2] کە ناوی (وَادِي الأَزْرَق)ـە، واتە: شیوە شینەکە. إرشاد الساري: ٥٠/٤.

١٥٥٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْن مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابن شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ، فَأَهْلَلْنَا بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُهِلَّ بِالحَجِّ مَعَ العُمْرَةِ، ثُمَّ لَا يَحِلَّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا». فَقَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ، وَلَمْ أَطُفْ بِالبَيْتِ وَلَا بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «انْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي، وَأَهِلِّي بِالحَجِّ، وَدَعِي العُمْرَةَ». فَفَعَلْتُ، فَلَمَّا قَضَيْنَا الحَجَّ أَرْسَلَنِي النَّبِيُّ ﷺ مَعَ عَبدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَاعْتَمَرْتُ، فَقَالَ: «هَذِهِ مَكَانَ عُمْرَتِكِ». قَالَتْ: فَطَافَ الذِينَ كَانُوا أَهَلُّوا بِالعُمْرَةِ بِالبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلُّوا، ثُمَّ طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا بَعْدَ أَنْ رَجَعُوا مِنْ مِنًى، وَأَمَّا الذِينَ جَمَعُوا الحَجَّ وَالعُمْرَةَ فَإِنَّمَا طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا[١].

## ٣١- باسێک: ئافرەتی حەیزدار و زەیسان چۆن نیەتی حەج و عومرە بێنن؟

**أَهَلَّ (ئەوەی لە دڵیدابوو) بە زمان وتی، بەوتن دەری بڕی، وە (اسْتَهْلَلْنَا وَأَهْلَلْنَا الهِلَالَ [٢] هەموو ئەم وشانە لە مانای دەرکەوتن و ئاشکرابوونەوە وەرگیراوە، وە (اسْتَهَلَّ المَطَرُ) واتە: باران لە هەورەکە باری و پەیدابوو، وە (وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ[٣] (لەئەسڵدا لەدەنگ بەرز کردنەوەوە هاتووە)، ماناکەی لە شێوەی مانای: (اسْتِهْلَالِ الصَّبِيِّ) دەنگی گریانی منداڵە لە کاتی لەدایکبوونیدا.**

---

[١] بڕوانە: ٢٩٤.

[٢] ئەگەر مەفعول بیهی بێت: بە مانای بە شوێن دەرکەوتنی مانگدا گەڕاین، بەڵام ئەگەر فاعیل بێت واتە: مانگ دەرکەوت.

[٣] کە پێشتر بۆی نەکرا، چونکە لە حەیزدا بوو.

**١٥٥٦- عائيشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: لە حەجی ماڵئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە مەدینە دەرچووین ئیحراممان بەست بە عومرە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس ئاژەڵی هەدیەی لەگەڵ خۆی هێناوە با ئیحرام ببەستێ بە حەج وعومرە، پاشان ئیحرام ناشکێنێ تا حەج و عومرەکە هەردووکیان تەواو نەکات))، منیش کاتێ گەشتمە مەککە لە حەیزدابووم نەتەواف بەیتم کرد، نەسەعی نێوان صەفا و مەروە، جا ئەم حاڵەی خۆم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((پەلکەکانی قژت بکەرەوە و قژت شانە بکە، ئیحرام ببەستە بە حەج، واز لە عومرەکە بێنە و مەیکە))، منیش وام کرد، جا کاتێ کارەکانی حەجمان تەواوکرد، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر (کە برای عائیشە بوو) ناردمی بۆ تەنعیم، (ئیحرامم بەست)و عومرەکەم کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمە لە جێگای عومرەکەت))[1]، عائیشە دەڵێ: جا ئەوانەی ئیحرامیان بە عومرە بەستبوو، تەواف بەیتو سەعی نێوان صەفا و مەروەیان کرد، پاشان ئیحرامیان شکاند، وە کە گەڕانەوە لە مینا تەوافێکی تریان کرد، بەڵام ئەوانەی ئیحرامیان بە حەج و عومرە پێکەوە بەستبوو، تەنها یەك جار تەواف بەیتیان کرد.**

## ٣٢- باب مَنْ أَهَلَّ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ كَإِهْلَالِ النَّبِيِّ ﷺ.

قَالَهُ ابْنُ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**١٥٥٧-** حَدَّثَنَا المَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ عَطَاءٌ: قَالَ جَابِرٌ ﷺ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَلِيًّا ﷺ أَنْ يُقِيمَ عَلَى إِحْرَامِهِ. وَذَكَرَ قَوْلَ سُرَاقَةَ[2].

---

[1] بڕوانە: ٢٩٤.

[2] بڕوانە: ١٥٦٨، ١٥٧٠، ١٦٥١، ١٧٨٥، ٢٥٠٥، ٤٣٥٢، ٧٢٣٠، ٧٣٦٧.

## ٣٢- باسی ئەو کەسەی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئیحرامی بەستووە وەک ئیحرام، بەستنی پێغەمبەر ﷺ

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە[1]**

**١٥٥٧- عەتا دەڵێ: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە عەلی ﷺ لەسەر ئیحرامەکەی خۆی بەردەوام بێ، (عەتا دەڵێ): وە جابیر وتەکەی سوراقەی باس کرد[2].**

١٥٥٨- حَدَّثَنَا الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ الخَلاَّلُ الهُذَلِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا سَلِيمُ بْنُ حَيَّانَ قَالَ: سَمِعْتُ مَرْوَانَ الأَصْفَرَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ عَلِيٌّ ﷺ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ مِنَ اليَمَنِ، فَقَالَ: «بِمَا أَهْلَلْتَ؟». قَالَ: بِمَا أَهَلَّ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ. فَقَالَ «لَوْلاَ أَنَّ مَعِي الهَدْيَ لأَحْلَلْتُ». وَزَادَ مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ: قَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ «بِمَا أَهْلَلْتَ يَا عَلِيُّ؟». قَالَ: بِمَا أَهَلَّ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: «فَأَهْدِ وَامْكُثْ حَرَامًا كَمَا أَنْتَ».

**١٥٥٨- ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: عەلی ﷺ لە یەمەنەوە هات و گەیشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ (لە مەککە لەکاتی حەجدا)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (بە عەلی): ((ئیحرامت بەچی بەستووە؟)) وتی: بەو ئیحرامەی پێغەمبەر بەستوویەتی (بەستوومە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە ئاژەڵی دیاری بەیتم پێیە، ئیحرامەکەم دەشکاند))[3]، لە گێڕانەوەی**

---

[1] لە فەرموودەی ژمارە: ١٥٥٨، ١٥٥٩ یان ٤٣٥٣، ٤٣٥٤ باسەکەی دێت و لەوێدا ڕوونی دەکەینەوە.

[2] وتەکەی سوراقە لە فەرموودەی ژمارە (٢٥٠٥، ٢٥٠٦) دێت.

[3] حەجەکەم دەکرد بە حەجی تەمەتوع، واتە: دوای ئەنجامدانی عومرە ئیحرام دەشکێنێ، دواتر ڕۆژی هەشتی ذي الحجة ئیحرام بە حەج دەبەستێ.

**موحەممەدی کوڕی بەکر لە ئیبنو جورەیجەوە ئەم زیادەی لەگەڵدایە: پێغەمبەر ﷺ بە عەلی فەرموو: ((عەلی ئیحڕامت بەچی بەستووە؟)) عەلیش وتی: بەو شێوە ئیحڕامەی پێغەمبەر ﷺ ئیحڕامی پێ بەستووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کەواتە ئاژەڵێك سەرببڕە[1]، وە چۆن لە ئیحڕامدایت بەردەوامبە لەسەر ئیحڕامەکەت)).**

١٥٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ قَيْسِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي النَّبِيُّ ﷺ إِلَى قَوْمٍ بِالْيَمَنِ فَجِئْتُ وَهْوَ بِالْبَطْحَاءِ، فَقَالَ: «بِمَا أَهْلَلْتَ؟». قُلْتُ: أَهْلَلْتُ كَإِهْلاَلِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «هَلْ مَعَكَ مِنْ هَدْيٍ؟». قُلْتُ: لاَ. فَأَمَرَنِي فَطُفْتُ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ أَمَرَنِي فَأَحْلَلْتُ فَأَتَيْتُ امْرَأَةً مِنْ قَوْمِي فَمَشَطَتْنِي، أَوْ غَسَلَتْ رَأْسِي، فَقَدِمَ عُمَرُ ﷺ فَقَالَ: إِنْ نَأْخُذْ بِكِتَابِ اللَّهِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُنَا بِالتَّمَامِ، قَالَ اللَّهُ: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴿١٩٦﴾ ﴾ البقرة. وَإِنْ نَأْخُذْ بِسُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ فَإِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ حَتَّى نَحَرَ الْهَدْيَ[2].

**١٥٥٩- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ناردمی (بۆ سەروکاری) هۆزێك لەیەمەن، جا (لەکاتی حەجدا لە مەککە) چوومە خزمەتی لەکاتێکدا لە بەتحا بوو، فەرمووی: ((ئیحڕامت چۆن بەستووە؟))، وتم: ئیحڕامم وەك ئیحڕام بەستنی پێغەمبەر ﷺ بەستووە، فەرمووی: ((ئاژەڵی دیاری بەیتت پێیە؟)) وتم: نەخێر، ئینجا فەرمانی پێکردم (بەتەواف بەیت و سەعی نێوان صەفا و مەڕوە)، منیش تەواف بەیت و سەعی صەفا و مەڕوەم کرد، ئەوسا فەرمانی پێکردم**

---

[1] چونکە علی حەجی قارن ئەنجام دەدات، کە بریتی یە لە ئیحرام بەستن بە حەج و عومرە، کە لەم حاڵەتەدا دەبێ ئاژەڵێک سەرببڕێ وەک دیاری بۆ بەیت.

[2] بڕوانە: ١٥٦٥، ١٧٢٤، ١٧٩٥، ٤٣٤٦، ٤٣٩٧.

**ئیحرامم شکاند، جا ڕۆیشتم بۆ لای ئافرەتێکی هۆزەکەم[1] قژی شانەکردم، یان سەری شۆردم، ئینجا کاتێ عومەر ﷛ (لە خیلافەتی خۆیدا) هات فەرمووی: بێگومان ئەگەر ئێمە کاربکەین بەوەی لە قورئانەکەی خوادا هاتووە، ئەوە فەرمانمان پێدەکات کە حەج و عومرە بەتەواوی بکەین و ئیحرام نەشکێنین هەتا حەجەکەش تەواو دەکەین، دەفەرموێ: ﴿ وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴿١٩٦﴾ ﴾[2]، وە ئەگەر کار بەفەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ بکەین ئەوە هەروایە، پێغەمبەر خۆی کە ئیحرامی دەبەست، نەیدەشکاند هەتا ئاژەڵی دیاری بەیتی سەرنەبڕیبایە (لە مینا)[3].**

## ٣٣- باب قَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى: ﴿ الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ ﴿١٩٧﴾ ﴾ البقرة. وَقَوْلِه ﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ ﴿١٨٩﴾ ﴾ البقرة.

وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَشْهُرُ الحَجِّ: شَوَّالٌ، وَذُو القَعْدَةِ، وَعَشْرٌ مِنْ ذِي الحَجَّةِ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ لاَ يُحْرِمَ بِالحَجِّ إِلاَّ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ. وَكَرِهَ عُثْمَانُ أَنْ يُحْرِمَ مِنْ خُرَاسَانَ أَوْ كَرْمَانَ.

---

[1] سەرنج: ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەو ئافرەتە خێزانی یەکێک لە براکانی ئەبو موسا بووە. بڕوانە: فتح الباری: ٥٢٦/٣.

[2] واتە: حەج و عومرە بە چاکی و تەواوی ئەنجام بدەن.

[3] واتە: عومەر ﷛ ڕێگری کردووە کە خەڵک (تمتع) بکات، وە پێی ناخۆش بووە خەڵکەکە ئیحرام بشکێنن کاتێ عومرەیان کرد هەتا حەجەکەش تەواو نەکەن.

## ٣٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (حەج لە چەند مانگێکی دیاریکراودایە، جا ئەوەی کە لەو مانگانەدا دەست بەکار بوو و بڕیاریدا حەج بکات، ئەوە دەبێت نزیکی هاوسەری نەکەوێت و گوناهـو موجادەلەو گوفتاری نادروست ئەنجام نەدات لە کاتی حەجدا). وە ئەم فەرمایشتەی خوا: (ئەی موحەممەد پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی نوێبوونەوەی مانگەکان، پێیان بڵێ: ئەوە بۆ دیاریکردنی کاتەکانە بۆ خەڵکی و بۆ زانینی کاتی حەج (خوا ڕێکی خستووە)).

**عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: مانگەکانی حەج بریتین لە: شەوال و زولقەعدە و دە ڕۆژی یەکەمی مانگی زولحیجە. عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: سوننەتە تەنها لە مانگە دیاریکراوەکان بۆ حەج نیەتی حەج بێنێت و خۆی ئامادە بکات (بۆ حەج). عوسمان ﷺ بەلایەوە پەسەند نییە کەسێك (بەنیازی حەج بێت) لە خۆراسان، یان کرمانەوە نیەتی حەج بێنێ وئیحرام ببەستێ.**

١٥٦٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ الحَنَفِيُّ، حَدَّثَنَا أَفْلَحُ بْنُ حُمَيْدٍ، سَمِعْتُ القَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ، وَلَيَالِي الحَجِّ وَحُرُمِ الحَجِّ، فَنَزَلْنَا بِسَرِفَ، قَالَتْ: فَخَرَجَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: «مَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْكُمْ مَعَهُ هَدْيٌ فَأَحَبَّ أَنْ يَجْعَلَهَا عُمْرَةً فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُ الهَدْيُ فَلاَ». قَالَتْ: فَالآخِذُ بِهَا وَالتَّارِكُ لَهَا مِنْ أَصْحَابِهِ، قَالَتْ: فَأَمَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَرِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَكَانُوا أَهْلَ قُوَّةٍ، وَكَانَ مَعَهُمُ الهَدْيُ، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى العُمْرَةِ قَالَتْ: فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ

اللَّهِ ﷺ وَأَنَا أَبْكِي فَقَالَ «مَا يُبْكِيكِ يَا هَنْتَاهْ؟». قُلْتُ سَمِعْتُ قَوْلَكَ لأَصْحَابِكَ فَمُنِعْتُ الْعُمْرَةَ. قَالَ «وَمَا شَأْنُكِ؟». قُلْتُ: لاَ أُصَلِّي. قَالَ: «فَلاَ يَضِيرُكِ، إِنَّمَا أَنْتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِ آدَمَ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْكِ مَا كَتَبَ عَلَيْهِنَّ، فَكُونِي فِي حَجَّتِكِ، فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَرْزُقَكِيهَا». قَالَتْ: فَخَرَجْنَا فِي حَجَّتِهِ حَتَّى قَدِمْنَا مِنًى فَطَهَرْتُ، ثُمَّ خَرَجْتُ مِنْ مِنًى فَأَفَضْتُ بِالْبَيْتِ، قَالَتْ: ثُمَّ خَرَجَتْ مَعَهُ فِي النَّفْرِ الآخِرِ حَتَّى نَزَلَ الْمُحَصَّبَ، وَنَزَلْنَا مَعَهُ، فَدَعَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ: «اخْرُجْ بِأُخْتِكَ مِنَ الْحَرَمِ، فَلْتُهِلَّ بِعُمْرَةٍ ثُمَّ افْرُغَا، ثُمَّ ائْتِيَا هَا هُنَا، فَإِنِّي أَنْظُرُكُمَا حَتَّى تَأْتِيَانِي». قَالَتْ: فَخَرَجْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغْتُ، وَفَرَغْتُ مِنَ الطَّوَافِ ثُمَّ جِئْتُهُ بِسَحَرَ فَقَالَ: «هَلْ فَرَغْتُمْ؟». فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَآذَنَ بِالرَّحِيلِ فِي أَصْحَابِهِ، فَارْتَحَلَ النَّاسُ فَمَرَّ مُتَوَجِّهًا إِلَى الْمَدِينَةِ. ضَيْرُ: مِنْ ضَارَ يَضِيرُ ضَيْرًا، وَيُقَالُ: ضَارَ يَضُورُ ضَوْرًا، وَضَرَّ يَضُرُّ ضَرًّا[1].

**١٥٦٠- عائیشه ﵂ دەڵێ: له مانگەکانی حەج و شەوەکانی حەج و له شوێن و کات و بارودۆخەکانی حەجدا، له خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووین (له مەدینه بەرەو مەککه)، جا له سەریف بارو بنەمان خست، عائیشه دەڵێ: ئینجا پیغەمبەر ﷺ (لەچادرەکەی) هاتەدەرەوە بۆ نێو هاوەڵانی و فەرمووی: ((هەر کەسێکتان ئاژەڵی دیاری بەیتی نەهێناوە و پێی نییە، وە حەز دەکات ئیحرامی حەجەکەی بکات بە عومرە، ئەوە با بیکات بە عومرە، هەرکەسێکیش دیاری پێیە، با ئیحرامەکەی نەکات بە عومرە (وەك خۆی بمێنێتەوە بە ئیحرامی حەج) ))، عائیشه وتی: جا هەبوو له هاوەڵانی حەجەکەیان کرد بە عومرە و هەندێکیان نەیانکرد، عائیشه دەڵێ: بەڵام پێغەمبەر ﷺ و کۆمەڵێ له هاوەڵانی توانایان هەبوو، وە ئاژەڵی دیاری بەیتیان پێبوو، لەبەر ئەوە نەیاندەتوانی ئیحرامەکەیان بگۆڕن بە عومرە، عائیشه دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ**

---

[1] بروانه: ٢٩٤.

لام، لەوکاتەدا دەگریام، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ژنەکە ئەوە بۆ دەگریت؟)) وتم: گوێم لەو فەرمایشتەت بوو بە هاوەڵانت فەرموو، کەواتە من ڕێگری عومرەکردنم لێ کراوە، فەرمووی: ((چیتە؟)) وتم: نوێژ ناکەم (کەوتوومەتە بێ نوێژی)، فەرمووی: ((زیانت لێ نادات، بێگومان تۆش ئافرەتێکیت لە ئافرەتانی ئادەم، ئەوەی خوا بەسەر تۆدا هێناویەتی، بەسەر هەموو ئافرەتانی ئادەمیدا هێناوە و نووسیوە، کەوابوو کارەکانی حەجەکەت ئەنجام بدە، بەڵکو خوا عومرەکەشت بە قیسمەت بکات))، عائیشە دەڵێ: جا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشتین لەو حەجەیدا تا گەشتینە مینا، ئەوسا پاکبوومەوە لە بێ نوێژی، ئینجا لە میناوە ڕۆیشتم بۆ مەککەو تەواڤی ئیفازەم کرد بەدەوری بەیتدا، پاشان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە ڕۆژی سێزدەی زولحیجە لە مینا دەرچووین، ڕۆیشت هەتا لە موحەصصەب لایدا، ئێمەش لەگەڵیدا لاماندا و دابەزین، ئینجا پێغەمبەر ﷺ عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری بانگ کرد، فەرمووی پێی: ((عائیشەی خوشکت لە سنووری حەرەم بەرە دەرەوە، با (لە تەنعیم) ئیحرام ببەستێ بە عومرە، پاشان عومرەکە تەواو بکەن، پاشان وەرنەوە بۆ ئا ئێرە، من چاوەڕوانتانم هەتا دێنەوە بۆ لام))، عائیشە دەڵێ: جا هەردووکمان (من و عەبدوڕەحمان) ڕۆیشتینە دەرەوە (لە مەککە بۆ تەنعیم، ئیحرامم بەست)، هەتا لە عومرەکە بوومەوە و تەواڤی ماڵئاوەییم تەواو کرد، پاشان لە بەرەبەیاندا ڕۆیشتمەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش فەرمووی: ((ئایا (لە عومرەکە) تەواوبوون؟)) وتم: بەڵێ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ جاڕیدا بەنێو هاوەڵانیدا بەبارکردن، ئینجا خەڵك باریان کرد و ڕۆیشتن، پێغەمبەریش ﷺ ڕوو بەمەدینە ڕۆیشت. (ضَيْرُ) دروستە لە (ضَارَ يَضِيرُ ضَيْرًا)ـەوە هاتبێ، وە دەشوترێ: (ضَيْرُ) لە (ضَارَ يَضُورُ ضَوْرًا)ـەوە هاتووە، وە لە گێڕانەوەیەکی تردا بە (ضَرَّ) هاتووە لە فەرموودەکەدا، کە لە (يَضُرُّ ضَرًّا)ـەوە هاتووە.

## ٣٤- بابُ التَّمَتُّعِ وَالإِقْرَانِ وَالإِفْرَادِ بِالحَجِّ، وَفَسْخِ الحَجِّ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ

١٥٦١- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَلاَ نُرَى إِلاَّ أَنَّهُ الحَجُّ، فَلَمَّا قَدِمْنَا تَطَوَّفْنَا بِالبَيْتِ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الهَدْيَ أَنْ يَحِلَّ، فَحَلَّ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الهَدْيَ، وَنِسَاؤُهُ لَمْ يَسُقْنَ فَأَحْلَلْنَ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَحِضْتُ فَلَمْ أَطُفْ بِالبَيْتِ. فَلَمَّا كَانَتْ لَيْلَةُ الحَصْبَةِ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يَرْجِعُ النَّاسُ بِعُمْرَةٍ وَحَجَّةٍ وَأَرْجِعُ أَنَا بِحَجَّةٍ. قَالَ: «وَمَا طُفْتِ لَيَالِيَ قَدِمْنَا مَكَّةَ؟». قُلْتُ: لاَ. قَالَ: «فَاذْهَبِي مَعَ أَخِيكِ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَأَهِلِّي بِعُمْرَةٍ ثُمَّ مَوْعِدُكِ كَذَا وَكَذَا».

قَالَتْ صَفِيَّةُ: مَا أُرَانِي إِلَّا حَابِسَتَهُمْ. قَالَ: «عَقْرَى حَلْقَى، أَوَمَا طُفْتِ يَوْمَ النَّحْرِ؟». قَالَتْ: قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: «لاَ بَأْسَ، انْفِرِي». قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَلَقِيَنِي النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ مُصْعِدٌ مِنْ مَكَّةَ، وَأَنَا مُنْهَبِطَةٌ عَلَيْهَا، أَوْ أَنَا مُصْعِدَةٌ وَهْوَ مُنْهَبِطٌ مِنْهَا[1].

## ٣٤- باسی جۆرەکانی حەجی: تەمەتتووع[2]، ئیقران[3]، ئیفراد[4]، وە هەڵوەشانەوەی ئیحرامبەستن بە حەج بۆ کەسێک ئاژەڵی دیاری نەهێنابێ بۆ گۆڕینی ئیحرامەکە بە عومرە

**١٥٦١- عائیشە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە مەدینە دەرچووین، لامان وابوو ئیحرام بەستن تەنها بە حەجە[1]، بەڵام کاتێ گەیشتینە مەککە و**

---

[1] بڕوانە: ٢٩٤.

[2] حەجی تەمەتتووع: واتە ئیحرام بەستن بە عومرە لەپێش ئەنجامدانی حەجدا.

[3] حەجی قیران یان ئیقران: بریتیە لە کردنی حەج و عومرە پێکەوە ئیحرام ناشکێنێ تا هەردووکیان تەواونەکات.

[4] حەجی ئیفراد: واتە ئەنجامدانی هەریەک لە حەج و عومرە بەجیاجیا لەپێشدا ئیحرام بە حەج دەبەستێت و ئەنجامی دەدات، پاشان ئیحرام بە عومرە ببەستێ و عومرەکەی ئەنجام بدات.

**تەوافمان کرد بەدەوری کەعبەدا، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەوانەی ئاژەڵی دیارییان نەهێنا بوو (پاش ئەنجامدانی عومرە) ئیحرامەکەیان بشکێنن، ئیتر ئەوانەی ئاژەڵی دیاری بەیتیان نەهێنابوو ئیحرامیان شکاند، خێزانەکانی پێغەمبەریش ﷺ ئاژەڵیان نەهێنابوو، بۆیە (عومرەیان کردو) ئیحرامی حەجەکەیان شکاند، عائیشە دەڵێ: من کەوتمە بێ نوێژی و تەواڤ بەیتم نەکرد، جا کە گەیشتینە شەوی مانەوە لە موحەصصەب، عائیشە ﵂ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن هەموو خەڵکی دەگەڕێنەوە حەج و عومرەیان کردووە، بەڵام من تەنها حەجم کردووە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ ئەو شەوانەی گەیشتینە مەککە تەواڤ بەیتت نەکرد؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: ((لەگەڵ براکەت (عەبدورەحمان) برۆ بۆ تەنعیم و لەوێ ئیحرام ببەستە بە عومرە، پاشان ژوانگەت ئەوێ و ئەوێ بێت)).**

**صەفییە وتی: وا گومان دەبەم ڕێگریان دەبم لە ڕۆیشتن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لەشت بەبار وزار بە ئازار بێ، ئەی ڕۆژی یەکەمی جەژن تەوافت نەکردووە؟)) صەفییە دەڵێ: وتم: با تەوافم کردووە، فەرمووی: ((دەی قەینا بگەڕێرەوە (لەگەڵماندا بۆ مەدینە) ))، ئینجا کاتێ پێغەمبەر ﷺ پێمگەیشت لە مەککە لەسەر ڕۆیشتن بوو، منیش بۆ مەککە دەهاتمەوە، یان بە پێچەوانەوە.**

١٥٦٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ حَجَّةِ الوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِالحَجِّ، وَأَهَلَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالحَجِّ، فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِالحَجِّ أَوْ جَمَعَ الحَجَّ وَالعُمْرَةَ، لَمْ يَحِلُّوا حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ[٢].

---

[١] ئەمە کاتێ بووە ئەحکامەکانی حەجیان لا ڕوون نەبووە، یان نەیانزانیوە عومرە لەکاتی حەجدا دەکرێ.

[٢] بڕوانە: ٢٩٤.

**١٥٦٢- عائيشه ﵂ دەڵێ: له ساڵی حەجی ماڵئاوايیدا له خزمەت پێغەمبەردا ﷺ له مەدینه دەرچووین (ڕوو بەمەککه)، هەمانبوو ئیحڕامیان تەنها به عومڕه بەستبوو، هەشمان بوو ئیحڕامی به حەج و عومڕه بەستبوو، له نێویشماندا هەبوو تەنها به حەج ئیحڕامیان بەستبوو، وه پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحڕامی بەس به حەج بەستبوو، ئەوسا ئەوانەی ئیحڕامیان تەنها به حەج بەستبوو، یان ئیحڕامیان به حەج و عومڕه پێکەوه بەستبوو، ئیحڕامیان نەشکاند هەتا ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان.**

١٥٦٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ مَرْوَانَ بْنِ الحَكَمِ قَالَ: شَهِدْتُ عُثْمَانَ وَعَلِيًّا ﵄، وَعُثْمَانُ يَنْهَى عَنِ المُتْعَةِ، وَأَنْ يُجْمَعَ بَيْنَهُمَا، فَلَمَّا رَأَى عَلِيٌّ، أَهَلَّ بِهِمَا: لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ وَحَجَّةٍ، قَالَ: مَا كُنْتُ لأَدَعَ سُنَّةَ النَّبِيِّ ﷺ لِقَوْلِ أَحَدٍ[1].

**١٥٦٣- مەڕوانی کوڕی حەکەم دەڵێ: (لەکاتی حەجدا) عوسمان و عەلیم بینی ﵄، عوسمان ڕێگری دەکرد له موتعەی حەج[2]، وه ڕێگری دەکرد له ئیحڕام بەستن به حەج و عومڕه پێکەوه، جا کاتێ عەلی (ڕێگری کردنی عوسمانی) بینی، (عەلی) ئیحڕامی بەست به حەج و عومڕه (و وتی): نیەتم هێنا به عومڕەو حەج، عەلی وتی: من واز له سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ناهێنم بۆ قسەی هیچ کەس.**

١٥٦٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ العُمْرَةَ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ مِنْ أَفْجَرِ الفُجُورِ فِي الأَرْضِ،

---

[1] بڕوانه: ١٥٦٩.

[2] واته: جۆری حەجی تەمەتوع، که ئیحڕام ببەستی به عومڕەو ئەنجامی بدەی، پاشان ئیحڕام بشکێنی، له ڕۆژی هەشتی زولحیجه ئیحڕام ببەستی به حەج.

وَيَجْعَلُونَ المُحَرَّمَ صَفَرًا، وَيَقُولُونَ: إِذَا بَرَأَ الدَّبَرُ، وَعَفَا الأَثَرُ، وَانْسَلَخَ صَفَرُ، حَلَّتِ العُمْرَةُ لِمَنِ اعْتَمَرْ، قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مُهِلِّينَ بِالحَجِّ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً، فَتَعَاظَمَ ذَلِكَ عِنْدَهُمْ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الحِلِّ؟ قَالَ: «حِلٌّ كُلُّهُ»[1].

**١٥٦٤- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: خەڵکی سەردەمی نەفامی (پێش ئیسلام) عومرەکردن بەلایانەوە لە مانگەکانی حەجدا لە خراپترینی خراپەکان وابوو لە زەویدا، مانگی موحەڕەمیان دەکرد بە مانگی صەفەر، دەیانوت: ئەگەر برینی پشتی وشتر چاك بوویەوە[2] و شوێن پێی حاجیان نەماو کوێر بوویەوە، وە مانگی صەفەر[3] تێپەڕی، ئەوەی بیەوێت عومرە بکات عومرەکردنی بۆ دروستە، پێغەمبەر ﷺو ئەو هاوەڵانەی لە ڕۆژی چوارەمی زولحیجە بە(لبیك) حەجیان دەبەست، فەرمانی پێکردن کە حەجەکەیان بکەن بە عومرە (ئیحرامەکەیان بشکێنن)، ئەوە بەلای هاوەڵانەوە زۆر گران بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە چ حەڵاڵ بوونێکە؟ فەرمووی: ((حەڵاڵ بوونی هەموو ئەو شتانەیە کە لەسەر ئەو کەسە حەڕامە لە کاتی ئیحرامدا بیکات)).**

١٥٦٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَيْسِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ. فَأَمَرَهُ بِالحِلِّ[4].

**١٥٦٥- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: (لەکاتی حەجدا) گەیشتمەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێ کردووە ئیحرامەکەی بشکێنێ[1].**

---

[1] بڕوانه: ١٠٨٥.

[2] لە سەفەری حەج ماندوویان حەسایەوە و برینیان نەما.

[3] واتە: مانگی موحەڕڕەم چونکە صەفەریان دەگۆڕی بە موحەڕڕەم.

[4] بڕوانه: ١٥٥٩.

١٥٦٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ. وَحَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ حَفْصَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا شَأْنُ النَّاسِ حَلُّوا بِعُمْرَةٍ وَلَمْ تَحْلِلْ أَنْتَ مِنْ عُمْرَتِكَ؟ قَالَ: «إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي، وَقَلَّدْتُ هَدْيِي، فَلاَ أَحِلُّ حَتَّى أَنْحَرَ»[٢].

**١٥٦٦- حەفصەی (ڕەزای خوای لێ بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بۆچی ئەو خەڵکەی تر عومرەیان کرد و ئیحرامیان شکاند، بەڵام تۆ بەکردنی عومرەکەت ئیحرامت نەشکاند؟ فەرمووی ﷺ: ((من قژم پێکەوە نووساندووەو ئاژەڵی دیاریم هێناوەو نیشانەم کردووە، بۆیە ئیحرام ناشکێنم تا وشترەکەم سەرنەبڕم)).**

١٥٦٧- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنَا أَبُو جَمْرَةَ نَصْرُ بْنُ عِمْرَانَ الضُّبَعِيُّ قَالَ: تَمَتَّعْتُ فَنَهَانِي نَاسٌ، فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، فَأَمَرَنِي، فَرَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ رَجُلًا يَقُولُ لِي: حَجٌّ مَبْرُورٌ وَعُمْرَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ. فَأَخْبَرْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: سُنَّةَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لِي: أَقِمْ عِنْدِي، فَأَجْعَلَ لَكَ سَهْمًا مِنْ مَالِي. قَالَ شُعْبَةُ: فَقُلْتُ: لِمَ؟ فَقَالَ: لِلرُّؤْيَا الَّتِي رَأَيْتُ[٣].

**١٥٦٧- ئەبو جەمرە کە نەصری کوڕی عیمرانی زوبەعییە دەڵێ: حەج و عومرەم بە تەمەتوع کرد، خەڵکانێك وتیان: نابێ وابکەی دروست نییە، منیش پرسیارم لە عەبدوڵای کوڕی عەباس کرد ﷺ، فەرمانی پێ کردم بیکەم و دروستە، (کە کردم) لە خەومدا دیم وەك پیاوێك پێم بڵێ حەجێکی چاك و عومرەیەکی وەرگیراوە، ئینجا ئەو خەوەم بۆ عەبدوڵای کوڕی عەباس گێڕایەوە،**

---

[١] دوای ئەوەی عومرەی کرد، چونکە ئاژەڵی دیاری بەیتی نەهێنابوو، ئەم فەرمووده بەدرێژتر لە ژمارە: ١٥٥٩ دا هاتووە و مانامان کردووە.

[٢] بڕوانە: ١٦٧٩، ١٧٢٥، ٤٣٩٨، ٥٩١٦.

[٣] بڕوانە: ١٦٨٨.

**وتی: ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، وە پێی وتم: لام بمێنەرەوە، بەشێك لە سامانەکەمت دەدەمێ، شوعبە وتی: وتم: (بە ئەبو جەمرە) بۆ بەشێك لە سامانەکەی پێ دایت؟ وتم: لەبەر ئەو خەوەی کە بینیبووم.**

١٥٦٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا أَبُو شِهَابٍ قَالَ: قَدِمْتُ مُتَمَتِّعًا مَكَّةَ بِعُمْرَةٍ، فَدَخَلْنَا قَبْلَ التَّرْوِيَةِ بِثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، فَقَالَ لِي أُنَاسٌ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ: تَصِيرُ الآنَ حَجَّتُكَ مَكِّيَّةً. فَدَخَلْتُ عَلَى عَطَاءٍ أَسْتَفْتِيهِ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما أَنَّهُ حَجَّ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ سَاقَ البُدْنَ مَعَهُ، وَقَدْ أَهَلُّوا بِالحَجِّ مُفْرَدًا، فَقَالَ لَهُمْ: «أَحِلُّوا مِنْ إِحْرَامِكُمْ بِطَوَافِ البَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ، وَقَصِّرُوا ثُمَّ أَقِيمُوا حَلاَلًا، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ فَأَهِلُّوا بِالحَجِّ، وَاجْعَلُوا الَّتِي قَدِمْتُمْ بِهَا مُتْعَةً». فَقَالُوا: كَيْفَ نَجْعَلُهَا مُتْعَةً وَقَدْ سَمَّيْنَا الحَجَّ؟ فَقَالَ: «افْعَلُوا مَا أَمَرْتُكُمْ، فَلَوْلاَ أَنِّي سُقْتُ الهَدْيَ لَفَعَلْتُ مِثْلَ الذِي أَمَرْتُكُمْ، وَلَكِنْ لاَ يَحِلُّ مِنِّي حَرَامٌ حَتَّى يَبْلُغَ الهَدْيُ مَحِلَّهُ». فَفَعَلُوا[١].

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: «أَبُو شِهَابٍ لَيْسَ لَهُ مُسْنَدٌ إِلَّا هَذَا».

**١٥٦٨- ئەبو شیهاب دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ مەککە بە تەمەتوع عومرەم بەست، سێ ڕۆژ لە پێش تەڕوییەدا[٢] چوومە مەککە، هەندێ لە خەڵکی مەککە پێیان وتم: ئێستا حەجەکەت دەبێ بە حەجی مەککەیی[٣]، منیش ڕۆیشتمە خزمەت عەتا پرسیارم لێ کرد، عەتاش وتی: جابیری کوڕی عەبدوڵا رضي الله عنهما بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ حەجی کرد لە ڕۆژێکدا کە پێغەمبەر ﷺ ئاژەڵی دیاری**

---

[١] بڕوانە: ١٥٥٧.

[٢] واتە: سێ ڕۆژ پێش ئەو ڕۆژەی ئیحرام بە حەج دەبەسترێ کە ڕۆژی هەشتی زولحیجە یە.

[٣] چونکە ئەبێ لە مەککە ئیحرام دابەستی، پاداشتی ئیحرام بەستنی لە میقاتەوە لەکیس دەچێ.

**هێنابوو لەگەڵ خۆی، هاوەڵانیش ئیحرامیان تەنها بە حەج دابەستبوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ((بەتەواف بەیت و سەعی نێوان صەفا و مەروە ئیحرامەکەتان بشکێنن، قژتان کورت بکەنەوە، پاشان بەحەڵاڵی بمێننەوە تا ڕۆژی تەڕوییە، ئەوسا ئیحرام بە حەج دابەستن، ئەوەی لەپێشەوە کردتان بیکەن بە عومرە))، وتیان: چۆن بیکەین بە عومرە لەکاتێکدا ئێمە ناوی حەجمان لێ هێناوە؟ فەرمووی: ((ئەوەی فەرمانتان پێ دەکەم بیکەن، ئەگەر من ئاژەڵم لەگەڵ خۆم نەهێنابایە، منیش وام دەکرد کە فەرمانم بەئێوە کردووە، بەڵام من نابێ ئیحرام بشکێنم، هەتا ئەو ئاژەڵەی بەدیاری بۆ بەیتم هێناوە نەگاتە جێگای خۆی)) ئەوسا هاوەڵان ئەوەی فەرمانی پێکردن کردیان.**

**ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەبو شیهاب تەنها ئەم فەرموودەی هەیە لە بوخاریدا کە بەنەپچڕاوی بگاتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ.**

١٥٦٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ الأَعْوَرُ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: اخْتَلَفَ عَلِيٌّ وَعُثْمَانُ ﵄ وَهُمَا بِعُسْفَانَ فِي الْمُتْعَةِ، فَقَالَ عَلِيٌّ: مَا تُرِيدُ إِلاَّ أَنْ تَنْهَى عَنْ أَمْرٍ فَعَلَهُ النَّبِيُّ ﷺ. فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ عَلِيٌّ أَهَلَّ بِهِمَا جَمِيعًا[١].

**١٥٦٩- سەعیدی کوڕی موسەییەب دەڵێ: عەلی و عوسمان ﵄ لە عوسفان بوون، دەربارەی موتعەی حەج ڕایان جیا بوو، جا عەلی وتی: هیچ مەبەستێك نییە تەنها ئەوە نەبێت کە ڕێگری لە شتێك کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی؟ ئەوسا کە عەلی ئەمەی بینی ئیحرامی بە حەج و عومرە بەست.**

---

[١] بڕوانە: ١٥٦٣.

## ٣٥- بابُ مَن لَبَّى بِالحَجِّ وَسَمَّاهُ

١٥٧٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ قَالَ: سَمِعْتُ مُجَاهِدًا يَقُولُ: حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: قَدِمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ نَقُولُ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ بِالحَجِّ. فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَعَلْنَاهَا عُمْرَةً[١].

## ٣٥- باسی کەسێک ئیحرامی بە حەج بەستبێت و ناوی هێنا بێت

**١٥٧٠- جابیری کوڕی عەبدولا ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ گەیشتینە مەککە و ئێمە دەمانوت: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ بِالحَجِّ)، واتە: تەلبییەمان دەکرد بە حەج و نیەتی حەجمان هێنابوو. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین گۆڕیمان بە عومرە[٢].**

## ٣٦- بابُ التَّمَتُّعِ على عَهدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ

١٥٧١- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي مُطَرِّفٌ عَنْ عِمْرَانَ ﷺ قَالَ: تَمَتَّعْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَنَزَلَ القُرْآنُ، قَالَ رَجُلٌ بِرَأْيِهِ مَا شَاءَ[٣].

## ٣٦- باسی تەمەتوع لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ

**١٥٧١- عیمران ﷺ دەڵێ: حەج و عومرەمان بەتەمەتوع کرد لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، قورئانیش دابەزی (لەسەر دروستی تەمەتوع)، کەچی کەسێك بەڕای خۆی ئەوەی بیەوێ دەیڵێ[١]. (کە لە قورئان و فەرموودەدا نییە).**

---

[١] بڕوانە: ١٥٥٧.

[٢] واتە: ئیحرام و نیەتەکەیان لە حەجەوە گۆڕی بە عومرە بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ.

[٣] بڕوانە: ٤٥١٨.

## ٣٧- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ ﴿١٩٦﴾ ﴾ البقرة.

١٥٧٢- وَقَالَ أَبُو كَامِلٍ فُضَيْلُ بْنُ حُسَيْنٍ البَصْرِيُّ: حَدَّثَنَا أَبُو مَعْشَرٍ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ مُتْعَةِ الحَجِّ، فَقَالَ: أَهَلَّ المُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ وَأَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ وَأَهْلَلْنَا، فَلَمَّا قَدِمْنَا مَكَّةَ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «اجْعَلُوا إِهْلاَلَكُمْ بِالحَجِّ عُمْرَةً إِلاَّ مَنْ قَلَّدَ الهَدْيَ». فَطُفْنَا بِالبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالمَرْوَةِ وَأَتَيْنَا النِّسَاءَ، وَلَبِسْنَا الثِّيَابَ، وَقَالَ: «مَنْ قَلَّدَ الهَدْيَ فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ لَهُ حَتَّى يَبْلُغَ الهَدْيُ مَحِلَّهُ». ثُمَّ أَمَرَنَا عَشِيَّةَ التَّرْوِيَةِ أَنْ نُهِلَّ بِالحَجِّ، فَإِذَا فَرَغْنَا مِنَ المَنَاسِكِ جِئْنَا فَطُفْنَا بِالبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالمَرْوَةِ فَقَدْ تَمَّ حَجُّنَا، وَعَلَيْنَا الهَدْيُ كَمَا قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ ﴿١٩٦﴾ ﴾ البقرة. إِلَى أَمْصَارِكُمْ. الشَّاةُ تَجْزِي، فَجَمَعُوا نُسُكَيْنِ فِي عَامٍ بَيْنَ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى أَنْزَلَهُ فِي كِتَابِهِ وَسَنَّهُ نَبِيُّهُ ﷺ وَأَبَاحَهُ لِلنَّاسِ غَيْرَ أَهْلِ مَكَّةَ، قَالَ اللهُ: ﴿ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ ﴿١٩٦﴾ ﴾ البقرة. وَأَشْهُرُ الحَجِّ الَّتِي ذَكَرَ اللهُ تَعَالَى: شَوَّالٌ، وَذُو القَعْدَةِ، وَذُو الحَجَّةِ، فَمَنْ تَمَتَّعَ فِي هَذِهِ الأَشْهُرِ فَعَلَيْهِ دَمٌ أَوْ صَوْمٌ، وَالرَّفَثُ الجِمَاعُ، وَالفُسُوقُ المَعَاصِي، وَالجِدَالُ المِرَاءُ.

## ٣٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەو تەمەتوعە بۆ کەسێکە کە (خۆی) و کەس و کاری دانیشتووی دەوروبەری مزگەوتی حەرام نەبن).

**١٥٧٢- عیکریمە دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عەبباس ﵄ دەڵێ: دەربارەی موتعەی حەج پرسیاری لێ کرا، عەبدوڵاش وتی: کۆچەران و ئەنصارِ و خێزانەکانی**

[1] لە (فتح الباري)دا دەڵێ: مەبەستی عیمران بەو کەسەیە بە بۆچونی خۆی شتێک دەڵێ: عومری کوڕی خەتتابە ﵁، فتح الباري: ٥٥٢/٤. لە ڕاڤەی فەرموودەی: ١٥٧١ دا.

**پێغەمبەر ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا ئیحرامیان (بە حەج) بەست، هەروەها ئێمەش ئیحراممان بەست[1]، جا کاتێ نزیکی مەککە بووینەوە (لە سەریف) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( (بەوانەی ئیحرامیان تەنها بە حەج بەستووە)، ئیحرامی حەجەکەتان بکەن بە ئیحرامی عومرە، جگە لەوانەی ئاژەڵی هەدیەیان نیشانەکردووە و پێیانە))، ئینجا تەواف بەیت و سەعی صەفا و مەڕوەمان کرد، (ئیحراممان شکاندو) سەرجێییمان لەگەڵ هاوسەرەکانمان کرد، وە جلوبەرگی ئاساییمان لەبەرکرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەرکەسێ ئاژەڵی هەدیەی (پێبێ) و نیشانەی کردبێت، ئەوە دروست نییە ئیحرامەکەی بشکێنێ، هەتا هەدیەکەی نەگاتە جێگای خۆی))[2]، پاشان ئێوارەی ڕۆژی تەروییە[3] فەرمانی پێکردین ئیحرام بە حەج ببەستین، کە لەکاروباری حەج بووینەوە، تەواف ئیفازەمان کرد و سەعی صەفا و مەڕوەمان کرد، ئیتر حەجکردنەکەمان تەواو بوو، ئاژەڵ سەربڕینمان کەوتە سەر، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: (ئەوەی چی بۆ هەڵسوڕا لە قوربانی (بیکات)، وە ئەگەر یەکێك نەیبوو، با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لەکاتی حەجدا، وە حەوت ڕۆژ کاتێ گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆتان)، (إِذَا رَجَعْتُمْ) واتە: (کاتێ گەڕانەوە) بۆ وڵاتی خۆتان، مەڕێك دروستە بۆ هەدی[4]، لەساڵێکدا دوو پەرستشیان پێکەوە ئەنجامدا کە حەج و عومرەن، چونکە بێگومان خوا لە قورئاندا دایبەزاندووە، وە پێغەمبەرەکەشی**

---

[1] لە فەرموودەی تردا هاتووە کە سێ جۆر ئیحراممان بەستووە:
یەکەمیان ئیحرامیان بە حەج و عومرە بەستووە، یان بە حەج و هەدیەیان لەگەڵ خۆیان هێناوە.
دووەمیان ئیحرامیان بە عومرە بەستووە و تەواویان کردووە، پاشان ئیحرامیان بە حەج بەستووە.
سێیەمیان ئیحرامیان بە حەج بەستووە و هەدیەیان لەگەڵ خۆیان نەهێناوە.

[2] واتە: لە ڕۆژی یەکەمی جەژنی قورباندا سەربڕێ.

[3] ڕۆژی هەشتی مانگی زولحیجەیە.

[4] حەج و عومرەی تەمەتوع.

ﷺ فەرمانی پێکردووە و ڕێگەی داوە بەتەمەتوع بۆ ئەو کەسانەی دانیشتووی مەککە نین، خوای گەورە فەرموویەتی: (ئەم تەمەتوعە بۆ کەسێك ماڵیان لە مەککەدا نەبێ)، وە مانگەکانی حەج کە خوای بەرز و بڵند لە قورئاندا فەرموویەتی ئەمانەن: شەوال و زولقەعدە و زولحیجە، جا هەر کەسێ لەم سێ مانگەدا تەمەتوع بکات، ئەوە خوێن ڕژاندن یان بەڕۆژووبوونی لەسەرە.
(الرَّفَثُ): جوتبوونی پیاو و ژنە، (الفُسُوقُ): گوناه کردنە، (الجِدَالُ): شەڕەقسەیە.

## ٣٨- بابُ الاغتِسَالِ عِنْدَ دُخُولِ مَكَّةَ

١٥٧٣- حَدَّثَنِي يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ كَانَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ إِذَا دَخَلَ أَدْنَى الحَرَمِ أَمْسَكَ عَنِ التَّلْبِيَةِ، ثُمَّ يَبِيتُ بِذِي طُوًى، ثُمَّ يُصَلِّي بِهِ الصُّبْحَ وَيَغْتَسِلُ، وَيُحَدِّثُ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ[1].

## ٣٨- باسی خۆشۆردن لە کاتی چوونە نێو شاری مەککەوە (سوننەتە)

١٥٧٣- نافیع دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ ئەگەر بڕۆیشتبایە نزیك حەرەم، ئەوە (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی نەدەکرد، پاشان لە (ذِي طُوًى) شەو دەمایەوە و نوێژی بەیانی لەوێ دەکرد و خۆی دەشۆری، وە دەیگێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە وای دەکرد.

## ٣٩- بابُ دُخُولِ مَكَّةَ نَهَارًا أَوْ لَيْلًا

بَاتَ النَّبِيُّ ﷺ بِذِي طُوًى حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ دَخَلَ مَكَّةَ، وَكَانَ ابن عُمَرَ ﵁ يَفْعَلُهُ.

---

[1] بڕوانە: ٤٩١.

١٥٧٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابن عُمَرَ ﵄ قَالَ: بَاتَ النَّبِيُّ ﷺ بِذِي طُوًى حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ دَخَلَ مَكَّةَ. وَكَانَ ابن عُمَرَ ﵄ يَفْعَلُهُ[1].

## ٣٩- باسی ڕۆیشتنە نێو شاری مەککە بەڕۆژ یان بەشەو (سوننەتە)

**پێغەمبەر ﷺ لە (ذِي طُوًى) شەو ماوەتەوە تا ڕۆژ بۆتەوە، پاشان ڕۆیشتۆتە نێو شاری مەککە، عەبدوڵای کوڕی عومەریش ﵄ بەهەمان شێوەی دەکرد.**

**١٥٧٤- نافیع دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەو لە (ذِي طُوًى) مایەوە تا ڕۆژ بوویەوە، پاشان ڕۆیشتە نێو شاری مەککەوە. (نافیع دەڵێ): عەبدوڵای کوڕی عومەریش ﵄ بەهەمان شێوەی دەکرد.**

## ٤٠- بابٌ: مِنْ أَيْنَ يدخلُ مَكَّةَ ؟

١٥٧٥- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَعْنٌ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْخُلُ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا، وَيَخْرُجُ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى[2].

## ٤٠- باسێک: (پێغەمبەری خوا ﷺ) لە کوێوە دەچووە نێو شاری مەککەوە؟

**١٥٧٥- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە (کەدائەوە کە ملەو گەردنەی سەرووەوە دەڕۆیشتە نێوەوە (بۆ مەککە)، وە لە مل و گەردنەی خوارووەوە دەڕۆیشتە دەرەوە (لە مەککە).**

---

[1] بڕوانە: ٤٩١.

[2] بڕوانە: ٤٨٤.

## ٤١- بابٌ: مِنْ أَيْنَ يَخْرُجُ مِنْ مَكَّةَ ؟

١٥٧٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدُ بْنُ مُسَرْهَدٍ البَصْرِيُّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ مِنْ كَدَاءٍ مِنَ الثَّنِيَّةِ العُلْيَا الَّتِي بِالبَطْحَاءِ، وَيَخْرُجُ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى[1].

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: كَانَ يُقَالُ هُوَ مُسَدَّدٌ كَاسْمِهِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ مَعِينٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ مُسَدَّدًا أَتَيْتُهُ فِي بَيْتِهِ فَحَدَّثْتُهُ لَاسْتَحَقَّ ذَلِكَ، وَمَا أُبَالِي كُتُبِي كَانَتْ عِنْدِي أَوْ عِنْدَ مُسَدَّدٍ.

## ٤١- باسێک: (پێغەمبەری خوا ﷺ) لە چ شوێنێکەوە لە مەککە دەردەچوو؟

**١٥٧٦- عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەدائەوە لە ملەو گەردەنەی سەرووەوە کە لە بەتحایە دەڕۆیشتە نێو مەککەوە، وە لەملەو گەردنەی خوارووەوە دەڕۆیشتە دەرەوە لە مەککە.**

**ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: جاران دەوترا: موسەدەد[2] نێومڕۆکی وەك ناوەکەی وایە، هەروەها ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: لە یەحیای کوڕی مەعینم بیست، دەیوت: لە یەحیای کوڕی سەعیدم بیستووە دەیوت: بێگومان ئەگەر بڕۆم بۆ ماڵی موسەدەد لە ماڵی خۆیدا فەرموودەی بۆ بگێڕمەوە[3] شایستەی ئەوەیە، وە دەڵێ: من گوێم لێ نییەو ئاساییە بەلامەوە کتێبی فەرموودەکانم لای خۆم بێت، یان لای موسەدەد بێ[4].**

---

[1] بڕوانە: ٤٨٤.

[2] کە بوخاری فەرموودەکەی: ١٥٧٦ـی لەوەوە گێڕاوەتەوە، وە موسەددەد واتە: ڕێک و پێک و ڕاست و دروست و جێگای متمانەیە.

[3] واتە: مامۆستا بڕوات بۆ ماڵی قوتابییەکەی کە پێچەوانەی باو و نەریتی فەرموودەناسانە.

[4] ئەوەندە جێگای متمانەیەو باوەڕپێکراوە.

١٥٧٧- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ وَمُحَمَّدُ بْنُ المُثَنَّى قَالَا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا جَاءَ إِلَى مَكَّةَ دَخَلَ مِنْ أَعْلَاهَا وَخَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا[١].

**١٥٧٧- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ که هاته نێو شاری مەککه لەلای سەرووەوە ڕۆیشته نێوی شار، که ڕۆیشته دەرەوە لەلای خوارووی مەککەوە دەرچوو.**

١٥٧٨- حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ المَرْوَزِيُّ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَامَ الفَتْحِ مِنْ كَدَاءٍ، وَخَرَجَ مِنْ كُدًا مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ[٢].

**١٥٧٨- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە که پێغەمبەر ﷺ ساڵی ئازادکردنی مەککه لەکەدائەوە ڕۆیشته نێو شار، وە له کوداوە له سەرووی مەککەوە له شار دەرچوو.**

١٥٧٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنَا عَمْرٌو، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَامَ الفَتْحِ مِنْ كَدَاءٍ أَعْلَى مَكَّةَ. قَالَ هِشَامٌ: وَكَانَ عُرْوَةُ يَدْخُلُ عَلَى كِلْتَيْهِمَا مِنْ كَدَاءٍ وَكُدًا، وَأَكْثَرُ مَا يَدْخُلُ مِنْ كَدَاءٍ، وَكَانَتْ أَقْرَبَهُمَا إِلَى مَنْزِلِهِ[٣].

**١٥٧٩- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە که پێغەمبەر ﷺ ساڵی ئازادکردنی مەککه له کەدائەوە که له سەرووی مەککەوەیه ڕۆیشته نێو شاری مەککه، هیشام[٤] دەڵێ: عورِوە[٥] له هەردووکیانەوە لەکەدائو کوداشەوە دەڕۆیشته نێو شاری مەککەوە، بەڵام بەزۆری له کەدائەوە دەڕۆشته نێو شاری مەککه، چونکه ئەوەیان له ماڵی (شوێنی نیشتەجێبوون) ئەوەوە نزیکتربوو.**

---

١ بروانه: ١٥٧٨، ١٥٧٩، ١٥٨٠، ١٥٨١، ٤٢٩٠، ٤٢٩١.

٢ بروانه: ١٥٧٧.

٣ بروانه: ١٥٧٧.

٤ هیشام یەکێکه لەو کەسانەی فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە.

٥ عورِوەش گێڕەرەوەی فەرموودەکەیە.

١٥٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الوَهَّابِ، حَدَّثَنَا حَاتِمٌ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عُرْوَةَ دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَامَ الفَتْحِ مِنْ كَدَاءٍ مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ. وَكَانَ عُرْوَةُ أَكْثَرَ مَا يَدْخُلُ مِنْ كَدَاءٍ وَكَانَ أَقْرَبَهُمَا إِلَى مَنْزِلِهِ[1].

**١٥٨٠- هیشام له عورووه دهگێڕیتهوه دهڵێ: ساڵی ئازادکردنی مهککه پێغهمبهر ﷺ لهکهدائهوه لهسهرووی مهککهوه ڕۆیشته نێو شاری مهککه، (هیشام دهڵێ): عورِوه بهزۆری لهکهداوه دهڕۆیشته نێو شاری مهککه، چونکه ئهو ڕێگایه نزیکترینیان بوو له ماڵهکهی.**

١٥٨١- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺعَامَ الفَتْحِ مِنْ كَدَاءٍ. وَكَانَ عُرْوَةُ يَدْخُلُ مِنْهُمَا كِلَيْهِمَا، وَأَكْثَرُ مَا يَدْخُلُ مِنْ كَدَاءٍ أَقْرَبِهِمَا إِلَى مَنْزِلِهِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: كَدَاءٌ وَكُدًا مَوْضِعَانِ[2].

**١٥٨١- هیشام له (عورِوهی) باوکیهوه دهگێڕێتهوه و دهڵێ: پێغهمبهر ﷺ ساڵی ئازادکردنی مهککه لهکهدائهوه ڕۆیشته نێو شار، (هیشام دهڵێ): عورِوه له ههردووکیانهوه (کهداو و کودا) دهڕۆیشته نێو مهککه، بهڵام بهزۆری له کهدائهوه دهچووه نێو شاری مهککه، چونکه له ماڵهکهیهوه نزیکتربوو، ئهبو عهبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دهڵێ: کهدا و کودا دوو شوێن و جێگان.**

---

[1] بڕوانه: ١٥٧٧.

[2] بڕوانه: ١٥٧٧.

## ٤٢- بابُ فَضْلِ مَكَّةَ وَبُنْيَانِهَا

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ ﴾البقرة: ١٢٥ - ١٢٨.

## ٤٢- باسی گەورەیی مەککە و دروست کردنی کەعبە

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند: (بیربکەنەوە کاتێك کەعبەمان گێڕا بە پەناگای خەڵکی و جێی ئاسایش (پێمان وتن:) شوێنی ئیبڕاهیم بکەنە جێگای نوێژ، وە فەرمانماندا بە ئیبڕاهیم و ئیسماعیل کە ماڵەکەم پاك بکەنەوە بۆ ئەوانەی کە بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە، وە ئەوانەی کە تێیدا دەمێننەوە، هەروەها بۆ کڕنووش بەران و سوژدەبەران، وە بیربکەنەوە کاتێك ئیبراهیم وتی: ئەی پەروەردگارم ئەم شوێنە (کە مەککەیە) بکە بەشارێکی پڕ ئاسایش و ڕۆزی دانیشتوانی بدە لە میوەجات، ئەوانەیان وا بڕوایان بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە، (خوا) فەرمووی: ئەوەش بێ بڕوابێ ڕۆزی پێدەدەم بۆ چەند ڕۆژێکی کەم، لەپاشان ناچاری دەکەم بەسزای ئاگری دۆزەخ کە خراپترین**

**سەرئەنجامە، بیربکەرەوە کاتێك ئیبراهیم و ئیسماعیل بناغەکانی کەعبەیان بەرزکردەوە (دەیان وت:) ئەی پەروەردگارمان ئەم کردەوەیەمان لێ گیرا بکە، بەڕاستی هەر تۆی بیسەری زانا، ئەی پەروەردگارمان هەردووکمان بکە بە فەرمانبەری خۆت، وە لە نەوەشمان گەلێك بکە بەفەرمانبەری خۆت، وە ڕێگاکانی خواپەرستیمان نیشان بدەو پەشیمانیمان گیرا بکە، بەڕاستی هەر تۆی گیراکەری پەشیمانی و میهرەبانیت).**

**١٥٨٢-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا بُنِيَتِ الكَعْبَةُ ذَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ وَعَبَّاسٌ يَنْقُلَانِ الحِجَارَةَ، فَقَالَ العَبَّاسُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: اجْعَلْ إِزَارَكَ عَلَى رَقَبَتِكَ. فَخَرَّ إِلَى الأَرْضِ، وَطَمَحَتْ عَيْنَاهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: «أَرِنِي إِزَارِي». فَشَدَّهُ عَلَيْهِ[1].

**١٥٨٢- جابیری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: کاتێ کەعبە دروستکرایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ و عەباس بەردیان دەبردو دەیانگواستەوە، عەباس ﷺ بە پێغەمبەری وت: پشتەماڵکەت بخەرە سەرملت (تا بەردەکان ئازاری نەدات)، پێغەمبەریش ﷺ کەوت و دای بەزەویدا، چاوەکانی بڕیبووە ئاسمان وتی: پشتەماڵەکەم بەرێ، ئینجا توند پێچای بەخۆیەوە.**

**١٥٨٣-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ أَخْبَرَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ- أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهَا: «أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ قَوْمَكِ لَمَّا بَنَوُا الكَعْبَةَ اقْتَصَرُوا عَنْ قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ؟». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا تَرُدُّهَا عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ؟ قَالَ: «لَوْلَا حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالكُفْرِ

---

[1] بڕوانە: ٣٦٤.

لَفَعَلْتُ». فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: لَئِنْ كَانَتْ عَائِشَةُ ﷺ: سَمِعَتْ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا أُرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَرَكَ اسْتِلاَمَ الرُّكْنَيْنِ اللَّذَيْنِ يَلِيَانِ الحِجْرَ، إِلَّا أَنَّ البَيْتَ لَمْ يُتَمَّمْ عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ[1].

**١٥٨٣- عائیشەی (ڕەزای خوای لێ بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((ئایا دەزانی هۆزەکەت (قوڕەیش) کاتێ کەعبەیان دروست کردەوە، لەو بناغەی ئیبراهیم (کەعبەی لەسەر دروست کردبوو) بچوکتر دروستیان کردەوە))، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نایگێڕیتەوە بۆ سەر ئەو بناغەی ئیبراهیم؟ فەرمووی: ((لەبەر ئەوە نەبوایە هۆزەکەت تازە لە کوفر وازیان هێناوە و مسوڵمان بوون، ئەوە وامدەکرد و دەمبردەوە سەر بناغەکەی ئیبراهیم))، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: ئەگەر عائیشە ئەمەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستبێ، وا گومان دەبەم هۆی دەست لێ نەدانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو دوو سوچەی لای حیجری ئیبراهیمەوەن، تەنها لەبەر ئەوە بووە کە کەعبە بەتەواوی لەسەر ئەساس و بناغەکەی ئیبراهیم دروست نەکراوەتەوە.**

١٥٨٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، حَدَّثَنَا أَشْعَثُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الجَدْرِ أَمِنَ البَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قُلْتُ: فَمَا لَهُمْ لَمْ يُدْخِلُوهُ فِي البَيْتِ؟ قَالَ: «إِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ». قُلْتُ: فَمَا شَأْنُ بَابِهِ مُرْتَفِعًا؟ قَالَ: «فَعَلَ ذَلِكِ قَوْمُكِ لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاءُوا، وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاءُوا، وَلَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِالجَاهِلِيَّةِ فَأَخَافُ أَنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ، أَنْ أُدْخِلَ الجَدْرَ فِي البَيْتِ، وَأَنْ أُلْصِقَ بَابَهُ بِالأَرْضِ»[2].

---

[1] بڕوانە: ١٢٦.

[2] بڕوانە: ١٢٦.

**١٥٨٤- عائیشە ﵂ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی ئەو دیوارە (ی پێی دەڵێن حیجری ئیسماعیل) ئایا بەشێکە لە بەیت و کەعبە؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، ئینجا وتم: ئەی لەبەر چی نەیانخستۆتەوە سەر بەیت؟ فەرمووی: ((بێگومان گەلەکەی تۆ (قورەیش) (کاتێ کەعبەیان دروست کردەوە) دەستیان کورت بوو))، وتم: ئەی بۆچی دەرگای بەیت بەرزە؟ فەرمووی: ((بۆیە گەلەکەت وایان کردووە، تا هەرکەسیان ویست بیبەنە نێوەوەی کەعبە، هەرکەسیشیان ویست ڕێگری لێ بکەن و نەیبەنە نێوەوە، وە ئەگەر گەلەکەت تازە مسوڵمان نەبوونایە (ئەوە وەك خۆیم لێ دەکردەوە)، بەڵام دەترسم لە دڵیانەوە پێی ناڕازی بن کە حیجری ئیسماعیل بخەمە نێو بەیت، دەرگاکەشی بلکێنم بە زەوییەوە (نزمی بکەمەوە) )).**

١٥٨٥- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْلاَ حَدَاثَةُ قَوْمِكِ بِالكُفْرِ لَنَقَضْتُ البَيْتَ، ثُمَّ لَبَنَيْتُهُ عَلَى أَسَاسِ إِبْرَاهِيمَ ﵇، فَإِنَّ قُرَيْشًا اسْتَقْصَرَتْ بِنَاءَهُ، وَجَعَلْتُ لَهُ خَلْفًا». قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ: خَلْفًا يَعْنِي: بَابًا[1].

**١٥٨٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((ئەگەر گەلەکەت تازە مسوڵمان نەبوونایە (ماوەی کەمە لە کوفر وازیان هێناوە) بەیتم دەڕوخاند، پاشان لەسەر بناغە و نەخشەکەی ئیبراهیم ﵇ دروستم دەکردەوە، چونکە بەڕاستی قورەیش خانووی بەیتیان بچوك کردۆتەوە، هەروەها دەرگایەکیشم بۆ دادەنا لە پشتەوە))، ئەبو موعاویە دەڵێ: هیشام بۆی گێڕامەوە وتی: (خَلْفًا) واتە: دەرگایەك.**

---

[1] بڕوانە: ١٢٦.

١٥٨٦- حَدَّثَنَا بَيَانُ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا يَزِيدُ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ رُومَانَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: «يَا عَائِشَةُ لَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ لأَمَرْتُ بِالبَيْتِ فَهُدِمَ، فَأَدْخَلْتُ فِيهِ مَا أُخْرِجَ مِنْهُ وَأَلْزَقْتُهُ بِالأَرْضِ، وَجَعَلْتُ لَهُ بَابَيْنِ: بَابًا شَرْقِيًّا، وَبَابًا غَرْبِيًّا، فَبَلَغْتُ بِهِ أَسَاسَ إِبْرَاهِيمَ».

فَذَلِكَ الذي حَمَلَ ابْنَ الزُّبَيْرِ ﵄ عَلَى هَدْمِهِ. قَالَ يَزِيدُ: وَشَهِدْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ حِينَ هَدَمَهُ وَبَنَاهُ وَأَدْخَلَ فِيهِ مِنَ الحِجْرِ، وَقَدْ رَأَيْتُ أَسَاسَ إِبْرَاهِيمَ حِجَارَةً كَأَسْنِمَةِ الإِبِلِ. قَالَ جَرِيرٌ: فَقُلْتُ لَهُ: أَيْنَ مَوْضِعُهُ؟ قَالَ أُرِيكَهُ الآنَ، فَدَخَلْتُ مَعَهُ الحِجْرَ فَأَشَارَ إِلَى مَكَانٍ فَقَالَ: هَا هُنَا. قَالَ جَرِيرٌ: فَحَزَرْتُ مِنَ الحِجْرِ سِتَّةَ أَذْرُعٍ أَوْ نَحْوَهَا[1].

**١٥٨٦- جەریری کوڕی حازیم دەڵێ: یەزیدی کوڕی ڕومان بۆی گێڕاینەوە لە عورووەوە، ئەویش لە عائیشەوە ﵂ گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: ((ئەی عائیشە ئەگەر گەلەکەت پەیوەندییان بە نەفامییەوە تازە نەبووایە (تازە مسوڵمان نەبوونایە)، بە دڵنیاییەوە فەرمانم دەکرد کەعبە بڕوخێنرێ، جا ئەوەی کە لێی کەمکراوەتەوە دەمخستەوە سەری (و بەرزییەکەیم نەدەهێڵاو) دەمنووساند بەزەوییەوە، وە دوو دەرگام بۆ دەکرد، دەرگایەك لە خۆرهەڵاتەوەو دەرگایەك لە خۆرئاواوە، هەروەها دەمبردەوە سەر بناغەکەی ئیبراهیم (کە لەسەرەتادا کەعبەی لەسەر دروستکرابوو) )).**

**ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ پاڵی بە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە ﵄ نا بۆ ڕوخاندنی کەعبە. یەزید دەڵێ: خۆم دیم کاتێ عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ﵄ کەعبەی ڕوخاند و دروستی کردەوە حیجری (ئیسماعیلی) خستە سەری، بناغەکەی ئیبراهیمم دی کۆمەڵە بەردێك بوو، وەك بەرزایی پشتی وشتر وابوو.**

---

[1] بروانە: ١٢٦.

جەریر دەڵێ بە یەزیدم وت: شوێنی بناغەکەی ئیبراهیم لەکوێدا بوو؟ وتی: ئێستا پیشانت دەدەم، لەگەڵیدا ڕۆیشتمە حیجری ئیسماعیل، ئاماژەی کرد بۆ شوێنێك وتی: ئا لەوێدابوو. جەریر دەڵێ: لە حیجرەوە پێوام بۆ ئەو شوێنە شەش باڵ یان لەو نزیکەدا بوو.

## ٤٣- بابُ فَضْلِ الحَرَمِ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى ﴿ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ النمل، وَقَوْلِهِ ﴿ وَقَالُوٓا۟ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ۚ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ القصص.

## ٤٣- باسی گەورەیی و فەزڵی حەرەمی مەککە

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند: ( (ئەی موحەممەد تۆ پێیان بڵێ:) بێگومان فەرمانم پێدراوە کە تەنها پەروەردگاری ئەم شارە (مەککە) بپەرستم، کە ئەو خوایە (ڕێز شکاندنی) ئەم شارەی حەرام کردووەو هەموو شتێك تەنها هی خوایە، وە من فەرمانم پێدراوە لە مسوڵمانان بم)، هەروەها ئەم فەرمایشتەی خوا: (ئایا ئێمە ئەوانمان جێگیر نەکردووە لە شارێکی ڕێزگیراوی (قەدەغەکراوی) بێ ترس و بیمدا، هەموو جۆرە بەروبوومێك کۆدەکرێتەوەو دەبرێ بۆ ئەوێ (مەککە) بەرۆزی دان لەلایەن ئێمەوە، بەڵام زۆربەیان نازانن و تێناگەن).

١٥٨٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْن عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ الحَمِيدِ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ فَتحِ مَكَّةَ: .إِنَّ هذا البَلَدَ حَرَّمَهُ اللَّهُ، لَا يُعْضَدُ شَوْكُهُ، وَلَا يُنَفَّرُ صَيْدُهُ، وَلَا يُلْتَقِطُ لُقَطَتَهُ إِلا مَنْ عَرَّفَهَا»[1].

**١٥٨٧- عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا فەرمووی: ((بێگومان ئەم شاری مەککەیە خوا (ڕێز شکاندنی) حەڕام کردووە، دڕك و داری نابڕدرێ، نێچیری ڕاو نانرێت، شتی ونبووی هەڵناگیرێتەوە تەنها بۆ کەسێ نەبێ جاڕی بۆ بدات)).**

## ٤٤- بابُ تَوْرِيث دُورِ مَكَّةَ وَبَيْعِهَا وَشِرَائِهَا وَأَنَّ النَّاسَ فِي مَسْجِدِ الحَرَامِ سَوَاءٌ خَاصَّةً

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِۚ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾ ﴾ الحج، البَادِي: الطَّارِي، مَعْكُوفًا: مَحْبُوسَاً.

## ٤٤- باسی حوکمی بەمیرات وەرگرتنی خانووەکانی مەککەو کڕین و فرۆشتنیان و هەموو خەڵکی مافیان هەیە بە یەکسانی لە مزگەوتی حەڕام (کەعبەدا)

**بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان ئەوانەی بێ باوەڕبوون وە ڕێگری (مسوڵمانان) دەکەن لە ڕێبازی خواو لە (ڕۆیشتن بۆ)**

[1] بڕوانە: ١٣٤٩.

**مزگەوتی حەرام (كەعبە)، كە ئێمە گێڕاومانە (بەشوێنی خواپەرستی)، بۆ هەموو خەڵكی یەكسانە چ ئەوانەی لەوێدان، یان لە دەرەوە بۆی دێن، وە هەركەس مەیلی لە هەق لادان و زوڵم و ستەم بكات تێیدا، سزای بەئێش و ئازاری پێ دەچێژین).** (البَادِي): **غەریب و دەشتەكی.** (مَعْكُوفًا): **ڕاگیراو، گیردراو.**

١٥٨٨- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيْنَ تَنْزِلُ فِي دَارِكَ بِمَكَّةَ؟ فَقَالَ: «وَهَلْ تَرَكَ عَقِيلٌ مِنْ رِبَاعٍ أَوْ دُورٍ؟». وَكَانَ عَقِيلٌ وَرِثَ أَبَا طَالِبٍ هُوَ وَطَالِبٌ، وَلَمْ يَرِثْهُ جَعْفَرٌ وَلاَ عَلِيٌّ رضي الله عنهما شَيْئًا؛ لأَنَّهُمَا كَانَا مُسْلِمَيْنِ، وَكَانَ عَقِيلٌ وَطَالِبٌ كَافِرَيْنِ، فَكَانَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه يَقُولُ: لاَ يَرِثُ الْمُؤْمِنُ الكَافِرَ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانُوا يَتَأَوَّلُونَ قَوْلَ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يُهَاجِرُوا۟ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَىْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟ ۚ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾ ﴾ الأنفال. الآيَةَ[1].

**١٥٨٨- ئوسامەی كوڕی زەید (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە كە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چ شوێنێك دادەبەزی و دادەنیشیت لە خانووەكەت لە مەككە؟ ئەویش فەرمووی: ((ئایا عەقیل هیچ بڕە خانوو یان ماڵێكی هێشتووە (هەمووی فرۆشتووە) ))، ئوسامە دەڵێ: عەقیل و تالیب خانوو بەرەی ئەبو تالیبیان بەمیرات برد، نەجەعفەر و نەعەلی هیچ میراتیان لە ئەبوتالیب نەبرد، چونكە جەعفەر و عەلی مسوڵمان بوون، بەڵام عەقیل و تالیب كافر بوون،**

---

[1] بروانە: ٣٠٥٨، ٤٢٨٢، ٦٧٦٤.

**عومەری کوڕی خەتابیش ﷺ دەیوت: ئیماندار میرات لە کافر نابات، ئیبنو شیهاب دەڵێ: هاوەڵان ئەو فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندیان بە میرات تەفسیر دەکرد کە دەفەرموێ: (بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان هێنا و کۆچیان کرد و تێکۆشان بە ماڵ و گیانیان لە ڕێی خوادا، وە ئەوانەی (کۆچەرەکانیان) گرتە خۆیان یارمەتییان دان ئەوانە پشتیوان و دۆستی یەکترین ...) تا کۆتایی ئایەتەکە.**

## ٤٥- بابُ نُزُولِ النَّبِيِّ ﷺ مَكَّةَ

١٥٨٩- حَدَّثَنَا أَبُو اليَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ أَرَادَ قُدُومَ مَكَّةَ: «مَنْزِلُنَا غَدًا -إِنْ شَاءَ اللَّهُ- بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الكُفْرِ»[1].

## ٤٥- باسی (شوێنی) دابەزینی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککە

**١٥٨٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ویستی بڕواتە نێو شاری مەککەوە فەرمووی: ((سبەینێ جێگای دانیشتنمان -بە ویستی خوا- شیوی تیرەی کینانە دەبێت، ئەو جێگایەی کە تێیدا (کینانە و قوڕەیشییەکان) سوێندیان خوارد بۆ یەکتری لەسەر بەردەوامبوونیان لەسەر کوفر)).**

١٥٩٠- حَدَّثَنَا الحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا الوَلِيدُ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الغَدِ يَوْمَ النَّحْرِ وَهُوَ بِمِنًى: «نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الكُفْرِ». يَعْنِي: ذَلِكَ المُحَصَّبَ، وَذَلِكَ أَنَّ قُرَيْشًا

[1] بڕوانە: ١٥٩٠، ٣٨٨٢، ٤٢٨٤، ٤٢٨٥، ٧٤٧٩.

وَكِنَانَةَ تَحَالَفَتْ عَلَى بَنِى هَاشِمٍ وَبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ -أَوْ بَنِي الْمُطَّلِبِ- أَنْ لاَ يُنَاكِحُوهُمْ، وَلاَ يُبَايِعُوهُمْ حَتَّى يُسْلِمُوا إِلَيْهِمُ النَّبِيَّ ﷺ.

وَقَالَ سَلاَمَةُ عَنْ عُقَيْلٍ وَيَحْيَى بْنُ الضَّحَّاكِ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ: أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ. وَقَالاَ: بَنِي هَاشِمٍ وَبَنِي الْمُطَّلِبِ.

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: «بَنِي الْمُطَّلِبِ أَشْبَهُ»[1].

**١٥٩٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەر لەبەیانی ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان لە مینادا بوو، فەرمووی: ((ئێمە سبەینێ لە شیوی تیرەی کینانە دادەبەزین و دادەنیشین، ئەو شوێنەی کە تێیدا سوێندیان بۆ یەکتری خواردو هاوپەیمانییەتیان بەست لەسەر کوفر و بێ باوەڕی))، ئەو شوێنە مەبەست پێی موحەصصەبە، ئەویش ئەوەبوو قوڕەیش و کینان بوونە هاوپەیمانی یەکتری لە دژی تیرەی هاشم و تیرەی عەبدولموتتەلیب -یان تیرەی موتتەلیب -، لەسەر ئەوەی ژن و ژنخوازیان لەگەڵ نەکەن و کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ نەکەن، هەتا پێغەمبەریان ڕادەست نەکەن)).**

**وە سەلامە گێڕایەوە و وتی: لە عوقەیل و یەحیای کوڕی زەححاکەوە لە ئەوزاعییەوە وتی: ئیبنو شیهاب بۆی گێڕامەوە. هەردووکیان (سەلامە و یەحیا لە گێڕانەوەکەیاندا) وتیان:** (بَنِي هَاشِمٍ وَبَنِي الْمُطَّلِبِ).

**ئەبو عەبدوڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ:** (بَنِي الْمُطَّلِبِ) **ڕەواترە و نزیکترە لە ڕاستییەوە (نەك:** بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ)[2].

---

[1] بروانە: ١٥٨٩.

[2] سەرنج: چونکە هاشم و مطلب هەردووکیان برا بوون عبدالموتەلیب کوڕی هاشمە، ئەگەر بڵێن: (بنو هاشم و بنو عبد المطلب) ئەو کات پێویست بە (بنو عبد المطلب) ناکات، هەر بڵێی بنو هاشم ئەویش دەگرێتەوە، بەڵام کە بڵێی (بنوهاشم وبنو مطلب) واتە: نەوەی ئەو دوو برایە.

# ٤٦- بابُ قَوْلِ اللّٰه تَعَالى:

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾ رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ إبراهيم.

## ٤٦- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند:

**(وە بیریان بێنەوە کاتێ ئیبراهیم ﷺ وتی: ئەی پەروەردگارم ئەم شارە (مەککە) بکە بەشارێکی ئارام و ئاسایش وە خۆم و کوڕەکانم بپارێزەو دوورخەرەوە لەوەی بتەکان بپەرستین، ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەو بتانە زۆر لە خەڵکیان گومڕا کردووە، جا هەرکەسێ (لەڕۆڵەکانم) شوێن من کەوت، ئەوە بێگومان لە منە، هەرکەسیش سەرپێچی کردم، ئەوە بێگومان تۆ لێبوردەی میهرەبانی، ئەی پەروەردگارمان من یەکێك لە ڕۆڵەکانم نیشتەجێکرد لە شیوێکی بێ کشتوکاڵدا، لای ماڵە پیرۆزو ڕێزگیراوەکەتدا، ئەی پەروەردگارمان تا بە چاکی نوێژ بەجێ بێنن، دڵی خەڵکانێ وا لێبکەیت سۆزیان بێ بۆ لایان و لە هەموو بەرومیوەیەکیش ڕۆزیان بدە، بەڵکو شوکرانە بژێر بن).**

## ٤٧- بابُ قَوْلِ اللّٰه تَعالَى: ﴿ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْيَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ۚ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ﴾ المائدة.

١٥٩١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللّٰهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُخَرِّبُ الكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الحَبَشَةِ»[1].

## ٤٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بڵند: (کەعبە کە ماڵی ڕێزلێگیراوە، خوا دایناوە بەهۆی ڕاوەستانی کاروباری دین و دونیای خەڵکی، هەروەها مانگە یاساغەکان و قوربانییە دیارنەکراوەکان و دیاری کراوەکان، ئەوەش بۆ ئەوەی کە بزانن بەڕاستی خوا دەزانێ و بەئاگایە کە چی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، وە بێگومان خوا بە هەموو شتێ زانایە).

**١٥٩١- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((پیاوێکی دوو لاق باریکی حەبەشی کەعبە دەڕوخێنێ)).**

١٥٩٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ.[2] وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللّٰهِ -هُوَ: ابْنُ المُبَارَكِ- قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي حَفْصَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانُوا يَصُومُونَ عَاشُورَاءَ قَبْلَ أَنْ يُفْرَضَ رَمَضَانُ، وَكَانَ يَوْمًا تُسْتَرُ فِيهِ الكَعْبَةُ، فَلَمَّا فَرَضَ اللّٰهُ رَمَضَانَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «مَنْ شَاءَ أَنْ يَصُومَهُ فَلْيَصُمْهُ، وَمَنْ شَاءَ أَنْ يَتْرُكَهُ فَلْيَتْرُكْهُ»[3].

---

[1] بروانە: ١٥٩٦.

[2] ئەم فەرموودەیە بە دوو سەنەد و ڕشتە گێڕدراوەتەوە.

[3] بروانە: ١٨٩٣، ٢٠٠١، ٢٠٠٢، ٣٨٣١، ٤٥٠٢، ٤٥٠٤.

**١٥٩٢- عائیشه ﷺ دەڵێ: (خەڵكی ڕۆژی عاشوڕا (كه ڕۆژی دەیەمی مانگی موحەڕەمه) بەرۆژوو دەبوون، پێش ئەوەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەڕز بكرێت، عاشوڕا ڕۆژێك بوو (بەبەرگێك) كەعبه دادەپۆشرا (تازه دەكرایەوە)، جا كاتێ خوا ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی فەڕزكرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەركەس ویستی ڕۆژووی عاشوڕا بگرێ با بیگرێ، هەركەسیش ویستی بەڕۆژوو نەبێ، با بەرۆژوو نەبێ)).**

١٥٩٣- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، عَنِ الحَجَّاجِ بْنِ حَجَّاجٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي عُتْبَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيُحَجَّنَّ البَيْتُ، وَلَيُعْتَمَرَنَّ بَعْدَ خُرُوجِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ». تَابَعَهُ أَبَانُ وَعِمْرَانُ عَنْ قَتَادَةَ. وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يُحَجَّ البَيْتُ». وَالأَوَّلُ أَكْثَرُ. سَمِعَ قَتَادَةُ عَبْدَ اللَّهِ وَعَبْدُ اللَّهِ أَبَا سَعِيدٍ.

**١٥٩٣- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كه فەرمووی: ((بێگومان پاش دەرچوونی یەئجووج و مەئجووج حەجی بەیت و عومرەش دەكرێ))، ئەبان و عیمڕان ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە له قەتادەوە، پاڵپشتی گێڕانەوەكەی عەبدوڵای كوڕی ئەبی عوتبەیان كردووە، وه عەبدوڕەحمان گێڕاویەتیەوە له شوعبەوە بەم جۆرە: ((قیامەت هەڵناسێ تا وای لێ دێ حەجی بەیت ناكرێ)) گێڕانەوەی یەكەم (كه حەججاج و ئەبان و عیمڕان گێڕاویانەتەوە له قەتادەوە) زۆرترن، وه قەتاده له عەبدوڵای بیستووە عەبدوڵاش له ئەبو سەعیدی بیستووە.**

# پێڕستی بەرگی دووەم

## ١١- پەڕاوی نوێـژی هەینی ٨١

## ١٢- پەڕاوی نوێــژی تـرس ١٢٩



## ١٣- پەڕاوی دوو جەژنەکە ١٣٧

## ١٤- پەڕاوی نوێــژی ویتر ١٧١



## ١٥- پەڕاوی داواکردنی بـارانبـارین ١٨٠

## ١٦- پەڕاوی نوێــژی خۆرگیران ٢١١

## ١٧- پەڕاوی سوژدەكانی قورئان خوێندن ٢٣٥

## ١٨- پەڕاوی کورتکردنەوەی نوێـژ ٢٤٥

## ١٩- پەڕاوی شەو نوێــژ ٢٦٩

## ٢٠- پەڕاوی گەورەیی نوێـژکردن لە مزگەوتی مەککە و مەدینە ٣١٦



## ٢١- پەڕاوی جوڵان لە کاتی نوێـژکردندا ٣٢٢

## ٢٢- پەڕاوی هەڵەكردن ٣٤٤



## ٢٣- پەڕاوی مردوو و جەنازە ٣٥٧

## ٢٤- پەڕاوی زەکات ٤٨٣

## ٢٥- پەڕاوی حەج ٥٨٨